# ڕامان

91

- بنیاتە ڕووکەشەکان و.... نەجات حەمید ئەحمەد
- چەمکی خۆشەویستی... ئوسامە حوسێن ڕەسووڵ
- ڕەنگدانەوەی کەسایەتیی... عەبدولڕەزاق بیمار
- ڕیزکردنی بەردەبازەکان بۆ........ ناسر وەحیدی
- چاوپێکەوتنێکی فراوان لەگەڵ (جەمال داوود)..
- بە یادی هونەرمەند (بەدیع باباجان)...........
- بەڵگەنامەیەک پێش......... ئازاد عەبدولواحید
- بەهاکان و پەندی پێشینانمان.... زەیتۆ شێخانی



مانگانەیەکی ڕۆشنبیریی گشتییە
بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری ڕامان دەری دەکات



گۆڤارێکی رۆشنبیریی گشتییە
بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری ڕامان دەری دەکات
خوولی دووەم - ساڵی نۆیەم
کانوونی یەکەم / 2004

**خاوەنی ئیمتیاز**
شەوکەت شێخ یەزدین

**سەرنووسەر**
ئازاد عەبدولواحید

**دارێژەری هونەری**
سەرکەوت وەلی

**ناونیشان**
هەولێر - تەنیشت سینەما سەلاحەدین

**E-mail:**
raman@raman-media.net

**تەلەفۆنی گۆڤاری ڕامان**
٢٢٣٠٥٨٢

**تەلەفۆن و مۆبایلی سەرنووسەر**
٤٤٩٤٦٦٢
٢٢٢٨٥٠٦

**چاپ**
چاپخانەی حاجی هاشم

**نرخ**
(١٠٠٠) دینار

# ناوەرۆک

لە بەراوێزی کولتوورەوە

# لە پایتەخت.. دەبێ کار بۆ بزاڤێکی شانۆیی بکرێ

* هیچ عەیبەی تێدا نییە کە ئێمە شانۆمان ڕەگوڕیشەیەکی مێژوویی نەبووبێ، چونکە شانۆ بۆ خۆی هونەرێکی ڕۆژئاواییە و هەموو گەلانی ڕۆژهەلات ئەو هونەرەیان لەوان خواستووەتەوە، کورد لەژێر کاریگەریی شانۆی عیراقی لەو هونەرە نزیک بووەتەوە، بەلام ئەمەش بەو مانایە نییە سەرومڕ ئێمە کارەکانی لەناو لاسایی کردنەوەدا نقوم بووبن و هیچ هەولێک لەپێناوی پەرەپێدان و داهێنان لە ئارادا نەبووبێ، بەتایبەتی لەو سالانەی دوایی کە هونەرمەندان ڕوویان کردە هەندەران و زۆریان خوێندنی ئەکادیمیان لەوێ تەواو کرد و لەسەر دەستی هونەرمەندی گەورە، ئەزموون و تاقیمانەی خۆیان دەولەمەند کردووە.

* لە هەموو ولاتێکی پێشکەوتووی دنیا بزاڤ و چالاکی هونەری و ڕۆشنبیریی ئەوعی دەبێتە بەشێکی ڕووکاری پێشکەوتنی ئەو ولاتە، بۆیە لە بواری هونەردا بایەخی زۆر بە جموجوولی شانۆ دەدەن، سالانە پلانی بۆ دادەڕێژن و بودجەی شایانی بۆ دادەنێن تا بە ڕیزی شانۆ پێشکەوتووەکانی دنیا بگاتەوە، ئەم شانۆیەش پەیامی مرۆڤانە و هونەریانەی خۆی دەگەیەنێتە کۆمەلگا.. میوانانی ئەو ولاتەش زۆرجار سەردانی شانۆکان دەکەن و ئاستی پێشکەوتنی ولاتی پێ دەپێون، ئاستی چێژ و هونەری ئەو ولاتەی لێوە دەبینن، سەرەڕای ئەوەش شانۆ ئەگەر بتوانێ بینەر بەلای خۆیدا ڕابکێشێ، ئەوە زۆر چاک دەکرێ توێژی لاوان بەشێکی کاتی بێ ئیشی خۆیان لە شانۆیەکاندا بەسەرببەن.

* چەند سالێک پێش ئێستا لە وتارێکمدا نووسیبووم کە ئێمە شانۆمان هەیە، بەلام ئەوەی کەنیمانە (بزاڤێکی شانۆییە). باسمان لەوە نییە ئەو شانۆیەی هەمانە چەند پێشکەوتووە یان دواکەوتووە، تایبەتمەندیی خۆمانی پێوە دیارە، یان پاشکۆی شانۆی عیراقی و عەرەبی و ڕۆژئاوایە.. ناشلێین ئەو شانۆیە چەند جێ دەست و پەنجە و ستایلی دەرهێنەرانی کوردی پێوەیە، لەوانەیە زۆر لەو باسوخواسانە دوابێن و گفتوگۆی زۆری لە بارەوە کرابێ، بەلام بە دەرەنجامێکی گەشبێن و دلخۆشکەر نەگەیشتووین.

* ئەوەی لێرەدا مەبەستمە جارێکی تر بیورووژێنم ئەبوونی (بزاڤێکی شانۆییە) کە پێویستە هەبێ و بە هەموو هەول و توانامانەوە بۆی بکۆشین بێتە دی، چونکە ناکرێ میللەتێک ڕووی لە مەدەنییەت و شارستانیەت بێ، ڕووی لە ژیانێکی ئارام و سەقامگیر بێ، ڕۆلی (شانۆ) لەم قۆناغی بنیادنانە بەلاوە بنێ کە گرنگترین کۆلەکەی پرۆسەی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیرییە، باشترین هۆکاری هوشیارکردنەوە و بەرزکردنەوەی ئاستی دنیابینی و چێژی جەماوەریشە. هەر ناگونجێ پایتەخت لە هیچ ولاتێکدا هەر بە تەنیا خەریکی بەرزکردنەوەی ئەپارتمان و بینایەی گەورە و زەبەللاح بێ، خەریکی شەقام و کۆلان قیرتاو کردن بێ، بەلام شانبەشانی ئەو شۆڕشی ئاوەدان کردنەوە و سەرلەنوێ بیناکردنەوەیە هوشیاری کۆمەلایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری پێشنەکەوێ، کە یەکێکیش لە ڕوالەتە گرنگ و پێویستەکانی شانۆیەکی پێشکەوتووە، بەلکو پێویستی بە بوونی بزاڤێکی شانۆییە کە لەوەرزی شانۆیی تایبەت و دیاری کراودا بەبێ پسانەوە و پچڕان یەک بەدوای یەک لەو وەرزە شانۆییەدا نمایشی شانۆیی یەک بەدوای یەک پێشکەش بکرێن.

* بۆ ئەو مەبەستە پێش هەموو شتێ هەول بدرێ ئەو بینەرانەی لە شانۆ تەوەلا بوون و تۆراون ئاشت بکرێنەوە، چونکە هەر شتێ دوور لە خەلکی بکرێ، باوەڕ ناکەم کاری شانۆیی بەبێ بوونی (بینەر) هیچی پێ بکرێ، بۆیە دیراسەتکردنی دوورکەوتنەوەی بینەرانی ئێمە لە شانۆ کارێکی زۆر پێویستە، دەشکرێ سەرەتا بە هەندێ کاری کۆمیدیایی دەست پێبکەینەوە.

* هەرگیز دەق و نەبوونی دەقی خۆمالی گرفتێک نییە بۆ ڕێگرتن لە بزاڤێکی شانۆیی کارا، چونکە هەر لەسەرەتای سالانی حەفتاوە تا ئەمڕۆکە چەندان نمایشی شانۆیی جوان و گرنگ پێشکەش کراون و لە یادەوەری ئێمەدا ماونەتەوە، هەر ئەو دەقانەش بوون کە لە ئەدەبیاتی میللەتانی دنیاوە وەرگیراون و ئەو نمایشە شانۆییانە بوون کە لە دەقی شانۆیی بێگانەوە بە کوردی کراون، بۆیە پێم وایە نەبوونی دەقی خۆمالی، یان نەبوونی نووسەری دەقی شانۆیی نابێتە بیانوو بۆ وەستانی شانۆ و ئیفلیج بوونی.

* ئەمڕۆکە لە هەر ڕۆژێک زیاتر ئەرکی سەرشانی لایەنە پەیوەندارەکانە کە هەلومەرجی لەبار و کەشی گونجاو بڕەخسێنێ و زەمینەسازی بکات بۆ جوولاندنی ئەو گۆمە مەنگەی کە شانۆی کوردی تێکەوتووە، ئەمەش بەهۆی:

(١) کۆکردنەوەی سەرجەم بەهرە و توانایەکان و هاندانی تیپی ئەهلی جۆراوجۆر کە پالپشتی سالانە بکرێن، دەستگیرۆیی کردنەکە بەرانبەر قەبارەی پێشکەش کردنی کارە هونەرییەکانیان بێ، بە تایبەتی بەشداربوون لە وەرزی شانۆیی سالانەدا.

(٢) توانا و ئەزموون و بەهرەیەکی هونەریی زۆر هەیە، دەمێنێتەوە سەر ناساندن و دۆزینەوەی بەهرەو تواناي لاوەکان، کە ئەمانیش دەکرێ لە تیپی جۆراوجۆردا کۆبکرێنەوە و پالپشتی بکرێن.

(٣) ئەرکی وەزارەتی ڕۆشنبیرییە لەمڕۆکەدا کە توانای ماددی زۆر لەبەردەستدایە کەرستە و پێداویستیی شانۆیی بۆ تیپەکان پەیدا بکات، واتە ئیکسسوار و کەلوپەل و پێداویستی نمایشی شانۆیی.

(٤) ئەرکی سەرشانی وەزارەتە خۆی بەکاری لاوەکی و پەراوێزییەوە سەرقال نەکات، تەرکیز لەسەر کاری ستراتیژی بکات کە جێ بکرێ، لەو کارە گرنگانەش بایەخدان بەهۆلی نمایشی شانۆیی کە هەموو هونەرمەندانی شانۆیی داد و بێدادیانە لە دەست نەبوونی هۆلی تایبەتی کە مواسەفاتی پێشکەش کردنی نمایشی شانۆیی تێدا بێ.

(٥) ئەگەر (٢) سال جارێکیش بێ، فیستیڤال و کۆڕ و کۆبوونەوەی گەورە بۆ شانۆ سازبکرێ، کە تیپی سەرجەم شارەکانی کوردستانی خۆمان و ڕۆژهەلات و تەنانەت تیپەکانی ئەورووپاش داوەت بکرێن، ئەوەش خزمەتێکی گەورە بەو بزاڤە دەکات.

(٦) ئەرکی سەرشانی وەزارەتە داوەتنامە ئاراستەی هونەرمەندی گەورە بکات، تا بێنەوە و لە ناو ولاتدا وەرشەی شانۆیی بکەنەوە و مەشق و ڕاهێنان بە قوتابیانی هونەر بکەن و ئەزموونەکانیان بگوێزنەوە کوردستان.

(٧) هەندێ نمایشی جوان بۆ بیانییەکان ئامادە بکرێن، تا لە کاتی سەردانیان بۆ ئەم پایتەختە، کورد وەک هونەریش بناسن و بزانن لە ڕێگەی هونەریشەوە باوەشیان بە ژیاندا کردووە.

أ- من لەو باوەڕەدام ئەگەر ئەو زەمینە سازییە لەلایەن وەزارەتەوە بکرێ و هەموو کەلوپەل و پێداویستییەک دابین بکرێ، ئەوە توانای ماددی لەگەل توانای مرۆیی یەکدەگرنەوە بۆ کاری سەرکەوتوو، بەتایبەتی ئەگەر عیشق و دلسۆزی بۆ هونەر و پێشخستنی هەبێ.

ب- ئەگەر کەشوهەوایەکی سازگاری دوور لە پاشقول گرتن بڕەخسێ کە هەموو لایەک بێتە مەیدانی کارکردن و کەس بەتانیەی پێدا نەدرێ، ئەوە لەوسەر کێبەرکێیەکی پاک دروست دەبێ و لەو کێبەرکێیەوە شێواز و ستایلی کاری جیاواز و تایبەتمەند دێتە دی، ئەوساکەش تەمەنی درێژ و مانەوە بۆ کارە چاکەکان دەنووسرێ.

سەرنووسەر

# بنیاتە ڕووکەشەکان و کێشەی بە دەقبوون

نەجات حەمید ئەحمەد

زۆرجار گوێبیستی ڕستەیەک دەبینەوە کە زۆر لە نووسین و گفتوگۆ ئەدەبییەکاندا دووبارە دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە فلان شیعر یا چیرۆک یا ڕۆمان یا ڕەخنە دەق نییە! ئاخۆ سیفەتە ئەدەبییەکانی بە دەقبوون چین و پاشان چ پێوەندییەکیان بە بنیاتەکانی دەقەوە هەیە لە زمانی ڕووکەشی دەق و پاشان لە زمانی شاراوەی دەقدا، ئاخۆ لە خوێندنەوە و تێڕوانینی ئەدەبی مافی ئەوەمان هەیە بەم حوکمەوە هیچ نووسین و گوتراوێک ڕەت کەینەوە و بە دەقی دانەنێین، ئەمە ئەو پرسیارانەیە کە ڕۆژانە چەندین کاری ئەدەبی پێ ڕەت دەکرێتەوە و چەندین کاری دیکەشی پێ بەرز دەکرێتەوە، دەمانەوێ بزانین چ نووسین و گوتراوێک بە دەق دادەنرێت و چ نووسین و گوتراوێکیش دەشێ ئەم سیفەتەی لێ بسەنینەوە؟

ئەگەر بێتوو بە دەقبوون و پێوەری بە دەقبوون ئاستی ئەو مانایانە بێ کە دەقێک هەڵی دەگرێ، واتە مانا پێوەری بەدەقبوون بێ.

هەر لەسەرەتاوە بەرەو ڕووی کێشەیەک دەبین پەیوەست بە خوێنەر و خوێندنەوە، هەروەها پەیوەست بە دەوری ڕەخنەوە، حوکمدان لەم مەسەلەیە بەرەو ڕووی خودی بەهاکانی ڕەخنەمان دەکاتەوە کە دەبێ خوێندنەوەی بۆ هۆکارەکانی بیرکردنەوە هەبێ، تەنانەت پێش نووسینیش هەروەها لە پۆلێنکردنی ئاستەکانی خوێندنەوە و بایەخ و ماهیەتی خوێندنەوەی ئەدەبی و گشتیدا هەمدیسان بەرەو ڕووی جیاوازی ئەو ئاستانە دەبینەوە، کێشەکەش هەمیشە هەر لەوێوە دەبێ کە ئێمە بۆچی دەخوێنینەوە و چۆن بەرهەمێکی ئەدەبی دەخوێنینەوە؟

گەر بێتوو لە هەڵسەنگاندنی خوێندنەوەی ڕەخنەییدا پەیوەست بە هەر دەقێکەوە جۆرێک لە تێڕوانینی جیاکەرەوەمان هەبێ، بەوەی جیاوازییەک بخەینە نێوان دەقەکانەوە، لە چوارچێوەی «زمان، مانا، شێواز، ناوەرۆک، شیعریەت». واتە هەموو ئەو پێوەرانەی کە ڕەخنەی کلاسیکی لە دوو توێیانەوە پۆلێنی دەقەکانیان دەکرد، ئەوا کەلەبەری سەرەکی لەوێدا بوو کە زۆرجار تازە نەبوونەوەی هۆیەکانی یا ڕەگەزەکانی خۆیان لەخۆیاندا بەڵگەیەک بوون بۆ نوشوستی ئەم خوێندنەوانە و زۆرجار لە ئەدەبی کوردیدا زۆرترین بەرهەمی ئەدەبی بەهێز پەراوێزکراون و خوێندنەوەی شایستەی خۆیان بۆ نەکراوە و دەقەکان بەبێ دەنگی تێپەڕبوون.

زمان بەلایەنی ڕەخنەی کلاسیکییەوە خۆی لە پێوەرێکی فەرهەنگسازی نووسەر و زۆریی وشەی نوێ و پاراویی لە دەربڕین و بەکارهێنانی ڕەگەزەکانی ڕەوانبێژی دەبینییەوە، بە بزرکردنی پرسیاری گەوهەری لە دەق، ئاخۆ ئەو زمانە چ جیهانێک لە بیر و داهێنان لە پشتەوەیەتی، بەبێ پرسیارکردن لەو بنیاتانەی کە جیهانبینی نووسەر هێناویانیەتیە کایەوە، چونکە ئاشکرایە کە دەق هەیە بە جوانترین ڕستەی زمانەوانی و وێنەی جیاواز نووسراودتەوە، بەڵام لە گەوهەردا ئەو زمانە دەربڕین لە حاڵەتێکی بەهێزی جیهانبینی نووسەر، واتە تێڕوانینی نووسەر ناکات بۆ دەرەوەی خۆی و بۆ هەموو کێشەکانی دەرەوەی خۆی، بەمەش شتێکی نەگۆڕە کە زمان لەم ئاستەی مانادا تەنیا ڕێگە و کەرەستەیەکە بۆ دەربڕین و هاوبەشیکەرێکی داهێنەرانە نییە بۆ

بنیاتنانی هیچ دەقێک و زمان نابێتە ئەو هێزە کراوەیەی دەربڕین لێکردن کە لە توانایدا بێت شان بەشانی تێڕوانینی نووسەر پەرە بسەنێ لە خولقاندنی، یا گەیاندنی مانا و بنیاتەکانی دەق بە ئاستی دووسەرەبوونێکی داهێنەرانە.

لە بنیاتی ڕووکەش و شاراوەی دەق، زمان کاتێک لەم دەورەی دەکەوێ، لە ئاستە داهێنەرەکەشی دەکەوێ، بە پێچەوانەی ئەم حاڵەتەوە دەق هەیە زمانێکی نا ئارایشت کراو و نادەوڵەمەندی هەیە لە وشە و مانادا، بەڵام جیهانبینییەکی قووڵی بۆ بیرکردنەوە هێناوەتە ئاراوە، کەواتە ئاستی بە دەقکردن لە زماندا بەم تێگەیشتن و بەم پێوەرە، ئاستێکی ڕەخنەیی نییە لە خوێندنەوە و بەدەقبووندا، بەڵکو ئاستێکی دیکە هەیە بۆ تێڕوانینمان لە کێشەی بەدەقبووندا، زمان و سروشتەکەی بە جۆرێکە لە دەور و وەزیفە ئەدەبییەکانیدا، هەروەها لە چۆنێتی بەکارهێنانیدا دەورێکی بنیاتنەر و هەروەها بێ لایەنیشی هەیە.

لە ئاستە داهێنەرەکەیدا زمان دەورێکی قورسی هەیە، کە ئەویش توانایەتی لە چۆنێتی بەرجەستەکردنی جیهانبینیی نووسەر کە بەیەک جار تەکنیکی دارشتن و شێوازی دارشتنی مانا و چۆنێتی دەربڕین لێکردنە لەو کێشەیەی کە دەقێک هەڵی دەگرێ، بەمەش تاقە کاریگەریی سەر زمان فرە ڕەنگی و دەوڵەمەندیی تێڕوانینی نووسەر و تێگەیشتن و دەور پێ بەخشینی نووسەرە بەزمان، زمان سروشتێکی نەچەسپاوی هەیە، سروشتێکی پلاستیکی هەڵکشاو و داکشاوی هەیە، لەگەڵ کرانەوە و خۆ پێکەوەنانی مانا ئەو سروشتەی کاردەکاتە سەر چۆنێتی دەربڕین لێکردن.

حاڵەتی گەیین لە زماندا پەیوەست بە هەر دەقێکەوە، ئەو فرە ڕێچکانەی دەربڕین لێکردنە جیاوازانەیە کە نووسەر بە دووی بەهێزترینیاندا دەگەڕێ، کە ماناکانی جیهانبینیی نووسەر دەپارێزێ لە واڵابوونێکی نابنیات نەردا، ئەمەش هەمدیسان پەیوەستە بە خودی کاری نووسەر لە تواناکانی زماندا بە دەر لەو بیروبۆچوون و هەستانەی کە دەیەوێ لە ڕێگەی زمانەوە دیسیپلین و کۆنترۆڵیان بکات، ئەو توانایەش وادەکات نووسەر فراوانی و فرە ڕەنگی دید و بۆچوونەکانی لە ڕێگەی زمانەوە دەربڕینیان لێبکات.

زمان لە دارشتن و دەربڕین لێکردندا هەمیشە بەکراوەیی و فرە ڕێگەو فرە دەلالەت دەمێنێتەوە، ئەو سیحرو توانایەی هەیەتی لەم فرە ڕەنگییەی دەربڕین لێکردن، نووسەر دەخاتە بەردەم ئەزموون و تاقیکردنەوەی فرە دەلالەتی و فرە مانای ئەو جیهانبینییەی هەڵی دەگرێ، ئەمەش لەناوەرۆکدا ئاستی تێگەیشتن و دۆزینەوەیە، دۆزینەوەیەک کە زۆرجار سیمای داهێنان دەگرێتە خۆی، زۆرجار زمان دەکاتە پەلکە زێڕینەیەک لە مانا و پڕ لە دەلالەت لێکردن، نووسەری خاوەن جیهانبینی لە حاڵەتی زۆر دەگمەندا نەبێ، زمان لەبەردەمیدا نابێتە ئاستەنگ، بەڵکو نهێنییەکانی خۆی بۆ واڵا دەکات.

نەرم بوونەوەی زمان و کرانەوەی پەیوەستێ بەو مانایانەی نووسەر هەڵیان دەگرێ و کاریان بۆ دەکا لە چۆنێتی دەربڕین لێکردندا و هەر ئەم چۆنێتییەیە کە بایەخێکی گەورەی هەیە لە نووسیندا، نووسەر هەرچەندە ڕەوانبێ و جیهانبینی قووڵ و پڕ مانابێ، چەندێکیش لە زمانی نووسیندا بەتوانابێ، ئەو هەمیشە لەژێر کاریگەریی ئەو نەخشەیەی کە بیرەکەی پێ دادەڕێژێ، هەر دەمێنێتەوە، ئەو کاریگەرییە لەوێدایە کە نووسەر چۆن بتوانێت بە شێوازێک لە نووسین کە پێوەندیی بە سەرەتا و درکاندن و شاردنەوە و هێما و کاتەوە هەیە نووسینەکەی دەست پێ بکات، مەسەلەکە پێوەندی بەوەوە نییە کە زمان چەندێک توانای دەربڕین لێکردنی هەیە. پێوەندی بە تواناکانی نووسەرێشەوە نییە لە زماندا، بەڵکو بە شێوەیەکی تایبەت پێوەندی بەوەوە هەیە کە چۆن نووسەر زمان بەکاردێنێ بۆ بەرجەستەکردنی جیهانبینییەک یا دنیابینییەک، بە جۆرێک خراپ بەکارهێنانی زمان کاردەکاتە سەر ناوەرۆک و بنیاتەکانی دەق، بۆ نموونە زوو واڵاکردنی بابەتە گرنگەکانی دەق لە هەندێک جۆری نووسیندا، زیان بە خوێندنەوە دەگەیێنێ، هەروەکو چۆن هەوڵی زێدەڕۆیی زمانەوانی بۆ شاردنەوەیەکی زێدەڕۆیی بابەت، وا دەکات خوێندنەوە بەرەو بارێکی زۆر دیاریکراو بڕوات و خوێنەر تووشی وەڕسبوون و تێنەگەیشتن بەرێ، بەم پێیەش زمان ئەو توانایەی تێدایە کە لە دەستی نووسەراندا بە بارە داهێنەرەکەیدا بیرێ یاخود بە بارێکی نا داهێنەرانەدا بیرێ.

زمان بوونێکی نیمچە چەسپاوی هەیە لە تاکەکانی وشە و زاراوە و ڕستەکانی دەربڕین لێکردندا، هەروەها لە هاومانایی و وشە لێکچووەکان و ڕێزمان و تارادەیەکی چاکیش لە ڕەوانبێژی و پەند و حیکمەت و ئیدیۆمدا، بەڵام قەتاو قەت لە باری هەڵوەشاندنەوە و بنیاتنانەوەی مانادا ئەو بارە چەسپاوەی نییە، بەڵکو تەنیا پشت بە تواناکانی نووسەر دەبەستێت کە چۆن زمان بەکاردێنێ.

لە ڕەخنەی کلاسیکی کوردیدا جوانی و دەوڵەمەندیی ڕستە ئاماژەیەکی بەهێز بووە بۆ سەرکەوتنی دەق، بەڵام لە ڕەخنەی نوێدا زمان و هەژاریی دەربڕین لێکردن و بەرامبەر بەمەش دەوڵەمەندیی دەربڕین لێکردن تەنیا و تەنیا پشت بە نووسەر دەبەستێت لە چۆنێتی دەربڕین

لێکردن و چۆنێتی بنیاتنانی مانادا، هەروەک دەبینین لە ئەدەبی کوردیدا نووسەرانێکی زۆر، زۆر بە ئاگایی و دەوڵەمەندی و وشەی نوێوە دەقەکانیان دەنووسن، بەڵام لە گەوهەردا دەقەکانیان بەتاڵن لە بینای مانای بەهێز و ناوەرۆکی دەوڵەمەند، بەتاڵن لە ڕستەی سەرسوڕهێنەر و پڕ لە جووڵە، کەواتە زمان بەدەرنییە لە تواناکانی خودی نووسەر و هەوڵی ئەو بۆ بنیاتنانی دەقێکی زیندوو.

لێرەدا تووشی کێشە و گرفتێکی دیکە دەبین، ئەویش ئەوەیە کێشەیەک دەهێنرێتە ئاراوە بەبێ پەیوەستکردنی بەتوانای دەربڕین لێکردنەوە لەلای نووسەردا کە ئەویش کێشەی ناوەرۆک و شێوەیە، لەم لایەنەوە دەتوانین سەرجەمی نووسینەکانی ئەدەب و ڕەخنەی کوردی لە سێ تەوەری گفتوگۆ لەسەر کردندا کۆکەینەوە، لایەنێکیان ناوەرۆک بە پێوەری سەرخستنی دەقێک دادەنێن «ئایدیۆلۆژیستەکان»، لایەنێکی دیکەشیان شێوە بەسەر ناوەرۆکدا زاڵ دەکەن «فۆرم خواز و ستیلیست و هونەر بۆ هونەر خوازەکان» لایەنێکیشیان بەیەک چاوی گرنگی پێدانەوە سەیری ئەم دوو لایەنە دەکەن «بێ لایەنەکان»، ئەم جۆرە پۆلێنکردنەی دەقی ئەدەبی لە تێنەگەیشتن و نەزانیەکی سەیرەوە سەرچاوە دەگرێ، لەلایەکەوە هیچ پاساوێکی نەڕەوشتی و نە ئایدۆلۆژی، نە دەبێ ئەوە بسەپێنێتە سەر نووسەرێک کە ئەو چۆن لە نووسیندا دەبێ زیاتر بایەخ بە ناوەرۆک یا شێوە بدات و نە دەشتوانێ ئەوە بسەپێنێتە سەرنووسەر کە هاوسەنگییەک لە نووسیندا بێنێتە کایەوە، کە هەردوو بابەت وەکو یەک گرنگیان پێ بدا.

ئەم جۆرە پۆلێنکردنە سنوورداری کردنی توانای نووسەرە و لەلایەکی دیکەشەوە سنوورداری کردنی ئازادی نووسەرە و سەپاندنی جۆرێکی هەڵە لە تێڕوانین و بۆچوونە بەسەر نووسەران و پاشان بەسەر خوێنەراندا، کە بە داخەوە تاکو ئێستا لەلایەنە پراکتیکییەکەوە نازانین شێوە، یانی چی و پاشان ناوەرۆک، یانی چی و چۆن ئەم دوو لایەنە پێوەرێکن بۆ داهێنانی ئەدەبی.

شێوەی دەق مانای ئەوە ناگەیێنێ کە دەق لە ڕێگەی جوانکاریی وێنە و زمان و بەکارهێنانی زۆری وشەی ئاڵۆز و هێماوە، لە ڕێگەی نەبوونی بابەتەوە دەقێک بنووسرێ کە ناوەرۆک تیایدا لاواز و بێ ژیان و ناچالاک دەبێ و هەروەکو چۆنێک بیرنەکردنەوە لەو شێوازەی دەقێک هەڵی دەگرێ بە بەکارهێنانێکی زێدەڕۆی ناوەرۆک و بابەت و چۆنێتی گوتنی شتەکان و بایەخ نەدان بە لایەنێکی دیکەی دەق، بەڵکو بە چەندین ڕەگەزی زمانەوانی و هونەری نووسینەوە، هەوڵی لەبارابردنی توانای زمان بدرێ لە داهێنانی ئەدەبیدا، بەڵکو ئەوەی بەلای نووسەرەوە گرنگە و شوێنی پرسیار و بەدواداچوون و خوێندنەوەی وردە کە ئەو چۆن مامەڵەیەکی داهێنەرانە لەگەڵ هەموو کەرەستەکانی دەربڕین لەخۆکردن و دەربڕین کردن لە شتەکان دەکات، هەروەها لەو بیرو دنیابینییەی کە تەنانەت پێش نووسینی دەقیش، لە عەقڵی نووسەردا وەک قورساییەکی بیرکردنەوە بەرز و نزم دەبێتەوە، هەموو ئەمانەش دەچنە چوارچێوەی چۆنێتی بنیاتنانی دەقەوە بەو پێوەرەی هەموو بیر و دنیابینییەکی زارەکی و ژیاوە، هەمیشە وەک مانا و دەرک پێکردن و هەست پێکردنی پێش وەختە، لە گەردوونێکی بێ بنیات و بەرەڵادان، کە هەموو کەسێک بۆی هەیە لەمیانی قسە لەسەر کردن لە یەکێکەوە وەری گرێ و پاشان دەربڕینی لێبکات.

شێوە مانایەکی تەجریدکراوی ناگیان و نابنیات نییە، شێوە مانایەکی ڕەها و قاڵبێکی زانراو نییە، شێوە چۆنێتی بە بنیاتکردنی دەقەکانە و هەموو دەقەکانی دنیا چۆنێتی گەیشتنیان بەداهێنان لەو خاڵەوە دەبێ کە نووسەر چۆن بنیاتی زمان و مانا دەنێت، هەروەکو چۆن ناوەرۆک بە مانا کلاسیکییەکەی هاودژ و نەگونجاو نییە لەگەڵ چۆنێتی بەبنیاتکردنی مانادا، بەڵکو ناوەرۆکیش هەمدیسان مانایەکی تەجریدکراو و دیاریکراو و لە قاڵب گیراو ناگەیێنێ، بەڵکو ناوەرۆک گەوهەری کێشەی دەقەکانە و هیچ دەقێک بەبێ بوونی کێشەیەک نابێ بەدەق، کەواتە هەر چۆنێتی بنیاتنانی دەق و چۆنێتی دەربڕین کردنە لە کێشەیەکی زیندووی مرۆڤ و شتەکان دەق دروست دەکات نەک شێوەو ناوەرۆک، بنیات و کێشە ئەو دوو زاراوە ڕەخنەییە زیندووەن کە دەبنە چۆنێتیەک بۆ خوێندنەوەی دەقەکان و پاشان هەر لە دوای ئەو خوێندنەوەیەیە کە ئێمە دەگەینە گەوهەری باوەڕی بەدەقبوونی نووسینێک یا بەدەقنەبوونی، ئەمەش شێوەیەکی ڕەهای حوکم لەسەردان و ڕەتکردنەوە نییە بە قەد ئەوەی لە بنەڕەتەوە هەوڵی تێگەیشتنە لە نووسین بەشێوەیەکی بەرهەمهێن و بە چاوێکی زانستی و بێ لایەنەوە.

بۆ زیاتر لێکدانەوەی هەردوو زاراوەی بنیات و کێشەکە لە کتێبی تیۆری بنیاتی شاراوە بە کورتی باس کراون، لێرەدا ڕوونکردنەوەی زیاتر بەم دوو چەمکە دەبەخشین بە بنیات کردنی کێشە، کۆتاییەکە بۆ زانین لە زەمەن و بیرکردنەوە و تێڕوانینێکی ئاراستە دیاریکراو بۆ کێشەیەک، هەموو دەزانین کاتێک نووسەر دەست بە نووسینی دەقێک دەکات لە بەتاڵاییەکی بیرکردنەوە و بۆچوون و تێڕوانینێکەوە دەست بۆ قەڵەم نابات، نووسەر دەشێ بۆ ماوەی زیاتر لە چەندین هەفتە و مانگیش کێشەیەک لە بیرکردنەوەیدا هەبێ، کە لەسەرجەمدا پێوەندی ئەوە، یا بیرکردنەوەی ئەوە لە بابەتێکی

دیاریکراو، لە چیرۆک و ڕۆماندا ئەو کاری بیرکردنەوە و بە خولیا و گرفتاری بوونە زەینییە شەکەتی و ماندوبوونێکی گەورەی دەوێ، کاتێک نووسەر بیر لە ڕەنگدانەوەی کێشەکان دەکات لەسەر کەسایەتییەکان، ئەم جۆرە ڕۆچوونەی بیرکردنەوە لە کێشەیەکی سروشتی و مرۆیی و بوونیە، هەروەک ئەو بیرە سەرەتاییە بە مێژوونەکراوانەن کە هیچ بوون و بنیاتێکیان نییە، ئەو هۆکارە سەرەتاییانەی نووسین کە نووسەر بەرەو هاندان و جۆش پێدان دەبەن بۆ زیاتر کاملکردن و دەوڵەمەندکردنی، ئەمە وەکو هەر جۆرێکی دیکەی هونەرەکان نییە، بەڵکو هاوژیانی و هاوڕازی و هاوسۆزییەکی بەردەوامە لەگەڵ کێشەیەکدا کە نووسەر باوەڕ بەخۆی دێنێ، کە ئەم کێشەیە لە هەڵسەنگاندن و تێڕوانینیدا شوێنی بایەخ و گرنگی پێدانە و پاشانیش دۆزینەوەیەکە لە تێگەیشتندا، ئەمە پێوەندی بەوەوە نییە کە نووسەر چەندێک لە هاوسۆزییەکی ئایدۆلۆژی و هونەرییەوە پۆلێنی بیرکردنەوەکانی خۆی بکات، پێوەندی بەلایەنداری و بەمەنهەج کردنی بیرکردنەوە نییە، بەڵکو پێوەندی بەوەوە هەیە، کە ئەو کێشەیەی ئەو بیری لێ دەکاتەوە پەیوەست بە مرۆڤ و دەوروبەری خۆیەوە، کێشەیەکی مرۆیی و سروشتی و بوونایەتییە، کێشەیەکە کە مانایەکی گەورە لەبیرکردنەوە و پاشان تێڕوانینی مرۆڤ دەنوێنێ بۆ ئەو بوونانە، ئەم بیرکردنەوە پێش دەستییەی نووسین لە هەمان کاتدا گواستنەوەی هۆکارەکانی نووسینە لە دەقێکی ناکامڵ و بێ بنیات، دەقێکی زیندوو و بێ گیان، دەقێک کە هێشتا دەژی و لەلای نووسەردا نەگەیشتۆتە حاڵەتی پێگەیین لە تەواوکردنی ماناو تێگەیشتندا، کە پاش ئەوەی نووسەر ئەم بیرە سەرەتاییانەی کێشەی دەقێکی لەلادا کامڵ دەبێ، ئەوجا دەست بە چۆنێتی دارشتنی دەکات، نەک بەخشینی شێوەیەک بە بیرکردنەوە، چونکە بیرکردنەوە شێوەی نییە، بەڵکو بنیاتی هەیە، ئەو بنیاتەش لە بیرێکی یا کێشەیەکی نەنووسراودا بوونی نییە و لە دەقی نووسراویشدا کە لە مێشکەوە دەخرێتە سەر کاغەز، ئیتر لە بوونی نووسەر جیا دەبێتەوە و دەمرێت و دەبێتە تێگەیشتنێکی کۆتایی پێهاتوو هەروەکو بنیاتێکی بە مێژووکراوی کۆتایی پێهاتوو، بەڵام لەنێوانی بیر و نووسەردا پەیوەست بە دەقێکەوە، ئەوەی نووسەری بنیاتنەر بە زیندوویێتییەکی ڕەها دەهێڵێتەوە، گەڕانە بەدووی هۆکارەکانی نووسین، هۆکارەکانی نووسین ئاشنا کردنەوەی خوێنەرد بەو هۆیانەی کەوایان لە نووسەرێک کرد بەم جۆر و چۆنێتییە بیر لە کێشەیەکی تازە بکاتەوە.

لێرەدا پەیوەست بە بابەتەکەمانەوە ئەوەی گرنگە مەسەلەی بنیاتە، هەروەک دەزانین لە زمانی دەقدا کۆمەڵێک پەیوەستی دیاریکراو و ئاراستەکراو هەیە، کۆمەڵێک تێگەیشتن و ڕاگەیاندن و درکاندن و بۆچوون هەیە، کە بەپێی جۆری ئەدەبی گۆڕانیان بەسەردا دێ، ئەم زانین و گەیشتن و بیرە ڕاگەیاندراوانە دەکەونە بەشی سەرەوەی زمان، ئەمانە ئەو زانینانەن کە هەموو خوێنەرێک لە چوارچێوەی مانای سادە و زانراو و ڕووداو و چەندین ڕەگەزی دیکەوە وەک مانای ڕووکەش وەریان دەگرێ، ئەم ماناسەرخراوانەی زمانی دەق گەر بیان خەینەوە سەر ئەو چۆنێتییەی کە نووسەر هەوڵی داوە دەربڕینیان لێ بکات، دەبینین هەموو لە پەیوەستێکی سەیری خۆ ڕێکخستندان، چۆن؟

ئەم مانایانەی سەرەوەیی زمانی دەق، هۆکاری نووسین و گەوهەر و مانای ڕەهای دەق لە خۆیاندا ناگرن و ئاشکرای ناکەن، بەڵکو ئەو مانایانە لەم دەورەیاندا دەچنە چوارچێوەی چەندین بنیاتی سادە و ئاڵۆزی دارشتنی زمان و چۆنێتی بەکارهێنانیانەوە لە بۆتەی بنیاتە ڕووکەشەکانی دەق. بەمەش بنیاتی ڕووکەشی دەق هەموو پەیوەست و جووڵەو ڕوداو و بیرکردنەوە سەرەتاییەکانی نووسین دەنوێنێ لە بۆتەی کێشەیەکی بنەڕەتی کە ئەویش بە دەوری خۆی دەچێتە بۆتەی بنیاتی کێشە سەرخراودکانی دەقەوە، بنیاتی ڕووکەش لە گەوهەردا ئەو مانایانەن کە پێمان ئاشنا دەکرێن بە زمانێکی بەرجەستە بووی ساکار و ئاشکراو زانراودوە، کە دەبینین لە دەقێکیدا لەچوارچێوەی پەرەسەندن و پێشخستنێکی بنیاتنەردا، وەک هێڵێکی ئاشکرا و ڕوون لە دەقدا بوونیان هەیە و دەرکی پێ دەکەین، ئەم دەورەی بە بنیاتکردنی مانا لە پێناوی ئامانج و مەبەستێکی دیکەدایە، لە پێناوی شاردنەوەی بنیاتێکی دیکەدایە، ئەو بنیاتەی کە هیچ بوونێکی ڕاستەوخۆی لە زمانی نووسیندا نییە و وەک دەرکەوتەیەکی فانتازی و یوتۆپی نووسین لەژێردەوەی هەموو گوتراودکانەودیە کە پێش وەختە لە بنیاتی ڕووکەشدا دەربڕینیان لێکراود، بەم مانایەش شێودی چۆنێتی نووسین، شێودی چۆنێتیشی دارشتن و پاشان بنیاتنانی مانا دەبێتە تاقە پەیوەستێکی گرنگ لە نووسینی دەقی ئەدەبیدا، هەروەها دەبێتە ئەو ڕێگەیەی کە بەهۆیەوە ئێمە بتوانین پەیوەستی نێوان گوتراوە ئاشکراکراودکان و نەگوتراود ئاشکرا نەکراوەکان بدۆزینەوە، کە گرنگترین ڕەگەزی بەرجەستە بووش لەم خوێندنەوەیەدا بیرکردنەوە و چوونە سەری هۆکارەکانی نووسین و ئاشکراکردنی هۆکارەکانی دارشتن و بە بنیاتکردنە بە جۆرێک لە جۆردکانی، بنیاتە ڕووکەشەکانی دەق لە پەیوەستێکی گەوهەریدان، لەگەڵ بنیاتە شاراوەکانی دەق پەیوەستێک کە چەندین ئاماژە و

دەلالەتی جیاوازمان دەدەنە دەستەوە بۆ دەرککردن بە گەوهەری نووسین، بەوەش هیچ نووسینێک، هیچ بوونێکی بەرجەستە بوو، دیمەنی هیچ شتێکی بەرجەستە بوو، بێ بنیات نییە، گەردوون و بوون لە سەرتاپایاندا لە چوارچێوەی یەک بنیاتی شاراوە و نهێنیدان و هەموو ئەو بوونەی دەرکی پێ دەکەین و مانای لێوە دروست دەکەین بوونە رووکەشەکانن، کە هەر لەو بوونانەوە رۆژێک لە رۆژان دەگەینە تێگەیشتن لە بنیاتی شاراوەی بوونێکی رەهاو نهێنی و ئاڵۆز. بەم مانایەش بەبنیاتکردن هەموو کاتێک زمانێکی هەڵخەڵەتێنەر و بەلاڕێ بەرە.

کاتێک لە خوێندنەوەدا ئەو بنیاتانەی مانا لە بنیاتە شاراوەکەی جودا دەکرێتەوە و خوێندنەوە ناتوانێ بگاتە سنوورەکانی بنیاتی نەزانراو، هەر بۆیە لە ئەدەبی کوردیدا دەقی داهێنەر و سەرکێشی زۆرینەی جارەکان دەرک بە ئاستی داهێنانی نەکراوە، دەرک بە هۆکار لە نووسینەوەی نەکراوە و لە بێ دەنگییەکی بکوژدا بوونەتە دەقێکی مێژوویی، نەک دەقێکی زیندوو، لەم جۆرە تێک هەڵکێشیەی زمان، نووسەر بە شێوەیەکی سەیر لەدەربڕین لێکردندا دوو سەرە دەبێ، ئەو لە لایەوە لە دوو توێی بنیاتە رووکەشەکاندا وامان نیشان دەدات کە هەموو کێشەکان لەدەقدا لەو زمانەدایە کە بەردەستی کردووە، لەلایەکی دیکەشەوە زۆر وردەکارە لەوەی مانا شاراوە و خودییە گەورەکانی لە زمانێکی دەربڕین لێ نەکراوی دەقدا بشارێتەوە، وەک ئەوەی بیەوێ ئەو مانایانە هەمیشە بەشاراوەیی و نەزانراوی بمێننەوە، هۆکاری ئەم بزرکردن و شاردنەوەیەی مانا لە چەندین روویەکی جیاوازەوەیە لەلایەکەوە نووسەری داهێنەر خاوەنی زمانێکی تێر و پڕی بارگاوی دەبێ لەماناداو، کەوای لێ دەکەن دەسەڵاتێکی گەورەی بەسەر بەکارهێنانی زماندا هەبێ، ئەو دەسەڵاتەی هەناسەیەکی درێژی دەربڕین لێکردن بە نووسەر دەبەخشێ لەلایەکی دیشەوە، نووسەر دەیەوێ هەر خۆی چێژ لەم هونەری بیناکارییەی زمان وەرگرێ و دەسەڵاتی خۆی بەسەر زمان و مانادا بخاتە روو، لەلایەکی دیکەشەوە نووسەر هەمیشە و لە هەموو دەقێکدا چەندین مانای تایبەت و قەدەغە کراو و کەسایەتی لەلادا هەیە و نایەوێ لە بنیاتە رووکەشەکانی دەقدا دەربڕینیان لێ بکات، بەڵکو ئەو دەیەوێ تەنیا ئەوانە بەم مانایانە بگەن کە خاوەنی هاوسۆزی و هاوڕازین لەگەڵ نووسەردا.

نووسەر مرۆڤێکی بیرکەرەوەی هەستیارە، مامەڵەیەکی ئەوپەڕی وردەکاری و گرنگی پێدان لەگەڵ مانادا دەکات، ئەو نایەوێ لە درکاندنە زمانەوانیەکانیدا ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆیی لاواز و والاکراو بخاتە بەردەم خوێنەر، هەر خوێنەرێک و لە هەر ئاستێکدا بێت، ئەو نایەوێ بۆ هەموو خوێنەرێک، هەموو ڕاز و خەون و هیوا و چێژە تاوانبار و خۆشەویستییە گوماناوی و چەندین بابەتی دی بە والاکراوی بخاتە ڕوو لە شاردنەوەی ماناکان لە زمانی دووەمی دەقدا هەرگیز کردارێک نییە، بە کەرەستە زمانەوانییە حازر بەدەست و ساکارەکان بەم کارە هەڵسێ، هەروەک هێما و مەجاز و مانای شوێندراو و ڕستەی ئاڵۆز، بەڵکو ئەمە کردارێکی زمانەوانیی زۆر دوورە لە هەر کەرستەیەکی زانینی پێش وەختە، ئەمە پێوەندی بەزمانێکی خەفەکراو و قووڵەوە هەیە کە ڕاستەوخۆ وابەستەی هۆکارەکانی نووسینە، هیچ دەقێک بەبێ هۆکار لە نووسین بە دەر نییە و ئەو هۆکارانەش نە لە زمانی سەرەوەی دەق و نە لە کەرەستە زمانەوانییەکاندا بوونی نییە! بەڵکو دەرەنجامگیرییەکی پتەو و والا نەکراوە، کە لەنێوانی بنیاتە ڕووکەشەکانی زماندا، ئێمە تەنیا دەگەینە سەر ئەو ڕێچکەیەی کە بیر لەو زمانە نەنووسراوە بکەینەوە و زمان چەندێک بەرەو گۆڕانکاری و کورت بوونەوە و چڕبوونەوە بچێ، زمان چەندێک لە کەرەستەکانی نووسیندا دەوڵەمەند و فرە مانابێ، ناتوانێ بەسەر ئەم بارەی نووسینی ناڕاستەوخۆدا زاڵ بێ و ناتوانێ بچێتەوە سەر نهێنیە قووڵەکانی بیرکردنەوەی نووسەر، چونکە مانا خۆی لەخۆیدا وەکو مرۆڤ دوو سەرەو هەڵخەڵەتێنەرە، لەلایەکەوە کۆمەڵێک مانای جیاواز و لێکچوو دەخاتە دەقێکەوە لەلایەکی دیکەشەوە هەر ئەو مانایانە فرە مانایی دەخەنە بنیاتی خۆیانەوە کە ئەمەش یەکێک بوو لەو گیروگرفتە ڕەخنەییانەی کە لەگەڵ داهاتنی بنیاتگەری و کێشەی لەگەڵ ڕەخنەی ئایدیۆلۆژی گەیشتە سنوورێکی پێشکەوتوو لە چۆنێتی تێگەیشتنمان لە دەقێک.

مردنی زمان و ماناکانی لە بنیاتی ڕووکەشی دەقدا ئەو ڕاستییە ڕەت نەکراوەیە کە پەیوەستە بە سروشتی بیرکردنەوەی مرۆڤ و سروشتی ماناکانی بوون، پەیوەستە بەوەی هەموو ئەو شتانەی یا وردتر، هەموو ئەو مانایانەی دەربڕینیان لێ دەکات لە گەوهەری خۆیاندا لەژێر کۆمەڵێک پاساو و ڕاستیی دیاریکراودا دەبن وەک بنیاتی ڕووکەش، بەڵام هەمان ئەم ڕاستی و پاساوانە لەپێناوی مەبەست و هۆکاری دیکەدا نووسراون کە نووسەر تەنیا نووسەر ئەم مانایانە لەنێو دەقدا و هەروەها لە بوونی بیرکردنەوەکانی خۆیدا دەپارێزێ، ئەمەش پەیوەستە بە هەڵسوکەوت و هەڵوێست و بوونی مرۆڤ لەم گەردوونەدا کە هەرگیز ڕاستیی ڕەها و یەک تێڕوانینی مرۆڤ بۆ دەرەوەی خۆی ناچێتەوە سەر ئەو دیوی ڕاستی و هەڵوێستەکانەوە، هۆکاری پێشینەکانی

نووسین، سەرجەمی ئەو پاساوانەی نێو دەقن کەوا لە نووسەر دەکەن بە وریایی و هەندێک جار لە ناهوشیاری و نا ئاگاییەکی مەبەستدارەوە، ئەو ڕاستی و ئەو تێڕوانینانە سەد لەسەد خودیانەمان لێ بشارێتەوە کە وەک زمانێکی زیندووی هەڵوێستی ڕاستەقینەی نووسەر دەیخاتە پشتەوەی سەرجەمی گوتراوەکانی دەقەوە، بەمەش ئەو بەکارێکی نووسینی دووسەرە، هەڵدەستێ، ماناکان شێوەی نووسین و بابەتەکان ناکاتە سنووری کۆتایی دەق، بەڵکو شتێک، مانایەک، لە شێوەی بنیاتێکی نەگوتراودا دەهێڵێتەوە، کە ئامادە نییە لە زمانە ڕاگەیەندراو و مانا ئاشکراکراوەکانی دەقدا دەربڕینیان لێ بکات، بەڵکو ئەو دەیەوێ تەنیا ئەوانە لەو هۆکارانە بگەن و لە دەقدا پێی بگەن، کە هەندێک جار نووسەری داهێنەر هەر خۆی ئاماژە بەم حاڵەتە دەدات لە کاردانەوەی لەسەر ئەو نووسینە ڕەخنەییانەی کە لەسەر دەقەکانی دەنووسرێن، بەوەی ئەو نووسینانە نەیان توانیوە لەماناکانی دەقەکەی بگەن، با ئەو نووسینانە بەسەدان لاپەڕەی گۆڤار و کتێبەکانیشان گرتبێتەوە.

لێرەدا دێینە سەر مەسەلەی بەدەقبوون، پاش ئەوەی ئاڵۆزییەکانی نووسین و زمان و مانامان لە ئاراستەیەکی دیاریکراودا خستەڕوو؛ بەدەقبوون مەسەلەیەکی ئاڵۆز و نەویستراو و کەم پاساوە مەسەلەیەکە کە بە جارێک زۆرینەی دەقەکان ڕەت دەکاتەوە و تەنیا ئەو دەقانە سیفەتی بە دەق بوونیان پێ دەبەخشێ کە لە بنیاتی خۆیانەوە، واتە لە بنیاتە ڕووکەشەکانەوە، بنیاتی گەوهەریی دەقیان هەڵنابێ، کە بوونی نییە نە لە زمان و نە لەمانا ڕاستەوخۆکاندا، تەنیا ئەو دەقانە ئەم سیفەتەی بەدەقبوون هەڵدەگرن کە لە پشتەوەی زمانی نووسین و ڕاگەیاندراوەوە، زمانێکی دیکەی شاراوەیان بنیات نابێ، ئیدی لە دەرەوەی ئەم دووسەرەبوونەی زمانەوە، هیچ مانا و هیچ نووسینێک و هیچ دەقێکی نەشێوەیی و نەخوێندراوە و نەبینراوە و نە هەست پێکراو سیفەت و مۆرکی بە دەقبوون هەڵناگرێ.

ئەو دەقانەی لەمانا ڕووکەشەکانیدا هەموو ڕاستییەکان و هەموو بیروجیهانبینییەکانی بە ڕاستەوخۆیی و بێ قووڵ بوونەوە خراونەتە ڕوو، ئەوا دەبنە جۆرێکی دی لە نووسین و نابن بە دەق، چونکە بەدەقبوون مانای دۆزینەوەی دەسەڵاتێکی ناکۆنترۆڵ کراو و بێ سنوور و کراوەی زمان و مانایە پەیوەست بە بیرکردنەوە و مۆرکی ئازادییەکی ڕەهای نووسەر و بوونی ئەو دەنوێنێ و قەتاو قەت ئەو دەقانەی ناگەنە ئاستی دوو سەردیی بوون پەیوەست بەم بارەی نووسەر و نووسینەوە، نابنە دەق، بەدەقبوون بڕیار و حوکمدان و داسەپاندن و تێڕوانینی دکتاتۆریی خوێندنەوە قەبووڵ ناکات، بەدەقبوون ژیانێکی بەردەوامە لەنێو ئەو مانایانەی ڕوونکردنەوەیەک، ئاماژەیەک، پاساوێکی گەورە و ترسناک و وردمان، بۆ دەخەنە زمانی دەقێکەوە کە والا و ئاشکرا نییە و ئەو نووسەرە وردەکاردش لە هەموو مانا و وشە و بیرەکانیدا کار بۆ زمانێکی دیکە دەکات کار بۆ زمانی دووەمی دەق دەکات کە خاوەنی مانا و بنیات و کامڵبوونی خۆیەتی. لە ئەدەبی کوردیدا بە تێڕوانینی ڕووکەش و مامەڵەکردن لەگەڵ مانا و وشەکان و زمانی یەکەمی دەقەوە، زۆر لە دەقی ئەدەبی ئەو ڕێکەوتەیان لەبەردەم لابرا کە ئاماژە و پاساوە گەوهەرییەکانی زمانی دووەمیان بوونیان هەبێ، زۆر لە دەقی ساکار و بەیەک بنیات خوێندنەوە شێوێندران و شوێنی داهێنانی خۆیان نەدۆزرایەوە، لێرەشدا مەبەست لەم ئاراستەیە لەشیکردنەوەی دەق سەپاندنی تێڕوانین و داسەپاندنی یەک لایەنەی تیۆری نییە، بەڵکو ئەم مەسەلەیە ڕوویەکی دیکەشی تیادایە کە ئەویش ئەوەیە هیچ دەقێک لە دنیادا بێ دوو سەرەبوونی بنیات نابێ و هیچ دەقێک لەم ئاراستەیەی بەدەقبوون بێ بەش نییە، بەڵکو ئەوە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنەوەیەکی فرەلایەنی دەقەکانە کە پێمانی نیشان دەدات.

ئەو دووسەرەبوونە چ جیهانبینیی و چ جیهانێکی قووڵ یاخود ساکار لە پشتەوەی ئەم ئاراستەیەی زمانەوەیە و هەر لەویتوەش بەبێ هەڵوێست وەرگرتن، بەبێ بڕیاردان و حوکمدان و داسەپاندن، تەنیا خوێندنەوەیەکی بێ لایەن و زانستی، خوێندنەوەیەکی بنیاتنەر، ئەوەمان بەگوێدا دەچرپێنێ کە ئەو دەقەی خوێندنەوەمان بۆ کرد چەندێک سەرکەوتووە چەندێک ماناکان و ئاماژەکانی ئەو بنیاتانەی دروستیانی کردووە، ئاماژەیەکن بۆ ئەو سیفەتەی کە دەق هەڵی دەگرێ لە مەسەلەی بەدەقبووندا.

بەدەقنەبوون وەک حوکمێک لەسەر هەردەقێک فانتازیایەکی دکتاتۆرییە لە نووسیندا، چونکە لە گەوهەردا ساکارترین دەق کە بۆ خوێندنەوە دەخرێتە ڕوو بریتییە لە هەست و بیرکردنەوەی مرۆڤێک کە ئەویش شایەنی ئەوەیە بخوێندرێتەوە، بەڵام ئەم تێڕوانینە لەکۆتایی خوێندنەوەکانا، کە بەهایەکی مرۆیی و ڕەوشتی هەڵدەگرێ، نابێتە پێوەر بۆ بەدەقبوونی هەر دەقێک بەڵکو دەبێتە ئەو ئازادییە گەورەیەی نووسین کە مرۆڤ جورئەتی حوکم لەسەرخۆدانی هەبێ بەبێ ئەوەی حوکمی لەسەر بدرێ، ڕەخنە حوکمدان نییە، بەڵکو گەیشتنە بەو نهێنییانەی کە ئێمەی مرۆڤ بەیەکەوە دەبەستێتەوە گەیشتنە بەو نهێنییانەی کە ئێمەی بە بوون و شتەکانەوە دەبەستێتەوە و ئێمەش بە هەموو بوونمانەوە شوێنی بەزەیی و دڵدانەوەین.

# چەمکی خۆشەویستی لە شیعرەکانی عەبدوڵڵا پەشێو-دا

نوسامە حوسێن ڕەسووڵ



### پێشەکی

شیکردنەوە و باس لێوەکردنی لایەنی خۆشەویستی و چەمک و تێکەیشتنی لای (عەبدوڵڵا پەشێو)، ئەوەندە کارێکی ساکار نییە کە بۆ یەکێکی وەکو ئێمەمانان بتوانین بەو مەبەستە بچینە ناو ناخی شاعیر و هەوڵ بدەین سەرەتایەک بۆ دروستبوونی دەلالەتی خۆشەویستی و عیشق لەلای دەستنیشان بکەین و لەسەری بدوێین، چونکە ئەگەر بتوانین هەندێ لە واقیعی شیعرەکانی نزیک ببینەوە، ئەوا لە زۆر واقیعی تر دەستەوەستان دەوەستین و لەمەملەکەتی عیشقی ئەودا پێویستیمان بە هەمان هەستکردن بە موعانات و ئەندێشەکانی هەیە وەنەبێ هەر کەسێکیش کە بیەوێ باسی عیشق و سووتان بکا لای هەر شاعیرێ دیاردەی سەرکەوتوویی پێوە دیارنەبێ و نەتوانێ نموونە شیعرییەکانی ئەو شاعیرە شی بکاتەوە و مانا و چەمکی عیشق لای شاعیرەکە تێنەگا وەک تەلیسم لەناو مێشکی بمێنێتەوە.

### چەمکی خۆشەویستی لە شیعری نوێی کوردیدا

بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر چەمک و تێگەیشتنی خۆشەویستی و تێڕوانینی شاعیر، ڕوو لە شیعرەکانی دەکەین و نموونەکانی لێوەردەگرین، تا پێناسەی خۆشەویستی لای شاعیر دەستنیشان بکەین و پێش چاوی بخەین.

لە شیعری (تابلۆی ژیانم)دا دەیەوێ کەڤاڵێکی ژیانی خۆی بکێشێ و گوزارشت لەخۆی بکا، لە پاڵ ئەمەشدا دیەوێ باسی کاریگەری خۆشەویستی بکا لە ژیانی خۆیدا، کە لەم چوارینەدا دەردەکەوێ:

**منم گەردانەی گەردەنی خەیاڵ**
**ساتێ فریشتەی جوانیم دێتە پاڵ**
**تابلۆی هونەرم بۆ ساز دەکاتن**
**بۆی دێمە بزە خریە گڕ و گاڵ**

ئەوکاتە باس دەکاو وەسفی ئەوە دەکا کە فریشتەی جوانی دێتە پاڵ، بێگومان ئەو فریشتەیەش چەند سیفاتی تێدایە و شاعیر دەیەوێ ئەوەش ڕوون بکاتەوە کە ئەم سیفەتانەی فریشتە جوانەکە وا لە شاعیر دەکا کە بێتە بزە، خرپە، گڕوگاڵ. ئەو هەستەی وا دەکا کە ئەو هەموو کاردانەوەی هەبێ بەهۆی ئەوەیەوە کە تابلۆی هونەری بۆی ساز و ئامادە دەکا. لەسەرتاپای ئەم وێنە جوانەی کە شاعیر نەخشاندوویەتی، دەتوانین بڵێین پێشوازیکردنی لە خۆشەویستی پێشوازیکردنێکی سەرەتاییە، لە شیعرەکانی دواییدا وێنە شیعرییەکانی بەرەو بەهێزبوون دەڕوا. هەروەها ئەگەر باس لە زمانی شیعرەکەش بکرێ، ئەوە دەتوانین بڵێین کە زمانێکی سادە و ساکارە و لە ئاستی شیعرەکەدایە، ئەگەر بزانین گوتاری شیعری ئەو سەردەمە بەو شێوەیە بوو، وەک سەردەمی هاوچەرخایەتی ئێستا نییە، کە زمانێکی قووڵ و گران بێ و پێویستی بە وردبوونەوە هەبێ لەپاڵ ڕۆشنبیرییەکی هەمەلایەنە.

ئەوەی جێگای سەرنجە کە شیعرەکانی دیوانی (فرمێسک و زام) جیاوازییان لەگەڵ شیعرەکانی تری کە لە دیوانەکانی دیکە بڵاوی کردۆتەوە گەلێ زۆرە، چ لە بارەی بەکارهێنانی زیاتری کەرەستەی هونەری و شێواز و فەلسەفەدا، چ لە بارەی لێکگرێدانی مەسەلە خۆشەویستییەکان و کوردایەتییەوە، بۆیە دەبینین ئافرەت و کوردایەتی و جیاوازی چینایەتی، هەموو کەرەستەی نووسینی بوونە، هەروەک خۆی بە ئاماژەیەکی کورت لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی هاوکاری دەڵێ: «جاران بێدەنگ دەگریام، ئێستا دەنگم دەردەچێ».
ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنیشە ئەوەیە کە شاعیر زۆر بە سانایی و لەبەرائەتی یەکەم جاری ڕۆچوونە ناو دنیای عیشقەوە دەستی پێکردووە، کە بەرائەتی عاشقێکی پاک و دڵ سافی لێ دەڕژێ، ئەو بەرائەت ڕژانەش زۆر توندتر و خێراتر دەبێ، هەروەک لە شیعری (خۆفرۆش)دا ڕەنگدەداتەوە، کە ڕوودەکاتە ئەو کچەی خۆشیدەویست، ئەویش هەموو سامانی خۆشەویستی خۆی لەخۆ فرۆشتن بە برێ پارە دەبینێتەوە، ئەوەتا شاعیر لەفەزایەکی پڕ دەنگ بەرزکردنەوەیەکی شاعیرانە کە هەموو مانایەکی ئەدەب و شکۆدارانەی شاعیرانەی تێدا ڕەنگ دەداتەوە:

**کیژۆڵەی دڵگیر ئەی لەخۆبایی**
**بۆچی دەمکوژیت، بەناڕەوایی**
**بۆچی دڵ ڕەقی بەرامبەر بەمن**
**کە بت پەرستم، هەتاکو مردن**

عاشقی دڵ سووتاوی پڕ سۆ بە کۆمەڵە پرسیارێکی عاشقانە هێرش دەکاتە سەر کچە خۆشەویستە بێوەفاییەکەی کە لەخۆبایی بووە پاش خۆ فرۆشتن بە برێ پارە و هەموو مانایەکی خۆشەویستی و وەفاداری خستۆتە ژێرپێی و بە دیواری زەمەنێکی دڵرەقی داداوە. ئەو پرسیارانەش بۆنی سووتان و دڵ کرووزانی لێ دێ لەکاتێکدا شاعیر زۆر بوێر و ئازایانە پرسیارەکان دەکات و چاوەڕوانی وەڵامدانەوەش ناکا، چونکە لە هۆیەکەی گەیشتووە:

**دەزانم بۆچی دڵ پڕ لە قینی**
**لە چەقی ڕێگا چاوت نامبینی**
**چونکە لاوێکم دڵپاک و وەفادارم بۆت**
**شەوانی تاریک لە ئازارم بۆت**
**چونکە لاوێکم ڕاستم فێڵبازنیم**
**چونکە چاوبازنیم بەفیز و نازنیم**
**چونکە جل ڕەنگاوڕەنگی جادەنیم**
**چونکە قومارچی و فێرە بادە نیم**
**چونکە نازانم نە کەم و نە زۆر**
**ڕووی ماکیاج بکەم هەر ڕۆژ بە سەد جۆر**

هەموو ئەو سیفەتانە دەژمێرێ کە کچێکی هەڵخەڵەتاو بە سامان و جوانی دنیا پێی هەڵدەخەڵەتێ و خۆشی و شادی پێوەندی نێوان کچ و کوڕی تێدا دەبینێتەوە. لە سەرەتاشدا کچەکە ئەو ڕێسایەش نازانێ و لێی غافلە کە هەموو سامان و سەروەتی جیهان ناتوانن بزەیەک، شادییەک، خورپە و خۆشییەک، بۆ دڵە مردووەکان و چاو بە فرمێسک و دڵ شکاوەکان بکڕێ، یان هیچ نەبێ بتوانن جاربەجاریش بێ، بەشدارییان پێ بکەن لەگەڵ ئاهەنگێڕە درۆزنەکانی عیشق. جا لەبەر ئەوەی شاعیر ناتوانێ وەک ئەو درۆزن و هەڵخەڵەتێنەر و فێڵبازانە بێ و هەر ساتێکی بە جۆرە جلێکی ڕەنگاو ڕەنگ لەسەرجادەکان چاوەڕوانی بکاو ڕاوی دڵەتێنووەکان بکات و کار و پیشەی قومارچی بێ بەهەموو شتێ لە دڵپاکی و وەفاداری هی ئەو کەسەی خۆشی دەوێ و لە پێناویدا لە شەوانی تاریک لە ئازار دەبێ بۆی. شاعیر لەبەر ئەوەی ناتوانێ هەموو ڕۆژێ ڕوو و دەم و چاوی بە سەدجۆرە ماکیاج و دەمامک داپۆشێ و هەر ڕۆژ بە چەنددها جۆرێ، بۆیە ئەو کچە شاعیری ناوێ، بەڵکو (دون جوان)ێکی دەوێ کە ئەم سیفەتانەی تێدا بێ:

**دون جوانێک نیم سینگ دەربەڕێنم**
**لە سینەماکان تێر بتگەڕێنم**

ئاشكرایە كە یەكێ لەو دەردەكوشندانەی كە تووشی كۆمەڵگای ئێمە بۆتەوە و لەسەر هەموو ژیانی رۆژانەماندا رەنگی داوەتەوە ئەوەیە، كاتێ كوڕێكی هەژار دەیەوێ كچێك بكا بە هاوسەری ژیانی دوا رۆژی، دەبینین، چونكە هەژارە و خاوەن تەلار و كۆشك نییە و بەندەی سەربەرزییە و بەندەی دۆلار و دینار نییە و لەجیاتی سامان و پارە دڵێكی تانەمانی پێشكێش كردووە كە پڕیەتی لە وەفاداری و خۆشەویستی، ئەمەش لەلای شاعیر لە هەموو سامانی جیهان بە نرخترە، چونكە نافەوتێ و كۆتایی نایێ و هەردەم گەنجینەیەكی نەمر و لەبەرچاوە. مرۆڤ چی لە پارە و سامان بكا لەكاتێكدا دڵ و دەروونی ئاسوودە و گوشاد نەبێ. مرۆڤ چی لە پارە و سامان بكا كە خۆی دۆڕاند. بۆیە كچە لەخۆباییەكە شوو بە كوڕەكە ناكاو دڵەی پڕ زامداری پڕ سۆتر دەكات. ئەوەتە شاعیر ئەو هۆیەی بە شیعر روون كردۆتەوە:

**چونكە هەژارم خاوەن تەلارنیم**
**بەندەی سەربەرزیم بەندەی دینارنیم**
**چونكە لەجیاتی دیاری یا سامان**
**پێشكەشم كردی دڵێك تا نەمان**

لەكۆتایی شیعرەكەی هەمان مەبەستی پێشوو دووبارە دەكاتەوە كە پوختەی مەبەستی شیعرەكە دەستنیشان دەكا:

**«بەڵێ بۆیە تۆ دڵ پڕ لە قینی**
**لە چەقی رێگا چاوت نامبینی**

وەنەبێ ئەو دەردە كوشندەیە هەر لە سەردەمی شاعیردا هەبووبێ، بەڵكو لە سەردەمی ئێستاشدا هەیە و بەردەوامە و سەردەم بەسەردەم رۆیشتووە، چونكە ئەوەی تێبینی كراوە لەم كۆمەڵگایەدا تەپیو و دواكەوتووەی ئێمەدا ئەوەیە، كە شتە سلبیەكان رۆژ بەرۆژ لە زیادبوون و تەشەنەكردنن و بردو و بازاڕی هەردەم گەرمە و لایەنە ئیجابیەكانیشی وەك وەفاداری بۆ نموونە هەموو كات دەرگاكانی ژیانی بەسەرداخراوە، بۆیە پاشكەوتن و پێشكەوتنی میللەت بەو پرانسیپانە بەستراوەتەوە، جا ئەو لایەنە ئیجابیانەی كە لە كۆمەڵدا هەنە لەكاتێكدا برەویان نەما كۆمەڵگا بەرەو نەمان و فەوتان و شڵەژان دەبەن و ئافرەت وا لێ دەكەن چاوی لەبەرامبەر هەموو داخوازییەكانی دڵ بنووقێنێ و رووبكاتە پارە و سامان و ماناكانی خۆشەویستی بشوێنێ. لێرەدا پرسیارێكی گرنگ سەری خۆی هەڵدەدا.

ئایا شاعیر هەر بەم شێوەیە رەشبین بووە بەرامبەر بە مەسەلەی خۆشەویستی، دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە بەوەی بڵێین: رەشبینی شاعیر بەرامبەر خۆشەویستی وەك لە شیعری (خۆفرۆش) دیارە، مانای ئەوە ناگەیەنێ كە شاعیر لە سەرجەم شیعرەكانی رەشبین بووە، بەڵكو زۆر شیعری هەیە كە دەربڕین لەخۆشویستنی ژیانی خۆشەویستی دەكا و دەیەوێ بیسەلمێنێ كە دەتوانێ بەهۆی خۆشەویستی راستەقینەوە جیهان و ژینگەیەكی خۆش دابمەزرێنێ كە هەموو دڵەكان تێیدا ئاسوودە بن و خەون و ئاواتەكانیان بهێننە دی:

**توخوا گیانەكەم لەگەڵ بەیان زوو**
**بمگەینە كۆشكی بەرزی ئارەزوو**
**وەك پەیكەرێكی دەسكردی خوایی**
**بمخەرە ژینی پڕ دڵنیایی**

لێرەدا بانگەوازی یارەكەی دەكا كە بەیانی زوو بێتە لای و بیگەیەنێتە كۆشكی بەرزی ئارەزووەكان، ئەو ئارەزووانەی كە بەبێ بوونی ئەو ناتوانێ بیگاتێ و بەدەستی بهێنێ، بۆ ئەوەی بیخاتە ناو ژیانێكی پڕ دڵنیایی و خەون بینین بۆ داهاتووی گەش، كەواتە كاتێ ژیانێكی پڕ خۆشی و گوشاد بۆ شاعیر دروست دەبێ كە خۆشەویستەكەی لەگەڵ بۆلیلی بەیانی بێ و دەستی بگرێ و بیباتە كۆشكی بەرزی ئارەزوو، ئەگەر ئەمە شتێ بگەینێ، ئەوە دەگەیەنێ كە هەر بەدیتنی دڵخواز شاعیر هەموو ئارەزووەكانی دێتە دی و دەكەوێتە ناو ژیانێكی پڕ ئاسوودەیی، كەواتە مرۆڤ لەژێر سێبەری خۆشەویستی راستەقینە دەحەسێتەوە و تێرایی دێتەوە و ئارەزووەكانی تێر دەبێ.

شاعیر هەر بەوەندەش ناوەستێ بەڵكو داوا لە خۆشەویستەكەی دەكا هەر بە چاوی پڕ خەو و بە پۆشاكی فریشتەی خەو، هەناسەیەكی تر ببەخشێتە سەر پەڕەی گوڵی ژیان، كە دیارە هەناسە بەخشینەوەش بە هێمای دووبارە ژیانەوە دێتەوە.

ئەو ژیانەوەش لەگەڵ خەندەیەكی پاكی بێگرێ، موچركێك دەخاتە سەر دڵی شاعیر و دیل ئاسا دەیگرێ، لەپاڵ ئەمانەشدا داخی شەوی درێژ كپ دەكاو خرپەی دڵی خۆی بۆ هەڵدەرێژێ:

**وەرە بەردەرگا بەچاوی پڕ خەو**
**هەر بە پۆشاكی، فریشتەی شەو**
**هەناسەیەكی بۆن خۆشی لێوان**

**بخشێنە بەسەر پەڕەی گوڵی ژیان**
**بە خەندەیەکی پاکی بێگرێ**
**موچرک دڵم وەک دیل بگرێ**
**تا کپ کا داخی شەوی درێژم**
**کە خرپەی دڵم بۆت هەڵدەڕێژم**

ئەگەر تەماشای شیعرەکە بکەینەوە، ددبینین ئەو حاڵەتە دەروونییەی کە شاعیر تێیدا داوای لە خۆشەویستەکەی دەکا کە تۆزێ ببێتە هاوڕێی شەوانی ناخۆشی و نارەحەتی ژیانی لەبیربباتەوە و هەوڵ بدا گوێی لێبگرێ تا چی لەناو دڵی دایە بە پەنهانی و کپی کردووە و دەیەوێ هەڵیبڕێژێ، بە هەمان مەبەست لە شیعری (لەبەردەرگە) ڕەنگیداوەتەوە کە شاعیر لە شەوێکی ڕاشکاودا دەچێتە پێش دەرگەی دڵی خۆشەویستەکەی تا بۆ تاقە شەوێکیش بێ ببێ بەهاوڕێی:

**شەو ڕاشکا**
**ئەژنۆم شل بوو**
**مانگ بەتاقی ئاسمانەوە هەڵپڕووکا**
**دەرگەکەتم لێ بکەوە**
**بۆ چنینی چەپکە نێرگزێکی چاوت**
**بۆ نووچ دانێ**
**بۆ خەونێ تۆزێ گریانێ**
**لەسەر هەوری قژی خاوت**

لە هێمنی شەو کە ڕادەکشێ و و مانگ هەڵدەپڕووکێ، شاعیر دەبینین لە پێش دەرگای خۆشەویستەکەی ڕاوەستاوە و ئەژنۆی شل بووە، کەچی ئەو دەرگاکەی لێ ناکاتەوە، وەک ئەوەی گوێی لێ نەبووە و بە خەیاڵی دانایێ و دڵە ڕەقەکەی تۆزێ نەرم بکاو سۆزی لێ بڕژێ و دەرگای دڵی بۆ بکاتەوە، لەکاتێکدا باش دەزانێ مرۆڤ لەکاتی تەنگانەدا پەنا بۆ خۆشەویستترین کەس دەبا کە تێیدەگا و ئەمیش لەو دەگا و زەمینەی تێگەیشتن و ئاوێزانبوونی دڵەکانیش لەبارە و دەتوانن شفرەی گفتوگۆی یەکتر بخوێننەوە. ئەوەتا شاعیری عاشق بۆ چنینی چەپکە نێرگزێکی چاوی یارەکەی هاتووە، لەگەڵ نووچدانێ، خەونێ، تۆزێ گریانێ لەسەر هەوری قژی خاوی یارەکەی کە بۆ ئەوەی دڵی پڕ ئێش و زامداری ئۆقرە بگرێ و دابمرکێ و ئەندێشەی چەند ساڵانی دابمرکێ و برینەکانی سارێژ ببێ، لەپاشان بە دەنگێکی بەسۆزەوە هۆی هاتنەکەی لەم شەوە تاریکەدا ڕوون دەکاتەوە:

**لەگەڵ سیمای منداڵیما**
**لەگەڵ خەمی شۆڕەبیما**
**هاتووم و ناگەڕێمەوە**
**یا پێت دەگەم**
**یا وەک مۆمێک دەسووتێم و دەتوێمەوە**

ترووسکەی شاری یادگارییەکانی ڕابردووی خۆشەویستی بانگی کردووە لەگەڵ سیمای منداڵی و خەمە شۆڕەبییەکان کە دارێکە و لکەکانی شۆڕدەبێتەوە، کە دەیەوێ غەمی خۆی وەک شۆڕەبی لێبکا لە درێژبوونەوە و شۆڕبوونەوە بەناو ئازار و ناخۆشییەکانی لێکدابڕانی لە یارەکەی، ئەمانە تێکڕا وای لێکردووە بڕیارێک بدا کە یا بەدیداری دڵی شاد دەبێ و چەپکەنێرگزی چاوەکان و نووچدان و خەون و تۆزێ گریانێ بەدەست دەهێنێ، یان وەک مۆمێک دەسووتێ و دەتوێتەوە.

**گەیشتن بە یار= چەپکە نێرگزی چاو + نووچدان+ خەون + تۆزێ گریان**
**نەگەیشتن= توانەوە ئاسا تا نەمان و مردنی**

کە لەم دێڕەی دواییدا شاعیریەتی بەرجەستە دەبێ کە خۆی دەکاتە مۆم و ئەو شەوە تاریکە ڕووناک دەکاتەوە تا دادەمرکێتەوە لەپێناوی گەیشتن بە دیدار، هەربەمەندەش ڕاناوەستێ، بەڵکو دووپاتی دەکاتەوە:

**دەرگەکەتم لێ بکەوە**
**هەر دڵدارەکەی جارانم**
**هەر کێڵگەکەی بەر دەرگەکەتم**
**هەر تێنووەکەی کرێوە و لێزمەی بارانم**

ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە شاعیر نەگۆڕاوە و ئەم خۆشەویستی ناکا لەپێناوی چەند ساتێکی کورت بۆ گەیشتن بە مەرامێکی تایبەتی خۆی، کە مەرام و نیازەکەی بۆ جێبەجێ بوو لە ناوەڕاستی ڕێگای ژیان دڵدارەکەی بەجێ بهێڵێ و ژیانی بکاتە دۆزەخ و ژیان و ژینگەی لێ تار و بێزار بکا تا لە خۆشی بێزار ببێ، بەڵکو هەر دڵدارەکە و کێڵگەکە و تێنووەکەی کرێوە و لێزمەی بارانەکەی جارانە و نەگۆڕاوە لەمەشدا چەقی جەمسەری وەفاداری پیشان دەدات کە لەناو لاوەکانی ئەو سەردەمەی ئێمەدا دەگمەنە و خۆشەویستی زۆربەیان تەنیا بۆ گەیشتن بە مەرام و مەبەستی دیاریکراو و ئارەزووی منداڵانە و هەرزەکارانە دەڕواننە ئەو مەسەلە

گرنگ و چارەنووسییە لێکدانەوەکانیان وەکو هەتاوی زستان زوو دەڕەوێتەوە، بۆیە لەلای شاعیردا باشترە کچێک بکوژی لەوەی گاڵتە بە هەست و سۆزی بکەی، چونکە بەو مانایە دێ کە ژیانی تێک بدەی و نەوەیەکی داهاتووش بشێوێنی و داهاتوویان ڕەش بکەی، بەڵام ئەوە ئادگاری شاعیر نەبووە و نییە، بەڵکو ئەم بۆ شتی لەمانە پیرۆزتر هاتووە:

**شەو ڕاشکا**
**ئەژنۆم شل بوو**
**مانگ بەتاقی ئاسمانەوە هەڵپڕووکا**
**دەرگەکەتم لێ بکەوە**
**دار و بەردی بەر دەرگەکەتان هاتنە تکا**

دووبارە باسی شەو ڕاشکان و ئەژنۆ شل بوون و هەڵپڕووکانی مانگی کردووە- کە دیارە بۆ زیاتر سەرنجڕاکێشان و دەستەمۆکردنی سۆزی کچەکە وا دووبارەی کردۆتەوە- کەچی دڵدارەکەی دەرگای لێناکاتەوە، کە لە ئەنجامدا دار و بەردی پێش دەرگاکەیانی بە زمان هێناوە، ئەو گوزارشت لێکردنە لەم دێڕەی کۆتایی تامێکی شاعیرانەی بەخشیوە بە شیعرەکە لەکاتێکدا جێگای خۆیەتی ئاماژەی بۆ بکرێ کە شاعیری سەرکەوتوو ئەو شاعیرەیە کە دەتوانێ مامەڵە لەگەڵ وشەکان بەشێوەیەکی ئیستێتیکی بکاو هەریەکەیان لە شوێنی دیاریکراو دابنێ و گیانی ئەو سەردەمەیان بەبەردا بکا، کە لەمەشدا ئەو دەستەواژانەی لە ژیانیدا هەیە زۆرن و بەکارهێنانیان لە شیعردا وێنە و نموونەی شیعری جوان دروست دەکەن.

لە زۆر شیعری تردا ئەو جۆرە مامەڵانەی کردووە و سەرکەوتووانە لەگەڵ ئەو دیاردانەی، یان دەستەواژانەی کە لە ژیانی خۆیدا هەبووە، لە شیعرەکانیدا بەکاری بردوون:

**بتێک بووی دەسکردی خۆم کڕنۆشم بۆ دەبردی**
**لە ساتی تەنیاییما سکاڵام بۆ دەکردی**
**بەڵام ئەمڕۆ لە دەورت کۆمەڵێ کڕنۆش بەران**
**تفری نەخشی پیرۆزی پەنجەی منیان هەڵوەران**
**شێلایان ئەو شۆخییەی جێی سەرنج بوو بۆ هەڵبەست**
**ژەنگیان خستە ئەو دڵەی پرد بوو بۆ ژێر پێی مەبەست**
**کەوابێ تۆ دارشتەی دەستم بی و بۆ من نەبێت**
**ئیتر بۆچی لەژێر پێم ئەنجن بە ئەنجن نەبێت**

لەم شیعرەیدا شاعیر مامەڵەیەکی زۆر واقیعبینانەی لەگەڵ مەبەست و چەمکی خۆشەویستی و دەستەواژەی خۆشەویستیدا کردووە، لە کاتێکدا دەتوانین بڵێین کە بە بەشێک لەدانپیانانی تایبەتی خۆی دەژمێردرێ بەرامبەر بە یارەکەی، کەچی لە ڕێگای شیعرەکەیدا جۆرە مامەڵەیەکی لەگەڵ نائومێدی کردووە، لە مەبەستی ئەوە دەخوێنینەوە کە بە فێرۆدانی ئەو هەموو ماندووبوونەی دەگەیێنێ، کە لە پێناوی خۆشەویستەکەی کێشاویەتی کە ببووە خەمڕەوێنێک بۆ شاعیر و لە ساتەکانی تەنیاییدا شاعیر پەنای بۆ دەبرد، کە کەس نییە گوێ لە سکاڵا و گلەییەکانی بگرێ لە زەمەنە جەنجاڵەکەی شاعیر، ئەم سکاڵای بۆ دەبا، کەواتە دڵدارەکەی لێرەدا زیاتر وەک سەرچاوەی خەمڕەوێن و دڵدانەوە بەرجەستە کراوە، نەوەکو سەرچاوەیەکی حەسانەوەی سێکسی. کەچی هەر ئەو سەرچاوەیە مامەڵەیەکی تری لەگەڵ دەکرێ، لە کاتێکدا بەدەستی خۆی وەک بتێک دروستی کردبوو خۆشی کڕنۆشی بۆ دەبرد و خۆشەویستانە دەیپەرست، کەچی ئەمڕۆ کۆمەڵێ کڕنۆش بەران و فێڵبازان و فرۆشیارانی عیشقی پاک، تفری نەخشی پیرۆزی پەنجەی شاعیریان لەسەر دڵخوازەکەی هەڵوەراند، کە بەمەندەش ڕانەوەستان بەڵکو شۆخی ئەو خۆشەویستەی شاعیریان شێلا کە بۆ مەبەستی سەرنج بوو بۆ شیعر لەلای شاعیر و ژەنگیان خستە ئەو دڵەی کە پرد بوو بۆ ژێر پێی مەبەستی شاعیر.

ئەوەی ناحەزانی عیشق مەبەستیان بێ بۆ لێککردنی دوو دڵدار، تەنیا بە هەوڵدان بۆ گۆڕینی دڵەکان جێبەجێ دەکرێ، ناحەزان ناتوانن جوانی و شۆخ و شەنگی کچەکە لە دڵی کوڕە لاوە خۆشەویستەکەی بسڕنەوە، چونکە هەموو ئاسمانی دڵی ئەو بە ئەستێرەی جوانی کچەکە ڕازاوەتەوە، لەکاتێکدا ئەو کچە، یان کوڕەکە هەڵوێستی خۆی لەدەستدا و نەیتوانی بڕیاری چارەنووسی یەکلاکەرەوە بدات، ئەوا بە ئاسانی دەتوانن دڵیان لەسەریەکتر بگۆڕن، ئەگەر گۆڕینەکەش لەلایەن کچەکە بوو ئەوا وەک چارەنووسی کچەکە و خۆشەویستییەکەی لای کوڕەکە بەو شێوەیە دەبێ کە شاعیر باسی دەکا:

**کەوابێ تۆ دارشتەی دەستم بی و بۆمن نەبێت**
**ئیتر بۆچی لەژێر پێم ئەنجن بە ئەنجن نەبێت**

ئەمەش ئەنجامی هەموو هەڵوێست گۆڕینێکە لە هەر لایەکیان بێ، بەم شێوەیەش چیرۆکی خۆشەویستیان کۆتایی دێ و هەموو شت دەبڕێتەوە.

هەمان حاڵەت لە شیعری (نیازێک هەڵوەری)دا

دووبارە دەبێتەوە، بەڵام بە نەخشاندنی وێنەیەکی جیاواز:

**لە شیعرێکی خەمرەوێنا**
**لە دەفتەری بچکۆڵەی بیرەوەریا**
**لە هەزاران شادەمار و مێشک و خوێنا**
**تۆمار دەکەم سەرگوزشتەی**
**ئەو مێخەکەی**
**چەنەم شل بوو ئەوەندەی شیعری بۆ بڵێم**
**لە دواییشا کەبایی بوو**
**هەڵم وەراند خستمە ژێر پێم**

لەم هەڵوێستەدا شاعیری خاوەن هەڵوێست و یەک بڕیار هەڵی بوەرێنی و بیخاتە ژێر پێی، چونکە خۆشەویستی بە زۆری زۆردارەکی ناکرێ و هەموو جیهان کۆ ببێتەوە ناتوانن دڵێک والێ بکەن یەکێکی خۆشبوێ کە لەخۆیایی بێ و ئەو کوڕەی خۆشیویستووە وەک هیچ نەبوویەک تەماشای بکاو هیچ ڕێزێک بۆ هەست و سۆزی دانەنێ و ڕێز لە هەست و نەستی نەگرێ و هەمووکات وا هەست بکا کە کوڕەکە سووتاوە، برژاوە، ئاگری تێبەربووە، تا بێتە لای و کڕنۆش ببا کە هێمای زەلیلبوون دەگەیەنێ. لەکاتێکدا شاعیر بە هەڵوێستی پۆڵایین بەرامبەر ئەو جەنگە دەروونییەی خۆشەویستەکەی بۆتەوە، هەر لە شیعرێکی دیکەی بەناوی (لە دەستم دێ)دا دەیتوانی هەموو ئەو نهێنییانە باس بکا کە لەگەڵ کچە بێوەفاو هەڵخەڵەتاوەکەی ئاشکراو ڕیسوای کۆڕی عاشقانی بکا تا ببێ بە پەند بۆ هەموو ئەوانەی کە گاڵتە بە سۆز و هەستی ئاشق دەکەن و بەناوی پیرۆزی عیشقەوە لەسەر مێزی قوماردا قومار بە چارەنووسیان دەکەن، کەچی ڕقی پیرۆزی شاعیر ڕێگای نەداوە ئەو شتانە بکاو هەردەم بە چاوێکی ڕێزدوە ڕووانییەتییە ئەو ڕابردووە و خۆی بە مرۆڤێکی بێ ئەزموون و دڵڕەق و قینهەڵگر پیشان نەداوە، ئەگەر لە کاتێکدا بزاندرێ کە ڕقی شاعیر ڕقێکی پیرۆز و بەرزە و لەسەر هەموو مانایێکە و قینهەڵناگرێ و خۆشەویستی و مانا پیرۆزەکەی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بەکارناهێنێ، دەشزانێ هەموو جیهان پڕی کچە، بەڵام ئەم لە دوای کچێکی وادەگەڕێ کە پێش ئەوەی لەگەڵ شتی تری شاعیر تێکەڵبێ لەگەڵ گیانی تێکەڵاو دەبێ:

**لەدەستم دێ**
**کاتژمێری کامەرانیت بوەستێنم**
**لەدەستم دێ**
**ئەڵقەی پەنجەت پێ فڕێ دەم**
**نامەی بەختت بسووتێنم**

تا دەگاتە ئەوەی کە بڵێ:

**بەڵگەم پێیە**
**هەزار بەڵگەی ئاشکراو ڕوون**
**بەڵگەی چوارساڵ پێکەوەبوون**

لە ئەنجامدا ڕقی پیرۆزی شاعیر وای لێ دەکا بیر لە هیچ نەکاتەوە، چونکە:

**خۆشەویستیت**
**نەهەنگێکە**
**خوێنی هەڵچووم دەخواتەوە**

ئافرەتیش دەبێ ئەو هەڵوێستەی شاعیر بنرخێنێ و هەست بەوە بکا کە هەستی شاعیریش زۆر جیاوازە لەگەڵ هەستی کەسانی ئاسایی تر، شاعیر پێش ئەوەی جوانی و سامانی ئافرەتەکەی بوێ، گیانێکی پڕ هەستی ناسکی گەرەکە و دەیەوێ لە دوای ئافرەتێک بگەڕێ لەگەڵ گیانی بدوێ. کاتێ ئەو ئافرەتەی دیتەوە ئەوا دەوڵەمەندترین کەسە و ئاوڕ بۆ کچێکی تر ناداتەوە تەنیا حیساب بۆ ئەو ئافرەتە دەکا کە خۆشی دەوێ و لە پێناوی ئەودا دەژی و دەمرێ. بەمەش ئامانجەکانی خۆشەویستی دێتە دی و کوڕ و کچەکە دەگەنە نوختەی پێکگەیشتن و لێکحاڵی بوون، کە ئەو پێکگەیشتنە گیانییەش ڕووی دا، کۆتاییەکەشی بەخۆشی دەبێ. دەتوانن ژیانێکی خۆش و شاد پێکبهێنن و وەچەی نوێ بۆ ژیان بەرهەمبهێنن.

وەنەبێ شاعیر هەر لەم بوارانەدا کاری کردبێت، بەڵکو زۆر شاعیرانە پەردە لەسەر ئەو ڕاستییە شاراوانە هەڵدەداتەوە کە لە چاوی کچی خۆشەویست ڕەنگدەداتەوە، هەڵسوکەوتی کچە ئاشکرا دەکا و لە کچەکە دەگەیەنێ کە خۆشەویستی ناتواندرێ بشاردرێتەوە، بەڵکو لێرەدا لیبراڵی و سەربەستییەک دەداتە مەسەلەی خۆشەویستی کە لە هەست و هۆشی ئەوکەسە سەرهەڵدەدا کە کەوتۆتە ناو دنیای خۆشەویستی، ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە خۆشەویستییەک بێ لەو مەسەلانەی کە کەس ناتوانێ بیشارێتەوە:

**شەرم مەکە بەناوی ڕووت**
**ناوم بێنە پڕ بە گەرووت**
**با لە یەکتر ئاشکرابین**
**تاکەی لەناو ئاگرابین**

**نە تۆ (خوشکە)ی نە من (کاک)م**
**خۆشەویستی دەروون پاکم**

لێرەدا مەسەلەیەک دێتە گۆڕێ جێگای خۆیەتی ئاماژەی بۆ بکرێ، کە پێوەندی بە دەروونناسی جوولانەوەی مرۆڤ هەیە، ئەویش کە پیاو ناتوانێ خۆشەویستی خۆی بۆ یەک دەقیقەش بشارێتەوە، بەلام رقی خۆی چەند سال دەتوانێ بشارێتەوە، کەچی ئافرەت بە پێچەوانەوە خۆشەویستی خۆی پێ دەشاردرێتەوە و رقی خۆی پێ ناشاردرێتەوە. ئەم تێگەیشتنە دەتواندرێ لە شیعری (کاک) وەربگیرێ، کە هەرچەندە کچەکە هەر بەکاک ناوی شاعیری دەهێنا، بەلام شاعیر گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە ئەو خۆشی دەوێ، بەلام شەرمی کچانە و ترسی لە کۆمەل و نەوەک ئەگەر بە شاعیری وت و بەناوی رووت ناوی هێنا ئەوا شاعیر بە چاوێکی سووک تەماشای بکات، چونکە لە کۆمەلگای ئێمەدا شتێکی ئاشکرایە کە زەمینە بۆ خۆشەویستی تەسکە و لەبار نییە و کەسایەتی کچەکە لەسەر ئەوە رادەوەستێ کە هەتا مێرد دەکات خۆی لە هەموو شت بپارێزێ، بە تایبەتی لە مەسەلەی خۆشەویستی، کە زۆر تێروانینی تەسک و نائاشکرای تێ ئاخاندراوە. ئەگەر بیەوێ- واتە ئافرەتەکە- بشیکات دەبێ بە نهێنی بێ، ئەگەر نا ئەوا کچەکە بە چاوێکی سووک تەماشا دەکرێ و زۆرجار دەگاتە ئەو قۆناغەی کچەکە دەمێنێتەوە، کە بەم شێوەش کۆمەل تاکێک لە دەست دەدا، ئەمەش چارەنووسی هەموو جیهانە و ناتوانین لێی دەربازبین ئەگەر بمانەوێ هاوسەری راستەقینەی خۆمان هەلبژێرین کە پێش ئەوەی لەگەل پارە و سامانمان بدوێ لەگەل گیانمان تێکەلاو ببێ هەر چۆنێ بێ، دەتوانین هیچ نەبێ بەشداری هیوا و خۆزگەی شاعیر بکەین لە کەم کردنەوەی موعانات و ناخۆشییەکانی لەودی هەرکەس لەلای خۆیەوە راستگۆیانە و بێ پەردە پێوەندی لەگەل یەک ساز بدەین. شاعیر لە زۆر رەفتاریدا دەیەوێ مامەلەیەکی ساکار و بێ زۆرلەخۆکردن لەگەل ئەڤیندارەکەی بکا و پێناسەی خۆی بۆ بکا و خۆی بناسێنێ، بە سادەیی وەک سادەیی ناوی نیشتمانەکەی کە کوردستانە. لێرەدا ئەو پێکەوەگرێدانەی شاعیر لەگەل نیشتمانەکەی بەهرەیی و سەلیقەیی شاعیر پیشان دەدا، کە دەشیەوێ بلێ (من+ کوردستان) ئاشکرا و روونین و شتی زیادمان نییە و لە مەسەلەکانی ریاکاری و خۆبەزلزانی و خۆشاردنەوە لەژێر پەردە و دەمامک نازانین:

**بەلێ سادەم**
**سادەم و هەرسادەش دەبم**
**وەکو ناوی نیشتمانم**

شاعیر زۆر راستگۆیانە مامەلەی لەگەل خۆشەویستەکەی کردووە، بۆ شاعیرانی روون کردۆتەوە کە ئەم- واتە شاعیر- هەردەم سادە و ساکارانە دەمێنێتەوە.

شیعری سەرکەوتوو ئەوە دەسەلمێنێ کە راستگۆیانە شتەکان دەربڕین، کە بەراستی شاعیر توانیویەتی ئەو خالە بپێکێ و شیعرێکی سەرکەوتوو بەرهەمبهێنێ، ئەوەتا شاعیر چۆن خۆشەویستەکەی ئاگادار دەکاتەوە کە لێی نەگۆڕێ و بێتە لای و خۆشی بوێ، چونکە نایەوێ درۆزن و فێلبازێ و سادەییەکەی خۆی بدۆڕێنێ و هەستی ئەو بشێوێنێ و قومار بە گەورەترین و پیرۆزترین شت بکا کە هەستی خۆشەویستییە:

**هەموو رۆژێ**
**خوێنی (زین) یێک لە خەنجەرم دا دەچۆڕێ**
**گەر بێیتە لام وریای خۆت بە**
**خۆشت نەویم لێت نەگۆڕێ**

زۆر کەس زۆر ناراستگۆیانە و بە دلێکی ناپاک دەیانەوێ خۆشەویستی بکەن و هەر بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان پێوەندی لەگەل ئافرەتەکە دەبەستن و تەنیا تەماشای ئافرەتەکە دەکەن وەک ئامرازێکی پڕکردنی شەهوەت و سێکس بازی، بەلام شاعیر ئەو شتانە قبوول ناکاو زۆر راستگۆیانە مامەلە لەگەل ئەو کچە دەکا کە خۆشی دەوێ و دەیەوێ پێی بلێ کە ئەو خۆشویستووی وەک ئاسمان کە چەند دوورە ئەوی بە ئەندازەی ئەو دوورییەی نێوان ئاسمان و زەوی خۆش دەوێ و بە قوولایی دەریا و بە قەد قوولی گشت دەریاکان هەروەها دەیەوێ خۆشەویستەکەی بە نووسراوێک بچووێنێ کە دێرێکی بە قەد تالی پەرچەم بۆ ماوەی پێکەوەبوونیان دەیخوێننەوە، ئەوەتا شاعیر چەند بالی بیری لێکدەدا کەچی نە تێر دەبێ و نە دەشتوانێ بیخوێنێتەوە، خۆشەویستی راستەقینەش ئەوەیە هەموو ماناکانی لەخۆگرتبێ و خۆشەویستەکانی هەموو کات و ساتێ نە لە دیتن و قسەی یەکتر تێر نەبن و نە بە تەواویش لە یەکتر بگەن. بەم شێوەیەش خۆشەویستی بەردەوام دەبێ و هەموو رۆژێ زیاتر نوێ دەبێتەوە و شتی نوێی لێ دێتە بەرهەم.

خۆشەویستی واش هەیە کچەکە بە ئەندازەی سالێک

دوازدە وشە ناچرپێنێتە گوێی کورەکە، زۆر قسەکردنیش مانای زۆر خۆشەویستی نییە، بێدەنگی جۆرێکە لە خۆشەویستی. شاعیریش ئەو بیروباوەڕانەی سەرەوەی لە شیعری (خۆشم ئەوێی) چڕکردۆتەوە، کە ئیلهامی کۆپلەی یەکەمی لە گۆرانییەکی گۆرانیبێژی عەرەبی فەیرووز وەرگرتووە:

**خاتوونەکەم**
**بیستووتە ئاسمان چەند دوورە**
**من بارتەقای دووری ئاسمان**
**خۆشم ئەوێی**
**گیانەکەم تۆ نووسراوێکی**
**دێرت بە قەد تاڵی پەرچەم**
**من چوار ساڵە ئەتخوێنمەوە**
**چەند باڵی بیرم لێک ئەدەم**
**نە تێر ئەبم نە تێت ئەگەم**

زۆرجار ڕقی پیرۆزی شاعیرانە تەنیا ڕەخنەی لە کۆمەڵ پێ دەگرێ، بەڵام ئەو شیعرانەی کە لەسەری دواین لای ئێمە بەشێکە لە شیعری عاشقانەی ئەمڕۆمان کە ڕێگا بۆ لاوان ڕوون دەکاتەوە و پیشانیان دەدات چۆن خۆشەویستی بکەن، بە کورتی هونەری خۆشەویستییان فێردەکات.

لەپاڵ ئەمانەشدا خۆشەویستی لای شاعیر نەمرە و بەردەوامە. لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی دەرمانبری (زمان و شێواز) لای شاعیری ئەم لێکۆڵینەوەیەمان سادەیە و لەئاستی هونەرێکی قووڵدانییە. ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ (زمان و شێواز) لای شاعیرانی وەک: [جەلال بەرزنجی، دلشاد عەبدوڵڵا، هاشم سەراج، سەباح ڕەنجدەر، ئەحمەدی مەلا، ئازاد سوبحی] هەست بە ئاستی جیاوازی هونەری دەکرێت. ئەمەش بەڵگەی ئەمەیە کە شاعیر لە قاوغێکی سەرەتایی ماوەتەوە و پێشکەوتنی زۆر سنووردارە.

### ئەنجام

لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەماندا لەسەر چەمکی خۆشەویستی لە شیعرەکانی (عەبدوڵڵا پەشێو) دەتوانین بڵێین گەیشتووینەتە ئەو ئەنجامانە.

١- زمانی شیعری خۆشەویستی زۆر سادە و ئاسانە و دوورە لە زۆر لەخۆکردن و خۆخستنە ژێر دەمامک و لەژێر پەردەیی و دوو ڕوویی.

٢- هەڵوێستی شاعیر زۆر پۆڵایینە و خۆلەدەستدان و خۆدوڕاندنی تێدا نییە.

٣- مەسەلەی خۆشەویستی لای شاعیر پیرۆزە و بۆ مەبەستی تایبەتی بەکارنەهاتووە.

٤- عیشق لای شاعیر بەردەوام و نەمرە.

٥- زمان و شێواز لای شاعیر لە ئاستی هونەرێکی قووڵدا نییە.

**تێبینی:**

ئەم بابەتە وەک لێکۆڵینەوەیەک بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس پێشکێش بەسەرۆکایەتی بەشی زمانی کوردی کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدین کرا، بە پلەی (ئیمتیاز) وەرگیراوە و نمرەکەی (٩٨٪) بووە کە بۆ ساڵی خوێندنی (١٩٩٦- ١٩٩٧) بە یەکەم دەرچوو لەسەر ئاستی بەشی زمانی کوردی. لێرەدا بە بێ هیچ زیاد و کەمکردنێک بڵاوی دەکەمەوە.

**«ن. ح. ر»**

**سەرچاوەکان:**

١- عەبدوڵڵا پەشێو: فرمێسک و زام، چاپی (١)، چاپخانەی شیمال، کەرکووک (١٩٦٧).

٢- عەبدوڵڵا پەشێو: بتی شکاو، چاپی (١)، چاپخانەی شیمال، کەرکووک (١٩٦٨).

٣- عەبدوڵڵا پەشێو: شەونامەی شاعیرێکی تینوو، چاپی (١)، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا (١٩٧٢).

٤- عەبدوڵڵا پەشێو: شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم، چاپی(١)، چاپخانەی الحوادث، بەغدا (١٩٨٠).

٥- سمير الشيخاني: حصاد الفكر العالمي، ط(١)، م (دارالعلم للملايين، بيروت، (١٩٨٠).

٦- فاروق الشوشة: احلى (٢٠) قصائد في شعر العربي، ط(١)، م دارالعودة، بيروت (١٩٨٠).

٧- د. عزالدين مصطفى رسول: الواقعية في الادب الكردي، ط(١)، م ؟ بيروت.

٨- هاوکاری، ژ(١٢٧)، ساڵی (١٩٧١).



# بازە بەرێن کورد و مرۆڤایەتییێ د ئەفراندنێن (سەلیم بەرەکات)یدا

ئەحمەد قەرەنی

سەلیم بەرەکات یەکە ژ ئەوان نڤیسکارێن، کو بەرهەمەکێ مشە و زۆر هەی و، د هەمان وەخت دا ژی، گەلەک ل سەر هاتیە نڤیسین. ب تایبەتی ژ ئالیێ نڤیسکارێن عەرەب ڤە. ژبلی ئەوان چاڤپێکەفتن و هەڤپەیڤینێن دگەلدا هاتینەکرن، یان ژی راستەوخۆ د تەوەر و مێزگردێن ئەدەبی دا پشکدار بوویە. تشتەکێ ئاساییە کو ئەو هەموو گرنگیپێدان و نڤیسینە ب زمانێ عەرەبی بوونە، چونکە نڤیسینا سەلیمی ب عەرەبی یە و دەستەکێ بالا ژی د بکارئینانا ئەڤی زمانی دناڤ ئەفراندنێن ئەدەبی دا هەیە. لێ بەلێ ئەو ڕەوشا پڕ بها و حالەتێ سەرنج ڕاکێشێ د ئەڤێ سەلیقەداریا زمانڤانییێدا دهێتە بەرچاڤ و پێدڤییە د ئەڤێ دەلیڤێدا بێژین ئەوە کو:

١- هەر کەسەکێ شاکارێن سەلیمی بخوینیت، یان ژی ڤەکۆلینێ تێدا بکەت، دێ ناچار بیت بزڤریتەڤە فەرهەنگەکا زمانێ کوردی، ژبەرکو بکاریت رامانێن هەموو پەیڤێن وی تێبگەهیت، چونکە ناڤێن شوین و جهێن کوردستانێ، یان ژی ناڤێ کەسانێن دناڤ نڤیسینێن وی دا دهێن گەلەک ژ ئەوان کوردینە و، ژ دۆرهێلێ ژیانا کوردەواریدا هەنە، یان ژی دروستبووینە، وەکو: (فەرهاد، رەوەند، بێکەس، خەلۆ، جزراوی، نینو سارین، سەربەست، هەوار، سەرعو، رندۆ، مانۆ، فارکۆ، مێڤان، جەگەر سەیدا، دینوکا، سۆرا، سیدرۆک، کۆچەر، سیکانو، شەمدین، مهاباد، قامشلی، بهارنک، دەشتا بریڤا، نەهاوەند، ماردین، معیریکا، عامودا، تربەسپی، هەکاری، بەتلیسێ، پیرخان....) ئەڤە هەمی پەیڤێن رەسەنێن کوردی نە و ناڤێن کەس و شوین و جهێن کوردستانێ نە، کوبافەرە هەر خوێندەڤانەکێ بەرهەمێن وی د ئەڤان پەیڤ و زاراوەیان دا شارەزا بیت. ئەڤ بۆچوونە ژی رێکەکا ڤەکری و خۆش ئامادە دکەت، ژبۆ هندێ کو جیهانا پان و فرەوانا ئەفراندن و شاکارێن سەلیمی، رێکا وێ دناڤ زمانێ کوردی دا دەستپێدکەت. ئەڤە ژ لایەکیڤە و، ژلایەکێ دیڤە سەلیمی ب خوە شارەزایەکا باش و قوول د ئەڤان پەیڤان دا

عموود، لەوما ژی بووینە جهێ پویتەدان و بکارئینانێ خەم نشیکاری بخوە ژی. هەر ژبەر ئەڤێ مەرەمێ ژی بویە. چاخێ ڤەکۆلەر (سامیە سەلۆم) نامەیا خوەیا مجستیرێ لسەر سەلیمی ئامادە دکر بناڤێ (وێنەیێن شعری لجەم سەلیم بەرەکاتی د دیوانا وی (طیش ب قوت)دا. ناچار بوویە کو هەفتیەکێ بهێتە شارێ قامشلی جهێ سەرەتا ژیانا سەلیمی و ل هەموو شوبن و قێژێن و کۆلان و خانیێ مالا سەلیمی بگەرێت و پرسیارا ژ زمان و نهێنییێن پەیڤ و زاراوەیێن کوردی بکەت کو دێ بنە کلیل ژ بۆچوونە ژوورا جیهانا شاکارێن سەلیمی.

٢- ئەو کەش و هەوایێن رویدانێن بەرهەمێن وی تێدا دژفرن، هەموو ژ جەرگێ ژیانا کوردەواریدا هەلقولاینە و، ب رەنگەکێ هونەری مێژوویا ورد و هویرا سات و وەخت و بزاڤێن کوردان دنڤیسن و تۆمار دکەن، کو ئەوا کوردان سەر نەخشەیا جوگرافی ژ دەستداین، لڤێرە دناڤ چرکەوساتێن مێژوویێدا دهێنەڤە وەرگرتن. ئەڤە ژی رێکەکا دەستخوەشە بۆ پاشەرۆژەکا گەش، کو کورد چڤەرێ دکەن.

ئەگەر عەرەبان هەولدابن مێژوویا کوردان لدویڤ سەلیقا خوە پاژۆن و، نەخشەیا کوردستانێ لدویڤ دلێ خوە بگۆرن. هەلبەت رەنگڤەدانا ئەوان کاران کورد نێخستینە د دەلیڤەکا تەنگاڤدا، کو ب بزاڤێن هەمەجۆر هەولبدەن بەرەڤانیێ ژ خوە بکەن و، ب کریارەکا خورت رێچکا خەباتێ گرتبوو و، ئەز دبێژم بهایێ ئەوێ خەباتێ قوربانیدانەکا یەکجار مەزن بوویە، کو ئەڤرۆ بوویە جهێ شانازیێ و، د هەمان وەخت ژی دا قۆناغەکا پڕ هەیبەتە د رێبازا ئازادییێدا.

د ئەڤێ قۆناغێدا حنێر و بلیمەتیا (سەلیم بەرەکات)ی خویا دبیت، کو شێوازێ خەباتا وی، شێوازەکێ دەکمەن و یەکانەیە، دەمێ رەنگڤەدانا بزاڤا وی ب هەمان هێزا بەرامبەر بوویە، لێ د سەنتەکا پێچەوانەدا، کو زمانێ بەرامبەر لدویڤ دلێ خوە شێلایە و هەڤیر کریە و ب شارەزایی جیهانەکا پان و فرەوان و پڕ خەون و هیڤی پێ دروست کریە. مرۆڤ وەسا هزر دکەت دەمێ ژ ڤەخویندنا شاکارەکا وی خلاس دبیت، وەسا هزر دکەت کو ئێش و ئازار و مەرگەساتێن ئینسانی کەلەکەبووینە و وەکو چیایێن کوردستانێ بلندبووینە و، ل سەرێ بەرزترین لوتکەدا سەلیم راوەستایە و وەریسێ رزگاربوونێ ژبۆ خویندڤانێ عەرەب داهێلایە، داکو ژ دۆزەخەکا ئینسانەکی دروست کری ببەتە بەهەشتەکا کو ئینسانەکێ دی چاڤەرێ یە دروست بکەت.

ژبلی لایەنێ فەلسەفی یێ قوولێ سەلیم دکارێن خوەدا چێ دکەت، کو دۆزا مرۆڤایەتیێ ل پێشیا دۆزا نەتەوایەتیێ دهێت. یان ژی دکارین بێژین لایەنێ مرۆڤایەتیێ رەشمالەکا کۆچەرایە و هەموو رەوش و حالەتێن بچووک و مەزن، سڤک و گران، رەنگ و بێرەنگ، دلئێش و دلشاد.... هتد جهێ وان دبندا هەیە. لێ بەلێ ئەو کەش و هەوایێن کوردەواریێ و رەنگڤەدانا سایکلۆژییەتا مرۆڤێ کورد دناڤ کارێن (سەلیم)یدا، ب روون و ئاشکرایی دیاردکەن کو خودان مالٚ کیە و میڤانێن عەزیز ژی کینە. لەوما ژی یا فەرە لڤێرە هنەک ژ ئەوان حالەتان بەحس بکەین وەکو بەلگە و بیانگ بۆ ئەڤێ بیروبۆچوونێ:

- [تۆ نزانی چاوا ئەو درزێن دناڤبەرا عامودێ و مۆسیسانا ژ کەلەخێن هێستر و پرتێن پەرتی پڕ بوونە].

- [ئەزێ ماندی مە، دەنگێ تە نایێ من و، ئەزێ بانیا (معیریکا) و ئەوان چوارچەرخێن کوردان یێن قرش بارکری دبینم].

- [چ بێژمە ئەوان نێچیرڤانێن زینان لسەر پشتا سەیێن سلۆقی دادنێن، ل کێلەکا شەنگال و چیایێ عەبدولعەزیز].

- [من هیڤی دکر کو درزێن من پڕ ببانە ژ رویڤیێن «ماردین» و «عەنتابێ»].

- [دناڤبەرا هێمایێن من دا کاروانەکی خۆ کۆشت و من ژی ب خەما نەهاوەندێ ڤەشارتەڤە].

- [کەڤالێن سەرنشیڤێن نەخشڤانان دهۆلێن قامشلی دا].

- [جزیری و چوێچکا خوە ژ پەنجەرا دائێخستی بەرەڤ گوندان فرین].

- [ئەو رویبارێ ژتە خودان ژبەر تیشکەکێ ژ مێژوویا کوردان پەردێن حەیا خوە لاددەت و تە لوول ددەت و، تو رادبی سەرپێ].

- [و دەریا ژ مهابادێ دچە].

- [و ئەز شاروگوندێن خوە وەکو دەستکەقرشەکی دناڤ چوارچەرخێن کوردان دا دبینم].

- [شەمدینی دبینم و سترانا کوردی دسترە و، (موسیسانا)یێ لسەر دوو دەستێن ژ لاولاوێ بۆ ئالاڤێن تەڤنکەران بلنددکەت].

- [دێ بۆ ئەوێ بەفرێ گریم ئەوا ژ بانیێن باکوورێ هەتا شەنگالێ باری].

- [شەمدینۆ، و تۆ یێ پشت گوهـ هاڤێتی شەمدینۆ
نەهـ گوللە ژ چاخێ عەرەبێن فرەنگی تێن،
و هێسترا تەکەت شەمدینۆ
و تۆ وان هەردوو چاڤێن خەمۆکی ژ تشتەکی دگێرینی،

و دبێژی: ئەز مالم، و دەرگە ژی هەر ئەو دەرگەهە:
چەند دار، و چەند مێژوویەکن ئەوێن چەتەیێن بێزەڤەر حاشاتییێ ژی دکەن هەروەسا عەرەب ژی].
- [و ژ «فەتال»ێ هەتا «بەندەرێ» من ژبۆ شەیبۆبێ کورد وەلاتێن دن برن].
- [ژ دێرزەمـــان، ل دێر زەمـــانەکێ نێـــزیک، هەتا باکووێ تەمەنێن مە لسەر درێژیا هێلا ترێنا دناڤبەرا «تربەسپی»یێ و «ماردین»ێ گورێل کرن، و نشکێڤە دەنگێ پیرە ترێنێ هات، یەکەم جار بوو، ئەو ڤیرێنا لژێر بارێ تەرش و تەوال و نەمانا حکومەتێن مەزن...].
- [بانگ دکـەم: چمـا ئەڤ باکـوورە، چمـا ئەڤێ راوەسـتـیـای دناڤـبەرا مـوێژ و بزنان دا، ئەو ب تەنێ لێڤۆکە دناڤبەرا هەمی ئالیان دا.]
- [و ب ناڤێ چیایێ یەکانە و د خەمێن خوە دا دچمە پێش].
ئەڤێن سلال هنەک ژ هەڤۆک و پەرەگرافێن جوّدا جوّدا بوون کو ژ چەند شاکارێن وی هاتبوونە وەرگرتن ژ ئەوانا:
- كل داخل سـيـهـتف لأجلي. و كل خـارج أيضـا، ١٩٧٣.
- هكذا أبعثر موسيسانا، ١٩٧٥.
- للغبار، لشمدين، لأدوار الفريسة وأدوار الممالك، ١٩٧٧.
- الجـمـهـرات، في شـؤون الدم المحـرج و الأعـمـدة وهبوب الصلصال، ١٩٧٩.
ژبلی ئەڤـان کارێـن وی ژی، مرۆڤ دشێت دناڤ دێر و هەڤۆکێن کارێن دن ژی، ژ خەم و کول و خەونێن کوردەکێ مشەخت و بێکەس دناڤ رووپەلێن مێژوویەکێدا، گەلەک وێنە و سەلیقە و کەش و سەقایێن کوردەواری ڤەخونیت هەتا ئەگەر راستەوخۆ و دەقاودەق ژی نەبیت. ژبۆ نموونە شاکارێن وەکو: (كنيسة المحارب، ١٩٧٦) و (الجند الحديدی، ١٩٨٠) و (الكراكی، ١٩٨١).
لێ بەلێ دکـارێـن وی یێن دویڤـدا، پـتـر ئەڤ رێچکە دیار و خـویا بوو، پێدڤی هندێ ناکـەت مـرۆڤ ل پشت پەیڤ و ئیدیەمان رامان و مەبەستێن وی فەهم بکەت، بەلکو چارچۆڤێ گشـتـیێ دەڤـێن وی لدۆر مـەبەست و ئامانجەکا سەرەکی دزڤرن. و دناڤ ئەوێ ئامانجا سەرەکی دا، جارەکا دن مرۆڤ دشێت ب ساناهی شۆر ببیتە دناڤ ئالیێـن ورد و هویرێـن ژیانا مـیـللەتێ کـورد دا هەروەکـو رۆلێ سەلبی یێ ئاغا و کـەتخودایێن کوردان دگـێـرن و ژبەر بەرژەوەندی و خوەشـیـا خـوە، ناهێلن کـورد یەکـتـر بگرن و، هەردەم بووینە ئەگـــەرا بژالەبوون و لاوازیا جەمـاوەری، ئەڤە ژی بناس و هۆکارەکێ سەرەکـییە کو هەتا نهـا دەولەتا کـــوردی دروست نەبوویە و، نەبوونا قـەوارەکێ سـیـاسی کو مـاف و کەلەپوور و سـامـانێ وان بپـارێزیت، خـالا یەکێ و مـاکـا هەمـوو دەرد و ئێش و کـارەسـاتانە. ئەڤ لایەنە ب رۆهن و ئاشکرایی درۆمـانا «الفلكيون في ثلاثاء الموت، الكون»دا دیار دبیت.
پشـتـی وەشـان و بەلاڤبوونا ئەڤـان هەمـوو شـاکـاران، ل جەم عـەرەبان ژی، دیاربوو کـو سـەلیمی چ دڤـێت، چاوا کـــاردکـــەت، و دزانیت چاوا ل بســـتـــا دلی بدەت. د گـەرمـتـرین دەڤـەرا ب یەکگەهشـتنا کـورد و عـەرەبان دا، وی کـاردکـر، و بوو جـهێ رێزگرتن و دلخـوەشـیـا هەمـوو خوێندەڤانێن هندک ژ هەستا مرۆڤایەتیێ دزانن. بۆ نموونە شـاعرێ عـەرەبێ فـەلەسـتـینێ (مـەحـموود دەرویش)ی د هوزانەکا خوەدا ب ناڤونیشانێ (ليس للكردي إلا الريح) د بندا نڤیسـاندیە (إلى سليم بركات). مەحموود د ئەڤێ شعرێ دا هەڤپەیڤینەکا راستەوخۆ دگەل کوردان دکەت ب رێکا کـەسـایەتیـا (سـەلیم بەرەکـات)ی و، پرسگرێکا زمـانی وەکـو هۆکـارەکێ بنەرەتی دادنیت، و رۆژا داهاتی یا کوردان ب داڤەکا ترسێ ڤە گرێددەت چونکە هەرچیێ وەلات نەبیت، ئایندە ژی ژێرا مـسـوگەر نابیت، بەلکو ل غوربەت و جهێن بیانی دێ سەرێ خوە ل سـەربالکێ خەم و ئەگـەران دانیت. لەومـا ژی مـەحـموود د دێرەکا خـوەدا دبێژیت:

**پێناسا من زمانێ منە- ئەز- و ئەز-**
**زمانێ من ئەزم- ئەز د زمانێ خوەدا مشەختم-**
**و دلێ من پەرەنگەکا کوردییە ل سەر چیایێن خوەیێن شین-**

لدویڤدا مەحموود هونەروەریا سەلیمی ب خودراگربیەکا پیـرۆز دزانیت، و ئەڤ ئاگـادارییە ژ بۆ هۆشـیـارکـرن و ژ خەوهەسـتانا کوردانە، کو ئەڤرو نێزیکی ئاگرێ راسـتی و حـەقـیـقـەتێ بووینە، هەروەکـو د ئەڤی وێنەیی دا خـویا دبیت:

**ئەڤ رێڤینگە رێڤینگەک نیە، هەر چاوا بیت**
**باکوور باشوورە، رۆژهەلاتە رۆژئاڤا**
**د ژێر زەمینێدا- بای پارزینک نینە،**
**نە کارەک ژی بۆ تۆزێ، هەروەکو ئەو**
**حەسرەتا خوە بۆ یەکی دی ڤەدشێریت،**
**سترانان نابێژیت**

**ئەو دەمێ سـێـبـەرا وی دچیـتـە دناڤ قـورمێ دارا ئەکاسیادا ناسترە، ئان ژی پرچا خوە ب بارانەکا هویر تەڕ ناکەت-**
**بەلکو رازێن خوە دگـەهینـتـە گـورگی، پرسـیـارا هاتنا**

**کلخێ لێ دکەت= وەرە سەگباب ئەم دەهۆلا تعلێ شەڤێ بقۆتین هەتا مریان ژ خەو ڕاکەین- چونکە کورد یێ ژ ئاگرێ حەقیقەتێ نێزیک دبن، پاشی تێنە سۆتن وەکو پەپوولەکا شاعران.**

ژبلی ئەڤێ شعرا پڕ هەڤپەیڤین، کو یەکێک ژ مەزنترین شـعرێن عەرەبان بۆ (سەلیم بەرەکات)ی گۆتیە و، تێدا ژین و چارەنڤیسا مللەتێ کورد تێدا خویا کریە، ب تایبەتی ئەو کوردێن ل غوربەت ومشەختییێ دا دژین. لێ بەلێ سەلیمی ب خوە ژی ئەڤ وەریسە توندتر کریە، چاخێ درۆمانا خودیا ناڤدار ب (أنقاض الأزل الثاني)دا، سەرهاتیا ئەوان پێنج مێرخاسێن ژ مهابادێ هەلاتین، پشتی کۆمار تێکچووی، خوە ژبەر چاڤێن ئیرانیان ڤەدشێرن و قەستا چیایێ جۆدی دکەن.

د ئەڤێ رۆمانێ دا سەلیم دکاریت خوبندەڤانی دناڤ چەندین داڤێن ئالزی یێن رویدان و جهێن دلڤەکەرێن دەڤەرێ بگەڕینیت، چونکە ئەو پێنج کەسێن شیاین رابکەن، پشتی لەشکری چەندین خەلک سێدارەداین و ژ ئەوانا پێشەوایێ کۆمارێ، لێ ئیرانی دزانن کو هنەک ژ کوردان وندا بوونە و دناڤ کۆشتیان دا ژی دیار نینە ژ ئەوانا: (مەلا نەژدەت، جەگەر سەیدا، زبنۆ مێڤان، شەریف رندۆ، والی جەناب) ئەڤ پێنج زەلامە خوە ب دستڤە نادەن بەرەڤ وەغەرا دویر دکەڤنە رێ. هۆسا سەلیم ئەڤێ رۆمانێ دکەتە سێ پشک. دپشکا یەکێدا، دستهەلی وزیرەکیا ئاسایشا شاهی دیاردکەت، کو چاوا ل شوین پێن ئەوان پێنج کەسان کەفتینە، ب تایبەتی بەرپرسێ ئەڤی ئەرکێ سیخۆری کو دکەسایەتیا (شەهپۆر نەزمی)دا هاتیە نواندن. شەهپۆر ژی ب رێکا دارودەستەکێن هەوەکا پشکنینێ دەست پێ دکەت.

ئەڤ هەر پێنج سوارێن کورد دگەهنە رۆژهەلاتا رویباری و ل ئاڤاهیێ (کەریم پیرخان) پەیا دبن، کو نەڤ کابرایە مەزنێ ئەوێ دڤەرێ بوویە و، ل ئەوی دەمی مالباتا بابەکیان ژی کو کۆچەربوونە، ل پاوانێ پیرخانی ئاکنجی ببوون، چونکە کەڤنتر ژی یەکتر ناس دکر، و ل ئەوان دەمێن سالێ ل پاوانێ وان دمان.

ل کۆچکا کەریم پیرخانی هەر پێنج مێڤان و رۆستەم بابەک مێڤانن. دبیتە بەریکانیا ستران گوتنێ دناڤبەرا سترانبێژێ کەریم پیرخانی و سترانبێژێ مالباتا رۆستەم بابەکی. لێ بەلێ سترانبێژێ مێڤان جەمیل فارکو دبێژتە کورێ خود عەلی، کو بچیت دگەل ژنا خوە برازێت، چونکی ئەو کارێ زەلامینیێ دەنگی وی خوەش دکەت و، پاشی بێت ل کۆچکێ یارمەتیا بابێ خوە بدەت و، بەرامبەر سترانبێژێ کەریم پیرخانی خوەڕاگریت. لێ دەمێ ئەڤ تەڤنە سەردگریت، کەریم تورە دبیت، لێ مێڤانێن وی ژی ئەو پێنج کەس، رێکەکێ بۆ دادنێن و ب تایبەتی سترانبێژ زینۆی مێڤان کو کەریم پیرخان مامۆستایێ گوندی (مانۆ)ی دگەل (جەگەر سەیدای) کو دەلیلەکێ شارەزایێ رێ و رێبواران بوویە، بنێریتە هەکاریا و بەتلیسێ و مێرسین و وانێ و شارێن دی یێن کوردستانێ کو پەیڤ و سەرپێهاتیێن ستران بۆ بینن. لڤێرە ئەو رویدانێن ب سەر مانۆ و جەگەری دا دهێن کەش و هەوایێ رۆمانێ دگەهینتە لوتکەیا چێژ و تامێن ڤەخویندنێ.

گەریانا ئەڤان هەردوو رێڤینگان، ژبۆ دەستخستنا پەیڤێن ستران، جوگرافیا کوردستانێ ب جوانی دهێتە نەخشاندن و، و شوین و زەمەن تێکەل دبن، ب تایبەتی چاخێ هەردوو دگەهنە گوندێ (سۆرا) ل کێلەکا چیایێ جۆدی کو مالا کورێ خالەتا بابێ جەگەری ل وێرێ یە.

لڤێرە هونەروەریا سەلیم بەرەکاتی خویا دبیت، چاخێ ب رەنگەکێ جوان و رند ژیان و پێگەوتەرتیفێن گوند و شاران نیگار دکەت، و هەموو پەیوەندیێن مرۆڤایەتیێ ب تەڤنەکێ جوان درێسیت. هەر ل ئەڤی گوندی هەردوو رێڤینگ مەزنێ گوندی ناس دکەن کو ناڤێ وی (نەدیم سەفوەت مێرسینی)یە و، ئەو پەیمانێ ددەتە ئەوان کو پێویست ناکەت زێدەتر خوە ماندی بکەن، بەلکو ئەو دکاریت هەموو دەفتەر و کاغەز و هەتا جلکێن وان ژ ستران پڕ بکەت. کابرایەکێ دن ژی دهێتە دیوانا نەدیمی کو ناڤێ وی قاوون شێخە، ئەو وەعدی ددەت کو پەیڤێن ستران بۆ ئەوان بینیت، لێ داویێ خویا دبیت کو ئەو پەیڤێن جوان یێن قاوونی نینە بەلکو لجەم کچا خوشکا خوە (نینۆ سارین)ێ دهینیت، سەلیم بەرەکات د ئەڤێ رۆمانی دا کۆمەلەکێ ژ شعرێن نینۆ بەحس دکەت، کو جوانترین پەیڤن هاتینە گوتن. ئەڤە ژی بەلگەیەکا دیکەیە کو چەندین پەیڤ و سترانێن کوردان هاتینە گۆتن و بەرزەبووینە، یان ژی خەلکێ بۆ خوە برینە، یان ب ئاشکرایی دزینە، دەمێ هەردوو مێڤان ژ گوندێ سۆرا دەردچن سوارەکی دبینن ب سەروسیما دزانن کو ئەڤە سەربەستە مێرێ (نینۆ سارین)ێ کو نچیرڤانەکێ بناڤودنگێ دەڤەرێ بوویە و، گەلەک شاخێن پەزکویڤیێن ئەوی کۆشتین خەلکی ب سەرەدەرکێن مالێن خوەڤەکربوون.

جارەکا دن سەلیم دزڤریتە سەر ردوشا هەر پێنج هەڤالان ل مالا (کەریم پیرخان)ی ل خاکا سیدرۆک و، زەلامێن شاهی دگەهنە گوندی و زۆر ب هویر و کویری

بەحسا ڤەدیتنا ئەوا دکەت، و ئەو ئاریشە و کێشەیێن دناڤبەرا هەردوو ئالیان دا دروست بووین، هەتا دگەهتە ئەوێ رادەیێ کو هەر پێنج مێڤان دگەل کەریم و هەردوو کوڕێن وی دکەڤنە بەر دەستەرێژیا زەلامێن شاهی و کۆتاییەکا بێوەغەر دهێتە رێکا وان هەرودکو کۆتاییا هاتنا کۆمارا مهاباد چاخێ پیلان دژی هاتینە گێران و ژناڤچووی.

ئەڤ رۆمانە بەلگەیەکا کۆمانبرە کو (سەلیم بەرکات)ی، دۆزا گەلێ خوە کریە تایبەتمەندیەکا هەرە رەسەن دناڤ بۆچوونێن مرۆڤایەتیێ دا، چونکە ئەو وەکو مرۆڤ هزر دکەت و داهێنانێن خوە ژی هەر لسەر ئەڤێ سەلیقێ دادرێژیت کو بنیادێ تێکستێن خوە وەسا پڕ خەیال و ئەندێشەیەکا تێکەل و تەڤلیهەڤدا دگەل کەتوارەکێ دەستنیشان دکەت کو شوین و زەمەن دبنە پرتێن کەسایەتییێن شاکارێن وی.

هەر لسەر ئەڤێ بیروڕاییێ، ب تشتەکێ فەر دزانم، کو یەک ژ نڤیسینێن سەلیمی دڤێرەدا تۆمار بکەم، ئەوا د گۆڤارا (دوگر- Dugir)دا بەلاڤ کربوو، هەژمار (٥) ئادارا سالا (١٩٩٧)ێ، کو ل سویدێ دەردچیت و ل رووپەلێن (١٠-١٣)دا جهێ خوە گرتی:

## سەرپێهاتیا بێکەسێ تێلۆ

**سەلیم بەرەکات**

ناڤێ وی بێکەسێ تێلۆیە. ئەو ژی مینا هەر زارۆکەکی دیتر، دچاڤێن دێ و باڤێ خوە دە کارەغەزالێ پێشەرۆژێ بوو. دچە دبستانێ. دبستانا سەرەتایی کو تاکر و بەر ب یا ناڤین دە فریا. وەک هەسپێ جریدێ ئەڤ قۆناغ ژێ بری دا کو بگهێژە خوەندنا لیسەیێ. دو قۆناغێن زانستێ ب داوی ئانین، تشتەکی پڕ هندک مابوو، کۆ ئەو ژی ب قاسی وێ شیانا پێوستا کۆ وی بگهینە خوەندنگەها بلند؛ ئا ل پایتەختا وەلاتێ وی یێ عەرەبی بوو. لێ بەلێ خەونێن وی یێن وێ چاخێ یێن ناڤنەتەوەیی، قوبلەنامەیا دلێ وی بەر ب پایتەختا کۆ وێ دەمێ پایتەختا نیڤێ جیهانێ بوو، ڤەکرن: مۆسکۆڤا. دێ بچە مۆسکۆڤایێ. بالەفر دزانن چاوان د ئەسمانێ ناسکری دە، د وێ خێزا کۆ ژ چەند کەڤانان پێک تێ کۆ ئیستەگەهێن رێچا شینێ، بەر ب مۆسکۆڤایێ دە بچن.

نە خوە، گەرەک، جلووبەرگنە پاقژ و ئالاڤنە گوهداریێ کۆ ل وێ دەرێ ل بازاران نینن و تووتنەکە ئەمەریکانی پەیدا بکە، ژ جهەکی دوور تێ، تو کەسی ژێ نەپرسی و نەژی تو کەس لێ گەریا، چونکی خوەندەڤانە دێمەک پاراستییە، و هلبژارتنا مۆسکۆڤایێ بخوە، ژ بۆیی وەرگرتنا زانینێ، پاراستنێ خورتتر دکە، بەشداریا گیان بۆ «مادیبیەتێ»یە. دە ئەم هەرن جەم پارتیا هەرێمێ، جەم نوونەرێ جیگرێ کۆمیتەیا هەرێمێ وسا ل گۆری بەلاڤۆکێن ئۆکتۆبەرێ؛ مەها ئازادیا نوو.

پارتی دکارە ژ بێکەس رە ل سەر لیستەیا خوە بووسەکێ پەیدا بکە، لێ پەیداکرنا پاسەپۆرتەکێ چەتینە: ها ڤا شکەستنا خورتا پێشین ل ڤر دەست پێ دکە، نژادا بنەعێلا وی یا کۆ ل باژارنە دووری دلێ وەلێت دژی، تو جاری نەدرامیا کۆ دێ رۆژەکێ ژ رۆژان حەوجەداری پاسەپۆرتەکێ ببن. دوورترین جی ژ بۆ وان گوندێن کۆ ل بەر دەستێ ئالاڤێن ڤەگوهەستنێ بوون؛ لگۆر قۆناغێن خوە: کەر، ڤانتر، عەرەبانە، کەمیۆن... هد. لێ ل سەر رێچا مۆسکۆڤایێ گر و چیا و گۆل و دەریا پەیدا دبن.

بەرێ ژبۆ نژادا بێکەس دژواریا رێویتیا سالەکێ، وەک نموونە، دکاریبوو ب ئاوایێ خوە ئامادەکرنێ، هنەکی سڤک ببە؛ هەتانی کۆ مرۆڤ لاواز و ژ سەقەم و گەرمێ چەرم قەمری ژی بگهیشتا. لێ سەر رێچا مۆسکۆڤایێ سینۆرێن وەلاتان هەنە، پاسڤان و نەوبەتدارێن بەژ و دەریا و ئەسمان هەنە، ژ بۆ دەرباسبوونا د وان دەریان رە کاغەزێن ب موهران موهرکری و بەلگەیێن فەرمی پێویستن.

هیڤی نەهات برین. د هەر یاسایێ دە کونەک ژ بۆ ب دزی لێزیڤراندنێ هەیە. بێکەس بێ پاسەپۆرتە چنکی د ستوونەکە تایبەتی دە، ژ ستوونێن دەفتەرێن دەولەتێ «مەکتوم» هاتیە نڤیساندن، ئەڤ پەیڤ ژی کورتکرنا نەهێنی یا هەڤۆکەکە رەوانبێژە: «ل دائیرەئێن نفووسێ نە مووسەجەلە»، ئانگو: تونەبوونا بەلگەیا یاسایی یا برانا (بورهانا) هەموەلاتییە. دێمەک، چ بران ل سەر هەبوونا بێکەس نینە ژ بلی بەلگەنامەیا موختارێ تاخێ، ئەڤ بەلگەنامەیا کۆ خوە بچرینە نکارە ژێ رە ژبلی کاغەزا «ئیخراج قەیدێ» یا کو جی و رۆژچێبوونا وی دەستنیشان دکە، ب دەستخینە. نە خەمە.

مۆسکۆڤایێ ل بەر دەستە، بێکەس ژی ژ خوە دژی، دێمەک دێ خوە ژ کونا جی، ل جی بزڤرینە. دە ئەم بەرێ خوە بدن بەیرووتێ. هوون پاسەپۆرتەکێ دخوازن؟ هێسانە. فەرموو: پاسەپۆرتەکا بورگاری نیڤ نازک، سەختە لێ ب زیرەکی، دگەل تەمبینامەیەکێ ژ پارتییێ. دە بەر ب رێچا ئاسمان دە، دێ بێکەس بفیرە.

مۆسکۆڤایێ یا وی یە. کوردە و پاسپۆرتا وی بولگاری

یە. تو کەس ب هووربینی ل سەر ڤێ پرسگرێکێ رانەوەستیایە: بێکەس ب پیرۆزیا ناڤنەتەوەیبوونێ هاتیە نخوماندن، ئانها ل خەینێ خوەندەڤانێن نژاد یەکبوویی دەمینە، خوەندەڤانێن کو دێ دەرفەتنە، کو قەت نەما جارەکە دی دوبارە دبن، ب دەست وان بکەڤن، دێ کەچێن پۆر زەر ب هێسانی و ل بن پەرێن دلۆڤانیا چینی راکشینێ زەڤییێن نەڤینێ. لێ بێکەس، وەک گەلەکێن دیتر، کێفا وی ژ دلبژاندنێن سەربەردایی و وسا هێسان رە نایێ، چونکی گرێدانا دلێ وی ب ژنێ ڤە گەرەکی پێکرێدانا «پیرۆزمەندی» و «قەدەغە کرنا» کو ل وێ دەرێ یە، ل بەر دەرگەهێن دلبژاندنێ، تێکچوونە.

ها ڤایە، نە خوە بێکەس مێیا خوە دیت. کەچەکا قوبروسی یە، شیارە، چەتنە، د خوەشی و نەخوەشیێ دە ل سەر کو سرا خوە پێشکێشی مێرەکی تەنێ بکە هاتیە ب شیر ڤەکرن؛ هەتانی کو بلالووک ل سەر بێڤلان و ل پاش گوهان خویانی بکن، ئانگو هەتانی پرێتیا دوور و کوور. دەمەکێ هەڤالتیا وێ کر، پشت رە ئەو ژ خوە رە کر ژن. هێ ل مۆسکۆڤایێ ل سەر روونشتەکێن خوەندنێ بوون، لاوەک ژێ رە ئانی، ژ بۆ ب ناڤکرنا وی هەڤدوو راکشاندن. وێ ناڤێ وی کر «ڤالانتینۆ» (ئەڤینباز و دلدار و مەهرەبانێ ماچان)، بێکەس ژێ ناڤی وی کر «جاندا». دایکێ کورێ خوە دانی مالا باڤێ خوە، ل قوبروسێ، و ڤەگەریا پاسپۆرتا مێرێ خوەیێ خوەندەڤان، و ب زانستێن کیمیایێ و ئامادەکرنا دەرمانان مژوول بوو، بێکەس ژ سەربەردایی ب زانستێن داهێنانا تەلەڤزیۆنی مژوول دبوو، هەمی بهەریا خوە ژ بۆ پێکانینا فلمەکی ل سەر هەلبەستڤانێ کوردێ بێمیناک «جەگەرخوێن» تەرخانەکر. جەگەرخوین هەلبەستڤانێ ناهەنگێن کوردان، تو سترانەکا کوردی نکارە خوە ژ پەیڤێن وی بێن سادە، مشت گری، مشت شادی، هێسان، بێن ل سەر هەمی زمانان، رزگار بکە، لێ بەلێ پەیڤێن وی بێن دیتر ژێ ل هەڤدوو دگەرێن، پەیڤێن وی بێن نەهێنی، پەیڤێن جەگەر خوینێ شۆرەشگێر، پەیڤێن جەگەرخوینێ چینپەرەست، پەیڤێن جەگەرخوینێ کو باوەریا وی ب چارەنووسێن گەلان و ب خوەشیا پشتی پەڤچوونان، دهات هەڤالێ نازم حکمەت و پول ئەلوارد و ئاراگۆنە. ژیانا خوە، وەک «مەلایەکی» مسلمانی زانا، شیرەتڤان، مامۆستایێ خوەندن و بلێڤکرنێ، ب ئەزموونەیێن هشیارێ، دەست پێ کر، و ژنشکێڤە پشتا خوە دا شاشک وجوبەیا خوە، و ل بن پەرێن رێبازا مادی بوو رێبەرێ برایەتیا مرۆڤایەتیێ، دژمنێن وی پر دبوون، دکانداران نەما تشت دفرۆتنێ و سلاڤا وی نەما ڤەدگەراندن. لێ بەلێ هەلبەستێن وی بێن ئەڤینداریێ تو جاری ژ «محرابا» سترانێ قوتنەبوونە: «ئەز کەڤۆکم، کەڤۆکا رەشم، ل سەر بانا..» ژبۆ کوردان دبە چاڤکانیا یەکەمینا سلۆگانان: «ئەز کوردم، بەژن بلندم..»، «ئەز سۆرم». پێشی مۆسکۆڤایێ ب دلشادی وەک سەرگۆمگەهێ هلبژارت، پشت رە بەرێ خوە دا سوێدێ، هەتانی مرنا خوە ب دەستپاکی خەونا ڤلادیمیر ئیلیچ لێنین دپاراست.

بێکەس لگەل کامێرا یا خوە یا سینەمایی بەرێ خوە دا «جەگەر خوین» ل هاودۆر ماسەیا وی، پێنووسێن وی، کاغەزێن وی، دەنگێ وی، وێنەیێ وی، دگەریا. ل ژێر سیبەرا زلامێ گرسی خوەشک چوون و هاتنا ل بەخچە ژێ ژبیر نەکربوو. زلامێ کو ئەگەر کەچێن وی ب جلێن خوە بێن کن ل کۆلانێ دیار ببوونا، کورد و رەشێن باڤێن خوە ژ سەر هشێ خوە دچوون. هاڤایە، مەبەستا من بێکەسە، داویا داوی سەرەنجاما خەباتا وی بەلگە کاسێتەکە، کو پشترە دێ ل سەر جامێن قالندێن تەلەڤزیۆنان ل مۆسکۆڤایێ و ل هن وەلاتێن ئەورووپایێ، وەک سلاڤەکە بێدەنگ، هەر کۆملەتەکی ب کێفخوەشیێ کەرخی بیێن بیرا خوە، بێ وەشاندن.

خوەندن ب داوی هات، بێکەس و ژنا خوە تێرا خوە زانین وەرگرتن، لێ دێ بێکەس ڤەگەرە کوودەرێ؟ پاسپۆرتا وی یا کو «سۆسیالیزمێ» چاڤێ خوە ژێ گرتبوو، ل وەلاتەکی دیتر ب هێسانی د کارە بێ ناسکرن. «ژنێ! دە بەری من هەر وەلاتێ خوە و چارەیەکێ بکە» ژ ژنا خوە رە گۆت. ژنا بمژنزراڤ و پەیڤ لەزۆک بەری وی چوو. مزگینی ژێ رە هات: دێ قوبروسێ پێشوازیا وی وەک مێڤان ل جەم ژنا وی، بکە. جارجاران، پێدڤی و ئەرکێن مرۆڤایەتیێ ب ئاواکی بێمیناک زەلالن، ب تایبەتی ئەگەر گێولێ «وەزارەتا هوندر» یا وەلاتەکی بخوازە.

بێکەس رێچا دەرکەتنێ ژ خوە رە پەیداکر- ئانگۆ نەو پاسپۆرتا کو ژ کاغەزەکێ پێک تێ و رێ دەدە دەرکەتنا بێڤەگەرم. نە خەمە. بێکەس ل بالەفرخانەیا لارنەکایێ پەیا بوو. ژنا وی و کورێ وی ئەو وەرگرتن و ب هەڤ رە ل نیقۆسیا یا چەلەنگ بەرێ خوە دان «هێلینا مالباتی». نیقۆسیا پایەدارو بازارێ داوین یێ دابەشکری د هەرێمێن نژادا مرۆڤی دە. هەمی گهشتێ هەڤ، سەر سەران و سەرچاڤان، لێ ئانها گەرەک جڤانا لگەل کار بێ نژاندن. زانستێن بکارئانینا کامێرایا سینەمایی دلەرزن. ل قوبروسێ یێن کو ئالاڤێن ڤەگوهەستنا وێنەکێشانا ب بزاڤ، هلدگرن، پرن هەڤبەشەکی وەک

بێکەس وسا بێبەلگە و کۆ ژ نشکێڤە هاتیە، دێ چما ژ وان رە گەرەک بە؟ دەرفەت نینە. بێکەس ب یەونانی و رووسی و عەرەبی و کوردی پڕ باش د پەیڤە، و ب ئنگلیزی چنڤنێ دکە و چار گۆتنێن فرانسی و دو گۆتنێن ئەلەمانی و ب ئیتالی ژی «رۆژباش» دزانە. لێ، درفەت نینە. نەخوە کا ئەم هەڕن ل کارخانەیێن کۆ ل سەر ڤان تخووبان بەلاڤبوونە بپرسن، کا ئەم هەڕن ژ فرۆشگەهان و ژ عەنبارێن فرۆتنێ بپرسن؛ کا ئەم هەڕن ل وان دەڤەرێن کۆ کارکەرێن گەلێن رەخێ رۆژهلاتی دەریا سپی ب دزی و بێ فەرمان دخەبتن، بپرسن. لێ بەلێ بێکەس ژ بەر مافێ روونشتنا خوە یا پیرۆز ئەگەر کار ببینە دکارە مافێ کار ب هێسانی وەرگرە، ل ڤر دناڤبەرا رەوشا وی و رەوشا وان کارکەرێن «نەقانوونی» دە جهێوازیەکە مەزن هەیە؛ کارکەرێن کۆ هەر پێنج شەشەک بە هەڤ رە خانیەکی کەڤنی هەرفی ل سەر «سنۆرێ کەسک» کۆ چەپەرێن پاسڤانان ل باکوور و ل باشوور ژ هەڤ جهێ دکە، کارێ دکن. گەرەک ل ڤر، گەرەک ل ور، و گەرەکی ژ تونەبوونێ چێتر ل کارخانەیەکە بۆیاغێ کۆ نە شەروال و نەژی کۆملەک ژ وان دفلتن، و دەمژمێرێن ب هەڤو دووڤە گرێدایی ژسبەهێ هەتانی ئێڤارێ و هلگرتنا بەرمیلان بەر ب ئالاڤێن تەڤلهەڤکرنێ دە هیڤی نینە. سالەک، دوسال، سێ سال، چار، پێنج، هەیواخ ل وندابوونا دەما وەرگرتنا زانستیێن مۆسکۆڤایێ!!.

بێکەس بڕیار دا کۆ ڤێ رێچا خوارا «قەدەرا مادی» هنەکی سەرراست بکە. رووس، پشتی تێکچوونا سستێمان، ب ئاواکی پڕ بالکێش تێن قوبروسێ، کۆمپانی، فرۆشکار، ژنێن خوەفرۆش، دیلانگەرین، مافیا. نەخوە دەرفەتا کار ل بەر بێکەس فرەهتر دبە رۆژنامە راگەهاندنان بەلاڤ دکن و ب لاڤلاڤ وەرگێرێن کۆ یەونانی و رووسی دزانن، دخوازن. کۆمپانیێن سەیرانێ ژ دایک دبن و دتەقن، وەک تەقینا دانیشتوویی یا ل ئافریکایێ کۆ ل ور، ب برچیبوونێ و ب مرنا ژ برچیبوونێ چارەسەر دبە.

دێ بێکەس لگەل چار زمانان بەرێ خوە بدە وان. دێ ب رووسی لگۆر رەسەنیا پووشکین و رەوانبێژیا بلندگۆیێن سۆڤیێتان و دەڤۆکا هاشکرنا دەرڤەیی ب زمانێ شێرنۆمەردین ب وان رە بپەیڤە. دێ ل ڤر کی مێڤانێن وە بن؟ ما عەرەبن؟ فەرمۆ ڤا عەرەبیا من ژی یا ب رێزمان و یا بێرێزمان، فەرمۆ دەڤۆکێن باشوور، و رۆژهلات و هن ژ دەڤۆکێن رۆرئاڤا ژی. و ژبۆ کەسێن کۆ ب یەونانی دیەیڤن بێکەس خاوەنێ ئاقلێ بەرخوەدانا ئانالیزا بەرێز کۆستا ئافیگالۆ یا د رۆژینا «گیتیرۆس»

دە یە.

کارمەندێن کۆ پسپۆریا وان ب ڤان هەردوو زمانان گرێداییە، د جی دە بخێرهاتنا بێکەس دکن، داخوازا مە تۆ یی، پشتی بخێرهاتنێ، شێوەیێ زمان و ئاخفتنێ تێت گوهەرتن، تێت گوهەرتن دا کو هێژایی رەوشا کۆمپانیان بە: معاشەکی هندک، لێ سەرێ هەر بکرەکی (زبوون، کوند) ژی تشتەک ژێ رە دمینە. باشە، پێویستە بێکەس خوە ژ بۆیاغ تەربەنتینێ رزگار بکە. پێویستە ئیجا کەرەفێتەکێ و چاکێتەکی خوەشک و شەروالەکی ئووتیکری ل خوە بکە. دێ کوڕێ وی مت و مات لێ تەماشە بکە و ببێژە: «تو یێ ب جلێن پاقژ بچی کار؟» ئەرێ دێ بێکەس ب جلێن پاقژ بچە و دێ بەژنا وی یا درێژ درێژتر ببە. لێ بەلێ دڤی کاری دە؛ کارێ کو بێکەس دێ سەرێ هەر بکرەکی پەرانا ب دەستخینە، ژ بلی چەند رۆژان نادۆمینە. تەڤ دەرەو و خاپاندنە. شارەزاییا رووسان رێ نادە بێکەس کو سوودەکێ ژ بکڕان قەزەنج بکە. نا، پێلەوانن. باشە، کۆمپانیێن مەزنتر هەنە، د ئانۆنسا مەزن دە ب پایەداریەکە ئەشکەرە ژ دایک دبن. لێ ژ دل ژێ رە دبێژن: کاغەزێن داخوازا کاربین، دگەل کاغەزێن پیشە و زیرەکیان، دگەل کاغەزێن جیگەهێ پەروەرەبوونێ، دگەل بێن هەبوونا تە، ئانوهایی و پاشرۆژا تە، و بێن باشبوونا رابوون و روونشتا تە، بەلگەیا روونشتنا خوە یا قانوونی، و بەلگەیا ژنئانینێ، و مادام تو بیانی یی تکا یە تو یێ کۆپیەکێ ژ پاسپۆرتا خوە ژی بینی.

هەمی داخوازێن وان دکارن ب ئاواکی ژ ئاوایان پەیدا بن، لێبەلێ کۆپیا پاسپۆرتێ؟ هەی هاوار!

ماتو بێ پاسپۆرتی؟ تو چاوان دەرباسی ڤی وەلاتی بوویی؟ تو چاوان ژ وەلاتێ خوە دەرچوویی؟ چ؟ تو بێ هەموەلاتی یی؟!!!؟!!! تە ل مۆسکۆڤایێ خوەندیە؟ نا. ل مە نەگر، داخوازنامەیا تە نایێ پەژراندن.

بێکەس بۆیاغ ل پاش خوە هشت. پەیمانەک ب کۆمپانیەکێ رە ئیمزە کربوو لێ ئەو خاپاندن، دەست ڤالا دەرکەت. ڤا ژ نوو ڤە ل ئانۆنسان دگرە. بێهیڤی دبە، بەرێ خوە ددە بایلۆزخانەیا وەلاتێ خوە: «ئەز دخوازم مرۆڤێن خوە ببینم». ژێ پرسی: «تو چاوان ژ وەلات دەرکەتی، مادەم تە مافێ دەرکەتنێ وەرنەگرتیە تو نکاری مافێ ڤەگەرێ ژی وەرگری».

وەختا کۆ من رۆمانا خوە «هۆزانێن تارستانێ» یا کۆ د سالا (١٩٨٥) ئان هاتیە وەشاندن، نڤیساندبوو، من ناڤێ بێکەس ژبۆ قەهرەمانێ وێ هلبژارتبوو، بێکەس ناڤەکی کوردی یی ناڤدار و ناسکری یە، لێ بەلێ وێ

وەختێ ئەز پێرگی تو کەسی نەببووم کۆ ب راستی ناڤێ
وی بێکەس بە، هەتانی کو ئەز راستی کریڤێ خوە یێ کۆ
ب دەه سالان ژ من بچووکتره بێکەسێ تێلۆ، هاتم.
بێکەس ژی پرسگرێکە کە دیتره، پرسگرێکەکە کۆ
پالپشتا وێ پرسگرێکا قەدەریانەیە یا کۆ من د
«هۆزانێن تارستانێ» دە ژبۆ کوردەکی ب کارئانیبوو.
جارجاران دانێ سبێ، بێسۆز تێ جەم من، پێویست ناکە
کۆ من ئاگاهدار بکە، چنکی ژ دو سالان و ڤر دە ئەز
بخوە سەرۆکێ یێن بێکارم. ژ مالێ دەرناکەڤم. هەر ل
مەتڤەخێ روودنێم و ب سێ تشتان مژوول دبم: زانستێن
ڤەگۆتنێ و ئانگۆیان، و کاغەزنە سپی ژبۆ ب دەسخستنا
بوهایێ کرینا نێن، و فەرهەنگنە خوارنچێکرنێ دا کۆ ل
سەر ئاگرێ وان خێزنە ژ خوارنێ بۆ ژن و کورێ خوە
ئامادە بکەم.

چفتەیا من یا نێچیرێ ژی ل تەنشتا منە. ژ پەنجەرەیا
مەتڤەخێ نێچیرا بالەندەیێن کۆ ل سەر دارێن
میوبورۆسێ داتینن، دکم. ما گەلۆ کەسێن تەنک دێ ژ
من بغەیدن؟ ما گەلۆ هەلبەستا تەنک یا کۆ شاهیا ڤێ
گەردوونێ تەنکە دێ ژمن تۆرە ببە.

هەسرەتا هەر چووکێ کۆ د ڤێ ناڤچەیێ رە، ب
بلنداهی بفرە ئەوە: کۆ چاوان نەکەتیە ناڤ دەستێ من.
ئەڤ بالەندە، سەعەت دەهێ سبەهێ، دبن زمێن دە پڕ
خوەشە، کرتەکرتا هەستیێن وی، ب خوەشی، دناڤ
درانێن کورسیان دە، پڕ خوەشە.

* * *

ئەڤ نڤیسینا سلال تێکهەلیەکا روحیە دناڤبەرا یەک
ژ رۆمانێن (سەلیم)ی و سەرپێهاتیەکا راستەقینە، کو
نیشانا ئەوێ هندێ یە، کا چەند ناڤ رویدان و
کەسایەتیا مرۆڤی کورددا چوویە خوارێ و، چاوا خوە
داهێلایە دناڤ کویراتیا خەم و ژان و کەسەر و خەونێن
وان دا.

دمینیت بێژم کو ئەڤ دەقا ل سلال من ژ پیتێن
ئەلفابێیا کوردی ب رێنڤیسا لاتینی ڤەگواستیە سەر
رێنڤیسا کوردی یا ئیرۆ لجەم مە دهێتە بکارهینان، لێ
بەلێ من باوەڕ نەدکر کو سەلیم دکاریت ب کوردیەکا
هۆسا رەوان بنڤیسیت ژی. لێ دەما بەری دوو سالان من
هێژا محەمەد عەفیف حوسەینی دیتی و، مەبەحسا
سەلیم دکر، ئەوی گوتن ئەو نڤیسین ژ ئالیێ رێزمان و
رێنڤیسێ ڤە ژ ئالیێ مە ڤە هاتیە راستکرن. ئەڤە ژی
سەرەتایەکا دی یە کو سەرنجا من راکێشای، من دڤێت
هێشتا (سەلیم بەرەکات)ی ڤەخوینم و ل سەر وی ژی
بنڤیسم.

# بنەماکانی مۆدێرنیتە و تیۆری سوژە

د. عەتا هودەشتیان
و/ لە فارسییەوە: ڕەسووڵ سوڵتانی
(بۆکان)

١- ئەدەبیاتی ئێرانی: لەسەر چەمکی مۆدێرنیتە ساوا و تاڕادەیەکیش کرچ و کاڵە. یەکەم کەم و کورییەکەی ئەوەیە کە ئەوئەدەبیاتە زیاتر؛ ڕاڤەکارە؛ نەک ڕەخنەگرانە لە هەرجێیەکیش دەستی بۆ ڕەخنە بردبێ زیاتر تا ڕادەی پێناسەیەکی گشتی یا دروشم خۆی چووک کردۆتەوە. لە حاڵێکدا، بۆ ئێمە کە ددرەوەڕا، لە ڕۆژئاوا دەڕوانین بەپێی دەستوور، دەبا توانیبامان ددوڵەمەندتر و قووڵتر لە خودی ڕۆژئاواییەکان لێی وردبینەوە و ناسیاری لێ وددەست بێنین؛ ڕاست ئەو کارەی ڕۆژئاواییەکان دەگەڵ ئێمەیان کرد و پێناسەیەکی پوختەتر لەخۆمانیان، لە ئەددبیات، هونەر، کەونینەناسی، مێژوو، فەلسەفەکەمان کۆکردەوە و دایان بەخۆمان و دیترانیش.

کەواتە، وادیارە ئەو ڕاستییەی دەڵێ: «باشترین ڕوانین- لەمەوداوە ڕوانینە» بۆ ئێمە نەهاتووە. ئەو هەموو پاش زاڵبوونی «ڕۆژهەڵاتناسی» ئێمە هەر نەمانتوانی «ڕۆژئاواناسی» لەناو خۆماندا بکەینە باو.

لەوانەیە هۆکارەکەشی سادەبێ. ڕۆژهەڵاتناسیی لەلایەن ڕۆژئاواوە و بە ئەنگیزەی ناسینی ڕۆژهەڵات و داگیرکردن و زاڵبوون بەسەریدا، بەڕێوەچووە، ئەویش بەپێی ئەو فەلسەفە بنچینەییەی کە «بۆزاڵبوون» ناسین پێویستە و هەر چەشنە ناسینێک دەتوانی «زاڵبوونی» بەدواوە بێ، بەڵام ئێمە ئەو کەڵکەڵەیەمان هەر نەبوو. چونکە نە لە بنچینەی وەها ناسینێک دەگەیشتین و نە پێویستیمان بە ناسینێک بوو کە زاڵبوونی بە دواوە بێ.

بە واتایەکی تر، ئێمە هیچ تێڕوانین و پێناسەیەکی ئەوتۆمان لە خۆمان نەبوو و نیمانە، مەگەر لە پێوەندی دەگەڵ ڕۆژئاوا. پێناسەمان لەسەرخۆمان دەست تێوەردراو و چەشنێک ئالوودەی ڕوانگەی ڕۆژئاواییەکانە. هەڵبەت ناکرێ بڵێی بۆ خۆمان دەکرا و دەمانتوانی ئەو کارە بکەین، ئێمە لێرەدا ، لەخۆوە، لە فەلسەفەی هەمیشەیی «شوناس» کەڵکمان وەرگرتووە کە بریتییە لەوەی: کە هیچ پێناسەیەک بۆ «خود» لە ئارادا نییە مەگەر لە پێوەندی دەگەڵ «ئەویتر» یا دیتران.

٢- لە چوارچێوەی ئەدەبیاتی مۆدێرنیتە لە ئێراندا، لەوانەیە کۆمەڵە بەرهەمی بڵاوکراوە لە ماوەی (٢٠)ساڵی ڕابردوودا؛ بەرهەمی «بابەک ئەحمەدی» لەژێر ناوی «مۆدێرنیتە و بیرۆکەی ڕەخنەگرانە» باشترین و بە بایەخترینیان بێ. بە هەبوونی ئەو بەرهەمە، ئێمە زیاتر لەنیو سەدە پاش «محەمەد عەلی فرووغی» و چەند«دەیە» پاش «مەحموود هوومەن» دیسان بینەری تێکۆشانێکی جیددیین بۆ ناسینێکی بێ خەوش، قووڵ و یەکدەست، بەڵام ڕاڤەکار لەسەر فەلسەفەی ڕۆژئاوا.

لەوەدا سێ خاڵی سەرنجڕاکێش هەن:

یەکەم ئەوەیە کە بەرهەمەکەی «بابەک ئەحمەدی» بە هەموو بەهێزی و سەرکەوتووییەوە، زیاتر لە تاوتوێکردنێکی مێژوویی گۆڕانکاری، فەلسەفەی ڕۆژئاوا دەچێ. دووەم ئەوەیە کە ئەو بەرهەمەش وەک بەرهەمەکەی «محەمەد عەلی فرووغی» بڕێک لە

وەرگێردراو و وەرگیراو دەچێ. سێیەم ئەوەیە کە: ئەوەش وەک دوو بەرهەمەکەی تر فەلسەفییە. کە هەڵبەت ئەو کارە هیچ ئیرادێکی نییە، بەڵام دەبێ بزانین کە فەلسەفە تەنیا بلّندگۆی مۆدێرنیتە نییە و ناکرێ لەو رێیەوە لە ماهیەتی پڕ پێچ و پەنای مۆدێرنیتە، تێبگەین. سەرەنجام ئەوەیە کە هیچ کام لەو بەرهەمە بەنرخانە، لە فرووغی بەولاوە، وەک «کۆ» یەک کە «نما» و وێنای شارستانیەتی رۆژئاوابێ،نەیانتوانیوەتە مۆدێرنیتە..

ئەوان تەنیا لە گۆشەنیگای فەلسەفییەوە ئەم دیاردەیەیان ناساند ئەوەی کە بیرمەندە ئێرانییەکان هەتا ئەمڕۆ کردوویانە: هەر ئەوەبووە کە رۆژئاوایان تەنیا لە رێی رۆژئاواوە؛ یانی بەهۆی بزووتنەوە نێوخۆییەکانیەوە شرۆڤەیان کردووە و نە بەهۆی تێگەیشتن لەو میکانیزمە بنچینەییەی کە وای لە مۆدێرنیتە کرد لە رادەی ژیانی دەروونی خۆیدا نەمێنێتەوە و بێتە پانتایی جوگرافیای دەرەوە و ببێتە شتێکی جیهانی و هەموو گۆی زەوی، بەشێوەیەکی مەسەلە ساز، ناچار بکا تێیدا بژی. کەوایە ئەوەی بەرچاوتان دەکەوێ: کۆی بیرو بۆچوونێکە سەبارەت بە ناسینی مۆدێرنیتە، دیاردەی بە جیهانیبوون و ئێران. «دوو تایبەتمەندیشی تێدایە».

یەکەم ئەوەیە کە: ئەگەرچی لە فەلسەفەوە دەست پێدەکا، بەڵام گەرەکیەتی سنووری لێکدانەوە فەلسەفیە تۆخەکان ببەزێنێ. دووەم ئەوەیە کە: ڕوانینێک لە مۆدێرنیتە دەخاتەڕوو کە: نە تەواو رۆژئاواییە و نە لە سنوورەکانی رۆژئاوا و لێکدانەوەی نێوچوارچێوە دەروونییەکانیدا بەرتەسک دەبێتەوە، بەڵکو، دەر و ژووری رۆژئاوای لەبەرچاوە و پێوەندیی بە ئێمەوە هەیە. یانی بە؛ رۆژهەڵات و بە ئێرانەوە.

### کامە مۆدێرنیتە؟

مۆدێرنیتەکە لە (madernus)ی لاتین وەرگیراوە؛ بڵێین شتێکە وەک (نوێکردنەوەی ئامانج). ئەوە قسەی بیرمەندێکی فەرەنسییە بەناوی «هانری لۆفۆر. کە بە تێڕوانینی ئێمە لانی کەم لە فەرەنسە یەکەم بیرمەندێکە کە خەریکی تاوتوێکردنی مۆدێرنیتە بوو. ئەو کە «نەناسراوە» لە ساڵی (١٩٦٢ز)دا لەپاریس بەرهەمێکی لەو بارەوە بڵاوکردەوە. مۆدێرنیتە لە پێشدا ڕوانینێکی جوانیناسانەی هەیە. هەموو بیردۆزانی رۆژئاوایی لەسەر ئەو رایەن کە کولتووری ئەورووپی لەپێشدا لەجوانناسیدا و دواتر لە ئەدەبیاتدا بوو کە باسی لە مۆدێرنیتەی هێناگۆڕێ. بودلێر: ئەدیبی شوێندانەری فەرەنسی و دواتر ئارتۆر رامبۆ شاعیری بەنێوبانگی ئەو وڵاتە، باسیان لە مۆدێرنیتە کردووە و هەردووکیان مۆدێرنیتەیان وەک چۆنیەتیەکی کاتی و ناپایەدار ناساندووە، بەڵام ئەو ناوە لە پانتایی ئەدەبیاتدا بەخێرایی چووە دەرێ و دەوروبەری ساڵەکانی (١٩٦٠-١٩٧٠) کەش و هەوایەکی نوێی داگرت. بیرمەندان وردە وردە لەنێو، هونەر، شارسازی، بیناسازی و کۆمەڵناسی و مرۆڤناسی، دیرۆک و بەتایبەتی لە فەلسەفەدا، سەبارەت بە مۆدێرنیتە دواون، بەڵام مۆدێرنیتە چۆن چووە ناو ناوەندە هزرییەکانەوە؟

ئەگەر لێی وردبینەوە تێدەگەین کە رۆژئاوا، لەدەیەی (٦٠)ەوە، لە بنچینە و بنەماکانی شارستانیەتی خۆیدا تووشی چەشنێک لە قەیرانی جیددی هات. بەرهەمگەلێکی بەرچاو لەناوەندە فیکرییەکاندا پیشاندەری ئەو قەیرانەن. لە پانتایی کۆمەڵایەتیشدا بزووتنەوەی «نارەزامەندی دەربڕین»ی (٦٨-٦٩) لە وڵاتە پێشەییەکاندا باشتر ئەو دیاردەیە دەردەخات. بەواتایەکی تر: وێدەچێ لەوکاتەوە؛ باس لە مۆدێرنیتە کراوە، کە رۆژئاوا وردە وردە بیری لە قەیرانەکەی، واتە سەردەمی دوای مۆدێرنیتە (پۆست مۆدێرنیتە) کردۆتەوە.

یەکەم بەرهەمەکان لەسەر پۆست مۆدێرنیتە لە دەیەی (٩٧٠ز)وە دەرکەوتن. یانی ئێمە پاش بزووتنەوەی (٩٦٩) شایەتی پرسیار و گومان لە بنەڕەتترین توخمە بنچینەییەکانی شارستانیەتی رۆژئاواییین. لە حاڵێکدا شارستانیەتی مۆدێرنی رۆژئاوا لەسەرەتای سەرهەڵدانەوە. هەوڵی ئەوەی دابوو تا ئازادی بکاتە یاسایی و پاشان بۆی دەکرێ بیکاتە بابەتێکی کۆمەڵایەتی. بزووتنەوەی (٩٦٩) بەشوێن تایبەتکردن و «بەتاککردنی ئەو ئازادییەدا بوو. بەم چەشنە لەو سەردەمە بەم لاوە، چەشنێکی تر لە «تاکخوازی نوێ» لە کۆمەڵگای پیشەییدا سەری هەڵدا و پەرەی سەند کە بە شوێنیدا وردە وردە بەرژەوەندی کۆمەڵ لە بەرژەوەندی تاک جیا بۆوە. سەردەمی ویستی کۆخوازی دامرکایەوە و، هەرچی زیاتر ئازادی بوو بە بابەتێکی «تاک» ئایدۆلۆژییە کۆخوازەکان بایەخ و بەهای خۆیان پتر لەدەستدا، بەڵام ئەوە خۆی پێوەندی بە دەرکەوتنی دیاردەیەکی ترەوە هەبوو. ئێمە لەو سەردەمەدا، ڕاست بە پێچەوانەی سەردەمی پاش «رووناکایی» بینەری لێکجیابوونەوەی رێی نێوان زانست و پیشەسازی لە رێبازی کۆمەڵگا و سیاسەت بووین. ئیتر زانست و ئابووری بۆ بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵی سیاسەت و سیتە

«Cité» نەدەچوونە پێش.

پاش دەیەی (١٩٦٠) بەرهەمی ئابووری و پەرەگرتنی زانستی وردە وردە ڕێگای سەربەخۆ و جیاواز لە یەکتریان گرتە بەر هەر کام وەشوێن وەدەست هێنانی بەرژەوەندی تایبەتیی خۆیان کەوتن. (هەڵبەت بزانین کە توێژەران لە هەموو جێیەک لەسەر ئەوە پێداگربوون کە ئەو گۆڕانکارییانە لە ڕاستیدا وردە وردە لەپاش شەڕی دووەمی جیهانیەوە دەستیان پێکرد.»

ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییانە لە بەرهەمەکانی کۆمەڵناسی ئەمریکی «دانیەل بێل» و فەیلەسووفی ڕادیکاڵی فەرەنسی «فەرانسوا لیوتار»دا خراونەتە بەر باس و لەوێدا کۆمەڵگای نوێ، بەنێوی کۆمەڵگای «پۆست پیشەسازی» یا پۆست مۆدێرن ناودێر کراون. «ئالین تورێن» کۆمەڵناسی میانەڕەوی فەرەنسی بەرلەوەش ناوی نابوو «کۆمەڵگای پیشەسازی» جیابوونەوەی زانست و ئابووری هۆکارەکانی بناغەدارێژی شارستانیەتی ڕۆژئاوا، ناوزەد کراوە، بەڵام بۆچی نارێکی و ناهاوئاهەنگی؟ ئەی هاوئاهەنگی لەکوێدایە؟

دانیەل بێل دەڵێ: کۆمەڵگا مۆدێرنەکان لەسەرەتای ژیاندا خاوەنی چەشنێک هاوئاهەنگی دەروونی بوون. ئەو هاوئاهەنگییە وەدیهێنەری چەشنێک پێوەندی دوو لایەنەی نێوان هۆکارە بناغەدانەرەکانی ئەو کۆمەڵگایانە بوون. نێستا ئەو پێوەندییە دوولایەنییە لەناو چووە و کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان تووشی چەشنێک لە هەڵوەشانی نێوخۆیی هاتوون. دانیەل بێل ناوی: لێکترازان، یا (پچڕان-disjonction) لەسەر ئەو دۆخە تایبەتە دادەنێ کە: پیشاندەری جودایی توخمە دامەزرێنەرەکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا و پێوەندی نارێک و ناهاوسەنگی نێوانیانە. لەو لێکدانەوانە، ئێستا دەکرێ چ شتێ بۆ تێگەیشتن و پێناسەکردنی مۆدێرنیتە کە ئامانجمانە، هەڵکرێنین؟

ئەگەر لێک هەڵوەشانەوەی توخمە بنیاتنەرەکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا یان ناو ناوە «پۆست مۆدێرنیتە». بەپێی قاعیدەی هاوسەنگی دەبێ ناوی مۆدێرنیتەی لێ بنەرێ. لەو بۆچوونە بۆ پێناسەکردنی مۆدێرنیتە بە دووشت دەگەین:

١- مۆدێرنیتە ناسێنەری چاخێکی مێژووییە، یانی تەنیا دەقێکی ئەدەبی نییە، بەڵکو، پیشاندەری شارستانیەتێکە. کەواتە چەمکێکە نە تەنیا فەلسەفی، بەڵکو مێژوویی. ئەگەر وابێ بێ شک ناسێنەری چاخ و سەردەمێکە. بە تێڕوانینی ئێمە مۆدێرنیتە هەر ئەوەیە کە هیگڵ سەدەیەک لەوەوپێش لە لێکۆڵینەوە مێژووییەکەیدا بە دروستی ناوی (چاخی نوێ) یا (چاخی مۆدێرنی) لێنا. ئەو بۆچوونە دەگەڵ ئەوەی هاربرماس فەیلەسووف و کۆمەڵناسی ئەڵمانی (بەدڵنیاییەوە لەژێر کارتێکەری هیگڵدا) ناوی (چەمکی مێژوویی- Concepthistorque) لێنا.

بەم چەشنە ئەو پێی وایە سەرەتای چاخی مۆدێرن لە کۆتایی سەدەکانی ناوینەوە؛ لە دەوروبەری (٩١٧) زاینییەوە دەست پێدەکا. بەواتایەکی تر ئێمە لە بواری جوگرافیای ڕۆژئاواییدا، پاش سەدەکانی ناوین؛ بینەری وەدی هاتنی زنجیرەیەک گۆڕانکاریی نوێ لە زانست و فەلسەفە و ئابووری و هونەر، سیاسەت و مەزهەبدا بووین. کە هەموو شارستانیەتی ڕۆژئاوای لە بنیاتەوە بەشێوەیەکی مێژوویی گۆڕی و سەردەمێکی نوێی بنیات نا کە بە «مۆدێرنیتە» یا «چاخی مۆدێرن» ناوزەد، دەکەین.

٢- لەوەی دانیەل بێل خستیەڕوو، دەکرێ بەو ئاکامە بگەین: کە مۆدێرنیتە خۆی «تەواوە» تێکە (کۆیەکە)، توخمە پێکهێنەرەکانی ئەو لە زانست، فەلسەفە، ئابووری، سیاسەت و مەزهەب، کۆمەڵێکی هاوئاهەنگ پێک دێنن ئەو کۆمەڵە لە چوارچێوەی سنوورێکی تارادەیەک هاودەنگ و یەکگرتوودا دەچنەپێشێ. بە چەشنێک کە دژ بەرییەکی بنچینەیی و بونیادی لەنێوان ئەو توخمانەدا نییە، بەڵکو هەر کام لەوانە وەڵامدەرەوەی ئەوی تر و تارادەیەک کاملکەرەوەی ئەوە. بەواتایەکی تر: شارستانیەتی مۆدێرن وەک «هەموو شارستانیەتەکان»، هەم بەجۆرێک هاوئاهەنگە، هەم چەند لایەن و پڕ لە دژ بەری و خاوەن «هەڵچوون و نیشتنەوە»، بەڵام دژ بەرییە دەروونییەکان بنەمای یەکگرتووی ئەو ناگۆڕن. دوای ئەو پێشەکییە ئێستا کاتی وەی هاتووە کە توێژینەوەکانمان لەسەر بنەماکانی مۆدێرنیتە قووڵتر بکەینەوە.

## بنەماکانی مۆدێرنیتە

کەوایە: دوو تایبەتمەندیی سەرەکی مۆدێرنیتە بریتین لە: «مێژووییبوون» و «تەواودت» بوون: بەڵام ئەو ئوسووڵە بۆ تێگەیشتن لەمۆدێرنیتە، هێشتا بەس نییە، دەتوانرێ بگوترێ کە شارستانیەتە مرۆیی مێژووییەکان، هەموویان خودان ژیانێکی پایدار و هاوئاهەنگییەکی ناوەکی بوون، ئیدی مۆدێرنیتە، چ جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ شارستانییەتەکانی دیکەدا هەیە؟

## تیۆری سوژە و شەش تایبەتمەندییەکەی

جیاوازی بنەڕەتی مۆدێرنیتە و شارستانیەتەکانی تر ئەوە بوو کە پێناسەیەکی نوێ تری لە ئینسان (مرۆڤ) دا دەدەستەوە. چونکە تەعبیری نوێ تر لە مرۆڤ هەبوو. ... یەکی تایبەتیشی بۆ غەیری مرۆڤ یانی سروشت دانا بە تێڕوانینی ئێمە هەر ئەو تایبەتمەندییە: یانی پێناسەیەکی نوێ لە مرۆڤ؛ بناغەی مۆدێرنیتە شرۆڤە دەکا. بەشێوەیەک کە لە پێشدا و لەڕێی تێگەیشتنی دروست وەهەڵسەنگێندرا و لەو پێناسەی دەکرێ لە تایبەتمەندییەکانی مۆدێرنیتە« یانی لە هونەر، سیاسەت، زانست،فەلسەفە، کۆمەڵ و تەنانەت نابووری و تەکنیک» تێ بگەی.

بەڵام ئەو بنەمایە چییە و پێناسەی نوێی مرۆڤ لەسەر چی دامەزراوە؟

مرۆڤ لە نێو شارستانیەتی مۆدێرندا، لە پەراوێزەوە بەرەو ناوەند کێشرا و وەک توخمێکی ناوەند ناسراو لەبەرکارەوە بوو بە بکەری ناسێنەر. مرۆڤێک کە بەرلەوە لە سێبەری ئوستوورە و وەهمدا دەژیا، بوو بە شوێندانەر، خوڵقێنەر و ناسێنەر. ئەوەش ڕاست ئەو شتەیە کە ئەدەبیاتی مۆدێرن لە ڕۆژئاوا نێوی ناوە (سوژە-sujet ـ subject)«لە فارسیدا مانایەکی پڕ بە پێستیان بۆ نەدیوەتەوە، لەوە بەدوا لەو نووسراوەیەدا لەو ناوە کەلک وەردەگرین.

«سوژە» لە ڕۆژئاوا مەبەستی جۆراوجۆری هەیە، زۆرجار ئەو مانایانە بۆ ئەم شتە دەبن کە ئێمە مەبەستمانە. سوژە بە مانای ڕێزمانی ئەو بابەتەیە. بابەتی سەرەکی. سوژەی ئێمەش بابەتێکی سەرەکییە. بەڵام ئەو بابەتە سەرەکییە: بێ ئاگایی و هەروەها لە بواری کردەوەی کۆمەڵایەتیدایە.

گوتمان: سەردەمێک مرۆڤ بوو: بە چەشنێک کە بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی جیهان: بەپێی پشت بەستن بە وەهم و ئوستوورە، پشتی بە زەینی خۆی بەست. سەربەخۆیی سوژە و دەکارکردنی زەین، تایبەتمەندییەکی تایبەتی پێدراوە، هەر بۆیە زۆربەی بیرمەندان، دەرکەوتنی مۆدێرنیتەیان بە هاتنەئارای زەینەتێکی نوێ-(subjectivite_moderne ) لە قەڵەم داوە، هێگڵ بە ڕوونی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، (هایدگەر)یش دۆزینەوەی زەینەتێکی نوێی، بە بنەمای چاخی نوێی ڕۆژئاوا، ناوبردووە.

کەواتە مرۆڤ لە گۆڕانکاری مێژوویی‌یەکاندا، لە پەراوێزڕا هاتە ناوەند. یانی هەر لە بنەڕەتدا، پەراوێز و ناوەندێکی بۆ ئەم بوونی هەیە. دابەشبوون هەیە. کەواتە سوژە لەپێشدا دابەشکەرە جیاکەرەوەیە.ئەم جیاکەرەوەیەش هەمیشە دەگەڵ بەها ڕووبەڕووە، سوژە «بەها» دانەرە. پەراوێز و ناوەندیش لە زەینی ئەودا بەها هەڵگرن و مانای تایبەتییان هەیە. کەواتە سوژە بەردەوام گۆڕانکاری پێک دێنێ. هەموو کارێکی ئەو مانا و ڕێبازێکی هەیە. شوێنێک داگیردەکا و بەرەو ڕێیەکی تایبەتی دەبیا. هەرچی وەبەر تێڕوانینی سوژە بکەوێ، هەر ئەوەندەی کە، کەوتۆتە بەر نەزدی سوژە: دیارە لە پێشدا دابەش کراوە و لێرەدایە کە لە مەنتقێکی تایبەتدا جێی خۆی هەیە. مەنتقی یەک لایەنەی سوژە. لەو مەنتقەدا، ئەو هەرچی سوژە نەبێ ناوی سوژەی لێدەنێ. هەرچی سوژە نەبێ ئۆبژەیە( بەرکار، یا شتەobject ــ objet).

ئەگەر مۆدێرنیتە، مرۆڤ لە دیاردەیەکی ئاساییەوە دەکاتە سوژە، کەواتە بۆ هەرچی بێجگە لە «مرۆڤ»یش دەبێ پێناسەی تایبەتی هەبێ. ئەگەر سوژە بکەرە، غەیرە سوژە کارلێکەر یا بەرکارە. یانی ئەو شتەی سوژە کاری لەسەردەکا. لەبەر چاوی سوژە هەر «ناسوژەیەک» «بەرکارە» و هەر بەرکارێکیش ئۆبژەیە. سروشت بۆ سوژە؛ ئۆبژەیە (ناسوژەیە).

سوژە دەست تێوەدەدەرە. دەست تێوەدەر لە هەرچی ناوی ناوە دۆخی «هێمن و نەگۆڕی» زەمان، مێژوو، کۆمەڵگا. کەواتە سوژە. پێناسەکار و دیاریکەرە. هەر دیاریکردنێکیش لە دابەشکردنەوە ڕا سەرچاوە دەگرێ. سوژەیە دیاری دەکا چ شتێ «هێمن و بێ گۆڕانکارییە» و شارستانە مردووەکان کامانەن. هیگڵ بەو چەشنە مێژووی تاوتوێ کرد. ئەو ڕۆژئاوای مۆدێرنی: بەرەو کامڵبوون و چالاک پێناسەکرد و ڕۆژهەڵاتیش بە پاشەکشەکەر و شارستانیەتەکەشی بە مردوو ناوبرد. (دەگەڕێینەوە سەر ئەم بابەتە).

هەر بە ئەوەندەیە دەکرێ لە زۆرشت بگەین.لەناو ئەو تایبەتمەندیگەلە باس لێکراوەدا بۆچوونێک هەڵدەبژێرین و بەپێی ئەو، شەش تایبەتمەندی سەرەکی «سوژە» تاوتوێ دەکەین.

١- سوژە بکەرێکی ناسکارە: لە ئەورووپا بنەمای ئێوری سوژەیان لە بیروڕاکانی فەیلەسووفی فەرەنسی سەدەی حەڤدە، (ڕۆنی دیکارت)دا دیوەتەوە. گەرچی ئێستا بیروڕاکانی دیکارت ڕەخنەهەڵگرن، بەڵام هێشتا هێندێ کەس بایەخی ئەوتۆ بۆ ڕاوبۆچوونەکانی دادەنێن.

لەلای دیکارت بنەمای تیۆری سوژە لەسەر ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە سوژە لە پێشدا بکەرێکی ناسکارە (نەک کارگەر). دروستبوون و شکڵگرتنی سوژە ئەوەیە کە خۆی حەزی لەوە بوو و هەوڵی دا جیهانی دەوروبەری خۆی و سروشت بناسێ و لە ڕەمز و کلیلی گۆڕانی جیهان بگا.

لەبەر بەرتەسکی ئەم بابەتە؛ لێرەدا ناگونجێ بە تێروتەسەلی باس لە تیۆری دیکارت بکەین، بەڵام تیشک دەخەینە سەر هێندێ لە قوژبنەکانی.

٢- سوژە جیاکەرەوەیە:

خۆی بە «من» و ئەوی دی بە «نامن» ناوەزد دەکا. خۆی بە «من» و ئەوی تر بە «سروشت» ناوزەد دەکا. «کۆ» لێک هەڵدەوەشێنێتەوە. سوژە گەرچی، تەواوەتێکە، بەڵام هەر تەواوەتێک لەلای ئەو لە دابڕان و جیا بوونەوەڕا دەست پێ دەکا.

سوژە پێکهێنەری پێوەندییەکانە. ئەو لە جیابوونەوەدا و لە ڕێگەی ئەوڕا پێوەندیی سازدەکا. ئەو (سوژە) خۆی لە سروشت جیادەکاتەوە، بەڵام ئەو جیابوونەوەیە نە بێ خاسیەتە و نە دوو لایەن، بەڵکو مانادار و یەک لایەنەیە. چوون سوژەیە شتەکانی لێک جیاکردوونەتەوە. هەرکارێک لەبەر ئامانجێک دەکرێ. ئامانجی سەرەکی و مەبەستی مرۆڤ لەدابڕان لە سروشت ئەوەیە کە سروشت بناسێ.

مرۆڤ بۆیە خۆی لە سروشت هەڵداوێرێ تا بتوانێ لەمەوداوە (لە دوورەوە) لێی بڕوانێ و لەو ڕێگایەوە بیناسێ. لەو ڕەوتەدا سروشت دەبێتە بابەتی شناسایی (بەرناس) یانی دەبێتە ئۆبژە (بەرکار). لێرەدا سوژە بابەتی شناسایی خۆی دەکا «شت» یا ئۆبژە. لەوشتەی لە تیۆری «ژێر کاریگەریی دیکارت» دەستت دەکەوێ. یەکەمیان ئەوەیە کە یەکەم ڕێگای ناسینی سروشت بۆ سوژە، «بەشتکردنی» سروشتە، بەڵام دەبێ بزانین پرۆسەی «بەشتبوون»ی سروشت لە بنەمادا، لە زەیندا شکڵ دەگرێ بنەمای فەلسەفەی مۆدێرنیتە ئەوەیە کە هەر شتێ ببێتە بابەتی شناسایی (بەرناس) یەکەمجار لە پێشدا لە زەیندا دەبێتە «شت» یا ئۆبژە.

٣- کەواتە، ڕەوتی بە «شتکردن»ی سروشت ڕەوتی سەرەکی ژیانی سوژەیە. بنەمای بوونی سوژە لە دابڕان و «بەشتکردن»ی «ناخود»ەوەیە. سوژە دەگەڵ هەرچی «ناخود»ەد ڕووبەڕوو دەبێتەوە. سروشت شتێکی جیا لەسوژەیە. تەنیا لە ڕێگای بەشتبوونەوەیە دەبێتە بابەتی «شناسایی زانستی»، بەڵام لەنیزامی مۆدێرندا کاری سوژە تەنیا ناساندنی ئۆبژە نییە. هەر چەشنە ناساندنێکی زانستی کە لەلایەن سوژەوە پێک دێ، دەبێتە هۆی زاڵبوونی سوژە بەسەر ئۆبژە و مرۆڤ بەسەر سروشتدا. کەواتە ناساندن، بەشتکردن و زاڵبوون پێوەندیی ڕاستەوخۆیان پێکەوە هەیە.

٤- سوژە هەمیشە هەژموونی خۆی دەچەسپێنێ:

لە هەر شوێنێ کاری ناسین بێتە هۆی زاڵبوون؛ سوژە وەک بکەری شناسایی (ناسکار) خۆی دەردەخا. لەو دۆخەدا باری بەرکاربوونی سروشت زیاتر بەسەر «شتبوون»دکەی، لە چاودەدا، بەڵام سوژە وەک بکەری ناسکار چ مانایەکی هەیە؟ ئەوە هەر ئەو سوژە ناسکارەیە کە لەوەپێش گوترا، دیکارت لەبەرهەمەکەی خۆی (تێفکرینێک لە میتافیزیک)دا ئاماژەی پێدەکا. ئەو سوژەیە لە ڕێگای گومانکردن لە زانیارییەکانی پێشوو دەست دەکا بە پرۆسەی ناسین، بەڵام لێرەدا زاڵبوون چ مانایەکی هەیە؟؟

بنەمای تیۆری (ناسین - زاڵبوون) ئەوەیە کە، بۆ دەکارکردنی سروشت دەبێ بیناسی بۆ ناسینیش دەبێ بەسەریدا زاڵ بی. ئەو وتە بەنێوبانگە، قسەی فەیلەسووفی ئینگلیزی فەرانسیس بیکۆن، کە گوتوویەتی و ئێستاش بیانووی سەرەکی ڕەخنەگرە پۆست مۆدێرنەکانی ڕۆژئاواییە. بۆ؟ چونکە هەر ئەم ڕستەیە لە ڕوانگەی ڕەخنەگرەکانەوە، کەم و کوڕی سەرەکی مۆدێرنیتە، یانی «دەسەڵات خوازی» سوژە (مرۆڤ) بەسەر سروشتدا نیشان دەدا. وتەکەی بیکۆن لەکاتی خۆیدا دەگەڵ هەوڵە فەلسەفییەکەی دیکارت تێکەڵبوون. دیکارتیش هەروا، ناسینی سروشت بە ڕێگایەک دەزانێ بۆ زاڵبوون بەسەریدا. ئەم چەشنە ناسین و زاڵبوونە لە زانستی ڕۆژئاوادا پێکەوە گرێدراون. بەو چەشنە، لە سەرەتاوە زانست لە مۆدێرنیتەدا، زانستێکی «خاوەن مەبەست» بوو.

ئەوە ناسینێکی مەبەستدار و مانادارە، ناسینێکە نەوەک بەمەبەستێکی پووچەڵ، بەڵکو بۆ دەکارکردن و کەڵک وەرگرتن و زاڵبوون بەسەر سروشتدا بەکاردێ.

٥- سوژە ناوەندخوازە:

هیچ سوژەیەک لە پەراوێزدا ناژی. سوژە تەنیا بەو مەرجە بنەماییەوە دابەش کارە کە خۆی لە ناوەند و «ناخود» بخاتە پەراوێزەوە، سوژە فەوتێنەر نییە (نافەوتێنێ)، بەڵکو پەراوێز خولقێنە، نە تەنیا شتەکان نافەوتێنێ، بەڵکو لەسەر جێی خۆیان دادەنێ. هەر ئەمیشە دیاری دەکا، شوێنی شتەکان کوێ بێ. نەخوا، نە

سوننەت لە زەینی «دیکارت» یا (کانت)دا بە «نەبوون» نەگەیشتن، بەڵکو لە ناوەندەوە بەرەو پەراوێزی پرۆسەی (ناسینی ئاوەزی و ژیانی کۆمەڵ، پاڵ پێوەندرا، سوژە ناوەندخوازە نەک پاوانخواز، زۆرکەس لایان وابوو، کە سەرهەڵدانی سوژە و دەرکەوتنی مۆدێرنیتە بە مانای هەوڵێکە بۆ فەوتاندنی مەزهەب و ئایین. لەحاڵێکدا سوژە حاشا لەوانە ناکا، بەڵکو کارایی مێژوویی و ئاسایی لێ زەوتکردوون و لە شوێنی هەمیشەیی و سروشتیاندا، جێگۆڕکێیەکی بنەڕەتی و (بێ گەڕانەوە) پێک دێنێ. خودی سوژە نەبێ هەموو شتێ لەسەردەمی دەسەڵاتی سوژەدا، یانی(لە سەردەمی مۆدێرنیتەدا) پەراوێزە.

٦- سوژە جیهانگیرە:

سوژەی دابەشکار، بە «شتکەر» دەسەڵاتخواز و ناوەندخواز، خۆی و هەڵس و کەوتەکەی بە جیهانگیر دەزانێ ئاواشی خۆ بەدنیا ناساندووەو ئاواشی خۆ بەسەر دیتراندا سەپاندووە.

مەسەلەی ناوەندییەکەی ئەوەیە کە سوژە ڕەوایی خۆی لە خۆی وەردەگرێ نەک لە ئۆبژە. ئەگەر بوونی ئۆبژە لە سەرهەڵدانی سوژەدا، شتێکی بنەڕەتییە، ئەوە بەو مانایە نییە کە سوژە تەواو و هەمیشە بە ئۆبژەوە بەسراوەتەوە، چونکە ئەو دابەشکەرە و لەو ڕێگەیەوە بۆتە هۆی وەدی هاتنی ئۆبژە. سوژە خۆی ڕەواییە. خۆی بەناوەند و مۆدێلێکی تەواو جیهانی دادەنێ.

(مرۆڤ- سوژە) خۆی بە مۆدێلی هەر مرۆڤێک دادەنێ کە دەیهەوێ شێوەی کامڵبوونی خۆی بەسەر دیتراندا بسەپێنێ. هەر ئەم «جیهانگیرییەیە» کە چواردە سەدە کلۆنیزاسیۆن (ئیستعمار) لە ڕۆژئاوادا شرۆڤە دەکا. بنەمای فەلسەفەی سەردەمی کلۆنیزاسیۆن لەسەر مەزنی مرۆڤی ڕۆژئاوایی و جیهانگیری مۆدێلی مرۆڤی ڕۆژئاوایی دامەزرابوو. لەڕێی خوێندنەوەی ڕەخنەگرانەی فەلسەفەی هیگڵەوە دەکرێ باشتر و بەرینتر لەو بۆ چوونە بگەین، چونکە ئەو بە ڕاشکاوی ئاماژە بەوە دەکا کە چاخی نوێی ڕۆژئاوا، بە مانای مەرگی مێژوویی شارستانیەتە ڕۆژهەڵاتییەکانە و ڕۆژهەڵات دەرەتانێکی نییە لەوەی ڕۆژئاوا لەوە بەدوا بەناوەند بزانێ و وەشوێنی کەوێ.

* * *

وەک ئاماژەی پێ کرا، باسکردن لە تایبەتمەندییە شەش لایەنەکانی سوژە تیۆرییەکە کە ئێمە لە ڕێگای خوێندنەوە و لەودیو فەلسەفەی دیکارت، هیگڵ، هایدگەر، ئادۆرنۆ، هۆکارکایەرو کەسانی ترەوە وەرمانگرتووە. لەوانەیە بکرێ تایبەتمەندیی دیکەشی؛ دیسان لەسەر بگوترێ.

ئەگەرچی لەو نووسراوەیەدا و لە لێکدانەوەی مۆدێرنیتەدا زیاتر لەسەر سوژە پێداگربووین، بەڵام ئاگاداری ئەوە هەین، کە مۆدێرنیتە هەر سوژە نەبووە و سوژە هەر ئەو تایبەتمەندییانە نییە، لە بواری ئازادی، ئاوەز تێگەیشتوویی و کۆمەڵگای مەدەنیشدا دەکرێ لەسەری بنووسرێ، چونکە هەموو سوژەیەک هەمیشە و بەپێی پێویست «بەئاگا» نییە، هەموو ئازادییەکیش ئەو ئازادییە ڕاستەقینەیە لە خۆناگرێ کە سوژەی «بەئاگا» و شارستانیەتی کۆمەڵ داخوازێتی.

**سەرچاوە:**

سایتی: ئەخباری روز

http://www.(iran-akbare-rooz)

# ڕەنگدانەوەی کەسایەتیی حاجی قادری کۆیی لە ژین و لە هەڵبەستیدا

عەبدولڕەزاق بیمار
(بەغدا)



ئایا باسی کام لا لە لایەنە گرنگەکانی هەڵبەستی پیرۆز و کەسایەتیی موبارەکی حاجی قادری کۆیی بکەم؟(١). ئەو (حاجی)یەی مامۆستا گۆران گوتەنی (پێش سەردەمی خۆی کەوتووەتەوە)(٢) و مایەی شانازیی شارەکەی کۆیە و هەموو کوردستانە و ئەستێرەیەکە لە ئەستێرەکانی ئازادی و نوێخوازی و ڕووناکبیری سەدەی نۆزدەمین لە ناو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

کام لا؟ هەر لایەنێک پشووی درێژی دەرسکردن و لێکۆڵینەوەی ورد و بە دەرەتانی پێ دەوێ، بۆیە بەپێی دەرفەتی ئاسان ڕەخسا و مل لەبەر ملی هەندێک سەرەبابەت دەنێم کە خۆیان بەسەر هەست و هۆشمدا دەسەپێنن، بەو هیوایە جوینەوە و دووبارەکردنەوەی بەرهەمی پێشوو نەبێت.

### کەسایەتی حاجی قادر

هەروەک ئاشکرایە قۆناغی منداڵی کە قۆناغێکە کاریگەرییەکانی لە سەرتاپای ژیانی مرۆڤ ڕەنگدەدەنەوە و کەسایەتیی مرۆڤەکە ناتوانێ هەرچەند هەوڵ بدات خۆی لێ لابدات و شوێنەوارەکانی بشارێتەوە، قۆناغێکی گرنگە و لێکۆڵەرەوان بۆ ناسینی خەڵک بایەخێکی زۆری پێ دەدەن.

حاجی لە تەمەنێکی زوودا لە لادێ باوکی دەمرێ و دایکی دەیهێنێتە کۆیە، لە تەمەنی حەوتساڵیدا دەچێتە بەر خوێندن لای مەلا ئەحمەدی ئۆمەرگونبەتی خزمی، پاش دوو ساڵ دایکی دەمرێ. ئیتر هەتیوی بێ داک و باب لە سێبەری ئەو خزمەیدا لە خوێندن هەڵدەچێ و بەردەوام دەبێت.

چەند شتێک هەیە وا دەکەن منداڵ زووتر چاوی بکرێتەوە، وەکو ئەوە کە ژینگەی بگۆڕێت و سەرنجی بۆ شتی تازە لە دەوروبەری ژینگەیدا بچێت. بەڵێ ڕۆڵەی

لادێ کە بێتە شار و ژیانی تێکەڵاویی خێزان و کۆڵان و بازاڕ و کۆشک و تەلاری شار ببینێ، بێگومان هەستی دەبزوێ و بیردەکاتەوە و شتی تازە دەبینێت و فێردەبێت. هەتیوی بێ داک و بابیش هەستی بە ناگزووری و سەختیی ژیان زیاد دەکات و چەندین وێنەی بەرز و نزمیی ژیان و دەستکورتی و نەبوونی لە یادەوەریدا دەچەسپێ.. لە کەشی میللیانەی هەژاراندا لە تێکەڵاویی بە هاورێ و هاوژینانی کۆڵان و گەڕەکدا ئاگاداری فەرهەنگی قسەی میللیانە دەبێت، وەکو وشەگەلی دەمدرێژی، جوێن، هەڵچوون و تووڕەیی..

حاجی وەکو مامۆستا (سەجادی) لە باسی کەسایەتیدا دەڵێ: (تا تووڕە نەبووبێت زۆر کەیف خۆش و قسە قوت بووە، لەسەر شتی هیچە تووڕە نەبوو و زۆر زوویش هێدی ئەبووەوە- مێژووی ئەدەبی کوردی ل۳۱۲-).

ئەم تووڕەییەی لە زۆر لە شیعرە سیاسییەکانیدا دیارە، کە تووڕەش دەبێ زۆر وشە و بێژە و ئیدیەمی باوی ناو خەڵک کە بۆ جوێن و دەمدرێژی بەکاردێت، ئەو لێیان ناسڵەمێتەوە و بەکاریان دەهێنێت. بە نموونە لە کاتی هەڵچووندا دەڵێ:

**(کەچی کوڕ بینا ) کەوتەوە یادم**
**پێم گوت ئایا چلۆنە ئوستادم؟**
**گوتم ئێستاش لەسەر کەری ماوی؟**
**چا بوو مستم نەدا لەنێو چاوی!**

هەتا لە کاتی شینەییشدا و لە گفتوگۆ لەگەڵ زاتێکی زانادا:

**ئەمە دنیایە نامێنێ هەتا سەر**
**لە بۆ ئازاو و دانا و حیز و ماکەر**
**مەڵێ ئەم قیصەیە بێ ڕێ و جێ یە**
**لە ترسی تۆ نەبێ هێشتا لە کوێ یە؟**

لە بواری هاواری نیشتمانی و مەسەلەی ناسکی سیاسەتیشدا:

**هەرچی وەکو بەیانم بۆ کردوون بە تەحقیق**
**پەیدا دەبێ (سەگانە) کام قوڕ بکەین بە سەرمان؟**

لە بواری گواستنەوەی قسەی ناو خەڵک و هەندێ ئیدیەمی کوردەواریدا:

**ئاخری نایە (بە میسلی تری ڕۆم)**
**یان شەڕە جوێنێ لەناو خەرڕات و دۆم**

**ئاسنی سارد بە فوو گەرم نابێ**
**بە ترانیش حەمام گەرم نابێ**

ئەم ڕۆڵە لادێییە مەلازادەیە خۆی بۆ خوێندن تەرخان کرد، ئەگەر زیرەکی و ئاوات و چاوکرانەوەی نەبووایە، لەوانەبوو لەبەر ناگزووریی ژین دەست لە خوێندن هەڵگرێت و دەستی گیربێت لە شاگردیی یەکێک لە پیشەگەرانی بازاڕی کۆیە و بژێویی خۆی پێ دابین بکات، بەڵام ئەو منداڵە زیرەکە بۆ ئەوە دروست کرابوو کە بخوێنێ و لە خوێندنیشدا سەرکەوێ و سەر بەسەر ئەو زانستە نامۆیانەی ئەو وەختەدا بگرێت و لە نهێنییەکانیان شارەزا بێت، بۆیە بۆ زیادە خوێندن و فراوان کردنی چوارچێوەی ئەزموونی لە ژیان و لە زانستدا سەری لە کەرکووک داوە و لە تەکیەی تاڵەبانی ئاشنای ڕێبازی تەصەووفی (قادریی) بووە، دوای ئەوە چووەتە باڵەکایەتی، ڕواندز، لاجان، بێتووش و سابلاخ. لە گەشتی فەقێیەتی و خوێندندا سەرنجی داوەتە سروشتی کوردستان، بە ئاوەپرژە (تاڤگە) و هەوراز و نشێو و چیای سەرکەش و باخ و ڕەزی کوێستان و سینگوڕە و قەندیل. سەرنجی داوەتە چۆنیەتیی بەڕێوەچوونی قوتابخانە و مەلا بەناوبانگەکانی کوردستان.. ئاگاداری لە ڕۆژانی ڕابردووی نزیکی میرنشینی سۆران و بابان پەیدا کردووە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ ڕەشماڵ نشین و عێلاتی کوێستان گەڕ و ڕابواردنی خەڵکی ئەودیوی کوردستان کردووە، ناوچەوانی کەوتووە بە شتی تازە لە ئێراندا وەکو (چاپ)ی کتێب، مەسەلەی ڕێبازی جیاوازی ئایینی و ناحەزیی دەوڵەتی ئێران و شای عەجەمان و ڕێبازی ئایینی ئێران.

## حاجی قوتابییەکی هەڵکەوتوو

لێکۆڵینەوەیەکی وردی سەردەمی خوێندنی حاجی زۆر ڕووی گەشی کەسایەتیی حاجی قادرمان بۆ دیار دەکات، خۆشبەختانە گەلێ ڕاز و نیازی ئەو سەردەمە لە کتێبی (سیوطی) تۆمار کراوە کە من ساڵی (۱۹۷۲) لە ژمارە پێنجەمی گۆڤاری نووسەری کورد-دا وتارێکم بە ناونیشانی (حاجی قادری کۆیی قوتابییەکی بەهرەدار)(۳) لەبارەیەوە بڵاوکردەوە، بە پێویستی دەزانم پوختەیەکی کە بەکەڵکی ئێرە بێت لێ دووبارە بکەمەوە.

سیوطی کتێبێکە بە ناوی (البهجة المرضية في شرح الألفية) جەلالەددینی سیوطی شەرحی لە ئەلفیەی ئیبنو مالیک داوە کەوا بە هەزار دێڕە هۆنراوە ڕێزمانی عەرەبی

باس کردووه. حاجی به خۆڕاپەرموون و لێزانییەوە بە کتێبەکەدا چووەتەوە و چی زانیوە خستوویەتییە سەر گوزارەی هەندێک شوێن، لەژێر هەر نووسینێکدا مۆری (لکاتبه حاجی) یان (حاجی) لێداوە.

لە لاپەڕە (٩٨)ی ئەم کتێبەدا بە عەرەبی نووسیویەتی: «زۆر کەس هەیە بیروڕای زاناکانی پێش خۆیان بە بێ دەست لێدان و گۆڕین دەنووسنەوە و دەشلێن.. (لکاتبه فلان کوری فلان!) چۆن شەرم ناکەن؟ خۆ من ئەگەر وەکو ئەوانم بکردایە ئەوە پەراوێزەکانی من لە شەرحی کافیەش زۆرتر دەبوون».

کەوابێ ئەو هەر بۆ نووسین و خۆدەرخستن ئەو پەراوێز و لێ پێچینەوانەی نەنووسیوە، بە نموونە لە باسی شیانی چوونی لام بۆ سەر خەبەری (ن) بە سێ مەرجان لە تاکە هۆنراوەیەکدا دایڕشتووە:

**«بشرط تأخير وغير ماض**
**ومثبت كإنني لقاض» ل٦٤**

حاجی قوتابیی پێگەیشتوو چاوپۆشی لە هەڵەی کابرای فارسی نووسەرەوە و چاپکەری کتێبەکە نەکردووە.. کەوا شێوەی قالبی (گراوەری)ی چاپ لەو سەردەمەدا پەیدا بوو، ئەو دەسنووسی کۆنی لا چاکتر بووە، بۆیە نووسیویەتی:

**شابەیتی نەبی بە چاپی عەجەم نەیکری ئەمان!**
**گەر پێی ببی بە شا بە دوو شایی خەسارەتە**
**وەک من ئەگەر بەسەر هەموویدا بێی لە ئاخری**
**عیلمی هەموو جەهالەتە، نەفعی مەرارەتە.**

ئەم دوو بەیتییە لە دیوانەکەیدا بڵاو نەکراوەتەوە، بەڵام دوو بەیتییەکی تر بڵاوە، ئەویش هەر لە زەمی چاپی عەجەمانە کەوا لە لاپەڕە (١٣٧)ی (سیوطی)یەکەدا نووسیویەتی:

**یارەب بە قەدەر حەرفی (سیوطی) یەک یەک**
**رەحمەت لە (مصنّف) و لە قاریء بێ گەلەک**
**ئەمما عەجەم و ئەو کەسی چاپی دانا**
**بیباتە جەهەننەم بە عەزاب و بە کوتەک.**

لەم چوارینەشدا باسی گەشت و ژیانی خۆی دەکا لە گوندی (بێتووش) و ویستوویەتی بەهرە و هونەری ڕەوانبێژییەکی کەس نەکردوو بنوێنێ (داخەکەم لە گۆڤارەکەدا دوو وشە بە هەڵە لە چاپ درابوو):

**سەقەرێکە سەفەری ڕاهڕەو و بێ تووشە**
**خاصەتەن ئەم سەفەرە بەد أثرە بێ تووشە**
**بەدرەقەیی ڕێگەم ئەگەر خدری نەبی بێ تووشە**
**کافیە کافی یە کەوا مەنزلی من بێ تووشە**

(ڕاهڕەو: ڕێبوار. بەدرەقە: ڕێ نیشاندەر و پارێزگار. خدر: خدری زیندە).

هەر خۆیشی مانای ئەو چوار وشەی (بێ تووشە)ی لێک داوەتەوە و نووسیویەتی: «(١) زاد، (٢) بەبێ تۆ، (٣) زەحمەتە، (٤) ناوی گوندێکە».

لەم دوو بەیتە فارسییەشدا نموونەی ژنی قوتابیان: برسیەتی، غەریبی، بێ خەوی و ڕزینی پەراسوو لەسەر حەسیری ڕەق نیشان دەدا:

**یا رب بکرم بجای طاعت أز من**
**این کوشش و این سعی دمادم بەپذیر**
**وین گرسنگی و غربت و بی خوابی**
**فرسودن پهلوان ببالای حصیر (ل٧٦)**

دوژمنایەتیی حاجیی قوتابیی زیرەک و بەخۆڕاپەرموو هەر بە هەڵەی چاپی عەجەم نەوەستاوە، بەڵکو لەم کاتەدا ئەوەشی نووسیوە کە گوزارشت لە هەڵوێستی ئایینی و سیاسیی دەکات:

**قد سمعنا من منادٍ مات (شا)**
**لعنة الله عليه ماتشا (ل٦٩)**

هەر لە هەمان لاپەڕەدا بە عەرەبی نووسیویەتی: «ئەمەم لە گوندی بێتووش لە وڵاتی (ئالان)دا نووسیوە، کاتێک بوو مانگ گیرا و سەرداری گەورە عومەر پاشای عوسمانی ڕووی کردە ئێران، کە شای عەجەمان لە سنەوە ئەمەی بیست بۆی دەرچوو و هەڵات».

هەروەها لە لاپەڕە (١٢١)دا بە فارسی مێژووی ئەو دەمەی تۆمار کردووە:

«شەوی سێ شەموو بیستی مانگی جیمادی ئاخری هەزار و دووسەد و حەفتاو شەش» - ١٢٧٦ھ.

ئەم مێژووە، بۆ دیارکردنی ساڵی لە دایکبوونی حاجی ئێجگار گرنگە و پێویستە نووسەرانی مێژووی ئەدەب بایەخ بەم لایەنە بدەن. کەوا حاجی مەلا عەبدوڵڵای

دەبێ ساڵی (١٢٥٠ک) لەدایک بووە و قوتابی لە چ تەمەنێکدا (سیوطی) دەخوێنێ!؟

### حاجیی شاعیری بەهرەدار

حاجی ئەو ساڵەدا کە تەمەنی ڕەنگە لە (٢٠ - ٢٥) ساڵ زیاتر نەبووبێت، هەستی بە کەسایەتیی خۆی کردووە و یەک دەمی لە زانستی مەلایەتی و لە شیعر و ئەدەبیات و کاروباری کۆمەڵ داوە. ژیانی پڕ لە بزووتنەوەی لە ئاوێنەی شیعرەکانیدا، هەروەها لە ڕەوتی ژینی ڕۆژانەیدا ڕەنگی داوەتەوە. سەرگەرمی لاوی و بەخۆنازین خەیاڵی بۆ ئاستی بەرز بەرز هەڵفڕاندووە..

لەم ماوەیەدا جوانترین پارچە غەزەلی پێشکەشی دیوانی هەڵبەستی کوردی کردووە(٤). غەزەلی:

**ئەم خەیە کە شەمسییەیی شاهەنشەهی ئەرزە**
**تا چادری نیلی سەری سەر تیلەکی بەرزە**

لە هەموو ئەدەبی کوردیدا تاکی نییە.. شیعرێکی یەک بابەتی بە زنجیرە وەسف و نەخشاندن و دەربڕینی هەستی دڵداری، بەرامبەر گوڵەی ناو خیوەتێکی (لاجان). هەر بەم جۆرەش شیعری:

**کە هەستا قامەتی بەرزی لە فەرقی تا وەکو ئەرزی**
**پەریشان زوڵفی سەد تەرزی بەیەکدا دارژاو لەرزی**

هەڵبەستێکی تاکە لە وەسفی ئالقەی زیکری دەروێشانی قادری و دابەشکردنی شەرابی ئاسمانی بەسەر مریدانی مەستی زیکردا، نموونەی جوانیی مریدی مەیگێڕی کوڕەکە، کە بەداخەوە مامۆستا سەجادی بە هەڵە بۆی چووە(٥).

هەر بەم جۆرە وێنەکێشانی کوڕێکی ئەکرۆپاتیکی کە لاوی سندووسی لەسەر پەت یاری دەکا، ئەمەش نموونەیەکی تاکە لە هەموو ئەدەبی کوردیدا..

**لەسەر تەنافی کە لەرزی هەتیوی سندووسی**
**شکا مەتاعی زەریفی یو قیمەتی لووسی**
**تەنافی پردی صیراطە موناظیران مەحشەر**
**مەکانی مەلعەبە حەشرە لە مونمین و ڕووسی**
**سەمایە عەرصەیی بازی، گوریسی کاهکەشان**
**ستارە ناظیر و ماهیش هیلالی مەعکوسی.**

حاجیی قوتابی بە ڕوومەت لە بەرامبەر (قازی)ی سابلاخ دەوەستێ و سەرزەنشتی دەکا، چۆن ڕەوایە کە بە پیری و خاوەن ژنێکی جوان چاو لە کچێکی بێگانە ببڕێت؟:

**قازی سەر و سینەت سوپەری تیری قەزابێ**
**وەک دینی (روافض) بەدەنت بێ سەروپابێ**

و تا دوایی....

جا ئەو کەسایەتییە ڕووناکبیرە، سەرنجدەرە، بە هیممەتە بوو بە خاوەن دید و بۆچوونی خۆی لە ژیان و دەوروبەر.. کە گەڕایەوە (کۆیە) بوو بە پێشڕەوی لەشکری بەرەنگاریی بزووتنەوەی کۆنەپەرستانەی خەڵک هەڵخەڵەتێنەری تەریقەت و شێخ نەبیی ماویلیی نموونەکەی.

لە کاتێکدا کە دەبوو مەلایان گشت لەسەر ڕێگەی شەرع و سوننەت بەربەرەکانیی تەریقەت بکەن، هەتا ئەگەر وەکو فیکرەش لایان پەسند بێت چاو لە کردەوەکانی شێخ و خەلیفەکانی نەپۆشن، چونکە لە بنەڕەتدا شەرع و تەصەووف ئەوەندە خزمایەتییان نییە.. داخەکەم هەندێکیان بێدەنگ بوون، یان تەریقەتیان وەرگرت و وەگەڵ شەپۆلە تازەکە کەوتن، بەڵام حاجی قادری خاوەن بڕیار و باوەڕ و ڕۆشنبیر سەنگەری خەباتی چۆڵ نەکرد و بنەما سەرەکییەکانی بەرژەوەندی دارودەستەی شێخەکانی ڕیسوا کرد و لە بەرگوباری نەخشاوی ڕووت کردنەوە، زیرەکانە هەوڵی ئەوانی بە مەسەلەی ئابووری و چینایەتییەوە بەست و پیشانی دان کە هەر خەریکی ئەملاک و خەزنە کۆکردنەوەن، سەیریکە چۆن ئامانج دەپێکێ:

**بەڵێ شێخ قوتبە ئەمما قوتبی ئاشە**
**بە ناو و نیعمەتی خەڵکە گەرانی**
**کە نەفعێکت نەبوو بۆ موڵک و میللەت**
**بە من چی نەقشبەندی یانە مانی؟!**

### گەشت بەرەو هەندەران

ئەوەیە کەسایەتیی حاجی قادری مەلا و زانا.. من لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم کە گوایە حاجی بە پاڵەپەستۆی شێخ و ناحەزانی لە کۆیە دەربەدەربووە و چووەتە ئەستەمبووڵ. نەخێر ئەگەر مەلا قادر بیویستایە لە گوندێک مەلایەتیی دەکرد، یان لە شارێکی دی لە شارەکانی کوردستان دەگیرسایەوە، بەڵام ئەوێکی جوامێری خاوەن بڕیار، نزیک لە ڕێبازی (قادری) و دۆستی ئەمیناغای شاعیر و بە دەسەڵات لە هەرێمەی





شێخێكی لادێیی ماویلانی (گوندێكە لە ڕەواندز) نەدەپەنگایەوە، بەڵكو لە ئاسۆی دووری گەشی ژیانی ڕووانییەوە و ئاستی ئاوات و ئارەزووی زانین و ئاگاداربوون پاڵی پێوەناوە بچێتە ئەو ئەستەمبوڵە ببینێ كە زۆر كەس خەونی پێوە دەدیت.

كەسایەتیی حاجی ڕووی لە ئاستی بەرزی ژیان دەكرد.. هەروەكو ئەویش.. خۆ شێخ ڕەزا لەبەر هەڕەشە و ترسی كەس ڕووی لە ئەستەمبوڵ نەكرد!.. شێخ ڕەزا هەر كە لە كۆیە بوو فیكری لە سەفەری ئەستەمبوڵ دەكردەوە.. ئەدی ئەوە نەبوو كە لە شێخ غەفووری مامی تۆرا، گلەیی ئەوەی لێكرد كە نەیهێشتووە بچێ بۆ سەفەری ئەستەمبوڵ بە سیاحەت:

**ویستم كە بچم بۆ سەفەری ڕۆم بە سیاحەت**
**نەیهێشت و دووسەد ئەهلی عەمامەی لەسەرم كرد**

كەوا بێت بۆ سیاحەت چوون مانای دنیا دیتن و تێكەڵییە بە ژینی نوێ و شارەزابوونە لەو شارە سەیرەی كە جێنشینی سوڵتانی هەموو موسڵمانانە و مۆڵگای داهێنان و شتی تازەی ئەوروپا و دامودەزگای دەوڵەتە!

بۆ حاجی قادریش كە لە شێخ ڕەزا زیاتر بیر كراوە و ئاسۆی تێفكرین بەرزترە، چوونە شاری پڕ بریق و باق و پایتەختی ڕۆژهەڵات كارێكی بەجێ و پێویستە.. ئەگەر شێخ ڕەزا گەڕایەوە ولات حاجی بە جۆرێك تێكەڵی ژینی تازە بوو كە نەیتوانی بگەڕێتەوە كوردستان.

كەوابێت حاجی بەبێ تێشووی بیر و لێكدانەوەی ژیان و سیاسەت نەبوو، كە ڕووی كردە ئەستەمبوڵ، وەنەبێت هەر لەوێ چاوی كرابێتەوە و كەسایەتییەكی نوێی بۆ ڕسكا بێت.. نەخێر، ئەم قوتابییە بەهرەدارە، پاشان ئەو مەلا دنیا دیتووە و شارەزایە، بەڵكو ئەو خاوەن بیر و سەرنجە وردە و ئەو شاعیرە بەتوانایەی كە جوانترین نموونە، هەڵبەستی پێشكەشی دیوانی شیعری كوردی كرد.. ڕوون و ئاشكرا ئامادە و لێهاتوویی خۆی دەسمایەی سەوداكردن بوو لەگەڵ ژینگەی تازە بە هەموو لایەنەكانییەوە.

جا دەمەوێ بڵێم من لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم كە حاجی وەكو لاپەڕەیەكی سپی بووە پێش چوونە ئەستەمبوڵەكەی و لەوێوە بەرە بەرە بیروباوەڕی كوردایەتی و سیاسەتزانی و پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی دێڕ بە دێڕ لەسەر تۆماركراوە، بەڵكو خوێندنەوەی تۆماری ژینی منداڵی و فەقێیەتی و مەلایەتی لە كوردستاندا وێنەیەكی گەشی كەسایەتییەكی بەهێز و بیركەرەوە و بزووت و ئازا دەستگیر دەكات، كە كەسایەتیی پڕ شكۆ و بلیمەتانەی (حاجی قادری كۆیی)یە. هەر لەسەر ئەم بناغەیەش دەتوانین وێنەی كەسایەتیی حاجی تا دوارۆژی ژیانی دیاری بكەین.

**پەراوێز:**

(١) ئەم وتارە بۆ فیستیڤاڵی حاجی قادری كۆیی ئامادەكرابوو كە لە ڕۆژی (٦/ ١٠ەوە تاكو ٨/ ١٠/ ٢٠٠٤) لە كۆیە بەڕێوەچوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لە پرۆگرامی فیستیڤاڵەكە دانەندرا بوو، نەمخوێندەوە.

(٢) بڕوانە كتێبی (یادی پیرەمێرد) ئامادەكردنی مامۆستا عەلائەدین سەجادی.

(٣) گۆڤاری نووسەری كورد، بەغداد، ژمارە (٥)، ساڵی ١٩٧٢.

(٤) لەم بارەیەوە بە پشووتر وتارێكم لە سێ ژمارەی ڕۆژنامەی عیراق (لاپەڕە كوردی)یەكەی بڵاوكردووەتەوە.. لێرە پێویست بە دووبارەكردنەوەی بنەڕەتەكانی ناكات.. تكایە بڕوانە ڕۆژنامەی عیراق، بەغدا، ژمارەی ڕۆژی ١٢/ ١/ ١٩٨٣، پاشان ٢٣/ ٣ ئەنجا ٩/٢/١٩٨٣.

(٥) مێژووی ئەدەبی كوردی، عەلائەدین سەجادی، چاپی دووەم، ل٣١٥.

(٦) نموونەی هەڵبەستەكان لە دیوانی حاجی قادری كۆیی - ئامادە و ساغكردنەوەی مامۆستا كەریم شارەزا وەرگیراوە.



# نوێشکێک لە بارەی شیعرەکانی (حاجی قادری کۆیی)یەوە

ئەحمەد دلزار

جێی داخە کە زۆربەی شیعرەکانی حاجی قادر لەناوچوون و ئەو کەمە شیعرەش کە دەماو دەم لە هەندێ کەشکۆڵ و بەیازی ناو حوجرەی مزگەوتەکاندا کۆکراونەتەوە لەگەڵ ئەو دەفتەرە شیعرەش کە لە دەلاقەیەکی کاولی ئەمین ئاغای ئەختەر دۆزرایەوە و لەلای مەلا ڕەئوفی کوڕی سەلیم ئاغای کوڕی ئەمیناغای ئەختەر بوو، دوایی کەوتە لای کاک ڕۆستەم و محەمەد تۆفیق وردی و ئەوانیش دایانە گیوی موکریانی. مامۆستا گیویش تێکڕای ئەم شیعرانە و شیعری دیوانەکانی تریشی بەناوی (دیوانی حاجی قادری کۆیی- چاپی سێیەم) لەساڵی (١٩٦٩)دا بڵاوکردەوە، ئەوسا من پێشمەرگە بووم و دواییش لە پاییزی (١٩٧٠)دا چوومە دەرەوەی وڵات و لە پاییزی (١٩٧١)دا بەنهێنی گەڕامەوە کۆیە و دیوانی حاجی قادری کۆیی چاپی سێیەمم چاوپێکەوت و کەوتمە سەر خوێندنەوەی کە بەداخەوە هەڵەی زۆری تێ کەوتووە و پتر لە سی هەڵەم تێیدا تۆمار کردووە لە پاشان لە گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)ی ژمارە (١) ساڵی (٢) بەغدا (١٩٧٢)دا بڵاوکرایەوە، لەساڵی (٢٠٠١)دا هەمدیسان لە (پاشکۆی بیرەوەرییەکانم، ژمارە ٢)دا بڵاوکرایەوە.

ئێستاش لەو (٣١) تێبینیانە تەنیا سێ تێبینیتان بۆ دەخەمە ڕوو:

١- تێبینی ژمارە (٢٠)

**لەسەر شەو ڕۆژی داناوە مەڵێن فێسی لەسەر ناوە،**
**لەبەر با جامی یاقووتی بەموشکی وشکی داداوە؛**

لە مانا لێکدانەوەی ئەم شیعرەدا مامۆستا گیویش وەک مامۆستا ڕەفیق حلمی لەلاپەڕە (٦٦)ی دیوانەکەدا دەڵێ: «مەبەستی ئەوەیە: شەو کاکۆڵی ڕەشیەتی، ڕۆژیش فێسە، واتا لەسەر کاکۆڵی ڕەشی، فێسی سووری داناوە و لە پارچەی دوودمی بە چەشنێکی تری دەربڕیوە، کاکۆڵی کە وەکو (موشکی) وشک وایە بۆ ئەوەی با نەیشێوێنی، فێسەکەی کە وەکو جامی یاقووتی وایە لەسەری داناوە».

هەموومان دەزانین کە (کاکۆڵ) هی کوڕە نەک هی کچ. جا بەپێی شیکردنەوەکەی مامۆستا گیو دەبێ خۆشەویستەکەی حاجی قادر کوڕێکی کاکۆڵ ڕەشی فێس لەسەر بووبێ. جا دەبووایە مامۆستا گیو نەڵێ مەبەستی ئەوەیە، چونکە مەبەستی ئەوە نییە، بێ گومان، مەبەستی حاجی قادر ئەوە نییە کە خۆشەویستەکەی کوڕێکی کاکۆڵ ڕەشەو فێسێکی سووری یاقووتی

خستۆتە سەر شەوی کاکۆڵی کە وەک موشکی وشک وایە، بۆ ئەوەی با پەرێشانی نەکا، کە لە پاشانیش دەڵێ:

**لە تەقەی ناڵ و شەققەی پانی بەرزی ئاسمان لەرزی،**
**تەق و تۆق کەوتە سەر ئەرزی دەڵێن مەحشەر هەڵستاوە؛**

خۆشەویستەکەی حاجی قادر لەم هەڵبەستەیەدا کچێکی قژ ڕەشی کوردستانی بووە، کە وەکو هەموو ئافرەتێکی ئەوسای کوردستان، یان (کۆیە) کڵاوی دراو لێ دوورواوی قەنەوز تێئاڵاوی بەلیفکە و پەلکەی لەسەربووە، کە تائێستاش لەم جۆرە کڵاوە هەرماوەو پێی دەڵێن (کڵاوی بەتارانیان).

جاران ئافرەتانی ناوچەی کۆیە و دەوروپشتی وابزانم هی سلێمانیش فێسیان دەهێنا هی سوور، یان هی شین کە وەکو فێسی پیاوان قووچ و درێژ و تیسکدار نەبوو، بەڵکو کورت و فراوانتر و بێ تیسک بوو، پارچە دراوێکی زلی زیویان لە ناوەڕاستەکەی دەدووری و ئینجا ریزە دراوی زیویان بەبازنە بە دەوریدا دەدووری، کە بازنەکان تا لە ناوەندی کڵاوەکە دوورتر دەکەوتنەوە فراوانتر دەبوون، ئینجا قەتارەیەک پوولی زەردی بچووک، یان چارەکە لیردیان لە لێواری کڵاوەکە دەدووری بەشێوەیەکی ئاسایی شەست پوولەکە، یان شەست چارەکە لیرەی زێڕبوو دەیان خستە سەریان و ئینجا دەسرۆکەیەکی ئاوریشمی زەردیان دەهێنا کە چوار لکە قەنەوزی لێ دوورابوو، دوولکی پەمەیی، تەنیشتێک شین و ئەوی دی سەوز لەگەڵ چەفتەیەکی ڕەش و سپیدا تێکیان دەبەست و بەکرمەکێکی زێڕ، یان زیو، یان بە بەندۆکەییێکی شینی زەنگیانەیی لەم سەر و ئەوسەری بناگوێ و گەردەنیان بەند دەکرد کە وەک ڕۆژ لەبەر تیشکی خۆر، یان چرادا دەبریسکایەوەو لەگەڵ شەو پرچ و زوڵفیان شەو و ڕۆژیان لەیەک کاتا دروست دەکرد؛ وەکو گوتمان ئێستاش ئەم کڵاوە بە تارانیانە تاک و تەرا هەرماون، بەڵام ژنان بەر لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودوە تاسی زێڕ، یان زیو لەو جۆوە کڵاوانە دەدوورن و بەهەمان دەستووری کە باسم دەکرد، دەیخەنە سەر سەریان و پەلکە و لیفکەی قەنەوزی و چەفتەی گوڵینگەداری تێ دەئاڵێن..

کەواتە ئەو فێسەی کە حاجی قادر مەبەستی بووە، فێسێکی سووری ژنانەی دراو لێدووراو بووە، بۆیە دیوی ناوەوەی جامێکی یاقووتی و دیوی دەرەوەی ڕۆژێکی بریقەدار بووە.

خوالێخۆشبوو شاعیر و پارێزەر (محەمەد میهری)ش لە ئەستەمبوڵەوە ئەم هەڵبەستەی حاجی قادری تەخمیس کردووەو لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

**شوعاعی لەعلی لێو و سێوی مەمکی ئاگر و ئاوە،**
**دوو بسکی میسک و نوقتەی خاڵ و خەتی دانەوو داوە**
**ڕەشی چاوی لەنێو تاریکە شەودا شەوچرای چاوە؛**
**لەسەر شەو ڕۆژی داناوە مەڵێن فێسی لەسەر ناوە،**
**لەبەر با جامی یاقووتی بە موشکی وشکی داداوە؛**

٢- تێبینی ژمارە (٢٣)

لەلاپەڕە (٨٥)دا سێیەمین شیعر لە هەڵبەستی (نەقاشی دەمی...) ئەمەیە:

**فەرقێکی نەبوو غایەتی ئەو کردی بەسووکی،**
**زوو هات و ئەتۆش باعسی نازت بەگرانی؛**

مامۆستا گیو ئەم تێبینیەی خوارەوەی لەسەر نووسیوە:
«ئەم تاکەش لەنگەو نارێکی لە واتاکەشیدا هەیە، داخم ناچێ کە لەناو هیچ جۆرە دەستنووسێکی هیچ لایەنێکدا پوختترم بۆ نەدۆزرایەوە» تێبینیەکەی مامۆستا گیو تەواو بوو، بەڵام من هیچ لەنگی و ناتەواوییەک لەم شیعرەدا نابینم و لە ڕاستیشدا وەک ئاوی ڕەوان ڕەوانەو نارێکیشی لە واتادا نییە، مەگەر ئەوەنەبێ کە بەئەنقەست بەجۆرێکی دەربڕیوە کە مانایەکەی قورس و شاراوەیە. جا بۆ ئەوەی مانایەکەی شی بکەینەوە، دەبێ دوو شیعرەکەی پێشەوەشی بنووسین و ئەمەش هەرسێکیانە بەسەریەکەوە:

**نەقاشی دەمی نوقتەکی دانا بەنیشانی**
**زانی کە زەمی کردووە بێزارە لەمانی**
**صورەتگەری سەر لەوحەیی دیوانی مەلاحەت**
**دوو یوسفی کێشاوە بەبێ ئەوەڵ و ثانی**
**فەرقێکی نەبوو غایەتی ئەو کردی بەسووکی**
**زوو هات و ئەتۆش باعیسی نازت بەگرانی**

دەڵێ: ئەو نیگارکێشەی کە نیگاری دەمی خۆشەویستەکەمی دەکێشا نوختەیەکی دانا لەباتی (دەمی) بەڵام بۆی دەرکەوت کە دەمی کردووە و ڕەوانییە ئەو نوختەیەش بهێڵێتەوە، چونکە دەمی خۆشەویستەکەی لەو نوختەیەش بچووکترە!؛ هەروەها ئەگەر وشەی (دەمی) نوختەیەکی بخەینە سەر، دەبێتە (ذەمی).

دیسان دەڵێ نیگارکێشی سەر تابلۆی دیوانی زیبایی و جوانی کە (کردگارە) وێنەی دوو یوسفی کێشاوە: یوسفی کەنعانی و خۆشەویستەکەی من، بەبێ ئەوەی فەزڵی هیچ کامێکیان بدا بەسەر ئەوی تریاندا و بڵێ: ئەمە یەکەمە و ئەوە دووەمە.

[illegible] ئەم دوو یوسفە هیچ جیاوازییەکیان نەبوو، بەڵام
[illegible] یوسفی بەسووکی کرد لەبەر ئەوە زوو هات
[illegible] پێشەوە، بەڵام تۆ سەبەب بەناز و گریشمەت
[illegible] هاتی، واتە لە دوای ئەو هاتی، ئەگینا هیچ
[illegible]ەکتان نییە. بەم دەربڕینەی دەیەوێ بڵێ:
[illegible]ەکەی من لە یوسفیش جوانترە.
[illegible]یە تا ڕادەیەک، لەو مانایە دەچێ کە شێخ
[illegible] بەچوار شیعری فارسی دەری بڕیوە، لە
[illegible] ئەمەوە کە بۆچ شای پێغەمبەران لەژێر خاکدایە و
[illegible] مەسیح لە ئەفلاکدایە؟!
[illegible]ەیرێکی دیوانی شێخ ڕەزا بکەن، بەشی فارسی
لاپەڕە- ٥٢)

لە دوا وتەدا دەڵێم: حاجی قادریش وەک نالی و
ناوەڵەکانی ویستوویەتی هونەری شیعری خۆی پێشانی
خوێندەواران و شیعر دۆستان بدات و زیرەکییان تاقی
بکاتەوە، بۆیە دوابەدوای ئەم سێ شیعرە ڕاستەوخۆ
دەڵێ:

**پێمخۆشە غەزەل فەرشی قدومی عوقەلا بێ**
**نەک بێتو لەبەرکەن جوهەلا لەفز و مەعانی**

٣- تێبینی ژمارە ٢٤

دواشیعری لاپەڕە (٨٦)ی چاپی سێیەمی دیوانی
حاجی قادری کۆیی ئەمەیە:

**لە تووشی خۆم بوو هەرچی تووشی خۆم بوو**
**لە دەستی خۆیەتی حاجی شکاتی**

مامۆستا گیو وشەی (تووشی) ناوا شی کردۆتەوە:
تووش: هۆز، نەتەوە، تیرە (!!!)

منیش دەڵێم: حاجی قادر دەڵێ: لە کەللە ڕەقی و
لاساری خۆم بوو، هەرچی بەردنگاری خۆم بوو، شەکوا و
سکاڵاشم هەر لە خودی خۆمە.

هەمووشمان دەزانین کە گوتیان فلان کەس تووشە.
واتە کەللەڕەق و لاسارە.

لە ڕاستیدا حاجی قادر مامۆستای بیری کوردایەتی و
نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە بوو، بە درێژایی ژیانی بۆ
کورد تێکۆشا و تاڵاوی ستەمی زۆردارانی چەشت هەر
لەو سۆنگەیەشەوە بوو پەراگەندەی هەندەران بوو
بەناچاری گۆڕ غەریب بوو.

حاجی قادر لە دەربڕینی دنەدانی لاوان و ڕابەری
کردنیان بۆ فێربوون و یەکگرتن و تێکۆشانیان لەپێناو
ڕزگارکردنی کوردستان و سەربەخۆبوونا، شێوازێکی فرە
سووک و ئاسانی، لە شیعرەکانیا بەکارهێناوە، کەچی لە
هەندێ شیعری تردا گەلێ جۆرە جوانکاری و ڕەوانبێژی
بەکارهێناوە وەک نالی و کوردی و شاعیرە گەورەکانی
ئێران.

بۆ نموونە سەیرێکی ئەم بەرهەمانەی
حاجی قادر بکەن:

**ئەم خەیمە کە شەمسییەی شاهەنشاهی ئەرزە**
**تا چادری نیلی سەری سەرتەپلەکی بەرزە**

- ئەو شیعرەی کە بۆ ئەمیناغای ناردووە:

**ئەی محەمەد وەی ئەمین الدولە ئەمرۆ کۆیی تۆ**
**جەننەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوورکەوتەوە**

لە کۆتاییشدا چەند هونەرمەندانە دەڵێ:

**قاوەچی بەزمی ئەتۆ دنیایە سینی ئاسمان**
**ئافتابی زەرفە فنجانی مەهە قاوەی شەوە**
**ئەوشەوە بۆ هەر کەسێ دنیا بکاتە ڕۆژی ڕوون**
**شەو لە خوتتەی عومری ئەو عەنقایە دەریانی خەوە**

- ئەقاشی دەمی...... تاد
- لەسەر شەو ڕۆژی داناوە.... تاد

خۆ شیعرە بەهارییە ناودارەکەی کە لە غەریبی دایناوە،
چڵەپۆپەی شیعرە و خۆزیا هەموو کوردێک بە وردی ئەم
چامە (٥٧) بەیتەی ناوبەناو دەخوێندەوە کە بەراستی
شیعرە و ئەگەر حاجی قادر بەتەنیا هەر ئەم چامەیەی
ئەفراندبا، بەس بوو کە بەشاعیرێکی گەورە ناوبنرێ!

سەرەتای چامەکە ئەمەیە:

**وتم بە بەختی خەواڵوو بەسیە ئەتوبی خوا**
**لەخەو هەستە زەمانێ بچینەوە ئەولا**

کە لێی وردەبیەوەو دەبینی، بەشێوەیەکی فرە سرنج
ڕاکێش و شاعیرانە سۆزی دڵ و دەروونی خۆی تێکەڵ
بەجوانی سروشتی کوردستان دەکات و وەسفی
کوێستانەکان و ڕەنووە بەفرو هەرەسهێنانی و هۆبەو ماڵە
ڕەشماڵ نشینەکان و تێبەردانی کار و بەرخ و بگرەو
بەردەی کابان و بێری و مەڕوماڵات و هەڵکردنی چرا لە
گۆشەی هەر ڕەشماڵێکدا.

چەند جوان، جوانی وڵات بەبوونی دۆست و ئەحبابەوە
گرێ دەدا!

ئەم چامەیە گەورەترین گەواهییە لەسەر شاعیرییەتی
حاجی قادر کە سۆزی غەریبی ئەفراندوویەتی و مۆرکێکی
ڕۆمانسییانەی هەیە.

**سەرنج**

ئەم لێتوێژینەوەیە لە فیستیڤاڵی حاجی قادری کۆییدا
خوێندرایەوە، کە لە ڕۆژانی ٦-٨/ ١٠/ ٢٠٠٤ لەشاری
حاجی خۆیدا، سازدرا.

# تێکستێکی کۆن: بەراوردێک

مەحمود زامدار

پێشکەشە بەگیانی پاکی پێشەوا قازی محەمەدی نەمر، کە وەک مامۆستا هێمنی مهابادی پێی ڕاگەیاندم: کە پێشەوا زۆربەی زۆری شیعرەکانی حاجی لەبەربووە.

ئەم کۆنە سووکەڵە باسەم لە ژمارە (٥٣)ی ساڵی (١٩٨٧)ی گۆڤاری (کاروان) و بەسەرناوی (هەتاوی کورد و سەردەمی ڕاپەڕین) بڵاوکردۆتەوە. بۆ ئێرە هەم زۆر کورتم کردۆتەوە و هەم شتی تازەم خستۆتەسەر، ئەمیش لەبەر ئەم هۆیانە:

١- لێدوان لەو ڕۆژنامە دانسقەیە، واتە: (هەتاوی کورد)ی ساڵی (١٩١٣) و دەورە دیارەکەی.

٢- لێکۆڵینەوە لە چەند بابەتی هەرە تازەی وەک:

ئا- چامەیەکی (نالی).

بێ- چامەیەکی (حاجی).

پێ- سەرەتای سەرهەڵدانی مێژووی بزاڤی نوێخوازی لە شیعری کوردییدا.

جیم: مەسەلەی یەکلاکردنەوەی (مستەفا شەوقی) و چەند بابەتێکی تر.

بەڵام- بەداخەوە- وابوو بە (١٨) ساڵ وهیچ کەسێ خۆی لە قەرەی ئەو بابەتانەی ورووژاندم نەداو بووە بەردی بن گۆم- وەک هەموو عادەتێکی بێ کەڵکی کوردی- بۆیە ناچار خۆم ساغم کردنەوەو جارێکی دی پێداچوومەوە. ئێرەو ئەم بۆنە گرنگەش باشترین دەرفەتێکە، هەر هیچ نەبێ بۆ شیعرە هەرە ناودارەکەی (حاجی) تا بێم و جارێکی دیکە بیورووژێنمەوە، ئێ بەڵکو ئاوڕێکی لێ بدرێتەوە.

وەک لە هەموو لایەک ڕوون و ئاشکرایە ساغکردنەوەی سامانی بەپێزی ئەدەبیاتمان، نەخوازەڵڵا گەنجینەی لەبن نەهاتووی شیعری زیندووی کلاسیکیمان، ئەرکێکی گەورەی سەر کرۆژەڵەی شانی هەر نووسەر و لێتوێژەرەوەیەکی باڵا دەستە، بەتایبەتیش بۆ ئەو کەڵەشاعیرانەی کە دەورێکی یەکجار مەزن و دیاریان چ لە خێرایی کردنی تەوەرەی هزری نەتەوایەتی و خولقاندنی کەشوهەوای سازگاری هوشیاربوونەوەی سیاسی و ڕووناکبیرییەکی ڕەسەندا گێڕاوە. هەر بۆیەشە بایەخدان بەم لایەنە هەم پێویست و گرنگە، هەم ڕەوانی ئەو مەزنە شاعیرانە شاد دەکاو هەم دەبێتە مایەی تێڕامانێکی ورد و لێتوێژینەوەیەکی دیکەی لێتوێژەران.

وەک دەیزانن، (حاجی)ی نەمر، دوای (خانی)ی مەزن بەدیارترین هۆنەری شیعری سیاسی و نەتەوەیی بەرهەڵستکار دەژمێردرێ، مایەی ئەوەیە بەوپەڕی دڵسۆزی و دەسپاکی و ڕاستگۆییەوە، مامەڵە لەگەڵ شیعر و نەزمە هەڵایساوەکانیدا بکرێ و بە ئاوەزێکی ئەکادیمی و تەفسیریی و دوور لە دەستێوەردان و گۆڕین و خستنە سەر و جێگۆڕکێ پێکردن، لێیان بکۆڵرێتەوەو بنووسرێتەوە، چونکە چ شیعر و چ نەزمەکانی ئەم کەڵەمرۆڤە، بەڵگەنامەیەکی زۆر بەنرخن بۆ سەراودڵەکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و فیکری و

[illegible] دەروونی مرۆڤی کورد- بەتایبەتی [illegible]- و لە کوردستانیش بە- گشتی- لە [illegible] جیاکانی سەدەی نۆزدەمدا.. دیارە هەر [illegible] ئەوەی تر، چ لە فۆرم و چ لە ناوەرۆکدا [illegible] بەزۆری زۆردارەکی قۆناغەکان تێکەڵی [illegible]. هەر چەندە جەدەلیەتێکی بەتین و پتەو [illegible] قۆناغەکانیشدا هەبێ. خۆ دیارە (دەق)یش وەک [illegible] چاکترین شایەدێکی ئەو قۆناغانەن. هەر [illegible] گەمەکردن بەدەق، گوناهێکی گەورەیە و نابێ [illegible] بپۆشرێ، چونکە ڕوخساری مێژوو و قۆناغ [illegible] و مرۆڤیش چەواشە دەکا.

[illegible] دەڵێم: دەبێ پاراستنی (ئەمانەت) لەسەرووی هەموو جۆرە میزاج و هەواو هەوەسێکەوە بێ، چونکی [illegible] مێژوو لەسەرووی هەموو ئەو جۆرە بۆچوون و هەواو هەوەسەیە.

هەر بۆ نموونەو بەس: لەکاتی ساغکردنەوەی دەقدا پشت بە کۆنترین سەرچاوە دەبەسترێ و لێی دەکۆڵرێتەوە و ئینجا چاپ و بڵاوکردنەوەی.. خۆ گەر هات و لەو کۆنەش کۆنتر وەدەسکەوت، ئەوا ئەوەی یەکەم- چ دەسنووس و چ چاپ کەم تا کورت هەڵدەوەشێتەوە و ئەوەی دوایی دەبێ بەسەرچاوەو جێی متمانە و شوێنی خۆی دەگرێتەوە.

(١٠٦) ساڵ بەر لە ئێستا کە ئێستایە، لە ژمارە (٣) ڕۆژنامەی هەرە بەنرخی (کوردستان)ی دایک، کە جووتە برای ئەوەی بەدرخان پاشا (میقداد میدحەت و ئەورەحمان) لە قاهیرەی میسردا دەریانکرد، بۆ یەکەم جار لە دنیای چاپدا هەم ساڵی وەفاتی حاجی و هەم شیعرە ناودارەکەی تری کە بە (زەمانە ڕەسمی جارانی نەماوە) دەسپێدەکا بڵاوکراوەتەوە. ئینجا لەپاش ئەو بە (١٥) ساڵ و هەمدیس بۆ یەکەم جار لە گۆڤاری (هەتاوی کورد)ی ئەستەموولْ، شیعرە هەرە ناودارەکەی حاجی واتە: (٩١)ساڵ بەر لەمرۆ بڵاوبۆتەوە، لە پاشاو دوای (١٢)ساڵ و بۆ یەکەم جار، چاکترین کارێک بۆ دونیای پاکی حاجی کرابێت، چاپکردنی دیوانەکەیتی، بەناوی (کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی) کە لە ساڵی (١٩٢٥) و لەلایەن کوردپەروەرێکی وەک (ئەورەحمان سەعید)ی نەمرەوە، بڵاوکراوەتەوە.

(٢٣) ساڵ بەر لەم ساڵە گۆڤاری (هەتاوی کورد)م دەسکەوت و بوو بە ماخولیام و دوای ئەوە بە (٨) ساڵ لێکۆڵینەوەیەکی فراوانم لەگۆڤاری (کاروان) لەبارەی ئەو گۆڤارەوە بڵاوکردەوە و هەر هەموو ناواخنی ئەو گۆڤارەم ڕاگوازتەوەو بە وردیش گەلێ سەرەتا و دەرەنجامم بۆ ئەو شیعرە خستە بەردەست، بەمەبەستی ئەوەی ئەگەر بکرێ جارێکی تر، سەرجەمی شیعر و نەزمەکانی حاجی بەپوختی و بەخاراوی چاپ بکرێتەوە، سوود لەو سەرچاوە کۆنانەی کە دۆزراون و دەشدۆزرێنەوە، وەرگیرێ و بینە بنەمای ئەو پرۆژەیە. بۆ ئەمەش هاتم و دیوانەکەی مامۆستا ئەورەحمان سەعیدم کردە بنواشەیەک و شیعرەکەی نێو گۆڤاری (هەتاوی کورد) و ئەو چاپە بەنرخەم خستە بەرچێژی بەراوردکردنەوە، چونکە چ چاپەکەی مامۆستا گیوی موکریانی بەهەشتی و چ چاپەکەی مامۆستایان (کەریم شارەزاو سەردار میران) هەر هەموویان لەو سەرچاوە چاپکراوە سوودیان وەرگرتووەو کارە بەنرخەکانیان ئەنجام داوە.

جارێ با لەبەردەم بەسام و شکۆداری (حاجی)دا دەقە کۆنەکەی نێو گۆڤارەکە بخوێنینەوە، ئینجا بەرەو بەراوردکردنی پێنگاڤ هەڵگرین.

«ئودەبا چاکە لێم نەبن دەرهەم- لەم قسەو لەم حیکایەتەی دەیکەم» قەسیدە ناودارەکەی حاجی قادری کۆییە و لاپەڕە (١٧-١٩)ی گرتۆتەوە و بە سەرناوی (قەسیدەی ڕەحمەتی حاجی عبدالقادر کۆیی) تۆمار کراوە و بۆ یەکەم جاریش بڵاوبۆتەوە.. جیاوازی قەسیدەکەی ئێرەش لەگەڵ دیوانە پوختکراو و چاپکراوەکانی حاجی دا (گیو- شارەزا و میران) واکەوتەوە.

**ئودەبا: چاکە لێم نەبن دەرهەم**
**لەم قسەو لەم حیکایەتەی دەیکەم**
**ئیددیعای هەر سەنایعێکی بکەن**
**تاکو نەیبین ئیمتیحانی نەکەن**
**پێی دەڵێن حیلەباز و کەززابە**
**شێخ نەبی خاریجە لە ئەم بابە**
**خانەقا و تەکیە و شێخیان یەکسەر**
**پێم بڵێن نەفعیان چ بوو ئاخر**
**غەیری تەعلیمی تەنبەڵی کردن**
**جەمعی ئەملاک و خەزنە داکردن**
**دەفعەیەک ئیمتحانیان ناکەن**
**تێ بگەن زەهرە یا نەترباکن**
**دەمەحەکی بدەن ئەگەر وەکو زەر**
**تێدەگەن ڕێگرن وەیا ڕەهبەر**
**شێخ ئەوانەن دەشێخییان لادا**
**هیچ کەس ڕزقی هیچ کەس نادا**
**ئەی خەریکی ڕمووز و ناز و نیاز**
**ئەوروپا فەننی گەییوەتە ئیعجاز**
**قوللەیی ئیقلی لە ئەفلاکە**
**عەکسی ئەو گەردشی دەژێر خاکە**

یەعنی ژێر ئەرزی دەبن دەریا
«........»
کوورەیی ئەم زەمینەیان پێوا
خاتری تۆبێ چوونە جەووی سەما
قسەیێ ئەمڕۆ دەیگرن لە زوبان
ساڵێ تر بۆت دەکەن بەبێ نوقسان
سەد و پەنجا لوغەت زیادە دەکەن
ساڵێ بۆ ناوی سەنعەت و بۆ فەن
تۆش وەرە فەننێ فێرە چیت داوە
کافرە یەختیە وەیا جاوە
چینیی ئاتەش پەرستێ ئێستاکەش
گەبری بێ دین و هیندووی ڕووڕەش
بۆچی فەرموویەتی نەبی یی ئەمین
«اطلبوا علمکم ولو بالصین»
لازمە خوێ بخۆی وەکو بەرداش
کوللی قەرنێک دەگۆڕێ ئەمری مەعاش
هەرچی بێ بەهرەیە لە کەسبی کەماڵ
دەبتە دەروێش و مارگر و حەماڵ
تەنبەڵی کاری حیز و بێ خێرە
دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە
ئەهلی جەننەت نەشوان و گاوانە
جوتیار و سەپان و (خەرمەنانە)!؟
لە حەدیسا هەیە حەبیبی خودا
گوتی: الکاسب حبیب الله
موسحەفی خوایە عالیمی برسی
بەدوو نانی دەدات و ناترسی
صفی وەک تیشنە بوو لە زیکری هەتاو
سەد نوێژی دەدا بە کاسەک ئاو
شیعە وەک تیشنەبوو لە سینە زەدەن
بەدوو قەترە درا حوسێن و حەسەن
فایدەی گەر بدایە زیکر و دوعا
دەبووە قاڕوون گەدایی سەر ڕێگا
بە قسەی موخبیر و موئەریخی کۆن
میللەتی چینە چارسەد ملیۆن
سەربەسەر دەوڵەتی هەموو ژاپۆن
زۆر بە زەحمەت دەگاتە سیی ملیۆن
ئەهلی ژاپۆن بە فەن و سنعەتی چاک
سەیری چۆن چینی گرت و کردیە خاک
ئیتتیحادی بە ئیتتیفاقی ئەنام
سوپەرە بۆ حەوادیسی ئەییام
کوردی ئێمە نەزان و پاشکەوتن
پێکەوە پووش و ئاگر و نەوتن
بێ ئەگەر دەستی یەکتری بگرن
وەک سکەندەر هەموو جیهان دەگرن
خواردن و سەتری عەوەرت و سوکنا
باعیسی ژینە بۆ گەدا و پاشا
حاڵەتی وایە چی لەسەر خاکە
غەیری عیسا، کێ لە ئەفلاکە
ئەو هەموو مەدحی بادەو و دولبەر
نووسراوە لە سەد هەزار دەفتەر
وەکو خەمسەی نیزامی یی گەنجە
کە لەلای خەڵقی کیمیا و گەنجە
سەدیەکی پاشا شیرن و فەرهاد
بە کۆتایی دێ، مەعاش و موعاد
ئێستە میللەت دەبوونە ساحیب جاه
یا نەهەمتای «اولیاء الله»
حەیفە بۆ مەردی ساحیبی تەمییز
هێندەی باسی مەکانی پیس و مییز
کێ دەڵێ کوردەکان بە ئیدراکن
بەسە ئەم نەقسە گوێ لەمن ناکەن
لە قسەی ساغی من خەلەل دەگرن
واهیمەی شێخەکان لەدڵ دەگرن
ئەوی موحتاجی نان و پیوازە
یا هەتیوبازە، یانە مێبازە
ئەو کەسەی دەوڵەمەندەکی چاکە
بەندەیی (.....!) ناپاکە
عیشقبازی و هەوای دەروێشی
میللەتی خستە فەقر و بێ ئیشی
هەموو مردووی میان سمتی خرن
بەیتی مەدداحیان بەجان دەکڕن
بەیتی من چونکە کەڵکیان دەگرێ
لە غوربەتی و بێکەسی دەمرێ
تا لەژێر باری دیان نەمرن
زەحمەتە قەدری بەیتی من بگرن
یانە وەک ئەهلی مەغریب ئێستاکی
چیە ناوت؟ دەڵێ: خریستاکی
باوکم (ئەحمەدە) بە فیکرم دێ
خەڵقی لادێ بوو، دایکم (فاتێ)
ڕۆژی ئەووەڵ لە بەندەو و ئازاد
خزمەتی خەڵقە قیسمەتی ئەکرا
(حاجی) سابەسیە سەد هەزار دەفعە
پێم گوتی: ئەم قسانە بێ نەفعە
لێی گەڕێ قەومی تۆ هەموو مارن
دز و حیز و پیاوکوژ و هارن
مری ناوداری ورچی ناودارە
ڕاستیان خوارە، خواری خونخوارە

**بەوکە هەر چۆنی تۆ دەڵێی وایە**
**تێدەگەم ئەم قسانە خۆڕایە**
**قوڕی کام جێ بکەم بەسەر خۆما**
**ئەمە لێم بوویتە عیللەتی سەودا**
**بە قسەی چاکە دەستیان دەگرم**
**تەرکی ناکەم بەڵۆمە تا دەمرم**

جارێ بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێم: ژمارەی بەیتەکانی ئەم چامەیە لەو گۆڤارەدا (٥٩) بەیتە، کەچی لە دیوانە کۆنەکەدا (٤٩) بەیتە.. لە دیوانەکەدا ئەم بەیتە ئەزمانە هەیە و لە گۆڤاردا نییە:

١- دەخیلی شێخ ومێخ مەبە ئەبەدا
هیچ کەسێ ڕزقی هیچ کەسێ نادا
٢- نێرومێ لەم حەدیسە فەرقی نییە
گەر مەلا نەهی فەرموو دینی نییە

لە گۆڤاریشدا ئەم بەیتانە هەیە و لە دیواندا نییە:

١- شێخ ئەوانەن، دەشێخییان لادا
هیچ کەسێ ڕزقی هیچ کەسێ نادا
٢- لە حەدیسا هەیە، حەبیبی خودا
گوتی: (الكاسب حبيب الله)
٣- موسحەفی خوایە، عالیمی برسی
بە دوونانی دەدات و ناترسی
٤- ڕۆژی ئەوەڵ لە بەند و ئازاد
خزمەتی خەڵقە، قیسمەتی ئەکراد
٥- لێی گەڕێ، قەومی تۆ هەموو مارن
دز و حیز و پیاوکوژ و هارن
٦- میری ناوداری، ورچی ناودارە
ڕاستیان خوارە، خواری خونخوار

ئەمەیان وا، لە سووچێکی ترەوە، بە بەراوردێک لەنێوان گۆڤارو دیواندا، پاش و پێشکردن و جێگۆڕکێی بەیتەکان هەر زۆر دیار و زەق و ئاشکران، وەک بڵێی: دوو دەقی جیابن دەشێ بۆ ئەمە چارەیەکی ئەکادیمی بدۆزینەوە..

ئەمەی من لە بارەی یەک چامەی حاجی یا ئەزمی حاجی بوو، ئەی دەبێ ئەوانی دیکە، کە لێرەو لەوێی چاپە کۆنەکان- گۆڤار و ڕۆژنامەم مەبەستە چاپ کراون، چ هەڵوەستەیەکی بۆ بکەین.

دەی ئەمەشیان وا.. سەرباری ئەوەش، لە بەیت و نیوە بەیتەکانی نێوان گۆڤار و دیواندا، جیاوازییەکی بەرچاو هەیە و لە بەراوردکردنا بەم چەشنە کەوتەوە:

لە گۆڤاردا هاتووە:
ئیدیعای هەر سەنایعێکی بکەن
تاکو نەیبینن، ئیمتحانی نەکەن

لە دیوانیشدا واهاتووە:
ئیدیعای هەر سەنایعێک ناکەن
تاکە نەیخوێنن، ئیمتحانی نەکەن

لە گۆڤاردا هاتووە:
خانەقا و تەکیە و شێخیان یەکسەر

لە دیواندا هاتووە:
خانەقاو شێخ و تەکیەکان یەکسەر

لە گۆڤاردا هاتووە:
جەمعی ئەملاک و خەزنە داکردن

لە دیوانیشدا:
جەمعی ئەملاک و خەزنە کۆکردن

لە گۆڤاردا هاتووە:
دەمەحەکی بدەن، ئەگەر وەکو زەڕ
مەحەکی لێبدەن، ئەگەر وەکو زەڕ

لە گۆڤاردا:
اطلبوا علمكم ولو بالصين

لە دیوانیشدا:
اطلبوا العلم ولو بالصين

لە گۆڤاردا:
عەکسی ئەو، گەردشی دەژێر خاکە

لە دیوانیشدا:
عەکسی ئەو گەردشی لەژێر خاکە

لە گۆڤاردا:
کوللی قەرنێک دەگۆڕێ ئەمری مەعاش

لە دیوانیشدا:
هەموو قەرنێک دەگۆڕێ ئەمری مەعاش

لە گۆڤاردا هاتووە:
ئەهلی جەننەت ئەشوان و گاوانە
جوتیار و سەپان، خەرمەسانە

لە دیوانیشدا:
ئەهلی جەننەت ئەشوان و گاوانە
ساحیبی فەن و عیلم و عیرفانە

لە گۆڤاردا:
میللەتی چینە چارسەد ملیۆن

لە دیواندا:
میللەتی چینە چوارسەد ملیۆن

لە گۆڤاردا:
زۆر بە زەحمەت دەگاتە (٣٠)ملیۆن

لە دیواندا:
زۆر بەزەحمەت دەگاتە (٤٠) ملیۆن

لە گۆڤاردا:
وەک سکەندەر هەموو جیهان، دەگرن

لە دیوانیشدا:

وەک سکەندەر جیهان هەموو، دەگرن
لە گۆڤاردا:
سەدیەکی پاشا، شیرن و فەرهاد
لە دیوانیشدا:
یا وەکو (ثلثی)، شیرن و فەرهاد
لە گۆڤاردا:
بەندەیی.... ناپاکە
لە دیواندا:
بەندەیی ڕۆمیانی ناپاکە
لە گۆڤاردا:
لە غوربەتی و بێکەسی، دەمری
لە دیواندا:
لە غەریبی و بێکەسی، دەمری
لە گۆڤاردا:
تا لەژێر باری دیانان نەمرن
لە دیواندا:
تا لەژێر باری ڕۆمیان نەمرن
لە گۆڤاردا:
باوکم ئەحمەدە بەفیکرم دێ
لە دیواندا:
باوکم ئەحمەد بوو ناوی فیکرم دێ
لە گۆڤاردا:
تێدەگەم ئەم قسانەم خۆڕایە
لە دیوانیشدا:
پێم گوتی: ئەم قسانە خۆڕایە
دەی دەبەم چەشنە.. من خۆم و بەڕای خۆم

لەو باوەڕ و قنیاتەدام، کە دەبێ دەقی گۆڤارەکە بکرێتە بنەما و لەبەرچاو بگیرێ، نەک ئەوەی دیوانە کۆنەکە و هەر هەموو دیوانەکانی تریش، کە زۆر زۆر لەم دەقەی گۆڤارەکە جیاوازن و دەسکاری و جێگۆڕکێش کراون.. نیاز خوازم لە چاپی داهاتووی سەرجەم دیوانی حاجیی نەمردا، ئەم ئاماژە کردنەم جێی خۆی بگرێ:

**سەرنج:**

ئەم لێتۆژینەوەیە لە فیستیڤاڵی حاجی قادری کۆیدا خوێندرایەوە، کە لە ڕۆژانی ٦-٨/ ١٠/ ٢٠٠٤ لە شاری شیرینی کۆیە ساز درا.

# ڕیزکردنی بەردەبازەکان بۆ پەڕینەوە
## «خوێندنەوەی چیرۆکی پیرە پەپوولەکانی ئێواران»

**ناسر وەحیدی**
**(بۆکان)**

له خـوێندنەوەی دەقـێکی ئەدەبیـدا، خـاڵـی بنەمـایی ئەوەیە که خوێندنەوەی ئەدەبی خۆی نیزامێکه که هەموو بەشەکانی له پێوەندییەکی تێکسمڕاو و زنجیریدا پێکەوە لکاون. ئەم نیـزامـه بەشگەلێـک کـه هەمـان نیـشـانه وتراوەکـانن ڕێک دەخـات، بەشگەلێ: کـه له بەراورد لەگەڵ یەکتـردا دیاری دەکرێن و دەناسرێن. دەرسەکـانی تەشکخوازی چۆنیەتی باڵاکردن و هەڵچوونی نیزام بەسەر دەستکردەکانیدا فێری ئێمه دەکا و گەرەکیەتی له کەلێن و بۆشـایی پێـوەندی نێـوان دەسـتکردەکـانەود، تەشکی نیـزامـەکه نیـشـان بدات، خـوێندنەوە و هەڵسـەنگاندنی دەقـێکی ئەدەبی به بەشـێـک لەو نیـزامـه پێ مل نـابێ، دەبێ هەر بەشێـک له چوارچێوەی ئەو نیـزامـەدا لەبەرچاو بگیـرێ، ئەگـینا وەک ئەوە وایه بۆ گـورچیلەیەک کـه گایەکمان مردار کردبێتەوە.

**«منم پاکترین خـۆڵڕێژی شـارەکـەت، من نەک هەر خۆم...»**

له چیـرۆکی **پیرە پەپوولەکـانی ئێـوارانی** (شێـرزاد حەسەن)دا دەکـرێ خوێنەر گـومـان لەو «من»ی هەوەڵـی ڕستەکه بکا که بگێڕەوەی هەوەڵ کەسی تاکه. ئایا ناکرێ و ناشێ ئەو منه جـێگری «منی» نووسـەر بێ؟ به هاتنه ئارای ئەو شک و گـومـانه کەسایەتییەکی سەقامگیر که دەڕوانێـتـه گـۆشـەنیگایەکی دیاری کـراوەوە، جـێگری کـەسـایەتیـیـەکی بۆرەتار دەبێ. به سـەرهەڵدانی ئەو کەسایەتییه سەقامگیره لەم چیرۆکه ڕەواییەدا چیرۆکەکه یەکـیـەتیـیـەکی تازە و هێـزێکی شـانۆیی وەردەگـرێ. نیشاندانی گێژەنێکی ڕۆحی که کەسایەتی چیرۆک، یان باشتـروایه بڵێین نووسـەر تێی کەوتووە و تەقەلا دەدا به شێوەیەک لێی دەرباز بێ. گێژەنێک که پەردەیەکی ڕەش و بۆگەنی بەسەر هیوا و خەونەکانی کەسایەتی چیرۆکدا هێناوە، به جۆرێک که چاو له هەموو جوانییەکانی ژیان و کـۆمـەڵگا بنووقـێنێ. ئەو نه تەنیـا شـارەکەی، بگرە هەموو جیهانیش به سەرانگوێلک دەبینێ.



**«کوڕی خۆم... فێربه.. دونیـا زبڵـخـانەیەکی زۆر گـەورەیە.. گـەر گـەرەکتـه لێی حـاڵی بیت... برۆ ناوی و لووتت مەگرە..»**

ئەمـه قـسـەی باوکی کـەسـایەتی چیـرۆک «عـەولا گـووڕێژ»ە و کـەسـایەتی چیـرۆکیش وەک کـوڕێکی به ئەمـەک و گـوێ ڕایەڵ و به حەز و ئۆخژنێکی مازوخیستیەوە (خـۆئازاردان) لەژێر دەسەڵاتی باوک و هەوڵ و

مەرجی داسەپاوی کۆمەڵگادا ڕێگای باب و باپیری دەگرێتەبەر و لەگەڵ ئەم کارەدا ڕادێ.

کەسایەتی چیرۆک نوقمی پیسایی و زبڵ و زاڵی خەڵکی شار دەبێ و ورد سەرنجی تەنەکەی خۆڵی بەر ماڵەکانی شار دەدا و مرۆڤانەترین شتگەلی تێدا دەدۆزیتەوە. ئەو شتانەی کە زۆر بە زەقی دیارن، بەڵام خەڵکی شار خۆیانی لێ نەبان دەکەن. چاویان دەنووقێنن بۆ ئەوەی نەیان بینن، گوێیان دەئاخنن کە نەیان بیستن، لووتیان دەگرن بۆ ئەوەی بۆنیان نەکەن، دۆزینەوەی پاکی لەناو پیسیدا، فسکەفسک، چریەی لە بارچوو بەر لەوەی لە زار بکەونە خوار، پرشنگ و ورشەی چاو، کسپە، دزەی نیگا... ئەم شتانە هێند زۆر و گەورەن کە دەکەونە بەرپێی خەڵکی شار، ساتمە دەبەن، لەوانەیە ملیان بکشێ، بەڵام خۆیان شلوێ ناکەن و گورجێ سەیری ئەملا و ئەولای خۆیان دەکەن بزانن مەبادا کەسێک چاوی لێیان بووبێت.

خوێنەر لە هیچ شوێنێکی ئەم چیرۆکەدا تاقە وشەیەک نادۆزێتەوە کە وانیشان بدا کە کەسایەتی چیرۆک بە پێچەوانەی خەڵکی شار دژی کار و پیشەکەی خۆیەتی، یانی پاککردنەوەی شار لە پیسایی بە کارێکی خراپ و عەیب بزانێ، لەگەڵ ئەوەیدا کە ئەو کەش و هەوا ڕەش و بۆگەنەی دنیای کەسایەتی چیرۆکی سیخناخ کردووە، ئەو هەوڵ و تەقەلای خۆی دەدا، ئەگەرچی ئەو هەوڵە زۆر بچووکیش بێ. ئەمە نیشان دەدا کەسایەتی چیرۆک لە شەوەزەنگی بێ هیواییدا باوەڕێکی پتەو و قووڵی هەیە، خەونێکی مەزنی هەیە بۆ دەربازکردنی خۆی و شارەکەی لە پیسایی، ئەگینا لەسەر ویستی گراوەکەی وازی لە پیشەی باوکی دێنا، ئەو نە تەنیا باوکی ناچار ناکا دەست لە کارەکەی خۆی هەڵگرێ، خۆیشی پیشەی باوکی ڕەچاو دەکات. ڕەنگە هۆی سەرەکی ئەو کارە پابەند بوونی کەسایەتی چیرۆک و بنەماڵەکەیان بە خاکەوە بێ.

**چیرۆکی (پیرە پەپوولەکانی ئێواران)** لەگەڵ ئەوەی ڕەگەیەکی زۆر بەهێزی سروشتخوازی و لایەنگری لە پاک و خاوێنی سروشتی تێدایە، باسی پاوان بوون و بەسترانەوەی ئەبەدی بە خاک و خۆڵەوە دەکا. باپیرەی کەسایەتی چیرۆک دەبێتە خۆڵڕێژی شار، باوکی دەبێتە میراتگری باوکی خۆی، ئەویش دەبێتە خۆڵڕێژ، دایکی خۆڵخۆرە. ئەم سێ کەسە بە دەوری کەسایەتی چیرۆکدا سێکوچکەیەک پێک دێنن کە غەیری خۆڵڕێژی ڕێیەکی تری بۆ نامێنێتەوە.




**«بنەماڵەکەمان لەگەڵ خۆڵدا لە زەمانێکی زووەوە سەر و سەودای گەرمی هەیە».** ئەو سەر و سەودایە کەسایەتی چیرۆک پاوان دەکا مل بنێتە بەر ئەم خۆ جەزرەبەدان و ئازارە و دڵی بکاتە مەکۆی خەمی تەواوی خەڵکی شارەکەی. ببێتە تاقانە گوێگری نهێنیترین و شاراوەترین ڕازی شۆخە کچان، کچە کاڵفامەکان، قەیرەکچان، ئەو کوڕە گەنجانەی لاقیان نییە و بۆ ژوان بە چێوشەقە و عارەبانەی ئیفلیجیان (ویلچێر) دێنە سەر ئەو ڕاستە شەقامە کە لە ناوەڕاستەوە شار دەکاتە دوو کەرت تا دڵداری تێدا بکەن. دەبێتە ئەمانەتداری هەزاران فرمێسکی ڕژاوی ئەو قەیرەکچانەی کە تەواوی ماوەی تەمەنیان بێ سەمەر چاوەڕوانی گەڕانەوەی لاسی خەونەکانیان بوون.

فرۆید دەقێکی ئەدەبی و خولیا ئاساییەکان بەیەک شت دەزانێ و ئەو وەک دامرکاندنی خەیاڵی داخوازییەکانی نەست لەبەرچاو دەگرێ. کە لەلای مرۆڤگەلێکی تر دەبێتە هۆی هاندان و پێگەیشتن و ڕازیکردنی ئارەزووگەلێکی هاوتا. جیاکردنەوەی چەمکێک لە دەقەکان «گێڕانەوەی خولیا»یە، خولیایەک کە چیرۆکنووس دەیداتە پاڵ کەسایەتییە خەیاڵییەکانی چیرۆکەکەی خۆی. چیرۆکنووس لە مابەینی زەوی و ئاسماندا زۆر شت دەناسێ کە زانستی قوتابخانەیی ئێمە هەنووکەش ناتوانێ تەنانەت بیریشیان لێ بکاتەوە. ئەوە بۆ خوێنەر زۆر گرینگە بزانێ کە شوێندانان و بیرەوەرییە تایبەتییەکانی هونەرمەند تا چ ڕادەیەک لە بەرهەم هێنان و خوڵقاندنی بەرهەمێکی هونەری کاردانەوەیان بووە، یانی خوێنەر گەرەکیەتی لە دەقەوە بازبداتە سەر ژیاننامەی هونەرمەند و لە کەسایەتی چیرۆکەوە بۆ نووسەر. خوێنەر گرودۆڵی دۆزینەوەی پێوەندی نێوان دەق و ژیانی نووسەردکەیەتی. نەزرەیەی ڕۆمان لەسەر ئەوە

پێ دادەگرێ کە سیمای ڕۆمان، نیشان دانەوەی دنیای نەت و پەت کراوە. ئاڵوگۆڕی ئەدەب و ئاڵوگۆڕی کۆمەڵگا و تەشکی ئەدەبی و عونسورێک لە مەنتیقی مێژووی فەلسەفە پێکەوە دەبەستێتەوە، سیمای دەقێکی گەورەی ئەدەبی سەر بە قۆناغێکی مێژووی کۆمەڵایەتییە. تایبەتمەندی نووسەرێکی گەورەش، هۆگری نە ڕادبەدەری ئەوە بە ڕاستەقینە، ڕاستەقینەیەک کە لە هەموو مەبەست و پێش فەرزەکانی ئەو مەزنترە.

نووسەری چیرۆکی پیرە پەپوولەکان لە «دنیایەک دەدوێ، لە شارێک دەدوێ کە ڕاستە شەقامێک شارەکەی کردووە بە دوو کەرتەوە. کەسایەتی چیرۆک کاتێک کە شەقامەکە چۆڵ دەبێ، دەست دەکا بە خاوێن کردنەوەی پیسایی و ئەوەندە خۆ نەوی دەکا تا پشتی دەبێ بە دوو کەرتەوە، نووسەر بەهێنانە ئارای دوو بەری شەقام دوو پرسیار لە زەینی خوێنەردا دروست دەکا، یەک: ئەم بەری شەقام لەگەڵ ئەوبەری شەقام چ تەوفیرێکیان هەیە؟ دوو: ئەم ڕاستە شەقامە چییە کە خەڵکی هەر دووبەری شەقام بۆ دڵداری نا! بۆ هەڵڕشتنی داخ و دەردەکانیان دێنە سەری، نا ببوورن پیرە پڵنگەکان لەوێ ڕاودەووی پیرە پەپوولەکان دەنێن؟ یان دەیان پرسیاری سەیر و سەمەرەی تر، وەک تۆ بڵێی ئەو پڵنگانە هەروا بە پیری لە دایک بووبن، یان سەردەمانێک لە شاخ شفرەی بەرازی بەلەسە و شاخی کەڵی ملهوڕیان نەشکاندبێ و ڕۆژێک چاوی مار و سیخوڕیان دەرنەهێنابێ؟ شەوێک لوورەی گورگ و چەقەڵ و کەمتیاریان نەخنکاندبێ؟ چۆنە ئێستا کەوتوونەتە ڕاو ڕاوێنی پەپوولە و باڵیان دەقرتێنن؟

تۆ بڵێی ئەو پڵنگانە بە هاتنە ناو شار، خێرا پیر نەبووبێتن؟ تۆ بڵێی چیرۆکی پیرە پەپوولەکانی ئێواران ئاوێنەیەکی باڵا نوێن نەبێ بۆ ئەوەی پڵنگەکانی شاخ پیریی خۆیانی تێدا ببینن؟ تۆ بڵێی بۆ ئەوە نەبێ ئەوانەی وا بەڕاستی پڵنگن بە شوێن ئاوی حەیاتدا بەرێ، خۆیان لە پیری ڕزگار کەن و عومرێکی هەتا هەتاییان پێ ببەخشێ؟ یان خوێنەر دەتوانێ بپرسێ تۆ بڵێی خۆشەویستی پڵنگەکان وەها کاری نەکردبێتە سەر کەسایەتی چیرۆک «نووسەر» لەگەڵ ئەوەی هەموو ئێوارەیەک سەدان و هەزاران کەڵبەی ڕزیوی هەڵوەریو کۆدەکاتەوە و بە بەرچاوییەوە، پڵنگە پیرەکان ڕاودەووی پیرەپەپوولەکان دەنێن، بڕوا بەخۆی نەکا؟ ئەوەیە کە خوێنەر بۆی هەیە لە کەسایەتی چیرۆک و لە نووسەریش گومان بکا؟!

# قەولیٚ سوڕا ئەفرینا دنیایێ

د. سدیق بۆرەکەیی
(تاران)

## پێشەکی

ئەم قەولە هەروا دەیخوێننەوە بە زاراوەی کرمانجی باکوورییە و مێژووی نووسینی دەگەڕێتەوە بۆ هەشت سەد ساڵ لەمەوپێش کە گەلێ بایی دارە. لەم قەولەدا گەلێ بیرورا و بڕوای کۆنی باووباپیرانمان کە بڕوایان پێ بووە، بۆ دەردەکەوێ کە بە شێوەیەکی سادە و ڕەوان هۆنراوەتەوە.

گرنگی و بایی ئەم قەولە لەوەدایە کە گەلێ وشەی ڕەسەنی کوردی تێدا بەکاربراوە کە گەلێ لەو وشانە ئێستا بەکارنابرێن و ئەگەر ئەم قەولە نەبوایە ئێمە لەو وشانە هیچ چەشنە ئاگاییەکمان نەبوو. هەروەها گەلێ زارا و لەم قەولەدا بەکاربراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەورە و هیوادارم کە لە داهاتوودا بتوانم قەولەکانی تری ئێزیدی لە خەتی ئێزیدییەوە بێنمەسەر ڕێنووسی ئێستای کوردی و پێشکەشی خوێندەوارانی بەڕێز و هێژای کوردی بکەم.

### قەولی سوڕا ئەفرینا دونیایێ

ئەم قەولە سەبارەت بە خولّقاندن و بەدی هێنانی مرۆ و گیانداران و ئاسمان و زەوییە کە شێخ حەسەنی هەکاری بە هۆنراوی شەش و حەوت و هەشت و نۆ و دە و یازدە و هیجایی بەپێی ڕێ و ڕەوشتی ئێزیدی هۆنیوبەتەوە.

شێخ حەسەن کوڕی ئەبولبەرەکاتی هەکاری کە بەتاجولعارفین ناسراوە، بە پێی پەڕاوی (سماط الامراء) لە ساڵی ٥٩١ی کۆچی لە شاری هەکاری لە دایک بووە و لە ساڵی ٦٤٤ لە پەنجاو پێنج ساڵیدا بە دەستی بەدرەددینی لۆلۆی فەرمانڕەوای مووسڵ کوژراوە و لە زێدەکەی خۆیدا بەخاک سپێرراوە.

یەکێ لە شوێنەوارەکانی شێخ حەسەن چەکامەیێکە بەناوی سوڕا ئەفرینا دونیایێ واتە: ڕازی بەدیهێنانی جیهان کە بە زاراوەی کرمانجی باکووری هۆنراوەتەوە، ئەوا لێرەدا پێشکەشتانی دەکەین.

بەپێی کتێبی مەسحەفاڕەش، بەر لە بەدی هێنان و خولّقاندن، تاریکی هەموو جێگەیێکی داگرتبوو و ڕووناکی و ڕۆشناییەک لەوێدانەبوو و خوا لە ناو مرواریيەک دابوو بە ناوی دوڕی سپی و کاتێ لە دوڕەکە هاتە دەرەوە، دوڕەکە تەقییەوە و دووکەڵێکی لێ هەڵساو ئاسمان و زەوی و مانگ و ئەستێرەکان و هەتاوی لێ بەدی هات و لە پاشان خوا ڕووەک و دارو درەختی جۆر بەجۆری لە دەشت و کێوا بەدی هێنا و ئاگرێکی لە کێوی لالەشدا کردەوە تا هەموو دەم ڕووناک بێ و خەڵک لە ڕووناکیەکەی کەڵک وەرگرن.

پاشان مەشیە و مەشیانە، یا دایک و باوکی مرۆی لە چوار ڕەچەڵەک (ئاو و باو خاک و ئاور) خولّقاند و گیانی کردە لەشەکەیان و ناردیانیە بەهەشت و پێیانی ڕاگەیاند کە لە هەموو جۆرە میودبێکی بەهەشت بخۆن و

...مەر تەنیا دەست بۆ گوڵەگەنم نەبەن و خۆیانی لێ بپارێزن، بەڵام تاوس کە سەرۆکی فریشتەکانە ئەوانی هاندا کە لەو گەنمە بخۆن و ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە ئەوان لە بەهەشت دەرکرێن و کاتێ لەسەر زەویدا نیشتەجێ بوون لەگەڵ یەکتردا پێوەندی ژن و مێردییان بەست و لەپاش نۆ مانگ کچ و کوڕێکیان بوو، لە پاشا گەلێ منداڵیان لێ کەوتەوە کە تەواوی ڕەگەزەکانی جۆر بەجۆری حەوت کیشوەری جیهان لە پشتی ئادەم کەوتووەتەوە. هۆنەرێک دەڵێ:

**کاتێ دەرکرا ئادەم لە بەهەشت**
**کەوتە ناو کەژ و بیاوان و دەشت**
**ئەوەندە گریا تا خووا بەخشی**
**ئارام بووەوە دەروونی گەشی**
**ئێستا تەواوی بنەچەی مرۆ**
**لە وەچەی ئەون خۆت نەکەی ترۆ**

[illegible]

قەولێ سوڕا ئەفرینا دونیایێ

**یا ڕەبی دونیا هەبوو تاری،**
**تێدا تو نەبوون مشک و ماری،**
**تە زیندی کر تەزە حالی،**
**ج نەما گول ژێ باری**
**یا ڕەبی، تو هۆستایێ کەریمی،**
**تەفەکر دێ و دریا تاری،**
**تو هۆستایی هەر تشتی،**
**بهوشت چێ کر ڕەنگە بی،**
**ئەرد و ئەزمان تو نەبوون،**
**دونیا فرە بێ بنە بوو،**
**ئیسان و حەیوان ژێ تو نەبوون،**
**تە خالق سازکر،**
**د بەهرەدا تەنێ هەبوو دڕ،**
**نە دیاشی یا، نە دیەشی یا،**
**تە خاش روح ئانی بەر،**
**نوورا خالق پەیدا کر،**
**گۆشت و ڕوح هاتنە بەر،**
**نوورا چاڤان لێ هاتە دەر،**
**دەست و پێ کرە لەش،**
**لێ شیرن کر گۆت و بێژ،**
**خوداڤەندێ مە هۆستایێ ڕەحمانی،**
**ڕێ و دەرگەهێ دونیایێ ڤەکر،**
**هەر تشت ژ مەرا دەرنانی،**
**بوو بهوشت ئەردو ئاڤانی،**
**خوداوەندێ مە تشتی دناسە،**
**دوڕا کەسێ ژێ کر ئەساسە،**
**ژێ پەیدا کر مێرێ خاسە،**
**گۆت: «ئەڤا هێ نە بەسە»**
**دوڕ ژ هەیبەتا ئێزدان هنجنی،**
**تاقەت نەکر، هلگەڕی،**
**ژ ڕەنگێ ئیسان خەملی،**
**سۆر و سپی لێ هێوری،**
**ئێزدانی مە ب ڕەحمانی،**
**حوسن و جەمال ژ مەرا ئانی،**
**دەستوور دا قەلەمێ قودرەتێ،**
**ئەم ئاڤێتن ناف سوڕا مۆبەتێ،**
**هاڤێتن ئاڤێتە بەحرێ، بەحر پێ مەیانی،**
**دەخانەک ژێ دەخوەرنی،**
**چاردە تەبەق ئەرد و ئەزمان پێ نژنی،**
**ئێزدانی مە دوڕ دەرئانی،**
**مۆبەت ئاڤێتە ئاڤێ،**
**ژێ پەیداکر دوو چاڤێ،**
**ژێ هەرکی پەر ئاڤێ،**
**ئاڤ ژ دوڕێ حەرکی،**
**بو بەحرا بێ سەری بێ بنی،**

بێ ڕێ و بێ دەری
ئێزدانی مە سەر بەحرێ گەڕی،
ئێزدانی مە سەفینە چێ کر،
ئیسان، حەیوان، تەیرو توو،
جۆت بۆ جۆت ل سەفینێ سیارکر
خوداوەندێ مە سەفینە سەرە،
سەریکی دگەڕە چارکەنارە،
سەفینە قوول بوو ئاڤ کەتە سەرە،
مارێ خەرێ خا دانە بەرە،
خوداوەندی مە سەفینە ئاژۆت،
ژ کەنار چوو بەرکەنارە،
ئاژۆتە لالیشی گۆت: «هەق وەرە»
سولتان ئێزدی خوەش ڕێ بەرە،
لالیش کو ڕکنی بەشەرە،
نها ئێزدی ژێ خەبەرە
یا ڕەبی، بانگ دکم شێخێ مەزن،
چاڤ کانی، ئاڤ ژێ دزێن،
یا ڕەبی تە دنیا چێ کر، دنێ یا ب خێر،
ئیسان تێدا دژین ب تێر،
شەڤێت ڕەش، شەڤێت تاری
جی نەما گول ژێ بارین،
خوداڤەندی کەریم و ئەزمان
دا بەر مە ڕوح و زمان،
خوداڤەندێ مە ڕەبل سەمەد،
ئەفراندن شەش ملیاکەت
جوداکر ڕۆژ و جنەت
خوداڤەندێ مە ئەرد چێ کر، ئەزمان گوهاستن،
مجالە ئەردێ ب ڕاستن، نۆبەتا قەزا گوهاستن.
ل گونەهباران بوو ڕوهتێن
چقاس خوداڤەندێ مە دنیا دکر سەفەرە،
سفر دکر دارو بەرە،
پێ نژنینە ڕکنێ مەخبەرە
خوداڤەندێ مە هۆستا بەرە،
لالیش ژۆردا ئانی خوارە
لالیش بوو خاش جی و وارە،
ل ئەردێ شێن بوو نەباتە،
پێ زەینی زێندی قنیاتە
خوداڤەندێ مە ڕەحمانی،
چار قسم ژ مەرا دانی،
پێ حەبیبا ئادەم نژنی،
خوداڤەندی مە ڕەحمانی،

چار قسم ل ڕوو دنێ دانی،
یەک ئاڤە، یەک نوورە،
یەک ئاخە، یەک ژی ئاگرە
خوداڤەندی مە ب ڕەحمە،
دیارکر سازو قودوومە،
هاڤینە ئادەم هەڤسوور زۆر تخوویە،
هەڤسۆر گەری یا، هات هنداڤە،
غالبا ئادەم مابوو بێ کاڤە،
گۆ: «روحۆ، چما ناچی ناڤە»؟
خوداڤەندێ مە قودرەتە،
زەیاندی چقاس خولیاقەتە،
ژێرا چێ کر دۆژ و جنەتە،
خوداڤەندێ مە ئەرد چی کر، ئەزمان گوهاستن،
مەجەلا ئەردێ ب ڕاستن، نۆبەتا قەزا ڕاستن،
ژ ئیسان قەنجیتی خاستن،
لالیش ژ ئەزمان دهاتە،
ئەرد شێن دبوو گیهاتە،
پێ چەیران چقاس قنیاتە،
خوداڤەندێ مە ئینی کر ئەساسە،
شەمبێ بری کراسە،
چارشەمێ کر خلاسە،
هەڤسەد سال پاش هەڤسوور هات دوڕا نکاسە،
هەڤسەد سالی ژ بەری ئادەم ژمارە،
ئەردێ خارا نەگرتی شیارە،
هەتا لالیشا نووری ناڤدا هنارە،
ویاندا ڕوح هەدری،
هات و چوو بهری،
نوورا مۆبەتێ هنگاڤتە سەری،
هات غالبێ ئادەم دا هێووری،
خوداڤەندێ مە ڕەحمانی،
کاسا سورێ ژ ئادەمرا ئانی،
ئاڤ ژ کاسێ ڤەخار، ڤەژی یا،
جیدا مەست بوو، هەژی یا،
گۆشت ژێ خاست وی ڕوحی،
خوین ل جانێ وی گەوزی،
خیرەت کەتە ئاڤ سەری،
ئادەم خار ژی وێ کاسێ،
سوزا کاسێ خاس لێ تێ،
کەرەمەتا کاسێ گیهیشتێ، بهوشتێ،
مەلەکا ملێ ڤێ گرت، ئاڤێتە بهوشتێ،
ئادەم ژ کاسێ ڤە دخارە،

كەرەمەتا كاسێ پیڤا دیارە،
خا بێژی بوو هشیارە،
گۆ: «ئەڤ ئەرد چ خاشە».
گیهایێ شێن سەرگەشە،
ڕۆژ ڕۆژا مێرێ کەلەشە،
خوداڤەندێ مە ڕەحمانی،
ژ مەڕا کەرەمەک ئانی،
دەم و دەزگێ باش دانی
هەی ئادەمۆ ڕوو دنێ،
هەردەم بکە ئیمانێ،
خوداوەند ئەم خلاس کرن ژ تۆفانێ،
گەلی مریدان بکن کاری،
خێرا قودرەتێ ژ ژۆر باری،
خا دوور خن ژ نەیاری،
کەرەمەتا خوداڤەندێ مە هاتە خوارێ،
ئەرد و ئەزمان بێن خودانێ خێرێ،
قەت ژ بیر نەکن ڤێ خەبەرێ.

* * *

قەولی ڕازی بەدی هێنانی جیهان

خوایا جیهان لە ڕۆژی بەریندا تاریک و تار بوو
تیایا مشک و مارێک نەبوو
تۆ لە نوێوە زیندووت کردەوە
ئەوەندە ڕانەبورد کە گوڵت تێدا ڕواند
خوایا تۆ وەستایێکی بەخشندە و دڵاوای
تۆ دەرکەکانی تاریکت کردەوە
تۆ مامۆستای هەموو شتێکی
بەهەشتت جوان و ڕەنگین خوڵقاند
ئەوکاتە زەوی و ئاسمان نەبوون
جیهان گەلێک پان و بەرین و بێ بن بوون
مرۆ و گیانداریش نەبوون.
تو خۆت لەوەدا پیشان دا
لە دەریادا تەنیا دوڕ و مرواری یێک هەبوو(١)
هەر لە مێژەوە توانی خۆی بپارێزێ
تۆ باش گیانت بەودا
تیشکی خۆت لەوەدا دەرخست
گۆشت و گیانت بە لەشی ئادەم بەخشی
وە سۆمات دایە چاوانی ئەو
دەست و پێ و لاقت دایە لەشی
وت و وێژت بۆ شیرین کرد
خوایا تۆ وەستایێکی بەخشندە و دڵاوایت

ڕێ و دەرگای جیهانت بۆمان کردەوە
هەموو شتێکت بۆ ئێمە دەرهێنا
زەوی وەکو بەهەشت ئاوەدان بووەوە
خوای ئێمە هەموو شتێک ئەناسێ
ئەو دوڕ و مرواری یەکەی کردە بنەڕەتی هەموو شتێک
وە لەوەی شتی چاکی بەدی هێنا
و وتی: ئەمەش هێشتا بەس نیە
وە دوڕەکە لە سام یەزدان تەقییەوە
تاقەتی نەهێناو هەڵگەڕاو تێک چوو
وە بە ڕەنگی بنیادەم ڕازایەوە
سوور و سپی لەوەدا کۆبووەوە
یەزدانی ئێمە لە ڕووی خۆشەویستییەوە
چاکی و جوانی بۆ ئێمە هێنا
دەستووری دا کە پێنووسی هێز
ئەوە ئاوێتەی خۆشەویستی بکەن
ئەوسا دوڕەکەی ئاوێتەی دەریا کرد و دەریاکەی پێ گرساند
درز و قەڵیشێکی لێ دەرکەوت
وە چواردە چین زەوی و ئاسمانی پێ هێنایەدی
یەزدان دوڕەکەی هێنایە دەرەوە
خۆشەویستی تێکەڵی ئەوە کرد
وە لەوە دوو سەرچاوەی بەدی هێنا
وە چەند دڵۆپی ئاوی لێ تکا
وە ئاو لە دەریایێکی قووڵ و بێ بن
بێ ڕێ و بێ دەرو بێ سنوور
یەزدان بە ڕووی دەریادا گەڕا.
یەزدان کەشتییێکی دروست کرد
مرۆ و گیاندار و پەلەوەر
جووت جووت سواری کەشتییەکەی کرد
خوای ئێمە لەسەر کەشتییەکەدایە
ماوەیێک چوارگۆشەی جیهان گەڕا
بەڵام کەشتییەکە کونا بوو و ئاو هاتە سەر
مارێک خۆی خزاند و کونەکەی گرت
خوای ئێمە کەشتیەکەی لیخوڕی
لە کەناری دەریا دوور بووەوە
وە کەشتیەکەی گەیاندە کێوی لالەش و وتی: ئەی هەق وەرە
سانی ئێزیدی ڕێبەرێکی ڕند و باشە
کێوی لالەش پایەی مرۆیە
ئێزیدییەکان ئێستا بەوە ئاگەدارن
خوایا، ئەبێ شێخی مەزن بانگ کەین

له چاوه‌كانی كانی، ئاو هه‌ڵئه‌قوڵێ
خوایا تۆ جیهانت به‌دی هێنا، جیهانێكی پڕ له پیت و پێز
مرۆ له‌ناویا به تێری ژیان ئه‌باته سه‌ر
له شه‌وه‌كانی ڕه‌ش و شه‌وه‌كانی تاریكدا
جێگایێک نه‌ما كه له‌وه‌دا گوڵ نه‌ڕوێ
خوا به‌خشنده و دلاوایه
زه‌وی و ئاسمانی كرده پایه و هه‌ستوون
وه گیان و زمانی دایه ئێمه
خوای ئێمه له هه‌موو شتێک بێ نیازه
ئه‌و شه‌ش فریشته‌ی به‌دی هێنا (٢)
وه دۆزه‌خ و به‌هه‌شتی له یه‌ک جیاكرده‌وه
خوای ئێمه زه‌وی داهێنا و ئاسمانی به ئه‌ستێره‌كان ڕازانده‌وه
وه وتی: ئێستا ئه‌بێ زه‌وی ته‌خت بكرێت و نۆره‌ی گۆڕانی قه‌زایه
گیان له گوناهكاران گیرا
خوای ئێمه چه‌نده به جیهان دا ئه‌گه‌ڕا
به‌سه‌ر دار و به‌ردا ئه‌گه‌ڕا
ده‌روونی بنیاده‌م به‌وه بته‌و بووه‌ته‌وه
خوای ئێمه وه‌ستایه
كێوی لالەشی له ئاسمان هێنایه خواره‌وه

[illegible]

لالەش سه‌یرانگا و شوێنێكی باشه
له زه‌ویدا شینا وه‌ردی سه‌وز و شین بوو
ئه‌گه‌ر به زه‌ینی خۆت دا بگه‌ڕێیت ڕازی ئه‌بی
خوای ئێمه به‌خشنده و به به‌زه‌یی یه
ئه‌و چوار شتی بۆ ئێمه هێنایه دی
خوای ئێمه به‌خشنده و دلاوایه
چوار شتی له ڕووی زه‌وی دانا
یه‌ک ئاوه، یه‌ک تیشكه
یه‌ک خاكه، وه یه‌ک ئاوره (٣)
خوای ئێمه به‌خشنده و به به‌زه‌یی یه
ساز و هه‌نگاوی ئاشكرا كرد
ڕازێكی زۆری نایه دڵی بنیاده‌م
ئه‌م ڕازه ئه‌وه‌نده زۆر بوو كه هاته‌بان
قالبی ئاده‌م بێ گیان مابووه‌وه
فریشته وتی: ئه‌ی گیان له‌به‌رچی ناچیته ناو له‌شه‌كه‌وه
خوای ئێمه توانا و به‌هێزه
پاشان چه‌نده ئافه‌ریده و گیانداری به‌دی هێنا
وه دۆزه‌خ و به‌هه‌شتی داهێنا
خوای ئێمه زه‌وی هێنایه‌دی و ئاسمانی ڕازانده‌وه
ئێستا نۆره‌ی ئه‌وه‌یه كه زه‌وی ته‌خت بێ و نۆره‌ی قه‌زای ڕاسته
ئه‌و له بنیاده‌م چاكه و دروستی ویست
كێوی لالەش له ئاسمانه‌وه هات
ئه‌وسا له زه‌وی گیا و ڕووه‌كی جۆراوجۆر ڕووا
وه گیانداران به قنیات ئه‌له‌وه‌ڕان
خوای ئێمه ئه‌مه‌ی كرده بنه‌ڕه‌ت و به فریشته‌كان فه‌رمانی دا
ڕۆژی شه‌مه كراسێكی بڕی
وه ڕۆژی چوارشه‌مه دوورانی
حه‌وت سه‌د ساڵ له‌پاش ئه‌و نهێنییه، دوره‌كه ئاشكرابوو
حه‌وت سه‌د ساڵ به‌ر له ئاده‌میش بژمێره
زه‌وی به‌خۆی وریایی نه‌دی بوو
تا كه له ده‌روونی كێوی لالەشه‌وه ئاورێک هه‌ڵكرا
وه گیان له ڕێگه‌وه خۆی گه‌یاند
وه هات و چووه ناو ده‌ریا
خوا تیشكی خۆشه‌ویستی تێكه‌ڵ كرد
وه گیان چووه له‌شی ئاده‌م
خوای مه به‌خشنده و دلاوایه
پیاڵه‌ی نهێنی بۆ ئاده‌م هێنا
ئاده‌م ئاوی پیاڵه‌ی خوارده‌وه و گیانی تێ هات

وە لە جێدا مەست و سەرخۆش بوو و کەوتە جم و جووڵ

**گیانەکە لەو داوای گۆشتی کرد**
**خوێن لە لەشیدا کەوتە جم و جووڵ**
**زاتی پەیدا کرد و خیرەت کەوتە سەری**
**ئادەم لە ئاوی ئەو پیاڵەی خواردەوە**
**گەورەیی و پیرۆزی پیاڵەی بۆ دەرکەوت**
**لە ئاوی ئەو پیاڵە گەورەیی پێ گەیشت**
**فریشتەکان ملیان گرت و بردیانە بەهەشت**
**ئادەم هەر لە ئاوی پیاڵەی نەخواردەوە**
**گەورەیی ئەو پیاڵە لەو دەمەدا دەرکەوت**
**بژمن و لە خەوی نەزانی وریای بووەوە**
**وتی: ئەم زەوییە چەندە باشە**
**گیاکانی تێدا سەوز و شینە**
**رۆژ ئەوا رۆژی میری خۆش هەندامە**
**خوای ئێمە بەخشندە و دڵاوایە**
**بۆ ئێمە گەورەیی و رێزی هێنا**
**دەم و دەزگاییکی باشی بەدی هێنا**
**ئەی مرۆیانی رووی زەوی!**
**هەموو دەم بەخوای مەزن بڕوابێنن**
**خوا ئێمەی لە تۆفان رزگار کرد(٤)**
**ئەی لایەنگران! لە رێی خوادا تێکۆشن**
**پیت و پێزی ئەو بۆ ئێمە هاتە خوارەوە**
**خۆتان لەناتەبایی و نەیاری دوورخەنەوە**
**گەورەیی خوا بۆ ئێمە هاتە خوارەوە**
**زەوی و ئاسمان پیت و پێزمان پێ ئەدەن**
**ئێوەش لەو پیت و پێزە بەهرەمەند ئەبن**
**هیچ کاتێ ئەم قسە لەبیر مەبەنەوە**

**پەراوێزەکان**

١- بەپێی قسەی نۆلدکە ئەوەی کە خواچووەتە ناو دوڕ و مرواریبەک و ماوەیێک لە ناو دوڕەکەدا ژیاوە و پاشان هاتووەتە دەردوەو جیهان و مرۆی بەدی هێناوە بەشێکە لە بڕوای بنەڕەتی مانەوییەکان و یاربیەکانیش (کاکەییەکان) هەر لەسەر ئەو بیروڕایەن.

٢- ئەم شەش فریشتە لە کتێبی ئاوێستادا ناویان هاتووە و بریتین لە: «بەهمەن، ئوردی بەهەشت، شەهریوەر، سەپەندارمەز، خورداد، ئەمورداد» کە لەگەڵ ئەهورامەزدادا حەوتە وانەیێک دەهێننەدی و بەپێی پەراوی ڤەندیداد، ئەم فریشتانە لە ئاسمانی هەرە بەرزدا واتە: ئەو جێگایەی کە ئەهورامەزدای تێدایە لەسەر تەختێکی زێڕین دانیشتووە، ئەوان نوێنگەی دانایی و ڕاستی و دروستی و لەخۆبووردن و ئەوین و خۆشەویستی و بێ مەرگین و هەرکام ئەرکێکی تایبەت بە ئەستۆیانەوەیە تا چەرخی زەمان بەو جۆرە کە ئەهورامەزدا ئەیەوێ دەبێ هەڵیسووڕێنن.

٣- چوار ڕەچەڵەک لەناو کوردەکاندا هەر لە مێژەوە پیرۆز بووە و لە پەڕاوی ئاوێستادا سەبارەت بەم چوار ڕەچەڵەکە گەلێ باس کراوە و هەندێ لەو ڕەچەڵەکانەوە وەکو: ئاگروبادا گریەشتی تایبەتین و خاکیش هالە ژێر چاوەدێری ئەمشاسپەنتاو ئاویش لەدوای ئاورپیرۆزترین ڕەچەڵەکە و لە یەسنادا لە ئاو و فریشتەی ئاهێدگەلێ باس کراوە و کوردەکان ئەم چوار ڕەچەڵەکیانە هەرگیز پیس نەکردووە و بە پاکی و خاوێنی پارازتوویانە.

٤- لە پەڕاوی ڤەندیداد دا هاتووە کە نۆ سەد ساڵ لە پادشایەتی جەمشێر تێپەڕی و لەم ماوە درێژەدا زەوی لە جانەوەر و مرۆ و پەلەوەر پڕ بوو و جێگایێک چۆڵ نەمایەوە و ئەهورامەزدا بە جەمشێری ڕاگەیاند لەبەر ئەوەی زستانێکی زۆر سەخت دێتە بەر و تۆفانێکی گەورە هەڵدەستێ، هەموو مەڕ و ماڵات و دڵسات و جانەوەرەکان لەناو دەبا و دەبێ ئەشکەوتێکی گەورە فەراهەم کەیت و لە هەر گیاندارێک نێرو مێیەک لەو ئەشکەوتەدا دانێ و تەنانەت بنیادەم و پەلەوەریشی تێخەی و گژوگیا و گوڵ و ڕووەکی بۆن خۆش و دارو درەختی تێداربباربهێنی تا لەناونەچن، جەمشێریش وایەکرد و ئەوسا بە فەرمانی ئەهورامەزدا لە پاش چەند ڕۆژ باران و بەفرو بۆران تۆفانێکی زۆر سەخت و گەورە رووی دا و ئەوانەی کە لە زەوی دابوون، لەناوچوون، بەڵام ئەوانەی کە لە ئەشکەوتەکەدابوون ڕزگاریان بوو و پاشان لە زەوی بڵاوبوونەوە بەشایی و خۆشییەوە ژیان و بەرە بەرە زۆربوون.

**سەرچاوەکان:**

١- یەشتەکان وەرگێڕاوی: پووردواود- تاران، ١٣٠٨.
٢- ڤەندیداد وەرگێڕاوی سەی حەمە عەلی داعیولئیسلام- بۆمبەیی ١٣٢٧.
٣- مەسحەفارەش (سەدەی پێنجەمی کۆچی).
٤- جیلوە (سەدەی پێنجەمی کۆچی).
٥- قەولێ سورا ئەفرینا دونیایێ هۆنراوەی شێخ حەسەنی هەکاری (سەدەی شەشەمی کۆچی).
٦- سماط الامراء (دەستنووسە).



# جەمال داوود: ئەگەرچی لە زەمانی ئێمە کۆمپیوتەر نەبوو، بەڵام هەر بەو شێوازە زۆر کارم کردووە

مامۆستا (جەمال داوود حەسەن) هونەرمەندێکی پێشەنگی بواری فۆتۆگراف و مۆسیقای شاری هەولێرە، پێش شۆڕشی (١٤)ی تەمووز هەوڵی جیدی و زانستیانەی داوە کەوا بواری وێنەگەری بەشێوەی زانستیانە تەکانی پێ بدات و ستۆدیۆی وێنەی کارەبایی بۆ یەکەمجار لە هەولێر کردۆتەوە، هەر ئەم ستۆدیۆیەشی کردۆتە فێرگەیەک کەسانێکی زۆر لەشاری هەولێر فێری وێنەگرتن و چاپی وێنەو شتنەوەی فیلم کردووە، هەر بەمەش نەوەستاوە خولیا و حەزەکانی لەوە گەورەتر بوونە و بەهرەی تریشی هەبووە کە ئەویش خولیای دنیای مۆسیقاش بووە، بۆ ئەم مەبەستە لە کۆتایی ساڵانی پەنجاکان گرنگی داوە بەهێنانی ئامێری مۆسیقای جیاجیا و ڕۆژئاوایی، لەگەڵ فرۆشتنی ئەو ئامێرانەش خەڵکەکەی فێری مۆسیقاش کردووە، دواتر یەکەم تیپی مۆسیقای لە سەندیکای مامۆستایانی ئەوسا (دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز) دامەزراندووەو سەرپەرشتیی کردوون.

مامۆستا لەکاتێکدا کەوتووەتە تۆمارکردنی گۆرانییەکانی هونەرمەندانی هەولێر لە دەرەوەی ستۆدیۆی ئێزگەی کوردی، کە ئەوکاتە تەنیا تۆماری ناو ئێزگە وەردەگیرا و پەخش دەکرا، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بەشێوەیەکی هێندە جوان و ڕێک و پێک بۆیانی تۆمارکردبوو، بۆیە وەردەگیران و پەخشیش دەکران، لەو هونەرمەندانەی زۆر یارمەتی داون مامۆستایان: (تایەر تۆفیق، فوئاد ئەحمەد، محەمەد ئەحمەد ئەربیللی و کەسانی تر)

یەکەم کەس بووە کە وێنەی فۆتۆگرافی لە چوارچێوەی پیشانگەی فۆتۆگرافی لە هەولێر نمایش بکات کە لەساڵانی پەنجاکان و شەستەکاندا سەدایەکی چاکی هەبووە، زۆر وێنەی فۆتۆگرافی لەشێوەی کارتی جەژنانە بەدەیان هەزار دانەی لێ چاپ و بڵاوکردووەتەوە، لە کاتێکدا کە خەڵکی وێنەی ساکاری دەگرت و نەیاندەزانی وێنەی تەعبیری چییە، ئەم زۆر وێنەی تەعبیری و سوریالی بەو تەکنیکە ساکارەی ئەوکات چاپ و بڵاوکردووەتەوە. هاوڕێ و هاوەڵی هونەرمەندی ناودار (موراد ئەلداغستانی) بووە و بەردەوام سەردانی یەکتریان کردووە و لە کارە هونەرییەکانیاندا کاریگەرییان بەسەریەکەوە هەبووە، ڕەخنەیان لەیەکتری گرتووە و زۆر تاقیکردنەوەی هاوبەشیشیان پێکەوە ئەنجام داوە.

ماوەیەک لە جیهانی هونەری وێنەگەری و مۆسیقا دابڕا، لەبەر هەندێ بارودۆخی تایبەتی و نەفسی خۆی، بەڵام دواتر هاتەوە نێو مەیدانەکە و چەندین ساڵ سەرۆکی کۆمەڵەی وێنەگرانی عیراقی لقی هەولێر بووە و ئێستاش ئەندامی شانازییە لە کۆمەڵەی وێنەگرانی کوردستان.

بۆ بەسەرکردنەوە و چوونە نێو جیهانی ئەم هونەرمەندە پێشەنگ و بەتوانایە، ئێوارەی هاوینی ساڵی (١٩٩٨) لەگەڵ هونەرمەندان خوالێخۆشبوو کاک (ئەبوو سەباح) و کاک زاهیر حەمەد ئیبراهیم (کە ئەم زاتانە دوو شاگرد و یاریدەدەری نزیکی مامۆستا بوونە) بۆ بەبیرهێنانەوەی یادگار و بیرەوەرییەکانی هەندێ باس کە ترسی ئەوەم هەبوو مامۆستا لەیادی نەمابن، یان بەتەواوی بەبیری نەیەتەوە، ئەوان یارمەتییان داین و ئەم دانیشتنەمانی لێ کەوتەوە.

**ڕامان:** سەرەتای دەست کردنتان بە وێنەگرتن چۆن بوو، چی وای لێکردن ئارەزووتان لەسەر ئەو هونەرەدا بگیرسێتەوە؟

**جەمال داوود:** ساڵانی (١٩٤٣- ١٩٤٤) کە قوتابی بووم لە قوتابخانە، جارێکیان قوتابیان و مامۆستاکەمان وێنەمان بەیەکەوە گیرا، پاشان دانەیەک لەو وێنەیەم بەدەست کەوت، بەوە حەزم چووە سەر هونەری فۆتۆ و پێخۆشحاڵ بووم کەوا منیش بتوانم شتێکی وا بکەم، لە دوای (١٩٤٤) منیش بڕیارم دا دەست بەو جۆرە کارە بکەم کە هونەری وێنەگرتنە. لەساڵی (١٩٤٦) کە ئەوکات لە پۆلی شەشەم بووم، کامیرای [بۆکس] هەبوو، ئەو کامیرایە زۆر سادە بوو، وەک سندووقێک بوو، هاوێنەیەکی لە پێشەوە هەبوو، یەک دوو جووڵەی پێ دەکرا، فیلمی (١٢٠)ی دەخوارد یان پێ دەگیرا، شەتەری هەبوو بەبێ دایافرام بوو بەیەک جۆر وێنەی پێ دەگیرا. ئەوکات لە تەمەنێکی وا نەبووم، بەڵام حەزم دەکرد بەدەستی خۆم کامیرایەک دروست بکەم، چونکە سەرنجی کامیراکەم دا شتێکی وای تێدا نەبوو ئاڵۆز بێ.

**ڕامان:** ئەوکات کە وێنەت دەگرت کێ فیلمەکەی بۆ دەشتیەوە و چاپی دەکرد؟

**جەمال داوود:** ئەو کابرایەی کە پێشان وێنەکەی گرتین، لەلای دەروازەی پێشەوەی قەڵا، ئەوکات بینایەکی دووقاتی لێ بوو، سەرەوەی ئوتێل بوو، ئەو لەو ئوتێلە بوو، وێنەگری شەمسی بوو، ئەو فیلمی دوای شتنەوە و چاپ کردن بۆ دەگەڕاندینەوە، بەڵام نەمدەزانی ئاخۆ بەخۆی چاپی دەکرد، یان لەشوێنێکی تر ئەنجامی دەدا.

**ڕامان:** ئایا کابرا کورد بوو، یان غەیرە کورد بوو؟ ناوی چی بوو؟

**جەمال داوود:** نازانم بەبیرم نایەتەوە، بەڵام کورتەک و شەڕواڵی لەبەر دەکرد.

**ڕامان:** ئەمانە وای لێ کردی ئارەزووت بچێتە سەر کامیرا؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.

**ڕامان:** زانیمان دوای دەرچوونت لە (پەیمانگای مامۆستایان) یان بڵێین کە بوویتە مامۆستا، زمانی ئینگلیزیت بەهێز بوو، خەریکی وەرگێڕان و موراسلەی گۆڤاری فۆتۆ بوویت، ئەگەر ئەو قۆناغەشمان بۆ باس بکەی؟

**جەمال داوود:** لەبەر ئەوەی ئارەزووم لەو جیهانە بوو و دەمویست بچمە ناو ئەو هونەرەوە، بۆیە دەمویست لە هەموو شتێکی تێبگەم، خۆ ئەگەر شارەزاییت لە زمانی ئینگلیزی نەبایە هیچی لێ تێنەدەگەیشتی، چونکە ئەوکات هەموو شتەکان بەو زمانە بوون، هەر بۆ مێژوو باسی ئەوە دەکەم: ئەوکاتە ستۆدیۆیەک هەبوو، خەڵکێکی زۆر حەزیان لە فێربوونی فۆتۆگراف بوو، بەڵام ئەوان نەیان دەدا کەس، ئەمە وای لەمن کرد دەستێکی ڕەنگینم لەو هونەرەدا هەبێ و دەمتوانی خەڵکی فێری وێنەگرتن بکەم، بەوە دەستم پێکرد کە ناوی دەرمانەکانی فیلم شتنەوە و چاپ کردن بزانم و فۆرمیولام ئامادە دەکرد تا بیان دەمێ، تا خەڵکەکە لە ماڵێ، یان لە شوێنی وا بتوانن دەست بە وێنەگرتن و چاپ کردن بکەن، ئەو نهێنییەم دەرخست کە لای ئەوان (مەبەستی ستۆدیۆکە) شتێکی پیرۆز بوو، یان لێ نەدەگەڕان و بواری هەموو کەسێکیان نەدەدا فێری ئەو پیشەیە بێن، کەس نهێنی پیشەکەی بەکەس نەدەگوت، لەبەر ئەوەی بەزمانی ئینگلیزی کتێبی زۆر هەبوون، کە خوێندمنەوە هەستم کرد هیچ نهێنی تێدا نەبوو، چ سیحریشی تێدا نەبوو، ئەوکات زۆر کەس لە ساڵی (١٩٤٥) و (١٩٤٦) ئەوەیان بەلاوە وەک سیحر وابوو، کاغەزێک لەناو شلەیەکی وەک ئاو هەندێک دەیانهێناو دەیانبرد بەرەبەرە وێنەی لەسەر بەدەر دەکەوت، ئەمەیان بەلاوە زۆر سەیر و سەمەرە بوو.


جەمال داوود، فارس سەعدی

**ڕامان:** ئەو شتانەی بەخەڵکەکەت دەگوتن لەکاتی دانانی ستۆدیۆی کەمالی (ڕەحمەتی) برات بوو، یان برا گەورەکەت عەبدوڵڵا، یان بەر لەوکاتە بوو؟

**جەمال داوود:** پێش ستۆدیۆ دانانیش هەوڵدانم هەبووە، لەگەڵ ئەوانەی کە ئێستا هەندێکیان (ئەمری خوایان کردووە) کە قوتابی بوون لەگەڵ من، ئەوانیش حەزیان دەکرد فێربن، ئەوکات هەوڵدانم هەبوو، بەڵام هەوڵەکانم وەک ئەوکاتە نەبوون کە ستۆدیۆمان دانا، کە هەوڵەکانم سەرکەوتووتر بوون، ئەو کات کەمالی (ڕەحمەتی) شاگردی برا گەورەکەم عەبدوڵڵا بوو کە ئەو

پێش هەموومان ستۆدیۆی هەبوو، من ئیشەکەم لەوێ دەکرد، ئەوکات لە (دیبەگە) مامۆستا بووم کە دەهاتمەوە فیلم و شمەکی وەهام لەگەڵ خۆم دەهێناو چاپم دەکردن، پاشان هەمان ستۆدیۆم لێ کڕییەوە و بووە هی من، بەڵام بەناوی (کەمال)ی برام کرد و بووە ستۆدیۆ (کەمال).

**رامان:** بەر لە دانانی ئەو ستۆدیۆیە وەک زانیومانە کە لە دیبەگە مامۆستا بووی، ژوورەکەی خۆت وەک (دارک رووم)ت لێ کردبوو، وێنەشت لەوێ بەهۆی رووناکی چاپ دەکرد، وابزانم ئەوکات لەوێ کارەبا نەبوو؟

**جەمال داوود:** ئەوکاتە لە هەولێریش کارەبا هەبوو، بەڵام (AC) نەبوو، بەڵکو (DC) بوو، دەبوایە (محولة)یەک بکڕی ئەگەر ئامێرێکی کارەباییت هەبایە تا بەکاری بهێنی، چونکە ئەو ئامێرانە بەبێ (محولة) نەت دەتوانی ئیشیان پێ بکەی. ئەوکات کارەبا کەم هەبوو، بۆیە لە گوندەکان و لە دیبەگەش نەبوو. من توانیم سوود لە رووناکی خۆر وەرگرم کە لە پەنجەرەوە دەهاتە ژوورێ و لەجیاتی کارەبا بەکارم دەهێنا.

**رامان:** لە جیاتی (سێف لایت) چیت بەکار دەهێنا؟

**جەمال داوود:** ئەوکات جۆرە لەوزینەیەک یا (نوگە)یان پێ دەگوت، شتێکی زۆر سەیر بوو، چونکە لەو تەمەنەی ئەوکاتم زۆر حەزم لە شیرینی بوو، خەڵکیش حەزیان لێی بوو، ئەو (نوگە)یان چوکلێتە بە قەدەر شخاتەیەک دەبوو، بە کاغەزێکی سیلۆفینی داپۆشرابوو (سیلۆڤان)یان پێ دەگوت روون (شفاف) بوو، بەڵام بەرەنگی جۆراوجۆری وەک زەرد، سوور، کەسک بوو، تا سەرنج ڕاکێش بێت، من ئەو بەرگە چوکلێتەم لەجیاتی (سێف لایت) بەکاردێنا، دەهاتم بەهۆی ئاوێنە تیشکی دەرەوەم دەهێنایە ژوورێ و لەو کاغەزەم دەدا، ئەگەر سووربایە ئەوە رووناکی سووری پەیدا دەکرد، ئەگەر زەردیش بوایە رووناکییەکە زەرد دەبوو.

**رامان:** باشە ئەوکات بە ڕێگای (کۆنتاکت) وێنەت چاپ دەکرد؟ لەوانەیە لارجەر نەبووبێ؟

**جەمال داوود:** بێگومان.. لەوانەیە هەبووبێ، بەڵام من نەمدیبوو، لەوێ ئەو دیاردەیەم دەدی، کە ژوورەکەم تاریک بوو، رووناکی لە پەنجەرە (بچووک بووە) دەهاتە ژوورێ، لە دیواری بەرامبەرەکەی وێنەی دەرەوە هەمووی دیار دەبوو، بەبێ هاوێنەش پاشان دەمدیت لە ژوورێک کونە پەنجەرەیەکی بچووک هەبوایە لەسەر دیوارەکە وێنەی دەرەوە بە (عەکس) [واتە بە هەڵگەڕاوی] دەتدیت. ئەم شتانە لە ساڵی ١٩٤٨ سەرنجیان ڕادەکێشام.

**رامان:** گەر بێتەوە بیرت کەی عەبدوڵڵای برا گەورەت ستۆدیۆی دانا؟

**جەمال داوود:** لە (١٩٥٢) یان (١٩٥٣) لەو دەورە بوو بەناوی ستۆدیۆی رووناکی بوو، بەڵام لەساڵی (١٩٥٤) من ستۆدیۆکەم گۆڕی بەناوی (کەمال)م کرد.

**رامان:** ئەو کاتەی ئێوە ستۆدیۆتان دانا، لە هەولێر هیچ ستۆدیۆیەکی وەک ئێوە هەبوو بەشێوە زانستییەکەو بە ئینارەی کارەبا وێنە بگرن؟

**جەمال داوود:** نەخێر نەبوون.. ئەو ستۆدیۆیانەی کە هەبوون لە وێنەگرە شەمسییەکان پێک دەهات، چونکە ئەوان تەنیا بەرووناکی خۆر وێنەیان دەگرت، واتە وێنەیان بەکارەبا، یا بەفلاش نەدەگرت. شتی لەم جۆرە نەبوو.

**رامان:** ئایا ئەو کات ئێوە کارەبای (DC)یتان بەکاردەهێنا بۆ وێنەگرتنی ناو ستۆدیۆ؟

**جەمال داوود:** بەڵێ (DC) مان بەکاردەهێنا، بەبیریشم دێتەوە ئەوکات شتی سەیریشم دروست دەکرد، چونکە پرۆجێکتۆرو سپۆت لایت و لەو بابەتانە نەبوون، پرۆجێکتۆر وەک ئێستا پێشکەوتوو نەبوو، ئەو پرۆجێکتۆرەی من بەکارم دەهێنا، قوتوویەکی گەورەم کردبوو، پڕم دەکرد لە ئاو، خوێشم لە ئاوەکە دەکرد، زانستییانە دەمزانی دەبێتە (محولة)یەک، هێزی رووناکییەکەی پێ کەم و زیاد دەکرێ، ئینجا بەو کەم و زۆرکردنە، رووناکی پرۆجێکتۆرەکە بەرزو نزم دەبوو، بۆچی ئەمەم دەکرد؟ بۆ دەم و چاوی ئادەمیزادەکەی هەتا ڕتووشی نەوێت، یان کەمێک ڕتووشی بوێ. گوتم ئەو قوتووەی کە ئاو و خوێم تێکردبوو، شیشێکم بۆ کردبوو، کە بەرزو نزمم بکردایە، ئەوە لەگەڵ شەوقی رووناکییەکەی پێ زیادو کەم دەبوو، دەمدیت دەم و چاوی ئادەمیزادەکەی پێ ساف دەبێت، ئینجا سوودم لەو شتە زانستییە وەردەگرت.

**رامان:** لەمە بۆمان دەردەکەوێ، هەر لە سەرەتاوە حەزت کردووە شتەکان بە زانستی وەرگری، وانییە؟

**جەمال داوود:** بە زانستییانە سوودم لێ وەردەگرت، ئەو شتانەی کە لە قوتابخانە وەرمان گرتبوو، دەمویست بە پراکتیک جێبەجێی بکەم و سوودی لێ وەرگرم.

**رامان:** ئەوکاتەی کە ستۆدیۆتان دانا، کێ بوون ئەوانەی بەردەستییان دەکردی و یارمەتیان دەدای؟

**جەمال داوود:** زۆر سەیرە! ئەو کاتەی من دەستم پێ کرد، کەم کەس هەبوون لەو هونەرە تێ بگات، جگە لەوەی هێندە ناو و ئارەزووشی لەناو ئێمەدا نەبوو، تەنیا بۆ کاری پێویستی بوایە بۆ مامەڵە و (نفوس)، وابزانم (نفوس)ی ئەوکات وێنەی نەدەویست..

من ئەو ستۆدیۆیەم کە دانا، ویستم براکەم (کەمال) کە

کەم بوو. لە ڕووی دارایییەوە سوودی لێ وەربگرێ، لەبەر حوێی گوێی نەمابوو، بۆ ئەوەی نەبێتە ئەندامێکی بێ سوود. خۆشی توانای هەبوو، بەڵام ئەوانەی کە ئیشیان لەگەڵ من دەکرد کاک زاهیر بوو، ئەوکات لە ساڵی ۱۹۵۱ تەمەنی چەند بووە لێی بپرسە؟

**ڕامان:** دیارە ئەوکات زۆر منداڵ بووە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ، دەمگوت ئەگەر تەنگاو بم لەناو پەقرەجی (سەتڵ)ی دادەنێم و هەڵی دەگرم، هەر هێندە بوو، واتە زۆر منداڵ بوو بەس ئەو ئیشەی دەکرد.

**ڕامان:** واتە ئەوەی پێت بگوتبایە زوو وەری دەگرت؟

**جەمال داوود:** چی دەمویست دڵم بە ئیشەکەی دادەکەوت، چونکە من لە ئیشەکەم بە وردەم، زۆر ئیش بەدەستی خۆم نەیکەم دڵم داناکەوێ، بەڵام ئەوکاتی کە زاهیر منداڵیش بوو، ئەو شتانەی جێبەجێ دەکرد.

## لە کاتێکدا کە خەڵکی وایان دەزانی وێنەگرتن جۆرێکە لە سیحر، من بە شێوەیەکی زانستیانە مامەڵەم لەگەڵ فۆتۆ کردووە

**ڕامان:** گەر بێتەوە بیرت، ئەوکات چ کامیرایەکتان بۆ (سحب) وێنەگرتنی ناو ستۆدیۆ بەکار دەهێنا؟

**جەمال داوود:** یەکەم کامیرای بەکارمان هێنا، نایەتەوە یادم، بەڵام دوای ئەوەی خەڵکەکە زیاتر ڕوویان تێکردین، ئەوکات سەرەگرتن نەبوو بۆ هیچ شتێک، بەڵام بۆ وێنەگرتن، جادەکە شاهێدە و زاهیریش ماوە دەزانێ، خەڵکی بەدوو ڕیزیش هەندێ جار سەردیان دەگرت و چاوەڕوانیان دەکرد تا وێنەیان بگیرێ، یا فیلم بێننە لامان، یان فێریان بکەین.

**ڕامان:** دیارە ستۆدیۆکەتان نەک تەنها کاری ستۆدیۆیی لەناو دەکرا، بەڵکو فێرگەیەکیش بووە، ئایا وایە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. چونکە وەک گوتم ئەوانەی ئەو شتەیان دەکرد ئەوەی لە ئوتێلەکە بوو، ستۆدیۆیەکی شەمسی تریش هەبوو، ئەوانە مەحاڵ بوو لایان کەس فێربکەن، یان پێیان بڵێن دەرمان چییە و ئەو سنعاتە چییە.

**ڕامان:** ئایا ستۆدیۆکەی تر ناوی سیروان بوو؟

**جەمال داوود:** ستۆدیۆ سیروانیش هەبوو، گیوی موکریانیش هەیبوو.

**ڕامان:** هی مامۆستا گیوی موکریانی شەمسی بوو؟

**جەمال داوود:** شەمسی بوو، بەڵێ هەردووکیان شەمسی بوون. کاک محەمەد (مەبەستی محەمەد عەلی بوو) هەبوو لەکن گیوی موکریانی ئەو ئیشەکەی دەکرد، لێی بپرسن.... (ئەبوو سەباح قسەی پێ بڕی و گوتی ئەمری خوای کردییە) خوا عافووی بکا، ئەو ئیشەکەی دەکرد بەسەندووق و پەقرەج (سەتڵ)ی ئاو. سیروانیش هەمان شت لەسەر جادە دایناب‌وو، پەردەی ڕەشی دانابوو.

**ڕامان:** بۆ باکگراوندی وێنەکان لەناو ستۆدیۆ چیتان بەکار دەهێنا؟

**جەمال داوود:** من هەوڵی ئەوەم دەدا دیمەنێک بەدڵم بوایە، یان قوماشی ڕەنگاوڕەنگم دادەنا بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی باکگراوندەکەی پێ بکەم، چونکە باکگراوند کاریگەریی خۆی لەسەر وێنە هەیە.

**ڕامان:** دیارە بۆ ئەوەت بووە تا شتێکی سادە دەرنەچێت، ئایا وایە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. دەتدیت لەوێنەی تردا سەری کەسەکە، ئەگەر باکگراوندەکە زاڵ بوایە بەسەر کەسەکەدا دەتگوت بەدیوارەوە نووساوە، لێرەدا هەستت بەوە دەکرد وەک بڵێی سەری بە کەتیرە بەدیوارەکە لکێنراوە ئەمەش جوان نییە، بۆیە من دەمویست وای لێبکەم بەشێوەیەکی دیارو بەرچاو بێ، ئەو بەرجەستەیەش بە ڕەنگ پێ رادەگەیشتم، یان لەبنەوە پرۆجێکتۆرم بەکاردەهێنا، چونکە توانای ئەوەم هەبوو کۆنترۆڵی ڕووناکی لە دەست خۆم بوو، هەندێ وێنەی خۆم گرتبوو پرۆجێکتۆرم لە خوارەوە بەکارهێنابوو، وابزانم ئەو وێنانە لای (ئەبوو سەباح) و (زاهیر)ی هەنە کە ئەوکات گرتبوومن، ئینجا بەمە وام کرد باکگراوندەکە بەتەواوی دابڕێنم لەجیاتی پەردەی ڕەشی ساکار بەکاربێنم.

**ڕامان:** ئایا چەند سەرچاوەی ڕووناکیت لەوکاتدا بەکاردەهێنا؟

**جەمال داوود:** بەزۆری دوو جۆرە سەرچاوەی ڕووناکیم بەکار دەهێنا، یەکەمینیان بەشێوەیەکی گشتی بۆ کەسەکەم بەکاردەهێنا، من هەردەم دژی ئەوە بووم ڕووناکی لە پێشەوەو ڕاستەوخۆ بەر کەسەکە بکەوێ.

**ڕامان:** وا دەردەکەوێ تۆ حەزت لە ڕووناکی فلات نەبووە، وانییە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. ئەوە لام ستەم بوو، چونکە ڕووناکی فلات وێنەکەی مردووە، وێنەی بەرجەستەکراو دڵگیرە، ئەگەرچی لەوانەیە لە چوارچێوەی وەڵامی پرسیارەکە دەربچم، بەڵام من ڕام وایە هەر هونەرمەندێک



لەم جۆرە وێنەگرتنەدا کار بکات، وانەکا هەرگیز هەتاو لە پشتی سەری خۆی بدات، واتە رووناکی خۆر راستەوخۆ لە پێشەوە بەر گرتەکەی بکەوێ. لەجیاتی ئەوە وابکا یا هەتاوەکە لە لا تەنیشتەوە بەر کەسەکە بکەوێ کە وێنەی دەگیرێ، یان لە پشتەوە بەری بکەوێ هەر قەیدی ناکا، تەنانەت ئەگەر رووناکییەکەش بەتەواوی لە پشتەوە بەر گرتەکەش بکەوێ هەر قەیدی ناکا، بۆ نموونە من هەندێ وێنەی دیمەنم گرتووە، رۆژم هاویشتۆتە پشت خەڵکەکە، گەورەشم کردووە، لەو پێشانگەیەی کە بۆ یەکەم جار لە هەولێر کردمەوە، ئێستاش ئەو وێنەیە ماوە، بەراستی وێنەیەکی جوان بوو، چونکە هەتاو کەوتۆتە پشتەوەو خەڵکەکەو مەڕەکان بەجوانی دیارن، بەڵام باکگراوندەکە رووناکە ئەوەی تری لە پێشەوە هەمووی رەشە.

**رامان:** واتە وێنەکە بە سیللویت ئەنجامت داوە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.

**رامـــان:** باشە مامۆستا دەکرێ باسی ئەوە بکەی ئەو کاغەزو دەرمانانەی وێنەگرتن چۆن دەستتان دەکەوتن؟ یان چۆن کامیراو شتەکانی تر دەهاتنە هەولێرێ؟

**جـەمـــال داوود:** ئەگەرچی زۆر کەم هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی من لە گۆڤارو کتێبەکان شتم دەخوێندەوە، ئەوکات گۆڤاری تایبەتی لە دەرەوەی وڵات هەبوو دەهاتە بەغداو منیش دەچووم لەوێ کە کـتـێـبـخـانەی بیـانی تایبـەت هەبوو، ئەو کـتـێب و گـۆڤـارانەم دەکری، لەو کـتـێـبـانە دەمـدیت هەندێ شـتـی تێـدایە، کـۆمـپـانـیـا تـێـیـدا پرۆپاگـەندەی بڵاو کـردۆتەوەو داوایان لە هەندێ کـەس دەکرد، بەهۆی ئەوەوە هەندێ کەس (إستیراد)ی دەکردن، واتە کەرەستەو کامیراو پێداویستییەکانی دەهێنا.. من ئەگەر بمدیبایە کاغەزێک بەکەسانێک پێی دەرنایە، واتە نەتوانێ بەجوانی وێنەی لەسەر چاپ بکات، دەچووم لێیم دەکـڕییـەوە، ئەو کـاغـەزانە لەناو پاکـەت بوون، هەر پاکـەتێکیش فـۆرمـیـلای خۆی لەگـەڵدا بوو «مـەبەسـتی دەرمـانی شـتنەوەو چەسـپـاندنی کـاغـەزە کـە چۆن ئامـادە دەکـرێ و رێژەی هەر مـاددەیەک لەو گـیـراوەیە دەبێ چەندبێ» ئنجـا ئەگـەر بهـاتایە بەپێی فـۆرمـیـلای خۆی دەرمـانەکەت بۆ ئەو کـاغـەزە بگرتبایەوە، ئەوە شتی زۆر جوان و نایابت دەست دەکەوت.

**رامـــان:** ئاشکرایە پلەی گـەرمی رۆڵێکی گـرنگ و بەرچاو لە دەرمانەکان (دیڤلۆپەرەکان) دەگێرێ، ئایا ئێوە لەو کاتدا چۆن مامەڵەتان لەگەڵدا دەکرد؟ یا کۆنترۆڵتان دەکرد؟

**جـەمـــال داوود:** من ئەوکـات (ئەوە کـاک زاهـیـریش دانیـشـتـووە) لە ژیانی خۆمـدا فـیلم و ئەو شـتـانەم بەبێ (گـوێ نەدانە پلەی گـەرمی) هەرگـیـز نەشـوشـتـووەتەوە، دیسـان ئامـۆژگاریم بۆ برا وێنەگرەکان ئەوەیە، هەر کەم و زیادییـەک لە پلەی گـەرمی (گـیـراوەکـان) کـار لە وێنەکە دەکات بەتایبەتی لە دەموچاو، زیاتر کار لە بیلبیلەی چاو دەکـــات، چونکە بەسـروشـتـی دەرناچێـت و وێنەکـە بەمردوویی بەدی دەکرێ، زیاتر بە (شکل) دەچێت وەک لە وێنەیەکی زیندوو، بەڵام ئەگەر بێتوو کۆنتـرۆڵی پلەی گەرمی گیراوەکە (دیڤلۆپەرەکە) بکرێ، ئەوە بەتەواوەتی چاوەکـان زیندەگـیـان پێـوە دیار دەبێت، لای زۆر کـەس ئەمـەم باس کـردووە، تەنانەت لەگـەڵ کـاک مـسـتـەفـا شـەوکـەت ئەمـەم باس کـردووە لەکـاتی خـۆیدا. ئەگـەر رەخنەشم لێ گرتبێ (مـەبەسـتم لە کاک مـسـتـەفـا نییـە، بەڵکو هی ترە) گـوتوومـە ئەو وێنەیەت بۆ زیندەگی تێدا نییـە، گـوتوویانە بۆ عـەیبی چییـە؟ وێنەی ترم نیـشـان داون، ئەگەرچی وێنەکەش بە رەش و سپی بووە، بەڵام وا هەستت دەکرد کە رەنگاورەنگە.

**رامان:** راست دەفەرمووی، هەتا وێنەگرێکی پۆرترێتی جیـهـانی کە ناوی (کـارش)ە لە کـەنەدایە، ئەویش زۆر گرنگی بە چاوی کەسەکان دەداو دەیگوت کەسایەتی ئەو مرۆڤە لە میانی چاوەکانی دەخوێندرێتەوە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. واتە هەر وێنەیەک ئەگەر چاو لە رەنگی سروشتی خۆی گرێدەکانی پلەپلەیی رەنگەکانی یا تۆنەکـانی چونکە (رەش و سـپـیش رەنگاورەنگە) لەبەر ئەوەی پلەپلەیی تێدایە، هەتا ئەگەر کۆنتراستیش بێت هەندێک رەنگی خۆی تێدایەو پارێزگاری رەنگی خۆی دەکـات، واتە لە کـۆنتـراست و لە نۆرمـاڵ هەمـان شت دەکرێ، ئەو جۆرە وێنانە (مـەبەسـتی پۆرترێتە) ئەگەر هاتوو پلەکانییت بزر کرد، بەهای وێنەکە نامێنێ، وێنەکە دەدڕوا. بۆ نموونە دەبینی کابرایەک لەسەر مێزێکی ئاسایی دانیـشـتـووەو دەنووسێ و کـورسی لەژێرە، وێنەگری باش هەوڵی ئەوە دەدا لەبن پێی یا کورسییەکەی رووناکییەکی

تێ بێ بەت جۆرە هارمۆنیەتێک لەگەڵ دەوروبەرەکەی بەیە بکەت، وا نەکا نەشاز دەرچێت.
**رامــان:** ئەو نێگەتیڤانەی ئەوکات بەکارتان دەهێنا شووشە بوون یان جۆری تر؟
**جــەمــاڵ داوود:** من ئەوکات سێ جۆرم لە ستۆدیۆ بەکارهێناوە، لە دەرەوەش بێ لە هی شەمسیش، چونکە شەمسیش ئەوکات هەر کاغەز بوو، ئەگەرچی کەسانێک هەبوون بیست ساڵ بوو یەک جۆرە کاغەزیان بەکار دەهێنا، بەڵام من هەوڵم دەداو ئەوەیانم گۆڕی، واتە (دیڤلۆپەرەکانیان) هەتا بەم بۆنەیەوە هەتا دیڤلۆپەری تایبەتیم بۆ دۆزینەوە، بەهۆی کەم و زیادی ڕێژەی ماددە سەرەکییەکانی دیڤلۆپەرەکە دەمتوانی کۆنترۆڵی جۆری دیڤلۆپەرەکە بکەم و هەوڵم دەدا ئەمە لە وێنەگرەکانی ئەوکات بگەیەنم و فێریان بکەم، بزانن ئەو ماددەیە بۆ لەو گیراوەیە دەکرێ و دەوری چییەو چ گرنگییەکی هەیە، ئەگەر ئەم زانیارییەی زانی، هەڵبەتە ئەوکاتە دەتوانێ (کۆنترۆڵ) لە وێنەکەدا بکات.
بۆیە ئەو فیلمانەی ئەوکات بەکارمان دەهێنان هەر فیلمەو دیڤلۆپەری تایبەت بەخۆی هەبوو. یەکێک لە جۆری فیلمی ئەوکات، جۆری سلیلۆیدی هەبوو، جۆرێکی تر هەبوو وەک کارەبا بوو، مەبەستم لەوەیە وەک فیلمی سینەما وابوو کە هەندێ جار ئەگەر عاسی بوایەو گەرمی ڕووناکی لەسەری زیاد بایە ئاگری دەگرت، زۆر جار دەیانگوت ئەها سینەما ئاگری گرت دەتگوت بەنزینیان پێدا کردووە، ئەوکات لەو جۆرە فیلمە بەکار دەهات خەسڵەتیش ئەوەبوو وشک و ڕەق بوو، وەک کاغەز وابوو، تەنیا کاتێک گەرمایی بگەیشتبایە یەکسەر ئاگری دەگرت، فیلمی تریش هەبوو، هەروەک لە پێشەوە باسم کرد سلیلۆید بوو.
**رامان:** واتە فیلمی ڕۆڵی (١٢٠)ی..؟
**جــەمــاڵ داوود:** بەڵێ.. ئینجا ئەو فیلمە ڕۆڵ (١٢٠)یانە، یان فیلمی (٦٢٠)، (١٣٥) و (١٢٧) هەبوون، ئەو کامیرانە ئەو جۆرە فیلمانە لەگەڵیان بەکار دەهات، جگە لەمانە ئەو کات (کەت) فیلم هەبوو، فیلمەکە لەبەر ئەوەی لە ستۆدیۆ بەکار دەهات، چونکە یەک یەک بوو، لەبەر ئەوەی (کەت) فیلم مانای ئەوەیە (فیلمی بڕاو)، ئەو فیلمە بڕاوانە لەناو کارتۆن دانرابوون، دیارە کۆمپانیای دروستکەری ئەو ڕایەی هەبووە کەوا لەسەر چ جۆرە ماددەیەک وێنەکە چاپ بکرێ، ئەگینا جامی شووشەش هەبوو لەهەمان جۆر وێنەی لەسەر چاپ دەبوو، جگە لەوە (کەت فیلم) و (ڕۆڵ فیلم) و فیلمی ئاسایی، جۆرە کاغەزێک هەبوو، لەسەر شێوەی (وابزانم لای کاک زاهیرو ئەوانە هەندێ وێنەم چاپ کردووە لەکاتی خۆی کاغەز نەبوو) باغەیان پێ دەگوت یا بەناوی شتێکی تر، ئینجا من سوودم لەو جۆرە کاغەزانە وەردەگرت و وێنەم لەسەری چاپ دەکرد، پاشان گلۆپێکی زەعیفم لەپشتی دادەنا، ڕەسمەکەشت چاپ کردبوو زۆر جوان دیار دەبوو..
**رامان:** دەتوانین بڵێین وەک سلاید خۆی دەنواند؟
**جــەمــاڵ داوود:** وەک سلاید بوو، بەڵام سلاید نەبوو، چونکە سلاید (شفاف) بوو، بەڵام ئەو سپی بوو وەک شیر وابوو.
**رامان:** واتە نیمچە ڕوون بووە؟
**جــەمــاڵ داوود:** بەڵێ شیری (حلیبی) بوو وەک کاغەز سپی سپی بوو، ئەگەر بە ئاسایی ڕات بگرتایە لەپشتی هیچ دیار نەدەبوو، جا ئەگەر بهاتایە ڕەنگت بکردایە بەدەستی، چونکە ئەوکاتە فیلمی ڕەنگاوڕەنگ نەبوو، کە دڵنیم نەبوو (قطعي) نییە، چونکە لەوانەیە هەبووبێ، بەڵام من نەمدیبوو، یا هێشتان نەگەیشتبووە ئێرە، بۆ بەردەستی من، یان ئەو کەسانەی کە ئەم ئیشەیان دەکرد.
**رامان:** ئەو (کەت فیلم)انەی کە دەهاتن قەبارەکانیان چۆن بوو؟
**جەمال داوود:** هەبوون بۆ نموونە تا قەبارەی (کابنێت)م دەکری، بۆ زۆر شت بەکارم دەهێنا، بەس لە قەبارەی (٦×٩) زۆر هەبوو، گەر (کەت فیلم)ت بویستبایە هەمــوو کاتێک جۆری (٦×٩) دەست دەکەوت، جامت بویستبایە هەبوو، (ڕۆڵ فیلم)ی بۆ (٦×٩)، واتە جۆری کامیراکە ئەم دیاری دەکات، چونکە لەوانەیە هەمان فیلم بۆ کامیرایەکی تر دەبووە (٦×٦) یان بچووکتر، کە ئەمە لەسەر جۆری کامیراکە دەوەستا.
**رامــــــان:** باشە لەو کامیرایانەی ئەوکات هیچ گۆڕانێکتان تێدا دەکرد بۆ ئەوەی بکرێتە کامیرای (سحب داخلي)؟
**جەمال داوود:** بەڵێ.. هەندێ کامیرا هەبوون، دەمدیت (سەقەت) بووە لەلای هەندێ کەس، بەتایبەتی لەلای هەندێ برادەر کامیرای زۆر نایابیان هەبوو، دەچووم دەمکری، بەڕەحمەت بێ (کەمال) بەشێوازو ڕێگای خۆی پشتەکەی ڕێک دەخست و ئاسانی دەکردەوە بۆ نێت کردن.. چونکە (شەتەر)ی وا ئۆتۆماتیک دەگمەن بوو، زۆربەی کامیرای ئەوکات دەبوایە وەک کامیرای شەمسی ئێستا قەپاغی سەر (عدسە) هەڵگری و دانێیەوە، واتە (کات یا ماوەکە) لە دەست تۆ بوو نەک کامیرا. تەنانەت ئێمە لەناو ستۆدیۆ هەمان ڕێگامان بەکاردەهێنا.
**رامان:** لەوانەیە ئەو کاغەزو فیلم و (کەت فیلم)انەی

ئەوسا وەک ئێستا هێندە هەستیار نەبووبن، وانییە؟

**جەمال داوود:** هەبوو، بەڵام زۆر جۆر هەبوون، زانیاریشم لەسەریان هەبوو، دەمتوانی سوودیشیان لێ وەربگرم، وەک چۆن کاغەزی کلۆراید جیایە لەگەڵ کاغەزی برۆماید لە (قبول) کردنی ڕووناکی زوو وەردەگری یا درەنگ، ماوەی کەم دەوێ یان زۆر، ئەو فیلمانەش بەچەندان جۆر پێوەری جیهانی هەبوون، بەناوبانگترین پێوەری ئەوکات هەستیاری بە (DIN) و (ASA) هەبوون، بەڵام ئەوکات کەم کەس هەبوو لەوە بگات، کەچی بەلای منەوە شتێکی ئاسایی بوو، ئەو جۆرە قسانەم دەکرد، بۆ ئەوەی هەموو کەسێک بزانێ ئەوە چییەو سوودی چییە، منیش شانازی بەخۆم ناکەم بڵێم ئەوە من هەر لە خۆمەوە فێری بوومە، بەڵکو بەهۆی خوێندنەوەی کتێبی بیانی کە دەمبینی ئەو شتانەی تێدا باس کراوە، بۆ نموونە دەمبینی دەڵێن وێنەیەکیان گرتووەو زۆر جوانەو فاین گرتنەو ئەوهایەو ئەوهایە فیلمەکەی خێرایی (١٤)یە، دەگەڕام لەو جۆرە فیلمە بکڕم، نەبوو، بەڵام لە ڕێگای کۆمپانیا کە ئەوکات هەبوو داوام دەکرد، دەیانگوت چیت دەوێ دەمگوت فلان شت، لەلای خۆیان ئەمەیان تۆمار دەکردو ناوونیشانی منیشیان لای خۆیان دەنووسی و دوای ماوەیەک دەیاننارد بەشوێنمداو دەیانگوت ئەوەتا ئەو شتەی داوات کرد هێناومانە، دەتوانم بڵێم ئەو جۆرە فیلمەیان لەبەر من دەهێنا..

**رامان:** ئەو کۆمپانیانە لە بەغدا هەبوون، یان لە موسڵ؟

**جەمال داوود:** بەخوا لە بەغدا زیاتر هەبوون، کۆمپانیایەک هەبوو کەرەستەی وێنەگەری دەهێنا، (مەوادو پرۆجێکتۆرات و شتی وای دەهێنا) کۆمپانیاکە پسپۆڕبوو بە (مەواد)ی گێڤەرت و کاغەزی گێڤەرت ناوی ئەو کچەشم دێتەوە بیر کە لەوێ ئیشی دەکرد ناوی (میس سیرڤارت) بوو، هەر بەو بۆنەیەی کە ئەوان ئەو جۆرە کاغەزو مەوادانەیان دەهێنا، من ئەلبوومێکم دروست کردو بەخۆم کۆمەڵێک وێنەی خۆم (مەبەستم پۆرترێتی خۆم نا)، بەڵکو بەرهەمی خۆم وەک ئەو (ستیل لایف)انەی بەخۆم وەرم گرتبوون، یان دیمەن و گرتەی تر چاپم کردن و بەجۆری کاغەزی ئەوان بۆم بردن، گوتم ئەوە بەکاغەزی ئێوە چاپم کردوون، ئەوان بردیانە لای بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە، (سیرڤارت) هات و گوتی بەڕێوەبەر دەڵێ زۆر جوانن، بەڵام حەز دەکەین وێنەکان بەرهەمی دەستی خۆی بێت. گوتم من زۆر سوپاستان دەکەم کە ئیشەکەی منتان هەڵسەنگاند، چونکە ئیشەکەی من لاتان وابوو هی بیانییە. گوتیان ئەی بیانی نییە؟ گوتم نەخێر هەر هەمووی هی خۆمە، ئەگەر دەتانەوێ زیاتر دڵنیاتان بکەم دەچم هەموو شتەکانیشتان بۆ دێنم.. گوتیان: پێی ناوێ، تەنیا منیان بردە لای بەڕێوەبەری گشتی، لەوێ بۆم باس کرد ئەوە گوڵدانەو ئەوە فلان شتەو ئەوە ئەوهایە، تەنانەت لە نێوانیاندا وێنەی هەندێ یاری منداڵان هەبوو، ئەوانەی لەسەر شەقام شتیان دەفرۆشت کە لە مۆم دروست کرابوون وەک پەیکەرو شتی تر، جا وێنەی ئەوانەم بەسروشتی وەرگرتبوو، تەنانەت خەڵکی نەیدەزانی ئەوانە وێنەی پەیکەرن، چونکە زۆر دەردەچوون.. ئینجا قەناعەتیان هات و ئەلبوومەکەیان لێ وەرگرتم، لەبری ئەوە بە کەرەستەی فۆتۆ کە بایی (٣٠٠-٣٥٠) دیناری ئەوکات دەبوو لیستێکیان کرد، بەخۆڕایی دایانە من، ئنجا خوالێخۆشبوو کەمالی برام لەگەڵم بوو دەیگوت ئەوانە شێتن؟ گوتم بۆ؟ گوتی چونکە ئەوانە پارەیان وەرنەگرت، لەبەر ئەوەی تازە کەڕ ببوو گوێی لە قسەکانمان نەبوو، بۆیە نەیزانی ئەو شتانەیان بەدیاری داوەتە من.. دوایی تێم گەیاند مەسەلە چییە.

## هۆڵی گەل بە مۆسیقای تیپەکەی من کرایەوە، پێش من کەس ئامێری مۆسیقای ڕۆژئاوایی نەهێناوەتە هەولێر

**رامان:** لەوەوە وا دەردەکەوێ کەوا هاتوچۆی موسڵ و بەغداشت دەکرد؟

قسەی بڕیم.. گوتی لەبیرم چووبوو تا لە مووسڵیش هەبوو، بەڵام بەدەرەجەی (استیراد) نەبوو، وانە دەستی دووەم بوو، بەڵام پاشان ئەوانیش ڕاستەوخۆ (استیراد)یان دەکرد، لەوێ دوو سێ شوێن هەبوو لەوانە (مکتبة الآمل) هەبوو لە موسڵ، نازانم شتەکانیان لە کوێ بۆ دەهات، بەڵام کەرەستەکان ئەڵمانی بوون و زۆر کاغەزی چاپی لە لا دەماوەو کەم کەس دەیکڕی، بۆیە پێی دەگوتم، بەڵکو چارەیەکم بکەی، منیش لێم دەکڕی و دەمهێنایەوە هەولێرو دەمنارد بەشوێن وێنەگرەکان و پێم دەگوتن کە چۆن بەکاری دەهێنن و وێنەی لەسەر چاپ دەکەن، دوای ئەوە هەندێ کەس ستۆدیۆیان دانا کە ئەم قسەیە دەکەم ئەو کات بوو کە تازە ستۆدیۆ (فنون) کە کاک پاشا ئیشی تێدا دەکرد هونەرمەندیشە، لەو



**منارەی چۆلی لە هەولێر، بە کامێرای جەمال داوود - ساڵی ١٩٦٠.**

کاغەزانەی دەمهێنان ئەویش بەکاری دەهێنا، بەڵام (معاناة)ی هەبوو لە دەست خەڵکی، چونکە کە لەقەتەی هونەریی بۆ هەندێ کەس وەردەگرت، پێیان دەگوت ئەوە بۆچی وێنەکەمان سووتاوە (واتە مەبەستیان لە سێبەری سەر گۆنا و مل و نێوچاوانیان بوو)، وێنەی تری دەگرت بە (فلات)ی، تەنیا دوو کونە لووت و دوو چاو وەک دوو دەنکە ترێیە داتناوە لەگەڵی، کەیفیان بەو جۆرە وێنەیە دەهات، هەرچەندە کەسانێک هەبوون هەتا دیاریش نەبوون، شێت بوون لە جادان دەسووڕانەوەو منداڵ بەدوایان دەکەوتن، بەڵام هەستی هونەرییان هەبوو، کاک زاهیرو ئەبوو سەباح ئاگایان لێیە کە کاتێک پێشانگەیەکم کردەوە ئەگەر شیاو بێت ئەمە باس بکەم..

**ڕامان:** فەرموو فەرموو بڵێ بۆ نا؟

**جەمال داوود:** کاتێ ئەو پێشانگایەم کردەوە ئەو پیاوە شێت بوو، ڕیشەکەی هێندە جوان و سەیر بوو دڵم کەوتە سەری، بۆیە حەزم کرد وێنەیەکی بگرم، هێنامە ژووریَ منیش سەرەتا وێنەیەکی ئاساییم بۆی وەرگرت (لە دڵی خۆم گوتم با ئەمە دیاری بێ بۆی) پاشان گرتەیەکی ترم بەشێوەی هونەری وەرگرت، کە بەڕاستی وێنەکە زۆر جوان دەرچووبوو گەورەم کردو لە پێشانگەی ستۆدیۆکەمانم هەڵواسی، قەوارەی وێنەکەش (کابنت) بوو، ئەویش (واتە شێتەکە) وێنەکەی خۆی لەجام و چوارچێوەیەکی زێڕینی گرتبوو، ئینجا بەپەتێک بەیاخەی خۆی هەڵواسیبوو، زۆر کەیفی بەوێنەکەی خۆی دەهات، ڕۆژێک هاتە ستۆدیۆ، نازانم ئێمە بەچییەوە مەشغوڵ بووین، ئەو هەستابوو گرتە ئاساییەکەی خۆی لە شوێنی گرتە هونەرییەکەی ستۆدیۆکەمان هەڵواسیبوو، گرتە هونەرییەکەی لە جیاتییان بردبوو، وا دەرکەوت لەگەڵ ئەوەی کابرا شێت بوو، بەڵام هەستێکی هونەریی هەبوو. منیش کە ئەوەم زانی دەنگم نەکردو لێم نەسەندەوە، ئەگەرچی دزیبووی، بەڵام من دەمگوت نەخێر دیارە سەرسام بووە بە گرتەکە بۆیە بردوویەتی..

ئەگەر بواری ئەوەم پێ بدەن باسی گرتەیەکی تریش بکەم؟

**ڕامان:** فەرموو فەرموو بڵێ؟

**جەمال داوود:** ڕەسمێکی (پەیکەری ئێسقان) هەبوو، بۆ پێشانگا گەورەم کردبوو، وابزانم (٥٠×٦٠)سم بوو، کاک زاهیر چاپی کردبوو، ئەبوو سەباح و وان ئاگایان لێیە، کاتێک ئەوەم لە (کۆگای)ی ڕۆشنبیری جەماوەری دانابوو لەلای ئەبوو سەباح ووان، کاتێک وتیان ئەو وێنەیە نەماوە و دزراوە، من وتم تەنانەت ئەگەر بشدزرێت قابیلە چی لێدەکرێ، حەتمەن ئەو کەسە هەڵیدەواسێ، ئەو کاتە خەڵکی دەیبینن، بۆیە زۆر گوێم نەدایێ و وتم بابیبەن، دوایی دەرکەوت دزین نەبووە، بەڵکو شانازیکردن بووە بە وێنەکەم، لەناو کۆمەڵێک وێنە ئەمەی هەڵبژاردبوو، ئەویش نەجات خەتات بردبووی، چەندین ساڵ بوو لەلای خۆی بوو.

**ڕامان:** ئەو وێنەیە لە چ قۆناغێکدا گرتبووت؟

**جەمال داوود:** ئەو وێنەیە بۆ پێشانگەیەکی تایبەتی کردبوومەوە، چونکە پێشانگەی یەکەمم کردەوە، زۆر سەیربوو، لەبەر ئەوەی من پێشتر چەندین پێشانگەم کردبووەوە، بۆیە شتەکە سەیربوو نەمدەزانی خەڵکی وا بەجۆش و خرۆشەوە پێشوازی لێدەکەن، هەتا دەیانگوت سجلێک، شتێکت نییە تێبینی خۆمانی تێدا تۆمار بکەین، دەیاننووسی دەستت خۆش بێ و دەستەکانت واو

واو.....

**ڕامان:** یەکەمین پێشانگەت کەی کردەوە؟

**جەمال داوود:** لەبیرم نییە لە چ ساڵێک بوو بەتەواوی، بەڵام ئەوە دەزانم تازە شۆڕشی (١٤)ی تەمموز کرابوو لە قوتابخانەی ئەیوبیەش بوو.

«کاک زاهیر وتی وابزانم لەو پێشانگەیەدا نزیکەی (٢٠- ٢٥) وێنەی قەوارە شیت نمایش کرابوو».

زۆر بابەتی پۆرتریتیم دەگرت، بەتایبەتی وێنەی شێتەکان لەوانە (کسۆک)، کابرایەکی تر هەبوو پێیان دەوت (حەمە ئاسن) وێنەی ئەویشم گرتبوو لە پێشانگەکە دامنابوو، هەتا سەری ڕووت بوو، منیش پێیم وت ئەمجارە شتێک لە سەرت دابنێ، چونکە گرتەی یەکەم بەسەر ڕووتی بۆییم گرت.

ئەوکات لە چایخانەیەک لەسەر تەختی دانیشتبوو، ڕێبوارێک لەوێ ڕەت دەبوو تووڵی پێ بوو (قوماشی پەردە)، کابرای بانگ کردو تووڵەکەی لێ وەرگرت و لەسەری خۆی ئاڵاندو وتی دەئینجا وەرە وێنەیەکم بۆ وەرگرە، شێتەکان کاریان بەپەلەو فەوریە، چییان لێ داوا بکەی زووبەزوو بۆت ئەنجام دەدەن.

وێنەکەم بۆی گرت و لە پێشانگەم دانا، ئەو جۆرە وێنانە زۆر دەربڕن، چونکە ساکاری و سادەییان تێدایە، ڕاستگۆیی لە سیمایان بەدی دەکرێ، پێشانگەی یەکەمم بەزۆری هی ئەو جۆرە کەسانە بوو، هەر چەندە کەسیشیانم نەدەناسی.

یەکێک هاتە لام وتی: یارمەتییەکم بدە، منیش وامزانی شێتە، لێم پرسی ماڵت لە کوێیە، وتی: کەوتۆتە ژێر دەریا، منیش وتم دیارە عەقڵی تێکچووە بۆیە بەگاڵتەوە پێم وت: باشە ئەو دەریایە لە کوێیە؟ وتی: لای دوکانە.. وتم: بەڕاستی؟ وتی بۆ دیارە ئاگات لێی نییە، ئەوێ هەمووی دەکەنە ئاو و منیان دەرکرد، ئینجا ئێستا سلایدێکی ئەویشم ماوە..

**ڕامان:** کەس هەبوو بەر لە تۆ پێشانگەی کردبێتەوە؟

**جەمال داوود:** نەخێر کەس نەبوو.

**ڕامان:** ئەی چۆن بیرت لەوە کردەوە پێشانگەی فۆتۆگرافی بکەیتەوە؟

**جەمال داوود:** من کە ئەو وێنانەم دەگرت، عادەتم وابوو بەهەزاران لەو وێنانەم چاپ دەکردو دەمدانە خەڵکی بێ ئەوەی پارەیان لێوەربگرم، وەک دیاریی دەمدانێ، ئینجا ئەوان دەیان وت: بۆچی ئەو وێنانە لە شوێنێک دانانێی بۆخۆمان تەماشایان بکەین، بەم قسانە کاریان تێکردم، بۆیە منیش بیرم لێکردەوە، هەرچەندە لەوانەیە من دەرکم پێ نەکردبێ، یان هێشتان ئاستی هونەریم هێندە نەبووبێ یا کەسانێک نەبوون پێش من لاساییان بکەمەوە، هەرچەندە لاساییانیشم نەدەکردنەوە، چونکە حەزم لەلاساییکردنەوە نییە.. بۆ نموونە: ئەگەر تابلۆی کەسێک هەبوو، گەر من لاساییم کردەوە هەرچی بکەم وەک ئەوم پێ ناکرێ، خۆ ئەگەر لە (١٠٠٪)یش دەرم هێنا، ئەوە هەر هیچم نەکردووە، چونکە ئەوەی پێشوو ئەصلە، خۆ ئەگەر ڕەتاندیشت هەر بەوەی ئەو ناچێ و شتێکی ترت ئەنجام داوە، واتە هەر وەک ئەوت نەکردووە، واتە لە هەر سێ حاڵەتەکە وەک ئەوت نەکردووە، بۆیە بەڕای من وێنەی پشیلەیەک بگری، کە پشیلەکە چرنووک دەهاوێ، وێنەکەی وا بگری بە خێراییەکی زۆر نا (واتە خێرایی داخەر زۆر نەبێت) تا وێنەکە وەستاو نەبێت، بەخێراییەکی گونجاو بە لێکدانەوەو سەرنجی خۆت وابکەی دەستەکەی (فلو)بێت و لە هەمان کاتدا بەدەنی پشیلەکە نێت دەردەکەوێ، کاتی خۆی وێنەی تراکتۆرێکم بەو شێوازە گرتبوو، تایە گەورەکەی (فلو)بوو، ئەوانی تر (نێت) بە بینینی هەستت بەوە دەکرد کە دەڕوات، یان لە ڕۆیشتندایەو ئەمە زیندەگی تێدایە.

**ڕامان:** بەڵێ ئەمە یەکێک لە قوتابخانەکانە، دەربڕین لە جووڵە بەو شێوازە ئەنجام دەدرێ، وەک وێنەی شانۆیی و هەڵپەڕکێ و غاردانە؟

**جەمال داوود:** من بەتاقیکردنەوە گەیشتمە ئەو ئەنجامە و دەرسم وەردەگرت، دەمبینی وێنەیەکم وەرگرتووە لە حاڵەتی جووڵە دەمگرت وەها نەبوو، دیسان دووبارەم دەکردەوە، خێرایی داخەرم دەگۆڕی، دەمدیت دەگەیشتمە ئەنجامێک، ئەمانەم دەکرد بەر لەوەی کتێب و گۆڤاری بیانی لەو بارەوە بخوێنمەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئەوانەم بەدەست گەیشت، ئەوان زۆر لەم هونەرەدا پێشکەوتوو بوون.

**ڕامان:** ئەو گۆڤارانە چی بوون بەدەستت دەگەیشتن گەر بێتەوە یادت؟

**جەمال داوود:** گۆڤاری (ئەمچۆر فۆتۆگرافی)، زۆر ژمارەشم هەبوو لە گۆڤاری مۆدێرن فۆتۆگرافی، پراکتیکاڵ فۆتۆگرافی بۆ ئەم گۆڤارەی دوایی بەتراڤڵ چەک دەمنارد بۆم دەهات، ئەوکات بە (١) دینار بارێک گۆڤارت بۆ دەهات، بەڵام بە ئەمانەت نەدەگەیشتە دەستی خاوەنەکانیان، هەتا بۆ وێنەی ڕەنگاوڕەنگیش هەمان شت بوو، لەبیرمە جارێکیان برادەرێکم ژنیان بۆ براکەی هێنا، منیش وێنەکانیم بۆ گرت و ناردمە دەرەوە، کە فیلمەکە هاتەوە نەیاندامەوە، دوایی لە دەرەوە وێنەکانم دۆزیبیەوەو بەپارە لێیانم کڕییەوە، خەڵکەکە وایان دەزانی

فیلمی بیانییه، (تول و قداح و ئەو شتانەیان لەبەر بوو) بۆیە وایان دەزانی هی دەرەوەیە یا هی گۆڤارەکانی دەرەوەیە.

ئەم رووداوە نازانم کەی بوو، بەڵام دەزانم ئێستا کوڕیان گەورەیە و بەماڵ و ژنە، وابزانم دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز بوو.

**رامان:** وەک دەزانین پێوەندیشت لەگەڵ (موراد داغستانی) هەبوو، ئەو پێوەندییە چۆن دروست بوو؟ کەی بوو؟

**جەمال داوود:** کە یەک دووجار هاتوچۆم کرد، بینیم وێنە هونەرییەکانی خۆی دەیگرتن نیشانی منی دەدا، وای لێهات لەبەردەم خەڵکی ئەمەی نەدەکرد و دوور لە چاوانی ئەوان دەچووینە ژووری چاپ (ستۆدیۆکەی)، ژوورەکەی زۆر گەورە بوو، لەوێ تا سەربەستی خۆی وەرگرێ و ئازادبێ لە گفتوگۆکانمان، من پێم دەوت لێرە دڵم دەگوشرێ، ئەو دەیگوت ئاخر خەڵکی خۆیان تێ هەڵدەقوڵتێننە ناو باسەکەمان و دەبنە بارگرانی، ئینجا باسی وێنەکانی دەکرد کە چۆنی گرتووە، کە من ڕای خۆم بۆی دەربڕی، هەستم دەکرد سوودی لە قسەکانم وەردەگرت.

دەیگوت: بەڕاستی ئەو فکرەیە جوانە، منیش هەستی خۆم بەرامبەر تابلۆکانی دەردەبڕی کە جوانن، بۆ نموونە یەکێک لەو وێنانەی کە پێی سەرسام بووم، هی باران بوو لەگەڵ پەیتون، وێنەکە زۆر جوان بوو جووڵەی دابووێ، دووبارەی کردبووەوە، بەڵام بەجووڵەیەکی تر..

ئینجا دوا بەدوای ئەوە پێوەندی نێوانمان زۆر بەهێزبوو، هەتا دوو رووداوی سەیر لە نێوانمان رووی دا، هەر بەم بۆنەوە بۆتان دەگێڕمەوە کە زۆر سەیرن..

**رامان:** (قسەکەیم بڕی) ببوورە.. ئەو پێوەندییە پێش شۆڕش بوو، یان دوای شۆڕش؟

**جەمال داوود:** خۆی پێش شۆڕش پێوەندیم لەگەڵی هەبوو، بەڵام دوای شۆڕش بەهێزتر بوو تا ئەو ڕادەیە بوو، تەلەفۆنی بۆ دەکردم (ئەو کات تەلەفۆن لە بەینی شارەکاندا هەبوو) دەیگوت وەرە شەترەنجێک بەیەکەوە بکەین، کە منیش دەچووم دەمدیت وێنەیەکی تری چاپ کردووە، لەسەری گفتوگۆمان دەکرد، بەمە پێوەندیمان زۆر بەهێزبوو، ڕۆژێکیان هەواڵی ئەوەم بۆهات گوایە (موراد) مردووە، ئەو کات منیش لە بەغدا بووم، ئینجا زۆر جار هەتا لە بەغداش بەدوای مندا دەگەڕاو سۆراغی دەکردم، ئەو جارەیان سەرە جومجومەیەکی بەدەستەوە دەبێت و بەردو لای من دێت لە نوتێل، ئوتێلەکە ناوی (فندق الحکیم)بوو، کە هات پێیان وتبوو من چوومەتە دەرەوە، جا ئەو بۆیە هاتبوو کە جومجومەکەی بۆ (ترکیب) بکەم، بە منیشیان وتبوو مردووە، ئوتێلەکەی منی تێدا دابەزیبووم قادرمەکەی زۆر تاریک بوو، ڕووناکی کەم بۆ دەهات، لە دەرگای ژوورەکەم درا، کە دەرگام کردەوە بینیم سەلکە جومجومەیەک لەسەر سینییەک دانراوەو (موراد)یش لە پشتی.. لەبەر ئەوەی لە خەیاڵی مندا موراد مردبوو، بۆیە ئەو دیمەنە واقی وڕماندم و هەتا ڕادەی ئەوەی هێندەی نەمابوو لە هۆش خۆم بچم.. ئەمە رووداوی یەکەم بوو..



فۆتۆ: جەمال داوود

رووداوی دووەم، موراد پێشانگەیەکی لە بەغدا کردبووەوە، ناردبووی بەشوێنمدا کەوا شتێکی بۆ بنووسم، واتە ڕا و سەرنجەکانی بۆ بنووسم، منیش ئاگاداری ئەوە نەبووم کەوا وەزارەتی (اعلام و ارشاد)ی ئەوکات تابلۆکانیان لێی کڕیوە، یەکێک لە تابلۆکانی ئەوەبوو چەند کەسێک کاریان لە گۆزە دروستکردن دەکرد و تێیان هەڵدەدا..

**رامان:** منیش کتابەکەی موراد داغستانی (جدل الانسان و الطبیعة)م نیشان دا؟

**جەمال داوود:** لەوانەیە ئێستاش هەمان شتی نووسیبێ؟.

**رامان:** منیش وتم نووسیویەتی (عمال الفخار)؟

**جەمال داوود:** نەخێر لە پێشانگەکە نووسیبووی (تونگە)، باشە (تونگە) چییەو مەبەستێکی وا ناگەیەنێ، هەروەها یەکێک لە وێنەکان هی کابرایەک بوو کووڕ ببووەوەو کورسییەکی لە پشت خۆی هەڵگرتووە، لە دەرەوەی وڵات وێنەکەی گرتووە، بۆ ئەو لەقتەیە نزیکەی (٦) فیلمی (١٢٠)ی گرتبوو تا ئەو گرتەیەی دەست کەوتبوو، وتم باشە بۆچی؟ وتی ئاخر تا ئەو گرتەیەم دەست کەوت ئەو کابرایە منی کوشت، چونکە هەر بەدوایەوە بووم و وێنەیم دەگرت..

**رامان:** وێنەکەم نیشانی دا و وتم لە ژێری نووسراوە

(موسیقی الزمن)؟

**جەمال داوود:** من پێم وت (ئەوکات)، کەوا ئەو پەنجەرانە (جائز) نییە و لای من وێنەکە مردووە، چونکە بەلای منەوە ئەو وردە پەنجەرانە وێنەکەی کوشتووەو کەوتۆتە ئاستی نێو چاوانی کەسەکە، سەرەڕای نەگونجانی باکگراوندی وێنەکە، دەبوایە ئەویش مۆسیقایەکی تێدابوایە نەک هەر کابرایەکە، خۆ لەوانە بوو، لەوێ بینایەکی تازە بەرامبەر کونێتک هەر هەبووبن تا بیکردایە بەباکگراوندی وێنەکە، ئینجا ئەو ڕەخنانەی من کە لە دەفتەرەکەشیم نووسیبوون، دوای ماوەیەک هاتە هەولێر بۆ یەکەمجاری، سەری لێدام و زۆر تووڕە ببوو، ئەوکاتە هێشتان منی نەدیبوو، بەڵام وتبووی کەوا من زەرەری (٦٠٠) دیناری ئەوکاتیم لێ داوە بەهۆی ئەو ڕەخنانەی لێیم گرتبوون، چونکە لێی پەشیمان ببوونەوەو تابلۆکانیان لێی نەکڕیبوون.

**رامان:** لە قۆناغێکدا لەودیە وێنەی گەورەکراوی زۆر گەورەتان لەگەڵ کاک زاهیر ئەنجام دابێ، ئەو لارجەرانە کەی و چۆن دەستتان دەکەوت؟

**جەمال داوود:** ئەو کات لارجەر دەگمەن بوو، دەتوانرا (تکابیر)ی نیو شیتی یان شیت (٥٠×٦٠)سم ی پێ گەورە بکەی، کە ئەمەش سینی و شتی تری دەویست، ئەو کەرەستانە کەم بوون تا ئێستاش هەر نین، من هەمبوو، جێی شیتی تێدا نەدەبووەوە، بەڵام جێی (نیو شیتی تێدا دەبووەوە)، واتە بەرینایی وێنەکە بەقەدەر سینییەکە بوو، بەڵام حەزەکانی من زۆر لەوە گەورەتر بوون و دەمویست وێنەی زۆر لەوە گەورەتر ئەنجام بدەم.. کاک زاهیر لەوانەیە بێتەوە بیری وێنەی چەند گەورەمان ئەنجام دەدا، لەوانە وێنەی قەوارە (١.ر١×٣)م بوو.

تیشکی لارجەرەکەم لە دیوار دەداو کاغەزەکەم لەوێ چەسپ دەکرد، بەهۆی پێشەکی تەرکردنی پاشان دیڤلۆپەرمان بەهۆی (ئیسفنج)ەوە لێ دەخشاند، ئینجا فیکسەرو شتنەوەی بەئاو، پاشان وشک دەبووەوە.

بەم دواییە لارجەرێکی ترم بۆهات پێیان دەوت (هانسە) ئەوکات سینی گەورەی ئەلەمنیۆمی (فافۆن) هەبوو، بەڵام دەستی نەدەدا بۆ ئیشەکەمان، چونکە کارلێکی کیمیاوی ڕووی دەداو سینییەکە دەتوایەوە، یان کون دەبوو، دیڤلۆپەرەکەش دەگۆڕا، زاهیر- ئێمە دەهاتین بۆ شتنەوەی ئەو جۆرە (تکابیر)انە دیڤلۆپەرەکەمان سست دەکردەوە بەهۆی زیادکردنی ڕێژەی برۆماید لەناو دیڤلۆپەرەکە.

**رامان:** باشە وێنەگر ئەبوو سەباح چۆن خزایە ناو ئیشەکانی ئێوەوە، چونکە وەک دەزانین ئەو پێشان لە سینەما ئیشی دەکرد؟

**جەمال داوود:** لەبەر ئەوەی ئەبوو سەباح هەستی هونەریی هەبوو، ئەوکات زۆر کەس دەیویست ئێمە بچینە ماڵیان و لەوێ بەبۆنەی ژن هێنان وێنەی خێزانییان بگرین، هەتا شتێکم دێتەوە یاد کابرایەک هەبوو درۆیەکی زۆر گەورەی کردبوو، وتبووی وەرە ماڵی (متصرف) وێنەمان بگرە.. ئەبوو سەباح چووبووە ئەوێ بینیبووی ماڵێکی ئاساییە، هەر چەندە پێی ناڕەحەت بوو، بەڵام وێنەکەی گرتبوو، وتم گوێ مەدەیێ، چونکە ئەوە (تقدیر)ە بۆ تۆ، کابرا ویستوویەتی بەهەر شێوەیەک بێت تۆ بگەیەنێتە ماڵی خۆی تا وێنەیان بگری، دیارە وێنەکەی بەدڵی بووەو ناوی ستۆدیۆکەش ناوبانگی دەرکردبوو، بەمە وای لێهات (احتکاک)ەکە لەگەڵ ئەبوو سەباح دروست بوو، بەمە ئەبوو سەباح دەرچوونی زۆربوو تا وای لێهات فلاش و کامیرا بەسەر ئەبوو سەباح زاڵ بوون، وتمان لەوانەیە سینەما جێ بهێڵێ، بەڵام ئەویشی بەجێ نەهێشت و لەوێش ئیشی دەکرد، لەبەرئەوەی ئەبوو سەباح مرۆڤێکی سەر ڕاست و خۆشەویست بوو لەلای خەڵکی، بۆیە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی خۆش بوو ئەو کاتیش خێزانە (های لایف)ەکان ئەم وێنانەیان دەگرت.

ئەبو سەباح ناوی بە مرۆڤێکی ڕاستگۆ و ئەمین دەرکرد و نهێنی خەڵکیشی دەپاراست، چونکە ئەم سیفەتانە زۆر گرنگن بۆ وێنەگر.

**رامان:** دەڵێن ئەبوو سەباح یەکەم وێنەگری گەڕۆک بووە لە سەردەمی خۆیداو کەسی تر نەبووە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ هیچ وێنەگری تر نەبوون، وێنەگری گەڕۆکیان پێ بڵێن و بەفلاشیش بچێت وێنەی خەڵکی لە شوێناندا بگرێت.

**رامان:** واتە ئەبوو سەباح بووە پردێک، پێوەندی لە نێوان خەڵک و ستۆدیۆکەتان دروست کرد؟

**جەمال داوود:** بەڵێ وایە.

**رامان:** ئایا وێنەی ئەوانەی دەگیران، بۆیان دەبردرایەوە ماڵەکانیان، یان دەهاتن لە ستۆدیۆکەتان وەریان دەگرتەوە؟

**جەمال داوود:** بەپێی ڕێکەوت بوو، لە هەردوو جۆری هەبوو پەیڕەو دەکرا.

**رامان:** کێ بوون ئەوکەسانەی دوای تۆ لە هەولێر ستۆدیۆیان دانا، یان هاتبنە لاتان داوای زانیارییان لە ئێوە کردبێت؟

**جەمال داوود:** ئێستاش زەرفی ئەوکاتمان ماوە کە لەسەری نووسراوە ستۆدیۆ (کەمال) بۆ شتنەوەی فیلمی (٨، ١٦، ٣٥ ملیم) و زۆر شتمان دەهێنا، شتی غەریب



و دەگمەنمان زۆر دەهێنا نزیک بوو لەوەی بەم ساڵانەی دوایی (الشركة العامة للاجهزة الدقيقة) دەیهێنا.

**ڕامان:** واتە ئیسترادیشتان دەکرد بۆ فرۆشتنەوەیان؟

**جەمال داوود:** کامیراو ئەمانە.. نا.. بەڵام شتی ترمان زۆر دەهێنا، هەتا هەندێ کەسی غەشیم دەهاتن داوای دەرمانی نەخۆشییان لێدەکردین و وایان دەزانی (دەرمانخانەیە)، بەبیرم دێتەوە، موراد کامیرایەکی هەبوو نەدەفرۆشرا. من لێیم کڕی و داتانە (ڕووی لە ئەبوو سەباح کردبوو) برای برادەرەکمان ستۆدیۆی هەبوو، ئەوکات موراد وتی بە (٧٥) دینار کەمتری نادەم من بە (٦٠) دینار لێم کڕی ئەوکات (کەمال)ی ڕەحمەتی بەهەرزانی فرۆشتبوو بە (٥٠) دیناری دابوو، وای زانی زۆر بەگرانی فرۆشتووە، گەر من بوومایە بە (١٠٠٠) دیناریشم نەدەدا، دابوویە برای وەستا عەونی کە سەڵاحی ناوبوو..

ئەبوو سەباح: پاشان کامیرایەکت هێنا عەدەسەیەکت بۆ کڕیبوو لە بەغدا، دەتخستە سەر عەدەسەی کامیرا.. جارێک لە شەقڵاوە بە منت گوت (عەبدوڵڵا) بنێرە سەر چیای و ئەو زنجیرەی لە ملت بکە و سەرەکەی تری پێی لەسەر دابنێ، تا کامیرا لە دەستت نەجووڵێ.

**ڕامان:** دیارە سێپایە نەبووە؟

**جەمال داوود:** ئەگەر هەشبوایە وەک ئەو زنجیرە باریکە نەدەبوو لەڕووی عەمەلییەوە، زنجیرەکە باریک بوو درێژی نزیکەی (٥ر١-٢)م دەبوو ڕۆڵی ستاندی دەدێت..

**ئەبوو سەباح** - کامیرەیەکی تریشی هێنابوو، عەدەسەی لەسەر بوو لە کاتی وێنەگرتندا ئەسەر و ئەپێی شەخسەکەت لێ دیار نەدەبوو، کەچی وێنەکەی بەتەواوەتی دەردەچوو.

**جەمال داوود:** ئەو کات زۆر منداڵان و کەسانی تر دەیانکردە هەڵڵا لە کاتی وێنەگرتنی کەسێکدا، بۆیە ئەوان دەبوونە باکگراوندێکی نەشاز، تا لەم دیاردەیە دوورکەومەوە، هەستام جووت قەپاغێکی عەدەسەم لە لاتەنیشتێکی کامیراکەم قایم کردبوو بەهۆیەوە ڕووم لە کەسانێک دەکرد کە مەبەستم نەبوون وێنەیان دەرچێ، لە هەمان کاتدا ڕووی عەدەسە ڕاستەقینەکەشم لە کەسانێ دەکرد کە مەستم بوون بە ئیسراحەتی خۆم وێنەکەیانم دەگرت..

**ڕامان:** دیارە کامیرای ڕفلێکست بووە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ ڕفلێکسی جووت عەدەسەش بوو، جگە لەوەش ڕفلێکسی، یەک عەدەسەییشم هەبوو، ئەو کامیرایەی عەدەسە تەلیەکەم لەسەر قایم دەکرد مارکەی (کۆنتافلێکس)بوو.

**ڕامان:** باشە مامۆستا ئەوکات دیارە کارتی جەژنە پیرۆزانە نەبووە، بۆیە ئێوە ئەو وێنانەتان بە ژمارەی زۆر چاپ کردووە جێی ئەوانە بگرێتەوە؟

**جەمال داوود:** ئەو کارتانەی دروستم دەکردن، وێنەیەکی دیمەنی هەولێر و منارە بوون، لە تەکیا وێنەیەکی خۆشم لەسەر هەمان کارت چاپ دەکرد بۆ ئەوەبوو کە هەر کەسێک ویستبێتی بەهەمان شێواز بۆم دەگرت و چاپ دەکرد.

**ڕامان:** وا دەردەکەوێ ئێوە لەپاڵ کاری ناو ستۆدیۆکەتان بۆ وێنەگرتنی سروشت چوونە دەرەوەشتان هەبووە؟

**جەمال داوود:** ناشێ من خۆم بەخۆم بڵێم هونەرمەند، بەڵام هونەرمەند هەردەم کارلێک دەکا. ئەو کارلێکە وای لێدەکات زۆر شت لەلای بەقەدرو قیمەت بن، بۆیە زۆرجار ناچاری دەکردی بچی ڕسقت بەجێ بهێڵی و وێنەی تر بگری، وەک شاخ و داخ.. لەوێ لەبەر تیشکی سەرووی وەنەوشەیی زۆر بەشی شاخەکان لە وێنەکاندا ون دەبوون، من ئەوکات مەراقم لە چیای سەفین و دەوروبەرەکەی دابوو، لە جەنجەڕو ئاو دەرهێنان لە بیری، بەداخەوە زۆربەی نێگەتیڤی ئەو بابەتانە لە پڕ و لە ناکاو ون بوون و نەمان، ئێستا نزیکەی (٣٠) فیلمی ڕەش و سپی گیراو، کە نەشووراونەتەوە ماون، گەیشتمە حاڵەتێکی نەفسی وا موتەئەسیر بووم ئێستا ئەو فیلمانە وابزانم لەلای کاک یەحیا مەرجانە.

ئەبوو سەباح- (موداخەلەی کرد) وتی: زۆرجار کە

وێنەی دیمەنێکمان بگرتایە، جەمال ئەفەندی ڕێنمایی دەکردم کەوا شتێک بکەمە چوارچێوەی سروشتی بۆ دیمەنەکە، بۆ نموونە: کە وێنەی منارەی چۆلیم بگرتایە، دەیگوت عامودێک یا لادیوارێک دەربچوێنە لەگەڵ گۆشەیەکی دیمەنەکە..

**جەمال داوود:** من کە وێنەی منارەی چۆلیم دەگرت، کە ئەوکاتە دەوروبەرەکەی چۆڵ بوو، گەر هەور بە ئاسمانەوە نەبوایە، ئەوە گرتەکە هیچ جوانییەکی ئەوتۆی نەدەبەخشی، هەتا هەندێ جار دەمگوت گەر ئەوەش نەبوو، بڕۆن لقێ یا چڵە دارێک بگرن بەدەستەوە لە سووچێکی دیارکراوی دیمەنی کامیراوە بەدی بکرێ و ئەمە دەبێتە بەشێکی زیندووی وێنەکە یا دیمەنەکە.

**ئەبوو سەباح:** هەندێ جار دەیگوت دەستتان بکەنەوە وا وێنەکە بگرن وەک بڵێی منارەی چۆلی کەوتبێتە سەر لەپی دەستتان.

**جەمال داوود:** ئەوکات ئەو جۆرە تەکنیکە نەبوو، یان کەس نەیدەزانی، بە فیلم و کامیرای ڤیدیۆ جاران نەیدەکرد، بەڵام ئێستا بۆتە کارێکی زۆر ئاسایی.

لە زەمانی من گەر زەلامێک ببوایە دوو کەس لە دەوری مێزێک دانیشتنایە، ئەمە موعجزە بوو، کەس نەیدەزانی ئەوە یەک کەسە یا دووانن، سەد کەس گرەویان لەسەر ئەوە دەکرد بزانن یەک کەسە یان دووانن، بەڵام ئێستا بەهۆی پێشکەوتنی تەکنیک ئەمانە بوونەتە شتێکی ئاسایی.

ئەوکات کە وامان دەکرد منارە لەسەر لەپی دەست بەدی بکرێ، زۆر کەس وایان دەزانی ئەمە سیحرە، یان بەنی ئادەم دەچووە ناو بوتڵێک، یان لەم جۆرە شتانە.. من حەزم بەوە نەدەکرد ئەو شتانە بەیەک جۆر دەربکەم، بەڵکو هەردەم حەزم لە شێواز و جۆری تازە بوو، بۆیە هەندێ لەو جۆرە ڕەسمانەم دەبوونە کارت و بە هەزاران دانەم لێی چاپ دەکرد و دەمدا خەڵکی و دەهاتن بە کۆمەڵ لە کەمالی برامیان دەکڕی، لە قەزاو هەتا لە سلێمانیش دەهاتن دەیانکڕی، بەشێوەی کارتی جەژنە پیرۆزانە دەیانفرۆشتەوە هەندێ کەس هەبوون کارتی شەخسی خۆیان هەبوو، نیوەی ناوونیشانی خۆی بوو، نیوەکەی تری یەکێک بوو لە دیمەنەکانی من.

**رامان:** وا دەردەکەوێ لە سەردەمی خۆت شێوازی (دەبل ئیکسپۆزەر)ت بەکار دەهێنا؟

**جەمال داوود:** هەوڵدانم هەبوو.. ئەو (دەبل ئێکسپۆزەر)ە شتێکی دەگمەن بوو، چونکە وەک گوتم بۆ نموونە: وێنەم گرتووە کامیراکە وابوو نەتدەتوانی بەوشێوازە پێی بگری (هەروەک لە کامیراکانی ئێستادا ئەمەیان تێدایە یان بەئاسانی پێیان ئەنجام دەدرێ)، بەڵام من بەرێگای تایبەتی خۆم لە ژووری تاریک (دارک ڕووم) فیلمەکەم دەگەڕاندەوە، دیسان لەسەرم دەگرتەوە، تا فیت بیگەڕێنمەوە شوێنی پێشووی بەهۆی چەقۆ ڕۆخەکەم نیشان دەکرد، بەهۆی ئەمەوە دەمزانی گەڕاوەتەوە یا گەیشتۆتەوە شوێنی پێشووی و بەدڵنیاییەوە گرتەی دووەمم لەسەری دەگرتەوە بەمەش دەبووە (دەبل ئیکسپۆزەر).

**رامان:** وێنەی (حجر)ی یان ئەو وێنانەی ڕەش و سپی کە بەتاک ڕەنگی شین، قاوەیی، زەیتوونی.. دەرت دەچواندن لەچ قۆناغێکدا یا چ کاتێک ئەمانەت ئەنجام داوە؟

**جەمال داوود:** من کاتێک خۆم و خێزانەکەم بەسەردان چووینە دەرەوەی وڵات، فیکرم لەبارەی ژیانەوە گۆڕا، لەوێ شتی سەیرم دی زۆریش لەوێ ماینەوە، لەدوای هاتنەوەم زۆر شتم لەبیر چوو، بۆیە ئێستا ئەو مێژووانە بە تەواوی نازانم.

**رامان:** لەوانەیە لە ماوەی شەستەکان بێت؟

**جەمال داوود:** خۆی من لەماوەی شەستەکان چالاکییەکی زۆرم هەبوو، هەوڵدانی زۆرم لەبارەی فۆتۆگرافەوە هەبوو، چونکە پێشانگەی یەکەمم پێش شەستەکان بوو، کە بینیم خەڵکی زۆر بەجۆش و خرۆشەوە بەرەو پیری وێنەکانم دێن و حەزی لێ دەکەن، من گەرمتربووم، هەڵبەتە بەرهەمەکانیشم جوان بوون، دەمبینی خەڵکی وێنەیەکی ئاسایی دەگرن، من هەمان بابەتم دەگرتەوە بەهۆی بەکارهێنانی فیلتەر و شتی تردەوە دەمکردە بابەتێکی هونەری..

**رامان:** مەبەستم ئەوەیە لەو سەردەمی، تۆ مامەڵەت لەگەڵ فیلتەران کردووە بۆ وێنەی ڕەش و سپی.. بۆ زیاتر دەرخستنی هەور و پلەپلەیی تۆناتەکان؟

**جەمال داوود:** ئەو فیلتەرانەی بۆ ژووری تاریک بەکاردەهاتن بۆ (سیف لایت) هەر ئەو فیلتەرانەم بەکار دەهێنا، کە باسم کرد پەلکە کاغەزی سیلۆفینی ڕەنگینی چوکلێتی (نۆگە) بوو بەکارم دەهێنان.. (ئەو نۆگەیە وەک گەزۆ یا (من السما) وابوو بە کاغەزێکی ڕوونی هەمە ڕەنگ سوور، کەسک، زەرد، شین داپۆشرابوون) لەو ڕەنگانە سوودم وەردەگرت و دەمدیت ئەو کاغەزانە زۆر ڕوون (شفاف) نین، بۆیە دەمبرد لەبەر هەتاو دامدەنا و عەدەسەم لەسەر دادەنا، بۆ ئەوەی پێوەی بنووسێ، جۆرە کرێمێک هەیە واتە جامێکی شەفافە تیشکی (UV) سەرووی وەنەوشەیی دەمژێ، بەمەش گەرماییەکی زۆر دادەکا (خزن دەکا) کە هێندەیە بۆ ئەوەی کاغەزەکەی بە

ڕووی عەدەسەکەوە بلکێ.

ئەم کاغەزە کە بەڕووی عەدەسەکەوە دەلکا، ڕوون دەبوو، دیمەنەکەم بەجوانی دەدیت و هێندە بوو من بتوانم چەند گرتەیەکی پێ ئەنجام بدەم، بەتایبەتی هەور بە ڕەنگ نەوە، ئەو تەکنیکە لە شارەزایی خۆمەوە بەدەستم هێنا. نەک لە گۆڤار و کتێب..

**ڕامان:** وابزانم وێنەیەکی قەلآی هەولێرت لەلای مزگەوتی حاجی سالح دەباغ یا نزیک قشلەوە گرتووە، ئەم تەکنیکەت بەکارهێناوە هەورێکی زۆر جوانت تێدا (ابراز) کردووە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. ئەو گرتەیە لەوێ گرتوومە، زۆر بایەخم بە هەوری ئاسمانەکە داوە، چونکە ئاسمان لە ماوەیەکی تایبەتیدا هەوری زۆر جوانی پێوە دیار دەبێت، ئینجا ئەوکات من خۆم سەرپەرشتی ستۆدیۆ (کەمال)م دەکرد و زۆربەی ئیشەکان خۆم ئاگام لێی دەبوو، بۆیە دەبوایە بێم و بچم و زۆر ماندوو دەبووم، جاری وا هەبوو سێ دینارم سەرف دەکرد بۆ کڕینی بەنزین بۆ ئۆتۆمبیلی خۆم لەو ڕێگایە تەنیا بۆ ئەوەی پەڵە هەورێکم دەست کەوێ بۆ دیمەنەکە (جا سێ دیناری ئەوکات پارەیەکی زۆر بوو).

ئەبوو سەباح: سەیارەکەت وابزانم فۆڵگابوو؟

**جەمال داوود:** فۆڵگام هەبوو، سەیارەیەکی تریشم هەبوو دۆج بوو..

**ڕامان:** ئەو کاتەی وێنەتان لەسەر فەخفوری و هێلکە چاپ دەکرد، چۆن ئەم شتانەت بەخەیاڵدا هات ئەنجامیان بدەی؟

**جەمال داوود:** ئەو شتانە هی خەیاڵی نەبوون، شت هەبوون باسی لێوە کرابوو، نایەتەوە یادم، بەڵام دەزانم یا خوێندبوومەوە یا بیستبووم لە جێگایەک، کەی و چۆن؟ ئەوە نایەتەوە یادم، بەڵام کەس نەیکردبوو..

**ڕامان:** واتە تۆ یەکەم کەس بووی بەو شێوازە کارت کرد؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. ئەو شتانە لە ئاستی تاقی کردنەوەدابوون و نەگەیشتبوونە ئاستی بازرگانی، زۆر بەداخەوە دەفتەرێکم هەبوو، چەندین تێبینی و تاقیکردنەوەی خۆم تێیدا تۆمار کردبوو، جا دەفتەرەکە (١٠٠) پەڕی بوو، شتەکانیشم زۆر بەوردی تێدا تۆمار کردبوو تا تێیدا جێی ببێتەوە، ئیقتیسادی تێدا بکەم، ئەوکات گەنج بووم، کت وپڕ ئەو دەفتەرە نەما، بەس دێتەوە فکرم، کابرایەک ڕۆژێک هاتە لام گوتی ئەو فۆرمیولایانە لەسەری (نەقڵ) دەکەم بۆ ستۆدیۆکەم، کابرا ستۆدیۆی دەکردەوە، گوتی بۆتی دێنمەوە، تا ئێستاش نەی هێناوە بۆم، هەشت نۆ دە فۆرمیولام بۆ وێنەگرە شەمسییەکان دانابوو..

**ڕامان:** ئەوەمان لەیاد چوو پرسیاری لەبارەی بایەخدانت بە سلایدات و فیلمی سینەمایی و وێنەی سینەماییەوە لێ بکەین، ئەو بایەخدانە کەی و لەچ قۆناغێکدا دەستی پێکرد؟

**جەمال داوود:** بیرم نایەتەوە، بەڵام ئێستا کوڕەزایەکم هەیە، کاتی خۆی لە سوپا بوو، پاشان خانەنشین کرا، ناوی (نەوزاد)ە لەوانەیە لە دایک بووی ساڵی (١٩٥٠ یا ١٩٥١)بێ، بە منداڵی لەگەڵ برایەکەی بەشەڕ دەهاتن، لە نزیک مەرقەدی عوزێر پێغەمبەر، ئەوکات جادەکە دوو ساید بوو، نێوانیان دار و درەختی تێدا ڕوابوو، ئینجا براکەی تری لەخۆی بچووکتر بوو ناوی شێرزادە، منیش لەوێ بووم نەمدەویست نەوزاد لێی بدا، بۆیە دارێکم دابووە دەستی بەکەیفی خۆی لە نەوزادی دەدا، بۆیە هەڵدەچوو، بەڵام لێی نەدەگەڕام لە شێرزاد بداتەوە، ئینجا ئەم ڕووداوە دەمویست بەکامێرەی سینەمایی وێنەی بگرم، سەرەتا ئەوانم دەخستە پەنای درەختەکان، ئینجا وردە وردە بەدەرم دەخستن، ئەوکات زوومیش نەبوو، بۆیە وام دەکرد دوو منداڵەکە دەردەکەوتن و دەزانرا کەوا بەشەڕ دێن، جا ئەو منداڵە ئەوکات تەمەنی چوار ساڵ بوو، نەوزاد دوو تا سێ ساڵ لەو گەورەتر بوو، ئەو فیلمەی کە ئەو ڕووداوەم پێی تۆمار کرد، جۆری (١٦)ملیمی ڕەنگاوڕەنگ بوو جۆری بێدەنگ بوو، دوای بیست سی ساڵێ، ڕۆژێکیان ئەو فیلمەم بۆ لێدانەوە، کەلەسەر شاشە ئەو دیمەنەی بینییەوەو دەبینێ برا بچووکی لێی دەدات و دارەکەی بڵند دەکرد و لەسەری نەوزادی دەدا، براگەورەکە (نەوزاد) دیاربوو بە منداڵی سەری زۆر پەشابوو، بۆیە بەو دیمەنە ئیشەکەی نوێ دەبووەوە، قەسدی دەکرد تۆڵەی خۆی بکاتەوە و لە شێرزادی بداتەوە، ئینجا ئەو فیلمە لەو کاتەدا گرتوومە، ئێستا شێرزاد زاوای هەیە، مانای ئەوەیە ساڵی پەنجاو زیاتر بووە.

**ڕامان:** باشە ئەو فیلمە ڕەنگاوڕەنگانە دوای گرتنیان، هەڵبەتە شوێنێک هەبووە بۆی ڕەوانە بکەی تا بیشۆنەوە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. ئەو کات دوو سێ جۆر فیلم هەبوون، کۆمپانیای کۆداک لەم ڕووەوە زۆر پێشکەوتوو بوو، بۆیە من هەردەم هی کۆداکم دەکڕی، ئینجا کۆداک کرۆم کە پێیان دەگوت کۆداکرۆم، پارەی شتنەوەشی لەگەڵ کڕینی فیلمەکە بوو.. لێرەوە دەتتوانی بینێریتە فەرەنسا، ئەمریکا، یا هەر یەکێک لە دەوڵەتە ئەوروپییەکان کە وەکالاتیان تێدا هەیە، ئەوجا من دەمناردە ئەوێ..

ئێستاش هەندێ فیلمم ماوە گرتوومە، بەڵام لەبەر ئەوەی فیکرم گۆڕا، نەمناردن و هەر وەک خۆی ماون و جۆری (٨) ملیمی بەدەنگ (ناطق)یشە.

ئەو فیلمانەی دەمگرتن و دەمناردنە دەرەوەی وڵات ماوەی (١٤) ڕۆژ زیاتری نەدەخایاند بۆشم دەهاتەوە، پاشان لە بەغدا هەندێ وێنەگر هەبوون ئەو فیلمانەیان دەشوشتەوە، بەڵام کۆداکرۆم ناشورێتەوە تەنیا لە ڕێگای کۆمپانیای خۆی نەبێت، چونکە هەندێ نهێنی تایبەتی لەشێواز و دەرمانەکانیدا هەیە، بەڵام جۆری تر هەبوون ئەوان دەیانتوانی بیشۆنەوە، لەم جۆرە فیلمانە دەمناردنە بەغدا بیشۆنەوە، بەڵام ماوەی مانگێک تا دوو مانگی دەخایاند تا بۆم دەهاتەوە، لەوکاتەدا ئەوانەی دەمناردنە دەرەوەی وڵات بە دوو هەفتەی ڕەبەق بۆم دەهاتنەوە، بە فڕۆکە بەڕێکی دەچوو و دەهاتەوە، ئەو دوو سەرچاوەیە لەوکاتەدا هەبوون..

**ڕامان:** لەوەیە سلایدەکان بەهەمان شێوە بووبێت؟

**جەمال داوود:** سلایدەکان.. نەخێر بەو شێوەیە نەبوون، هەندێکیانم بەخۆم دەشووشتنەوە، چونکە کتێبم هەبوو تێیدا باسی چۆنیەتی شتنەوەی کردبوو جگە لە ڕێنماییەکانی فیلمەکە، دەرمانەکانیشی لەگەڵدا ڕوون کرابووەوە لە چۆنیەتی بەکارهێنانیان، لەبەر ئەوەی سلاید پۆزەتیڤ (واتە وێنەکە ڕاستەوخۆ لەسەری دەردەچێ بەشێوەی سروشتی) وەک نێگەتیڤ نییە کە قۆناغێکی تری بوێ بۆ چاپکردنەوەی بە ڕەنگاوڕەنگی لەسەر کاغەر، بەشێکی تری سلایدەکانم دەناردنە دەرەوەی وڵات، لەوێ بۆم دەشورایەوە و بۆم دەگەڕانەوە.

ئێستا کۆمەڵێک سلایدی نایابم هەیە کە هی بۆنەو زۆر جۆری شایی و هەڵپەرکێی کوردەوارین، چەند جۆرە هەڵپەرکێ لە (استعراض)ەکان کراوە، هەموویم بەسلایدی ڕەنگاوڕەنگ هەیە.

**ڕامان:** ئەوکات وابزانم سەرپەرشتیاری چالاکی قوتابخانەکان بووی، بەهۆی ئەمەوە توانیوتە ئەو جۆرە وێنانە بگری؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. چونکە پێش ئەوکاتیش زۆر وێنەم گرتبوو، واتە پێش ئەو کاتیش بایەخدانم بەم لایەنەوە هەبوو، حەزم لێی دەکرد، بۆ نموونە: وێنەی وەرزشوانمان دەگرت، یا وێنەی (نواندن)م دەگرت، هەتا هەندێ لە ئەکتەرەکان زۆر ناوی منیش دێنن، چونکە من بەوەندە نەوەستام، بەڵکو زۆریانم فێری نواندن کردووە.. یەک دوو ئەکتەری دیار لەهەولێر هەن ناومیان هێناوە، دەیانگوت بڕۆن عەبای داکتان بێنن، دەچوون دەیانهێنا یان بەکاغەز شتی سەیرم بۆ دروست دەکردن، جا ئەوان ئەم باسانەیان دەکرد، بەڵام ناویانم نایەتەوە یاد.. جا من وێنەم ڕەش و سپی و ڕەنگاوڕەنگ بۆ گرتبوون وەک شتێکی دۆکیومێنتی و هی خۆیان و مامۆستاکانیان، بەڵام من خۆم هێندە ئارەزووی ئەوەم نەبوو وێنەی خۆم بگرم، بۆیە کەم وێنەی خۆمم هەیە.. ئێستاش زۆر وێنەی غەریب و عەنتیکەم لەلا هەیە، بەڵام من تاقەتم نەمایە، نازانم بۆچی وام لێهات ئارەزوو و هەوەسم لەسەر فۆتۆ نەماو دڵم لەسەری سارد بووەوەو توانام نەما؟ بەڵام هۆی گەڕانەوەم بۆ نێو جیهانی فۆتۆ تۆ هاندەرم بووی و وات لێکردم دووبارە بەردەوام ببمەوە.

**ڕامان:** وا دەردەکەوێ لەناوەڕاستی ساڵانی شەستدا بایەخدانت بەفۆتۆ کەم بووبێتەوە، یان پێش ئەو کاتە، بایەخت بە مۆسیقاو هونەری مۆسیقا داوە، بیستمان کەوا ئامێری مۆسیقات هێناوە بۆ فرۆشتنەوە و فێرکردنی خەڵکی هەولێر، تیپی مۆسیقات دامەزراندووە، ئەگەر بکرێ باسی ئەم لایەنەش بکەی؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. یەکەم تیپی مۆسیقا کە من دامنا، دەتوانم بڵێم ژەنیاری مۆسیقای تێدا نەبوو، ئامێرەکەم دەدا دەستی پێم دەگوت لەکاتی ئاهەنگ گێڕاندا مەهێڵە دەنگی ئامێرەکە دەربچێت، چونکە جەماوەر دانیشتوون وا هەست بکەن کەوا تۆ مۆسیقاژەنیەکە دەکەیت، بەڵام لە ڕاستیدا من وەک دۆبلاج بۆم چارەسەر دەکردن.. پاشان ئەو کەسانە بوونە مۆسیقاژەنی چاک، من هەندێک شریتم بۆ ئێزگە تۆمار کردووە، ئەو کات ڕازی نەدەبوون بەتۆماری دەرەوەی ستۆدیۆ، بەڵام من لەکاتی خۆی بۆ تایەر تۆفیقم (بەڕەحمەت بێ) تۆمار کردبوو، ئێستاش شریتەکە ماوە، ئەو کات لەسەر بەکرات بوو، لەسەر (مسجلە)ی گرۆندیک تۆمارم کردووە.

ئێستاش بەکرەکە ماوە، ئەو کات من نایم بۆ لێدەدا، لە هەندێ شوێن کەمانچەم ژەنیوە، چونکە من بەخۆم مۆسیقاژەنێکی وا نەبووم دەستێکی باڵام لەو بوارەدا هەبێ، بەڵام کاتێک بۆشاییەک یا کەلێنێک پەیدا ببا، من پڕم دەکردەوە، واتە ئەگەر یەکێک نەهاتبا یا کەس نەبوایە و ئاهەنگێک هەبووایە من دەچووم مۆسیقاکەم بۆیان لێدەدا. ئەوکات (حبي ايە)ی ئوم کەلسووم ناوبانگی دەرکردبوو، من پێشەکییەکەم بۆیان لێدەدا و هەندێکیش لە مقامەکەی، ئەو عالەمە هەڵدەستان و دەهاتنە جۆش و خرۆش، چونکە شتی وانەبوو، ئێستا بەبیرم دێ لە هەندێ ئاهەنگ و شوێن شریتم تۆمار کردووە لەلای خەڵکی ماوە، داخەکەم لەلای من نەماون.

**ڕامان:** وابزانم یەکەم تیپی مۆسیقا لە هەولێر ئێوە

[...]تەرزێک وانییە؟

**جەمال داوود:** بەڵێ پێشتر نەبووە.. پێشی من کەس [...]ەووە بە شکڵی تیپ کە بڵێین تیپی مۆسیقایە لەگشت [...]ووەکەوە تەواو و کامڵ بێت نەبووە، تەنیا ئەوە نەبێ [...]ن [...]، هۆڵی گەل لە هەولێر من بە تیپی مۆسیقای [...] [...]ئیفتیتاح)م کردووە.

**ڕامان:** تیپەکەتان لەچەند کەس پێکهاتبوو؟

**جەمال داوود:** من بووم، بەڕەحمەت بێ مونیر داود بوو، خوالێخۆشبوو مونعیم مەزهەر بوو، یەکێکی تر هەبوو ئیقاعی لێدەدا (وەک بەبیرم دێ عیراقی نەبوو، مودەریس بوو نەقڵی هەولێر کرابوو، کە بینیم زۆر جوان دمبەکی لێدەدا، بۆیە خستمە ناو تیپەکەمانەوە).. بەبیرم هاتەوە ناوی (سەبری)بوو خەڵکی سووریا بوو، یەکێکی سوورسپی بوو.

**ڕامان:** وابزانم بەبۆنەی (ترفیع) کردنی مامۆستایەک ناوی سەید غەریب بوو ئەو ئاهەنگەتان گێڕا کە بە ئیرادەی مەلەکی تەرفیعی کردبوو؟

**جەمال داوود:** بەڵێ.. ئەو سەید غەریبە مامۆستای من بوو لە قوتابخانەی سەرەتایی، کە (ترفیع)ی کرد مووچەکەی بوو بە (۳۰) دینار بە خواستی مەلەکی، ئەو ئاهەنگەی کە بۆی کرا من بەشداربووم تیایدا، هەتا گۆرانی تورکمانی تێدا پێشکەش کرا، چونکە هەولێر کورد و تورکمان و عەرەبی تێدایە، بەڵام ئەوکاتە (محەمەد ئەحمەد ئەربیللی)م هێنا گۆرانییەکی گوت (نایەتەوە بیرم چ بوو، بەڵام محەمەد ئەحمەد حەتمەن دەزانێ، چونکە لە ژیانی خۆی نەهاتبووە سەر شانۆ من هێنامە سەرشانۆ) گەر لێ بکۆڵنەوە کەی هۆڵی گەل کرایەوە، ئەوە پێش ئەو مێژووە من تیپی مۆسیقام هەبوو.

**ڕامان:** نازانم کاک ئەبوو سەباح هەندێ ناوی هێنایەوە وەک فوئاد ئەحمەد، قادر دیلان و کەسانی تر؟

**جەمال داوود:** هەندێ لە هونەرمەندانی سلێمانی هاتنە هەولێر، دیاربوو ئەوانیش تیپی مۆسیقای تایبەتیان هەبوو کە هاتنە لامان، لە بیرمە خوشک و برایەکیان لەگەڵدا بوو، برایەکە گۆرانیبێژ بوو، بەڵام زمانی دەگیرا لەقسە کردندا، نازانم من چیم لێی پرسی، خوشکەکەی کردییە نوکتە گوتی: دەزانی باوکم دەڵێ چی؟ باوکم دەڵێ یەک پرسیار بکەو برۆ چی ئیش و کارت هەیە بکەو بگەڕێرەوە، ئینجا وەڵامەکەت دەداتەوە، چونکە زمانی دەگیرێ..

**ڕامان:** ئەبوو سەباح وتی سەرۆکی تیپی ئەوان ناوی خالید بوو هەتا شاعیریشە؟

**جەمال داوود:** ڕەحمەت لە باوکت ڕاستە.. ناوی خالید بوو، بەڵام نازانم خالید کێیان پێ دەگوت..

ڕامان: خالید سەرکار؟

**جەمال داوود:** نەخێر.. جا من ئەوکات زۆر قەڵەو بووم

**ڕامان:** وەرزشوان بووی؟

**جەمال داوود:** تا ڕادەیەک بەڵێ.. لە شەقڵاوە ئاهەنگێکمان هەبوو، دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمموز بوو، خۆم و تیپی مۆسیقاکەمان لەوێ پارچە مۆسیقایەکمان دەژەنی کە ئاوازەکەی خۆم دامنابوو بەناوونیشانی (فرحة تموز)بوو، پێشەکی ئەو پارچە مۆسیقایە (فوئاد ئەحمەد) کردییە ئاوازی گۆرانی (ئەمیرەکەم).. ئەو کات عادەت وابوو کە تیپی مۆسیقا بهاتایەتە سەر شانۆ، پێشەکی پارچەیەک مۆسیقایان پێشکەش دەکرد، ئینجا گۆرانی دەستی پێدەکرد، دوای ئەو پارچە مۆسیقایەم لێدا، هاتمە خوارێ لەناو جەماوەرەکە دانیشتم بۆ ئەوەی بزانم هەست و ڕای جەماوەرەکە چۆنە.. دووەم پارچە مۆسیقا پێشکەش کرا منی تێدا نەبووم، چونکە لەناو جەماوەر دانیشتبووم یەکێک گوتی: کوا کوا کابرایەکە.

گوتیان: کام کابرا..

گوتی: کابرا ورگ زلەکەی کە قامیشێکی بەدەستەوە بوو، دەیگوت ویق ویق.

گوتیان: ئاخر بۆچی؟

گوتی: ئاخر بێ ئەو مۆسیقاکە خۆش نییە، کە ئەمەم بیست گوتم من حەقی خۆم وەرگرت، (نایەکی بچووک بوو، وابزانم (بچوق نا)یان پێ دەگوت و لەلای کاک زاهیرە..) یا (صول نای)یان پێ دەگوت.

**ڕامان:** دەڵێن لەکاتی خۆیدا ئیستیرادی ئامێری مۆسیقات دەکرد و هانی خەڵکیت دەدا فێری مۆسیقا بن، دەکرێ باسی ئەم لایەنەشمان بۆ بکەی؟

**جەمال داوود:** ئەوکات شمشاڵ و دووزەلە هەبوو، خەڵکی لەگەڵ مۆسیقا زۆر تەبا نەبوون، مامۆستا مونیر خوا لێی خۆش بێ عوودی لێدەدا، دەچوو لە قوڕنەی واتە ئەوپەڕی گەڕەکەکە خۆی دەشاردەوە، کە منیش دەمدیت منداڵ و عالەم دیارنینە بە دەست ئیشارەتم بۆی دەکرد، دەیزانی ئەوە بانگی دەکەم، دەهاتە لام و بەیەکەوە دەچووینە شوێنێکی تر، پرۆڤەمان لەوێ دەکرد، بۆچی وامان دەکرد؟ هەڵبەتە ئەگەر ئەویان بدیبایە، پێیان دەگوت (ڕەبابۆک، ڕەبابۆک..) ئێمەش ئەوەمان پێ سووکایەتی بوو، چونکە مۆسیقا کارێکی بەرزە، ئەوکات من گەنج بووم، بەمنیان بووتایە ڕەبابۆک، ڕەبابۆک شتێکی گران بوو لەسەر دڵم، ئالەتەکانم لای ئەو دادەنا، کە دەمدیت کەس بەدەرەوە نییە، سەرمان بەیەکەوە

هەڵدەگرت و دەچووینە شوێنێکی چۆڵ، لەوێ پرۆڤەی خۆمانمان دەکرد، هەر جارەی لە شوێنێک، بەڵام کە شۆڕشی (١٤)ی تەمموز بەرپا بوو، ئەوکات خۆم و تیپەکەم بە ڕەسمی بووینە تیپی مۆسیقا بەناوی تیپی مۆسیقای مامۆستایان (الفرقة الموسيقية للمعلمين) کە سەر بە سەندیکای مامۆستایانی ئەوکات بووین، دوای ئەوە ئینجا (فوئاد ئەحمەد) هات ناوبانگی پەیداکرد بەیەکەم گۆرانی «سووک بن دەی دەی.. کە پێشتر مامۆستا باکووری دەیگوت) فوئاد بەشێوازی خۆی پێشکەشی کردو هەر بەو گۆرانییە ناوی دەرکرد، چونکە گۆرانییەکی سووک بوو لەسەر دڵان، ئێمە مۆسیقاکەمان بۆ دەژەنی.

سەرەتای دەست پێکردنی فوئاد ئەحمەدی گۆرانیبێژ، تیپی ئێمە پێی گەیاند هەتا بۆ تۆمارکردنی گۆرانییەکانی جارێکیان گوتی: نازانم دەنگم بۆ ئاوایە (وەک بلێی باش دەرنەدەچوو)، ئەوکات ماڵیان لە سەیداوە بوو، (نازانم ماڵی خۆی بوو یا یەکێکی تر، بەڵام بەزۆری بەهی خۆی دەچوو)، ڕۆژێکیان لە باخچەکە دانیشتبووین، وەک پرۆڤەیەک گۆرانییەکیم تۆمارکرد، میکرۆفۆنەکەم نزیکی دەمی کردەوە، ئینجا دەنگی جوان دەرچوو، پاشان گەڕایەوە لام و گوتی ئێستا زانیم کە دەنگم چۆن بەجوانی دەردەچێت دوای ئەوە ئینجا گۆرانییەکانی خۆی تۆمارکرد.

**ڕامان:** وابزانم پێوەندیشت لەگەڵ (شەماڵ سائیب)ی خوالێخۆشبووش هەبوو؟

**جەمال داوود:** بەڵێ، شەماڵ سائیب بەو بۆنەیەی کە زانیبووی تیپێک لە هەولێر هەیە، لە سلێمانییەوە هاتە هەولێر، گوتم- چۆنە هاتوویتە ئێرە، گوتی: مۆڵەتم هەیەو هاتوومەتە لای ئێوە، ئەوکات من ئۆتۆمبێلیشم هەبوو، چووینە لای ئاوی کەسک و سوور «کە فلکەی پێش (ئوتێلی زەیتونە)ی ئێستا بوو» لەوێ بەسێ قۆڵی من لە ناوەڕاست و فوئاد ئەحمەد و شەماڵ لە دوو تەنیشتم دانیشتبووین وێنەشمان بەیەکەوە گرت، وابزانم ئەبوو سەباح وێنەی گرتین، بۆ سبەینەکەی هاتە ستۆدیۆ (واتە ستۆدیۆ کەمال) خۆی بە فوئاد ئەحمەد ناساند، جا ئەوکات زاهیر (شاگردی کەمالی برام بوو) منداڵ بوو، گوتی ئەو منداڵە چۆن ئیشی وێنەگرتنتان بۆ دەکات؟ گوتم ئەوەی دەبینی (مەبەستم زاهیرە).. گوتی- نا، گوتم- ئەوە مۆسیقاژەنە، نازانم چی ئالەتێکی هێنا.

زاهیر- جەمالە فەندی کە تۆ پێت گوت ئەوە مۆسیقاژەنە، گاڵتەی پێ هات، وەک بلێی بەلایەوە سەیر بوو منداڵێک لەو تەمەنەدا مۆسیقاژەن بێت، بۆیە جەنابت دووبارەت کردەوە کەوا زاهیر مۆسیقاژەنە، بۆیە بەمنت گوت زاهیر برۆ ئۆکۆردیۆنەکەی بێنە، ئەو دانیشتبوو، منیش ئۆکۆردیۆنەکەم لەملم کرد، گوتم- چیتان بۆ لێدەم تۆش گوتت- بەکەیفی خۆت چی لێدەدەی لێدە.. منیش ئاوازی (هاتی بۆ هاتی شەماڵ سائیبم لێدا) دوایی (هەرە لەیلێیەکم لێدا)، پاشان جەمالە فەندی گوتی- زاهیر ئەوە دابنێ برۆ نایەکە بێنەو نایمان بۆ لێدە، منیش نایم بە تەقاسیم بەسێ جۆر لێدا، دوایی گوتی- نایەکەش دانێ برۆ....

**جەمال داوود:** کەمن پێم گوت ئەوە مۆسیقاژەنە، گوتی دەزانم، بەبێ بایەخی هێندە گوێی بەقسەکە نەدا، دیسانەوە گوتم- مۆسیقا ژەنە.. گوتی- دەزانم.. گوتم- ئاخر دەتەوێ گوێت لێی بێ.. ئەوکات بوو پێم گوتی برۆ ئۆکۆردیۆنەکە بێنەو لێدە، ئینجا قەناعەتی هات دوای ئەوەی ئاوازی خۆیشی گوێ لێ بوو..

**ڕامان:** ئەو ئامێرانە چی بوون کە دەتهێنان؟

**جەمال داوود:** چەند جۆری نای، کلارنێت، فلوت، ئۆبوا ئەوانە نرخەکانیان ئەوکات لە دەوروبەری (٣) دینار و (٥) دینار بوو، نەدەگەیشتە زیاتر، دواجار کە گران بوون بە (٩) دینارم دەدان، کەمانیشم بە دەوری سێ دیناری دەدا، ئێستا ئەو جۆرە کەمانی ئەوسا هەر دەست ناکەوێ و نییە هێندە دەگمەن بوون، ئێستاش، بەدەست ناکەون.

**ڕامان:** ئامێرەکان هی کوێ بوون؟

**جەمال داوود:** وابزانم کەمانەکان ئەڵمانی بوون و عوودەکانیش فازیل عەواد دەیکردن بە نرخی زۆر خەیاڵی.

**ڕامان:** لەگەڵ ئەوەی ئەو ئامێرانەشتان دەفرۆشت خەڵکیشتان فێری ژەنین و بەکارهێنانیان دەکرد؟

**جەمال داوود:** بەڵێ، ئێستا هەندێ کەس هەن لە تەلەفزیۆنەکان، هەرکەسە بە گوێرەی لایەنەکەی خۆی جاربەجار دەڵێ ئاواو ئاوا، لە ڕاستیدا وا نەبوو، ستۆدیۆ کەمال ژوورێک بوو، چەند گۆرانیبێژ لە هەولێرێ هەیە هەموویان دەهاتن، لەوێ کۆدەبوونەوە، من بەدەستی خۆم بە (مسجل)، کە (مسجلە)کەش لای ئەبوو سەباحییە، شریتم پێی تۆمار کردووە سەعاتێک، سەعات و نیوێک بەهەزاران شریتی بەکرە سەرف دەبوو لەگەڵ (مسجلە) هەرچەندە ئەوکات خەڵکی هێندە پارەیان نەبوو، بۆیە دەهاتن بە (٥٠) دینار دەیانکڕی، (٥) دیناریان پێشەکی دەدا، دوایی مانگانە (١) دینار بەگوێرەی توانای خۆی، نازانم ئێستا ئەبوو سەباح (مسجل)ەکەی ئەوکاتی ماوە یان نا؟ گەر مابێتی پێویستە بچێتە

مێژوو ئەو ناوی لە مێژوودا تۆمار بکرێ، چونکە بۆ تایەر تۆفیق و محەمەد ئەحمەد (ئەربیللی)، هەروەها بۆ فوئاد ئەحمەد و ئەوانە گشتیان گۆرانییەکانیانم پێ تۆمارکردووە، مارکەی (مسجلە)کە (کۆرتینگ)ی ئەڵمانی بوو، باشترین تۆمارکار بوو، ئەو شریتانەی من تۆمارم دەکرد لە ستۆدیۆکانی ئیزگە وا ساف و بێگەرد تۆماریان نەدەکردن، بۆیە کە شریتەکانی منیان وەردەگرت یەکسەر وەریان دەگرت و پاشان بڵاویان دەکردەوە، لەبیرمە جارێکیان (مشکۆ) چاوەڕێ بوو محەمەد ئەحمەد تەواو بێت، ئینجا گۆرانی ئەو تۆمار بکەم، شریتەکەی محەمەد ئەحمەد نیوەی قۆریات بوو، نیوەکەی تری گۆرانی بوون، ئێستا ئەوانە لە ئێزگە هەمووی لێ دەدرێن.

(ئەبو سەباح- هەڵی دایێ و گوتی- ئەدی ئەوە کێ بوو دەیگوت هەولێر بەگوڵ و بەگیایە پەرچەم زەردی تێدایە؟)

- ئەوە هی من بوو (واتە شیعرەکە) بەشێوەی گۆرانی ویستمان ئەدای بکەین، نازانم ژنی متەسەریف بوو، یان چ بەرپرسێکی ئەوکات بوو قەدەغەی کردین بیڵێین، وەلحاسڵ هەندێ بڕوبیانوویان هێنایەوە، من خۆ شاعیریش نەبووم، بەڵام لەسەر وەزنی مۆسیقا ڕستەو شتم ڕێکدەخست، ئەو شیعرەم بە (٤/٨) سەعات دانابوو، پێشی ماوەیەک گوێم لێبوو گوتیان ئەوە فۆلکلۆرە، لە کاتێکدا کە هی من بوو، ئنجا ئەوکات ئەو شیعرەیان بردە لای شاعیرێک پێی گوتن ئەوە لەوە دەچێ خاوەنەکەی هەر شاعیر نەبێ، بەڵام کەموکوڕیشی تێدا نییە، لەبەرئەوەی وەزن و قافیە (کێش و سەروای) تەواو بوون کە ئێستا نازانم شیعرەکە لەسەر چ وەزنێکە.

**ڕامان:** ئایا تەواوی شیعرەکە چۆن بوو؟

**جەمال داوود:** ئەمەیان کۆپەلەیەکیەتی:

**هەولێر بەگوڵ و بەگیایە**
**پەرچەم زەردی تێدایە**
**خوایە هەولێر ئاوابێ**
**جێگەی کوردی ئازایە**
**کوردم کوردم کوردم**

**ڕامان:** ئایا ئەو ئاوازانەتان بە نۆتە، یان لەخۆڕا لێدەدا؟

**جەمال داوود:** لەسەرەتادا (خۆرسک بوو، بەڵام پاش شۆڕشی (١٤)ی تەمموز، بوارێکی چاکیان بۆمان ڕەخساند و منیان کردە سەرۆکی تیپەکە، ئامێرێکی زۆرمان کڕی، بۆیە زۆر کەس دەهاتن خۆیان فێربکەن، منیش نەدەکرا بەشێوەی (فطر)ی خۆرسک تێیان بگەیەنم، ئەو گۆرانییە باوانەی ئەوکات یەکێکیان (عمي یا بیاع الورد) نازانم هی (خضیري ابو عزیزە)، گۆرانییەکی موسڵاویانە هەبوو، (یاردیلی) و (سمرە قتلتیني) (جنون الله لاتقولوا). کە ئاوازەکانیم بە مۆسیقا لێدەدا، گوتیان ئاخر ئەوە چۆن دەبێت.. منیش هەندێ بیرم لە وشەکان کردەوە سەرەدەریم لێیان دەرکرد، پاشان بیرم لەوەزنەکان کردەوە، منیش ئەوانەم بۆ نووسینەوە، دوایی بۆم دەرکەوت تەواوم نووسیوە، لە نەقابەی مامۆستایان تابلۆی (اعلانات) هەبوو، لەوێ شتەکانم بۆ هەڵدەواسین، ساڵی (١٩٥٨ و ١٩٥٩) واتە لە قۆناغی خۆرسکەوە هاتینە قۆناغی دیراسی، بەتاقیکردنەوە نۆتەکانم تەواو دەردەچوون.

**ڕامان:** وا دەردەکەوێ ئێوە بەزۆری (نای)تان لێدابێ؟

**جەمال داوود:** بەڵێ، ئێستا چەند شریتێکی (تایەر تۆفیق) هەیە دوو سەعاتە، من تێیدا نای لێدەدەم، شریتێکی محەمەد ئەحمەد بەتەواوی وابزانم ئەویش دوو سەعاتە یا (١/٥) سەعاتە، چونکە من بەزۆری شریتی درێژم بەکاردەهێنا، هەردوو سەعاتەکە من بەخۆم نایم لێدایە.

**لەم ساڵانەی دوایی وەک نوکتەی لێهات، لەلای باغی شار کابرایەک هەبوو شمشاڵ و نای و لەوبابەتانەی دەفرۆشت، منیش دیتم ئامێرێکی بەدەستەوە بوو پێی لێدەدا، منیش گوتم ئەوە ئاوا پێی لێنادرێ، لێیم وەرگرت تا بۆی لێبدەم بە دروستی مردم و سووتام هەر فیقەیەکیشی لێ نەهات، بەڕاستی زۆر بەسەرخۆم داشکامەوە، بەکابرام وت: لەوانەیە باوەڕیش نەکەی کەمن دەزانم نای لێبدەم.. کابراش ویستی بڵێ ئەگەر بتزانیبایە، ئەوە بۆت لێدەداین، بەڵام لەگەڵ ئەوەش خوا هەڵناگرێ کابرا بەساردی وتی وایە دەزانی.. ئا ئا..**

منیش گوتم.. تازە چارنییە دەبێ بچم وێنەیەکی خۆمت بۆ بهێنم کە لەناو تیپی مۆسیقا، مۆسیقام لێداوە تا بەتەواوی قەناعەت پەیدا بکەی، چوومەماڵەوە بگەڕێ بگەڕێ هیچ وێنەیەکم نەدۆزییەوە، بەڵام باش بوو تەلەفۆنیان بۆ کردم یەکێک گوتی وێنەیەکمان لەلایە (تایەر تۆفیق) بە پێوە گۆرانی دەڵێت و تۆش لە دواوەی لەگەڵ مۆسیقاژەنەکان نای لێدەدەی و مامۆستا (مونیر)یش عوود لێدەدا.

ئەو وێنەیەم بردە لای کابرا لەجیاتی ناسنامەکەم نیشانم دا، ئینجا هەڵیدایە و گوتی: مامۆستا لە دەم و چاوت دیاربوو مۆسیقاژەنی.

**هەڵپەیڤینی: فارس سەعدی**



## بەیادی هونەرمەند:
## بەدیع باباجان

کۆتایی مانگی چواری ساڵی (١٩٩١)، لە کاتێکدا زیاتر لە دوو ملیۆن کورد لە ترسی تیرۆر و کیمیایی و قڕکردن لەودیو سنووردکانی ئێران و تورکیا تۆقرەیان گرتبوو، تەواوی جیهان سەیری دەکردن، لە هەموو لایەک، بەتایبەتی لە ئەوروپا، کوردەکانی هەندەران، (کە ئەوسا ژمارەیان چارەکێکی ئەو ڕێژەیەی ئێستا بوو) پشێوی و ئاڵۆزییان تێکەوتبوو. لە هەمان حاڵەتی دەروونی و ئەخلاقی و ڕوحی دەژیان، هەرکەسە لەلای خۆیەوە هەوڵی دەدا بەڕێگایەک یارمەتی و پشتگیری ماددی و مەعنەوی کۆبکاتەوە، یان خۆی بگەیەنێتە سەر ئەو سنوورە وشک و ڕەقانە و لە نزیکەوە ئاگاداربێ و دەستی هەبێ لە جووڵاندن و چاککردنی هەندێ شت، ئەو ڕۆژانە تەواوی کوردی ئەوروپا لە جۆش و خرۆشێکی بێ نموونە دابوون. هەموویان بیریان لە کێشەکەیان دەکردەوە،

ئەوکاتە من لە سۆربۆن قوتابی بووم. لەناو ئەم جۆش خرۆشە، کۆمەڵەی (پزیشکانی بێ سنوور)ی فەرەنسی داوایان لە ئەنستیتو کرد چەند کوردێکیان بۆ بنێرێ فەرەنسی زان بن تا لەگەڵ ئەو تیمە پزیشکی و مرۆییە بەرەو ئێران بەڕێ بکەون. سەرەنجام من و چەند کەسێکی دیکە ئامادەیی خۆمان پیشان داو ڕۆژی (٢٩-٤-١٩٩١) ئێمە گەیشتینە تاران، لەوێشەوە بەخێرایی بۆ شاری سنە، ئینجا بۆ مەریوان، خۆمان گەیاندە ئەو تیمەی کە پێشتر لە مەریوان بارگەو بنەی دانابوو. بۆ ڕۆژی دوایی، بەیانی زوو- بەرەو سنوور چووین، کامپێکی گەورەی کوردەکان کە بەشی زۆریان خەڵکی ناوچەی هەڵەبجە و سەید سادق و ئەو دەوروبەرە بوون، لەم دیوەی سنوور، لەناو ئێران، لە دەربەند دزلی گیریان خواردبوو. نزیکەی بیست هەزار کەسێک دەبوون. تەواوی ئەو خەڵکە ژیانی لەناو قوڕو سەرماو ئاو بەسەردەبرد، گشت منداڵ و مێرد منداڵ و پیرەکان نەخۆش و ماندووبوون. دەیان کەسیان برینداربوون. چەندان کەس لەو کامپە گیانی لە دەستدا؟! ژیانی ناو ئەم کامپە وەک ڕۆژی قیامەت دەهاتە بەرچاو، بەهیچ

شتێک ڕانەدەگەیشتین، لە بەیانی تا ئێوارە، تا شەو بێ وەستان دەهاتین و دەچووین، سەدان منداڵ و کچ و کوڕی پارچەڵە لەم شاخانە، تا ئەژنۆ لەناو قوڕو سەرما، ئاوارە و برسی بوون و دەخولانەوە، بێ مەبەست و مەنزڵگایەک دەخولانەوە، هیچ شوێنێک نەبوو بۆی بچن، دوایی بچن بۆ کوێ؟!

ئێمە کارمان ئەوەبوو، لەگەڵ تیمە فەرەنسییەکە بە زووترین کات بەشێوەیەکی وەختی نیشتەجێیان بکەین و ئاوی پاک و تەندروستی دابین بکەین، بۆیە بەزووترین کات، لە کۆمەڵە خێوەتێکی گەورە، نەخۆشخانەیەکمان دروست کرد بۆ ئەو منداڵ و ژن و پیرانەی پێویستیان بە چاوەدێری پزیشکی چڕو بەردەوام هەبوو و لە هەمان کات خواردنیشیان مسۆگەر بوو.

ئەوانەی دیکە کە زیاتر ماندوو بوون، خواردن و دەرمانیان پێشکەش دەکرا. هەفتەیەک دواتر خەڵکەکە گوزەرانیان لەم لایەنانەوە کەمێک چاکتر بوو.

ڕۆژێک لە ناکاو کابرایەکی پیری ماندووی چاو زیت لەبەر دەرگای خێوەتی نەخۆشخانە پەیدابوو، بە فەرەنسییەکی نیمچە ڕەوان خۆی ناساندو گوتی من بەدیع باباجان-م. منیش یەکسەر وێنەی شاعیرانی کوردی ناو کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی) مامۆستا سەجادیم بەبیرهاتەوە. بۆ یەکەمین جار ئەو هونەرمەندەم لەسەر ئەم سنوورە و لەو ڕۆژە ڕەشەدا ناسی. لە دووری خەڵک لەبن خێوەتێک دەژیا، بە هەزار شەڕە شەق گەیشتبووە ئەو ناوە. وابزانم ژنێکیشی لەگەڵدا بوو، بەڵام نەمزانی چی ئەوبوو. دوای یەک دوو هەفتە مانەوە لەم دەربەندە، دیاربوو مامۆستا بەدیع لەم بارەی تێیدا بوو، لەسەر ئەم سنوورە، چ دڵگیری پێوە دیار نەبوو، چونکە بەبیرم دێتەوە؛ دەیگوت: بۆ خۆم لەناو ئەم سروشتە جوانەم، لەکوێ ئەمەم دەست دەکەوێ. بەڕاستیش وابوو، دەربەند دزلی ناوچەیەکی جوانە، کەمێک لەولاتر، بەردو سنوور بڕۆیت، دەگەیە دەریاچەی زرێبار، ئەم ناوچەیەش بەهاران بۆ خۆی بەهەشتێکە. ڕۆژی دوایی- واتە (١٥-٥-١٩٩١) بەخۆم و کامێراو ڕیکۆردەرێکی بچکۆلە چوومە بن خێوەتەکەی مامۆستا بەدیع و ئەم گفتوگۆ بچکۆلەیەم لەگەڵ سازدا کە لەم ڕۆژانە هەر ئەوەندە دەکرا. ئێستاش بۆ یەکەمین جار دوای چەندین ساڵ بڵاودەکرێتەوە.

هەفتەیەک دواتر ئەم ناوەمان بەجێهێشت و خۆمان گەیاندە کامپەکانی دیکە. تا ناوەڕاستی مانگی شەش لەسەر سنوورەکان، لەم کامپ بۆ ئەو کامپ،ماینەوە. ئەو سەردەمە ڕۆژانێکی ڕەش بوون. مرۆڤی هەستیاریان دەخستە ناو حاڵەتێکی زۆر وجودی و هوشیارییەکی ئەخلاقی و ڕۆشنبیری زۆر خەست و ڕاپەڕیو.

لێرەوە لە دامەنی ئەم هەستەوە ڕێگا بەخۆم دەدەم ئەو مەسەلەیە بورووژێنم، کە بەداخەوە، دیارە لەناو ڕۆشنبیریی کوردی ڕۆژی ڕەشی وا زوو زوو لەبیر دەکرێ، چەندان سەردەم و ڕۆژانی قیامەتی کورد لەبیرکران، مرۆڤەکان چوونە کوێ؟ قوربانییەکان چوونە کوێ؟ ئازارەکان چییان بەسەرهات، ماندووبوونەکان کوا لە کوێن؟ دەپرسم کوا داهێنانە ئەدەبییە مەزنەکان، ئەوانەی بتوانن وەک ئاوێنەیەک ئەم ڕۆژە ڕەشانە لەنێوچەوان و هەنیەی واقیع و ڕۆژگار بدەن و بیان گێڕێتەوە؟ ئایا ئەو کاتە نووسەران و ڕۆشنبیران خەوتبوون؟ چۆن وازوو ئەم ڕووداوانە، ڕووداو گەلی سەر سنوورەکان، لەبیرچوونەوە؟!

* سەرەتا خۆت بەخوێنەران بناسێنە؟

– من ناوم بەدیع حوسێن باباجانە، کوڕەزای میرزا بەدیع، دکتۆری دوایەمین دەوری بابانەکان، لەبەر ئەوە برای لە خۆم گەورەتر هیوای وابوو منیش بچمەوە سەر پیشەی ئەوان، بەڵام هەموو مرۆڤێ خولقەتی بۆ شتێکە، هەر لە منداڵییەوە هیوای مۆسیقام هەبوو ئینجا ڕەسم، لە حوجرە خوێندم و دوو جوزئی تەبارەکەم تەواو نەکرد، پاش مردنی باوکم ئێمە بەهەژاری پەروەردە بووین، باوکم خانەوادەیەکی زۆری بەسەرەوە بوو فکری لە سبەینێ نەدەکردەوە، چی دەست بکەوتایە هەر ئەو ڕۆژە خەرجی دەکرد، من لە ساڵی (١٩٢٣) لە شاری کەرکووک لە گەڕەکی «ئاخوڕ حوسێن» هاتمە دنیا کە سەر بەگەڕەکی گەورەی ئیمام قاسمە، هەر لەوێش گەورەبووم هەتا چواری ئامادەیی و ساڵێ لە سلێمانی خوێندم، لە پاشان چونکە هیوایەت و مەراقم لە ڕەسم بوو، وەختی خۆی هاتمە بەغدا، هەر لەبەر ئەوەی، باوکم ملی بۆ حوکمی عوسمانییەکان کەچ نەکرد، وەزیفەی پێ نەدراو بە هەژاری ئێمەی پەروەردە کرد، بەڵام باوکم سەربەرزانە بە پیشەکەی خۆی موکتەفی بوو، چونکە باری قورس بوو، خاوەنی دیوەخانە بوو، ئیتر ئێمە هەژار بووین و تەقاعودیان بۆ حیساب نەکرا، ئەوکات زەمانی ڕوپیە بوو، ماوەیەک لەدوای ئەوە چواردە ڕوپیە و نیویان بۆ دایکێک و سێ کوڕ بڕیبووەوە لە ماڵێکدا، هەندێ ژوورمان بەکرێ دابوو تا دایکم بتوانێ ئێمەی پێ بژێنێ، ئێمە بەو شێوەیە ژیاین، برای گەورەشم شێت بوو، باوکم ناردبووی بۆ توییەی ئەستەنبوڵ لە هەمان مەکتەب کە خۆی تێیدا بوو بە دکتۆر، ئەو لەوێوە لە غەریبی کە مردنی باوکی بیست، ئیتر تووشی هێدمە

بوو، لێی کردە شیزۆفرینیاو شێتییەکی ڕاستی، ئیتر دایکم و برام چوونە ئەستەمبووڵ هێنایانەوە کە لەژێر چارەسەردا بوو، ئەو برایەم لە ساڵی (١٩٧١ز) پاش چل و دوو ساڵ شێتی پێ بەزنجیرەوە ئیفلیج بوو. عەمری خوای کرد، شێتییەکی توندی هەبوو.

* لە بارەی دروست بوونی هەستی هونەری خۆت و نزیک بوونەوەت لە هونەری نیگارسازیەوە، قسەمان بۆ بکە؟

– بە فیکری من هەموو شتێ، هەموو مەراقێ هونەری، یان ئەدەبی و زانستی بێ هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ مرۆڤ وەک حەز لە دایک دەبێ، بەمنداڵی بەگوێزان نەغەماتم لێدەدا، هێشتا تەمەنم چوار ساڵان بوو کە دەمخستە سەر دۆلاب و مێزێ و دەمچەسپاندو هاتوچۆم پێدەکردو زیادو کەمم پێدەکردو بە پلەکانی نۆتەی مۆسیقی سروودم پێ لێدەدا، مامۆستای پۆلی یەکی سەرەتاییم دەیوت کێ فێری کردووی؟ دەموت نازانم، سەرەتام بەمۆسیقا هات، ئێستاش هارمۆنیکای منداڵ لێدەدەم پێی دەڵێن: «هارمۆنییکای منداڵان، لە ماڵەوە دووانم هەیە و لە وەرشەی نەخشەسازیش یەکێکم هەیە و لە فرسەتەکاندا کەیفی خۆمی پێ دەدەم، وەسیەتم کردووە ئەگەر مردم ئەوەم لەگەڵ بنێژن.

لە مۆسیقاش دوور نەکەوتوومەتەوە، ئێستا دەمرم بۆ مۆسیقای کلاسیکی، بۆ مۆسیقای جوان، ئینجا لە یەک و دووی سەرەتایی لەسەر دەفتەری وەزیفە ڕەسمم دەکرد کە ئەرکی ماڵەوە بوو، چۆلەکە و باڵندەم دروست دەکرد، ڕۆژێ مامۆستاکەم دەستی خستە سەر دەفتەرەکەم و وتی ئەمە چییە؟

بەتووڕەییەوە وتی: «من ئەمرۆ پیسترین قوتابیم دۆزییەوە» منیش سەری خۆم شۆڕکردو هەر دیوتەوە «ئەمە بۆ وەزیفە کراوە نەک ڕەسم.. هەی.. هەی» وتی ئەگەر دەفتەرەکە تازە نەکەیتەوە، دەستت بەڕاستە دەکوتمەوە، بەڵام من هەر بەردەوام بووم تا ناوەندی، لە پێشانگادا بەشداربووم و لەناو قوتابییەکاندا منیان دانابوو کە باش نیگار دەنەخشێنم، دوایی چوومە پەیمانگای هونەرە جوانەکان و ئیتر لەوێ دەرسم خوێندو بە ئیمتیاز دەرچووم، حەقی ڕەوانکردنی دەرەوەم هەبوو، دوو ساڵ هاتوچۆم کرد، ساڵێکیان ڕەشید جەودەتی برای مەحموود جەودەت هات یارمەتیم بدات کە لە خێزانە کۆنەکانی سلێمانی بوو، هەمووان خزم بووین، بەڵام سوودی نەبوو، نەیانناردم، کەسانی تر کە نمرەکانیان لە خوار منەوە بوو نێردران، گلەیی لە کەس ناکەم، بەڵکو گلەییم لە بەختی خۆم هەیە.

* هەر لەسەر هونەری نیگارسازی بەردەوام بوویت، یان بواری دیکەشت دۆزییەوە؟

– لەپێشدا تابلۆم دەکرد هەر جارەی دۆستێک دەهات و لەژێر دەستمدا دەری دێناو بەدیاری دەیبرد، بۆیە هەوەسم لەسەر تابلۆکردن نەما، شتی خەیاڵیم دەکرد، تەکلیف دەکرام بە ئیش و کاری شاعیران و نووسەران، پاشان لە بازاڕ لەگەڵ دوو برادەر دوکانێکمان بۆ هێلکاری و خۆشنووسی کردەوە، ئیتر نووسەرانی کورد دەهاتنە لامان و لەوەدا توانیم حەزەکانی خۆم تێر بکەم، بەڵام تابلۆکێشانم لەبەرچاوکەوت، چونکە هیچی بە قیسمەتم نەبوو، ئێستا هیچم لای خۆم نەماوە، هەموویان لێ سەندم.

* هونەری شێوەکاری ساڵانی سی و چلەکان، کە تۆ ئەوکاتە لە تەمەنی هونەری گەرمدا بوویت، لە چلەکان لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا دەرچوویت، هونەرمەندە بەناوبانگەکانی ئەوسای کوردستان و کورد کێ بوون، ئاستی هونەری شێوەکاری کوردی چۆن بووە؟

– هونەرمەندانی کوردی ئەوسا هێندە پێوەندییان پێکەوە نەبوو تا شارەزای یەکتر بن و یەک بگرن، بەڵام هی ئەم ساڵانەی دوایی کە ئەکادیمیاو پەیمانگای هونەرە جوانەکان هۆکار بوون بۆ ناساندنی هونەرمەندان بەیەکتر لەوانە عەزیز سەلیم و محەمەد عارف و ئازاد شەوقی کە هونەرمەندی چاکن کوڕەکەی ئازاد شەوقیش ڕکابەری (مونافیسی) باوکێتی، چاکترین پەیکەرساز کە بە پێوانەی کلاسیکی و تیۆرسازی و شیکار چالاکی هەبووبێ، کوڕێکی زاخۆیی بوو ناویم لە یاد کردووە دەتوان بڵێم میللەتی کورد، هەر لە زمانەکەیەوە دیارە کە زمانێکی شیعرییە واڕسکێکی هونەری بە تەبیعەت لە هەموو کەسێکی ئەم میللەتە بەدی دەکەیت، دەمێنێتەوە سەر پێگەیاندنی ئەو واڕسکە، زمانەکەمان لە موفرەداتدا پەکی ناکەوێ نە بۆ کێش و قافیە نە بۆ مانا نە بۆ واتا.

لە کەسانی هاوچەرخمان کە مامۆستام بووبن مامۆستا فایەق حەسەن و لەپاشان جەواد سەلیم، ئەمانە هونەرمەندی بەرزبوون لەو دواییەدا مامۆستا جەواد ڕێڕەوی خۆی گۆڕی، بەڵام مامۆستای کلاسیکم کە من خۆم حەزم لە هونەری کلاسیکە فایەق حەسەنە کە کەڵکی پێ گەیاندم، لەپاشان مامۆستایەکی ئێرلەندی بەناوی شوشو مەکەنتنی هات زۆر لەگەڵمان ماندوو بوو، ئەمە لە ساڵانی چلەکاندا بوو، ئەمەی دوایی لە ساڵی «١٩٤٧-١٩٤٩» وانەی پێ دەوتینەوە.

* دەربارەی ئەو وێنانەی کتێبەکەی مامۆستا عەلائەدین سەجادی کە لە ساڵی (١٩٥٢ز) چاپ بووە

بەناوی «مێژووی ئەدەبی کوردی» ئەمە چۆن بوو؟
– لە ساڵانی دوایی چلەکاندا تەکلیفی لێ کردم کە لە بەغدا بووین و لە گەلاوێژ، تەرکیزی دەخستە سەر وەسفی سەرو سیمایان، بەتایبەت هی حاجی قادری کۆیی زۆر ماندووی کرد تا وەسفی سەروسیمای دۆزییەوە، ڕۆژێک پیاوێکی زۆر بەتەمەنی دیبوو کە خۆی حاجی قادری بەچاوی خۆی دیبوو، عەلائەدین سەجادی لە خۆشیدا وەختەبوو باڵ بگرێ، دەمتوانی بەهەمان وەسف سەد ڕەسمی بۆ بکەم هیچی لە هیچی نەچێ، بەڵام ئەگەر ش...ێکی وا ڕێکەوت یەکێ هەبێ وەسفییت بۆ بکا ئەوە کارەکە مەیسەر تر دەبێ، هەر لەسەر ئەو وەسفە سکێچی یەکەم و دووەمی پەیکەرەکەی حاجی قادرم کێشا، ئەوسا خالید ڕەحال لە ڕۆما تەکلیف کرا، مامۆستا ئیحسان شێرزاد کە وەزیری شارەوانی بوو خۆی، چوو بۆ لای تەکلیفی کردم لە ڕۆما هات وتی ئەم وێنەیە پرۆفیلە لە تەنیشتەوەیە و دەمەوێ لەسەر ئەو وێنەیە سیماو ڕووخساری تەواویم بە سێ مەودا بۆ بکەی، سکێچەکانم بۆ کردو بردیە ڕۆما، لەوێ جێبەجێی کرد، ئێمەیان بانگ کرد بۆ پەردە لادان لەسەر پەیکەرەکەو مامۆستا مەسعوود محەمەد لام وایە لە کۆڕی زانیاری کورد بوو، دوایی لەوێ وتارێکی ئەدەبی جوانی خوێندەوە، پەیکەرەکە وابزانم لە ساڵی (١٩٧٠-١٩٧١) کرایەوە. من لە منداڵییەوە حەزم لە وردکاری بووە و حەزم لێ بووە شت بە سروشتی خۆی ببینم و دەستکاری سەربەخۆی تێدا نەکەم، خوای مەزن ئەم سروشتە جوانەی ئافەریدەکی کردووە، دەریایەکی گەورەی بەشەپۆل و بێ پایانە، پێویستی بەوە نییە من بێم شت بهاوێمە سەری، با بتوانین تنۆکێ لە دەریا ڕەسم بکەین، زۆرم پێ سەیرە ئەوانەی لە کلاسیک دەردەچن بۆ شتی تر دەگەڕێن وەک قوتابخانەکانی سوریالی و تەکعیبەی، وا دەزانن هەموو کلاسیکیان هەزم کردووە. لە کاتێکدا لەم تێنەگەیی بوون بۆ کوێ دەچن، سروشتێکی خاوێن هەیە عەکسی بکەنەوە لە منداڵییەوە خوا منی بۆ کلاسیک خەلق کردووە و تا شتەکان بە سروشتی خۆیان بگوازمەوە.

* جگە لە هێڵکاری، ماوەیەک لە تۆپۆگرافی و هەڵکۆڵین ئیشت کردووە؟

– سەبارەت بە تۆپۆگرافی هۆی ئەوە بوو کە لە «مساحة عامة» بووم، نانم لەسەر دەخوارد، دیسان وەختی خۆی دائیرەکەمان چەند زەماڵەیەکیان لەلایەن دەوڵەتی سویسراوە پێ بەخشرا، هەندێکیان بۆ دائیرەکانی چاکسازی کشتوکاڵی بوون، هەندێکیان ئاراستەی مەساحە کران، چونکە پێوەندی بە ڕەسمی کاری «نەخشە»وە هەبوو، کاری من بریتی بوو لە مەراتبی بەرزایی تا بتوانین شێوەیەکی بەرجەستە و فۆتۆگرافی پێ بدەین، شتەکە بگاتە ئەو ئاکامەی کە بەفۆتۆگراف لە ئاسمانەوە وێنەگیراوە، بەو شێوەیە دەربخرێت، کاری من ڕیلیف بوو، شوکر بە ئەنجامێکی باش گەڕامەوە و دبلۆمێکی تایبەتییان بۆ کردم.

پۆرترێتێکی شێخ ڕەزای تاڵەبانی هەیە کە نازانم کێ کردوویەتی، وەک بیستوومە تاڵەبانییەکان دەڵێن ئەمە لەو ناچێ لە خۆیەوە کردوویەتی، هەتا ئەمە سەرووپێچی تاڵەبانییەکان نییە، هاوکات شێخ ڕەزا هاوچەرخی باوکم بووە و ڕەفیقی شیعری و دوژمنی شیعریشی بووە، لە دوو لاوە هەجووی باوکمی کردووە لە دیوانەکەیدا، بەداخەوە لە هەندێکیانیدا قسەی ناشرینی بە باوکم وتووە، یەکێ لەوانە نیوەشەو هاتوون بەدوای باوکمدا تەداوی بکات، دکتۆر کە ئەرکێکی پیرۆزی لەسەر شانە، دوژمنی خۆیشی بچێت بۆ لای، دەبێ بە ڕێزەوە تەداوی بکات، تومەز ئەمە یەکێکە لە ناحەزانی شێخ ڕەزا کە پێی زانیوە و هەندێ قسەی ناشیرینی بەزاری فارسی بە باوکم وتووە، لەپاشان هەجووی ئەمینەفەندی مامی کردووە و دەڵێت:

**«دووجانەوەر لە نەسلی جانی ئیبنی جان**
**ئەمینی حاجی کەریم و ئەمینی باباجان»**

تەنانەت دەڵێن زۆر پیاوێکی فەقیرۆکە بووە، بەڵام چونکە وەچەی باباجان بە لووت زلی ناوبانگیان دەرکردووە! گوایە لووتێکی یەکجار زلی هەبووە، بۆیە لە جانەوەر چووە ئەگینا تەفسیری تری نییە.

* ئەی لە بنەچەدا باباجان لە چییەوە هاتووە؟

– ئەوە سەرگوزشتەی خۆی هەیە، باباجان هەردووکی ناوی باوکمە، ناوێکی بە ئیستیلاحی باپیرمە، کە خۆی ناوی مەجابریە بووە، ئەوە ڕووداوێکی لەدوا هەیە، سەرەتا وەختی خۆی کە دێتە شاری سلێمانی، تەماشا دەکات لە هەموو لایەکەوە ئاڵای ڕەش هەڵکراوە، ئەمە لە کاتێکدا مامۆستا حەمەی مەلا کەریم لێی پرسیم و ئەوکات لە گۆڤاری «بەیان» بڵاوکرایەوە، لێرە حاکمی بابان کوڕێکی بووە عەمری خوای کردووە ئیتر ئەویش بە سیفەتی ئەوەی دکتۆرە، دەپرسێ چی بووە دەڵێن هیچی نەبووە کەمێ سەری ژانی کردووە، سەری خستۆتەسەر کۆشی باوکی و تەواو بووە، ئەویش دەڵێت: ئەو ناوەی کە پێتان شتووە، ببینم، گوایە زەمانی کۆن بەو ناوەی مردوویان پێ شتووە زانیویانە ئەوە ناوی مردووە، یان

زیندوو، که بردوویانه وتوویەتی ئەوە ئاوی مردوو نییە، دەمەوێ بیبینم، تەماشا دەکات لە هەموو لایەکەوە لە کۆشک هەڵپەرکێ و شاییەو دەهۆڵ لێدانەو ڕەش بەڵەکە، ئیتر دەڵێن یەکێ هاتووە نیازمەندە بیبینێ، هەرچی دکتۆر ئەوەی لە توانایاندا بووە سەرفیان کردووە نەیانتوانیوە زیندووی بکەنەوە بەسەری ڕووتی دەگری، باوکی پیر بووە، دێ بەپیریان، یەکێ بووە وەک سەیاح، لە میانەی سەیاح خەتیە (؟) سلێمانی، لە سیاح بووە ؟ ، ئەویش دێ دەیبینێ و دەڵێ چۆن بوو دەڵێن ئاوا بووە، دەڵێ بچنە دەرەوە و کەس لە ژوور نەمێنێ، قەدیمەکانی سلێمانی هەر کەس قسەیەک دەکات یەکێ دەڵێ لێی داوە و ئیتر، خولاسە ئیجرائاتێکی کردووە تومەز ئەمە دڵی بەکاتی وەستاوە و نەمردووە، لە کاتێکدا کفن کراوە بیبەن بینێژن، خێرا کفنەکەی دەدڕن و هەندێ دەڵێن لە گۆڕ زیندوویان کردووەتەوە ئەمە هەوڵە، ئیتر سەری دەخاتەوە سەر کۆشی باوکی، ئینجا کە هوشیار دەبێتەوە وادەزانێ هێشتا سەری لەسەر کۆشی باوکیەتی، ئەوانیش تاقەت ناگرن لە کونی دەرگاو پەنجەرەوە بۆی دەڕوانن و کە بە ئاگادێتەوە دەڵێ «بابە» یەکسەر باوکی وەڵام دەداتەوە «وەی گیان»، ئینجا لەمەوە ناوبانگ بە «باوەگیان» پەیدا دەکات، ئینجا ئەوکاتە بەفارسی خوێندوویانە ناوی دووەمی بووە بە «جان»، ئینجا لە بەڵگەنامەکانی کۆندا کە هەمووی بلاوکرایەوە بەناوی «الأوراق البابانیە» مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم وێنەی گرتنەوە و بلاوی کردنەوە ئەوانەشی تێدا بوو، لە هەندێکیان نووسراوە «حەکیم باباجان» و لەوی تریان «میرزا بەدیع» دوو ناوی هەبووە، دەیکاتە دکتۆری تایبەتی خۆی، بەلام دەڵێ من ناتوانم لێرە بم، وەک گێڕانەوەش دەڵێن کچێکی خۆی داوەتێ تا بیبەستێتەوە، حەوت گوندی داوەتێ لەنێوانیاندا قزلەر و ئۆمەرە کوێرو بەردەکەر، لەناویاندا قزلەرو بەردەکەر هەڵدەبژێرێ و ئەوانی تر دەداتە دیاری بە جووتیارو مسکێنان، بەو شێوەیە لە سلێمانی دەمێنێتەوە، هەر بەم بۆنەیەوە ئەم دەفتەردم لەبەردەستدایە شتێکتان بۆ دەخوێنمەوە، چەندینی وام بزر کرد:

**هاتی دنیاوە بریان**
**خەڵکی بەتۆوە خەندان**
**ئەمما تۆ زارو گریان**
**کارێکی وا بکەی تا لە ڕۆژی چوونت ئەی دۆست**
**خەڵکی بەتۆوە گریان**
**ئەمما تۆ شادو خەندان**

خۆی زمانی کوردی بەو موفرەداتە زیندووەوە لە فارسی نزیکە، جوانییەکەی ئەوەیە.

**ئەمەم کردە عەرەبی**
**لو نلت بيت شاعر**
**ففي العطاء لا تهمل**
**كي لا يضطر أخر**
**لكي يبيع منزل**

ئەمە سەروادار نییە بەس حەزم کرد سەروای بۆ دانێم.

* دێینە سەر خاڵێکی هەستەوەر، دەربارەی کۆمەڵی کوردەواری و بزووتنەوەی کوردی لە سالانی سی و چلەکان چۆن بووە، ئەوکاتە چ ڕووداوێکی گرنگ لە ژیانی کوردی عێراق هەبووە؟

– لە سییەکاندا من منداڵ بووم، لەوکاتەدا شەڕی بارزان قەوما، بەبیرم دێ ماڵێکی موسلاوی هاتبوون باڵەخانەی ماڵی باوکمیان بەکرێ گرتبوو، چونکە ئێمە حاڵمان باش نەبوو، دایکم ناچار بوو باڵەخانەکەش بەکرێ بدا، کوڕێکیان ئەفسەر بوو لە شەڕی بارزاندا، ئەو ڕۆژە گرتیان بۆ سبەینێ کوڕیان بەشەهیدی هێنرایەوە سوبحانەڵلا، ناوی «عومەر وەهبی» بوو، هێنایانەوە ماڵی باوکم، ئەمە بوو بە مێژوویەک، ئیتر ئەمە لە سەرەتای سییەکان بوو، ئەوسا خۆت دەزانی بزووتنەوەکە لە چوارچێوەی داواکردنی مافی خۆیان نەترازابوو، تەنگیان پێ هەڵدەچنین و هەندێ باری ژیانیان تاڵ کردبوو، ئەو بوارەیان نەبووە هەموو میللەتی کورد ڕزگار بکەن.

* ئەوکاتە هیچ پارت و دەزگایەک نەبوو بەناوی کورد بدوێن؟

– نەخێر، دوای ئەوە لە چلەکاندا شەڕی بارزانی دووەم قەوما، هیچ ڕووداوێکی ئەوتۆم لە یاد نییە، بەلام لە بیستەکاندا شەڕی بەردەرکی سەرا قەوماوە و پاش شێخ مەحمود کە نەفی کرا و ئەمە دژی حکومەت و ئینگلیز بوون هەواڵیان بە پچڕپچڕی بە ئێمە دەگەیشت.

**ئا: د. موحسین ئەحمەد عومەر**

# بەڵگەنامەیەک پێش حەفتاو چوار ساڵ.. داوای کورد نەژادێکی بۆ لیوای کەرکووک و دروستکردنی لیوای باجەڵان کردووە

**ئازاد عەبدلواحید**

* زۆرجار باسی گرنگیدان بە بەڵگەنامە (دۆکیومێنت) کراوە، ئەم هاوارە زۆر کەم گوێی لێگیراوە، بەڵام گەشبینییەکە لەوەدایە کە ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر بایەخ و گرینگییەکەی لەلای خوێنەران و باسکارانی کورد ڕوون دەبێتەوە. لێرەدا باسی ئەو دۆکیومێنتانە ناکەم کە لەناو دۆلاب و (خزانە)کاندا پارێزراون و هەندێ لە لێکۆڵە کوردەکان کە دەستیان پێیان دەگا، لێیان دەردەهێنن و دەکەونە نووسین لە بارەیانەوە، چونکە ئەو بەڵگەنامانە بۆ خۆیان پارێزراون و ئەمڕۆش نەبێ بەیانی، ئەم لێتوێژەرەوانە نەبێ کەسانی دی دەکەونە لێکۆڵینەوە و تاووتووکردنیان، ئەوەی من مەبەستمە ئەو بەڵگەنامانەن کە مەترسیی لەناوچوونیان لێدەکرێ، چونکە لە ڕابردوودا بەسەدان و ملیۆنان لەو دۆکیومێنتانە فەوتاون و نەبوونی هوشیاری پێویست بە گرنگیی ئەو بەڵگەنامانە کارێکی وای کردووە بە دەستی خۆمان زۆرێک لەو دۆکیومێنتانە لەناوبچن، یان بەهۆی کەمتەرخەمی نواندن زۆریان بوونە خۆراکی مشک و مۆرانە، یان بەهۆی نەپاراستنیان بەو شێوەیەی پێویستە و بەهۆی کاریگەریی کەشوهەواو شێوە تووشی پوان و ڕزین هاتوون.

لەکن ئەو نەتەوانەی خاوەن قەوارەی سیاسی خۆیانن و ژیانی کولتووری خۆیان ڕێکخستووە زۆر لە مێژە ئەو قۆناغەیان تێپەڕاندووە باس لەوە بکەن کە ئاخۆ گرنگی (دۆکیومێنت) لەچیدایە، یان بپرسن چۆن و لەبەرچی بایەخی پێبدەن و کۆیان بکەنەوە و خانەبەندییان بکەن و بیانپارێزن؟ ئەوان کە دۆکیومێنتەکانی سەرجەم بوار و کایە جیاجیاکانی ژیانی خۆیان بەچاکی و زانستیانە پاراستووە و بەپێی یاساش لەپاش هەر (٢٠ - ٢٥) ساڵ جارێک، نەک هەر بەڵگەنامە ئاساییەکان، بگرە بەڵگەنامە نهێنییەکانیشیان دەخەنە بەردەستی باسکارانەوە تا لێیان بکۆڵنەوە و بیانخەنە ناو باس و لێکۆڵینەوە زانستی و ئەکادیمییەکانیانەوە.

* میللەتی ئێمە کە زەمانێکە لەلایەن سێ نەتەوەی سەردەستەوە کۆلۆنیال کراوە، بۆیە هیچ داوودەزگایەکی نەتەوەیی تایبەت بەخۆی نەبووە، بۆ تواندنەوە و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەییشمان ئەو نەتەوە سەردەستانە لە پێودانگی شۆڤێنستانەی خۆیانەوە هەردەم هەوڵیان داوە مێژوو و کەلەپوور و ڕەسەنایەتی و داوونەریتی ئەم میللەتە بشێوێنێ، ئەلحەقی خۆشی بەپێی پێویست لای لە مێژوو و کەلەپوور و بەڵگەنامەکانی خۆی نەکردۆتەوە، ئەوەندە دەروەستی شوێنەوارە دێرین و مێژووییەکانی خۆی نەبووە، هێرشی داوونەریتی بێگانە، زۆر داوونەریتی ڕەسەنی ئێمەی ڕاپێچ داوە و خۆی لەبەردەمیدا نەگرتووە، بۆیە بەهۆی پێنەگەیینی



حەماغای ئاورەحمان ئاغا

هوشیاریی نەتەوەییەوە خۆشی کەمتر لە ناحەز و نەیار و دوژمنە سەرسەختەکانی کەمتری بە مێژوو و شوێنەوار و کەلەپوور و بەڵگەنامەکانی خۆی نەکردووە!

بۆیە ئەمڕۆکە نەک هەر لە مێژووی دێرین و کۆن و سەدەکانی ناوەڕاستی خۆی بە تەواوی نەکۆڵیوەتەوە، بگرە لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی خۆشی بە باشی قووڵ نەبووەتەوە، بەمەش زۆر کەلێن و قوژبنی بە تاریکی ماوەتەوە و زۆر ئەلقەی گرنگی مافی تەواوی خۆی نەدراوەتێ، کە دەکرا بەهۆی دۆکیومێنتەکانەوە ئەو گرێ کوێرانە بکرێنەوە و ڕووناکی زۆرتریان بخرێتە سەر، یەکێک لەو دۆکیومێنتە مێژوویی و گرنگانەی لە کاتی خۆیدا لە شاری سلێمانی دەستم کەوت و لەم دواییەدا لەناو کتێبخانەکەمدا لەگەڵ کۆمەڵێ کاغەزی دیکە دۆزیمەوە، ئەم بەڵگەنامەیەیە کە لە (نیسانی ۱۹۳۰) بەناو و ئیمزای (کورد) لەلایەن چەند منەوەر و سیاسەتمەدارێکی کوردەوە پێشکەش وەزارەتەکەی (نووری سەعید - سەعیدییە) کراوە، ئەم دۆکیومێنتەش بێجگە لەوەی بۆ ئەوساڵە و لەکاتی خۆیدا گرنگی خۆی هەبووە لەوەی پاڵەپەستۆ و فشاری خستووەتە سەر ئەو وەزارەتە لە بەدی هێنانی داواکانی کورد و بەدەست هێنانی مافە ڕەواکانی، بۆ ڕۆژی ئەمڕۆکەش و لەپاش تێپەڕبوونی (٧٤) ساڵ بەسەر نووسینی ئەو یاداشتنامەیەدا هەر زیندووە و ئەو گرنگییەی خۆی لە دەست نەداوە، چونکە بەشێکی زۆر لەو داخوازیانە، لەو ڕستە و دەستەواژانە لەپاش ئەو هەموو ساڵانە تا بە ڕۆژی ئەمڕۆکەشمان دەگات، لەلایەن حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عیراق هەمان ئەو سیاسەتە پیادە و پێڕەو دەکەن کە ئەوان ڕووی دەمیان تێکردووە، تەنانەت بەوانەشەوە کە لەسەر شانی کورد جڵەوی دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست. پێش ئەوەی بە وردی بچینە ناو باسی ئەو دۆکیومێنتە و لێکدانەوەی مەغزاکانی، وا لەلای خوارەوە دەقی دۆکیومێنتەکە دەخەمە بەردەستی خوێنەرانەوە.

**لاحیقەی ژمارە (٣/٢). نیسانی (١٩٣٠)**
**مولاحەزاتمان دەرحەق بە بەیاناتی وەزارەتی حازرە (سەعیدیە)**

**لەپاش تەدقیق و تەحقیقی ئەو بەیاناتە ڕەسمییەی وەزارەتی حازرە کە لە (١٠/نیسان/ ١٩٣٠)دا لە جەرائیدی بەغادا نەشر کرابوو، لە نەزەر میللەتی کوردا وا دیارە کە: سیاسەتی وەزارەتی حازرە، سیاسەتێکی تەفرەدان و وەقت بەسەربردنە؛ چونکە مەزموونی ئەم بەیاناتە شتێکی تازە نییە، ئەم وەعدە بالفعل داخلی قەراری (عصبە الأمم) و بە سێهەمینی ماددەی موعاهەدەی ساڵی (١٩٢٢) و ماددەی (١٧)مینی دستووری عیراقی مونەیەدە و لەتەرەف مەرحووم عەبدولموحسین بەگ سەعدوونیشەوە چەند جارێک لە مەجلیسی نیابیدا ڕەسمەن و بە کەماڵی سەراحەت بەیان و ئیعتیراف کرابوو، ئەساسەن قسمێک لە مەوادی ئەم موقەرەراتە لە قسمێکی کوردستاندا بەتەواوی تەتبیق کراوە، بینائەن عەلەیهی میللەتی کورد وای لا خۆش نەبوو، کە وەزارەتی حازرە دەرحاڵ ئیکماڵی بەقیەی بکردایە، ئیتر میللەتی کورد نایەوێ ئەوقاتی خۆی بە تەفرەدان زایع و بەوەعدی ئیمڕۆ سبەی خۆی ئیغفاڵ بکا.. بینا لەسەر ئەمە بەرامبەر ئەم وەعدی وەزارەتە کە لەحاڵ زیاتر بۆ ئیستیقباله، میللەتی کوردیش تەشەکوراتی خۆی بۆ ئیستیقبال هەڵدەگرێ.**

**لە مەسائیلی ئیداری حازرەدا هەرچەندە لە تەعین بوونی [تۆفیق وەهبی بەگ] بۆ متەسەریفی سلێمانی نا مەمنوون نین، چونکە ئومێد و ئینتیزاری چاکەی لێدەکرێ، لە عەینی وەقتدا وامان ئەویست بۆ لیواکانی تریش پیاوانی دڵسۆز و حاڵ شوناس و کورد خواهو و کوردنەژاد تەعین بکرایە و بکرێ، لەبەر ئەمە: بۆ جەلبی**

**ئیعتیمادی میللەتی كورد دەبوایە لە تەعین كردنی متەسەریفی كەركووك ئەم حوجەتە بخرایە بەرچاو، ئەمجا ئێستاش بۆ ئەوەی ئیمان بە حوسنی نییەتی وەزارەت بهێنین، كوردان ئارەزوو ئەكەن بۆ متەسەریفیەتی (هەولێر) زاتێكی وا تەعین بكرێ كە حائیزی ئەو سیفاتە بێ كە لە سەرەوە بەیانمان كرد و هەروەكو لە مەجلیسدا لە تەرەف مەندووبە كوردەكانەوە تەلەب كرابوو حالەن لیوای [دهۆك و باجەلان] تەشكیل بكرێ. ئیتر لە ئەقوال زیاتر ئینتیزاری ئەفعال ئەكرێ و كوردیش قسەی خۆی بۆ دوایی هەڵگرتووە...!!**

* خوێندنەوەیەكی سەرەتایی ئەم دۆكیومێنتە چەند سەرنجێكمان لەلا بەرجەستە دەكات كە لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە ئەم بەڵگەنامەیە كە وەك یاداشتنامەیەك دراوە بە حكومەتەكەی (نووری سەعید) و بە زمانی كوردی نووسراوە، كە ئەمە بۆ خۆی دەلالەتێكی قووڵی خۆی هەیە، چونكە ئەو حەوت زاتەی كە دواتر ناویان دەنووسین و ئەم یاداشتنامەیان نووسیوە ڕووناكبیر و سیاسەتمەداری ئەو چەرخ و زەمانەی خۆیان بوون، كە بێگومان دەیانتوانی یاداشتەكەیان ڕاستەوخۆ بە زمانی عەرەبی بنووسیایە، بەڵام ئەوەیان نەكردووە و بەزمانی كوردی پێشكەشیان كردووە، خۆ هەر نەبێ دەیانتوانی ئەو یاداشتە بدەنە كەسانێكی عەرەبی زان تا بیكەنە كوردی بۆیان، كە ئەو سەردەمە زانای گەورە و پیاوی ئایینی زۆریش لە شاری سلێمانی ژیاون، بەڵام پەنایان بۆ ئەوەش نەبردووە.

* بەپێی بەدواداچوون و لێكۆڵینەوە و سۆراخ كردن دەركەوتووە كە ئەم یاداشتەی بە ناوی (كورد)ەوە ئیمزا كراوە ئەم بەڕێزانە نووسیویانە: **[میرزا تۆفیق قەزاز، عیزەت بەگی وەسمان پاشای جاف، ڕەمزی فەتتاح، فایەق بەگی عەلی بەگی بابان، مەجید ئەفەندی حاجی ڕەسووڵ ئاغا، حەماغای ئەوڕەحمان ئاغا، عەزمی بەگی بابان، شێخ قادر حەفید]** كە سەرجەم ئەو زاتانە خەمخۆر و سیاسەتمەدار و پیاوماقووڵ و خاوەن دەسەڵات و پیاوی ناسراوی ئەو سەردەمە بوون، ئیمزاكردنی ئەو زاتانەش بەناوی (كورد)ەوە لەكۆتایی یاداشتنامەكە بە خۆی خۆنەویستی و یەكگرتوویی دەگەیەنێ لە هەڵوێستی سیاسییان، هەر هیچ نەبێ لە شاری سلێمانی كە ئەوكاتە مەڵبەندی جووڵانەوەی سیاسی و كوردایەتی و شۆڕش و ڕاپەڕین بووە.

* كە نووسراوە لاحیقەی ژمارە (٣/٢)، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێ كە پێشتر یاداشتی تریان پێشكەش بە حكوومەت كردووە، لەوانەیە دواتریش هەر یاداشتی تریان پێدابێ، بەڵام دەست نەكەوتبێ و تائێستا نەدۆزرابێتەوە.

* لە دێرەكانی سەرەتای ئەم یاداشتنامەیەدا كە پێش كارەساتی (٦)ی ئەیلوولی ڕەش (١٩٣٠) نووسراوە، وەڵامێكە بۆ ئەو سیاسەتە چەواشەكارانەیەی حكوومەتی بەغدا كە دیارە لە ساڵی (١٩٣٠)دا لە ڕۆژنامەكانی بەغدا بڵاوكراوەتەوە، ئەم سیاسەتەش بە سیاسەتی (لەخشتەبردن) و (تەفرەدان) و (كات بەسەربردن) لەقەڵەم دەدەن، چونكە ئەم بەیاناتە (شتێكی نوێی تێدا نییە)، وا دیارە ئەم سیاسەتەی ئەوكاتە لە بارەی كوردەوە پەیڕەو كراوە، هەمان ئەو سیاسەتە بووە كە لە ماوەی (٧٤) ساڵ و تا بە ڕۆژی ئەمڕۆكەش دەگات و بە درێژایی ئەو ماوەیە، سیاسەتی (تەفرەدان بووە) كە نیشانەی خوو پێوەگرتن و موزمینی سیاسەتی حكومەتە یەك لەدوای یەكەكانی عێراق بەرانبەر بەو میللەتە ئازادیخوازە كە لەپاش بە زۆر پێكەوەلكانی كوردستان بە عیراقی عەرەبی و دروست بوونی دەوڵەتی عیراقەوە ئەم سیاسەتە بەردەوام بووە و كێشەی میللەتی كورد بە هەڵواسراوی ماوەتەوە و بیر لە چارەسەركردنی



**تۆفیق وەهبی**

ڕاستگۆیانە و جدییانەی نەکراوەتەوە، نەک هەر بیر لە چارەسەرکردنی ئەو کێشەش نەکراوەتەوە بگرە بە سیاسەتی تەعریب و پەراویز خستن و جینۆساید وەلام دراوەتەوە و خەونەکانی زیندەبەچاڵ کراوە.

* ئەو بەدگومانییە لەوەوەش هاتووە کە حکومەتی ئەوکاتە و دوای ئەوەش سیاسەتی پێچە بە دەورەیان بەرانبەر هەر بەڵێن و بڕیارێک پیادە کردووە کە لە (کۆمەڵەی گەلان) بە بەرژەوەندی و قازانجی کورد دەرچووە و کراوە بە (دۆکیومێنت) و بڕیار و یاسای نێودەوڵەتی و بە هەموو دنیادا بلاوکراوەتەوە، بێجگە لە بلاوکردنەوەی ئەو بەڵێن و یاسایانە لەناو ڕۆژنامەکانی ئەو سالانەی بەغادا.

* نابێ لێرەدا ئەو ئاماژەیە لەبەرچاونەگرین کە دەڵێ: (لەتەرەف عەبدولموحسین بەگ سەعدوونیشەوە چەند جارێک لە مەجلیسی نیابیدا ڕەسمەن و بەکەمالی سەراحەت بەیان و ئیعتیراف کرابوو) کە وا دیارە ئەوکەسایەتییە نیشتمانییە پاڵپشتی لە داواو مافەکانی کورد کردووە، لەناو کورد و عیراقییەکانیشدا پیاوێکی خۆشەویست بوو وەک دیاریشە هەر لە پاکی خۆشی بوو لە دەرئەنجامدا خۆی کوشت، لەوە دەچێ بەشێکی ئەو بڕیارانە لە بەشێکی کوردستاندا جێبەجێ کراون و چاوەڕوان کراوە بەشەکانی تری بڕیارەکان کە بەڵێن بۆ جێبەجێ کردنیان دراوە بێنەدی، بەتایبەتی ئەو داوا و بەڵێنانەی جێبەجێ نەکراون چاوەڕوان کراوە وەزارەتی نوێی (نوری سەعید) جێبەجێیان بکات.

* لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە ئەو کاتە و تا ئەمڕۆکەش کورد بە دەستی ئەو دەردەوە دەتلێتەوە و دەناڵێنێ کە نووسیویانە: (ئیتر میللەتی کورد نایەوێ ئەوقاتی خۆی بە تەفرەدان و زایع و بەوەعدی ئیمڕۆ سبەی خۆی ئیغفاڵ بکا)، کە ئەم سیاسەتە تەکتیکییە لەوساوە لەلایەن هەموو حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عیراق پەیڕەو کراوە و دەستی دەستی و ڕاوەڕێوی بە مافە ڕەواکانمان کراوە و ئەم پەتایەش هەر زادەی ئەمڕۆکە نییە، کاتێ حکومەتێ هاتووە بە وەعدی ئیمڕۆ سبەی کەسبی وەقتی کردووە و کوردیان پێ ئیغفاڵ کردووە. عەرەب واتەنی (وما اشبه اليوم بالبارحه) کاتێ ئەو قسە و دەستەواژانە دەخوێنینەوە وادەزانین ئەمڕۆکە نووسراون، چونکە ڕۆژانە دەبینین و دەبیستین هەموو ئەوانەی کوردیان کردووە و دەیکەن بە (پرد) لە هەموو سەردەم و قۆناغەکاندا تەنیا دەموچاویان گۆڕاوە، ئەگینا عەقڵییەت هەمان عەقڵییەتی جارانە و هەمان قسە و دەمو دوو و شێوەکارکردنە، ئەوەتا ئەوانەی لە کۆنگرەی لەندەن و سەلاحەدین و ناسریە و کوێ و کوێ بە گەرمی پاڵپشتی داوای (فیدرالی) بوون بۆ کورد، دەبینین ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە قسە و بەڵێنەکانیان پەشیمان دەبنەوە، بۆیە جوانیان نووسیوە کە بەرانبەر وەعد و بەڵێنەکانی ئەو حکومەتانە **(میللەتی کوردیش تەشەکوراتی خۆی بۆ ئیستیقبال هەڵدەگرێ)**، واتە ئەوکاتە سوپاسیان دەکات کە ئەوانیش گفت و بەڵێنی خۆیان بهێننەجێ، نەک لە ئێستایاندا کە هیچیان بۆ بە هیچ نەکردووە، دیارە لێرەشدا ئەو کوردە سیاسەتمەدارانە تەواو دڵنیابوون و دەستیان شوشتووە لەوەی دەستی کورد کەوتووەتە ژێر سەری ئەو حکومەتانەوە کە دان بەو مافانەدا بنێن، بۆیە (سوپاسی خۆیان بۆ ئاینده) هەڵگرتووە، دەنا کەی بووە مافی ڕەوای میللەتێک بەو هەموو قوربانی دان و مەینەتییەی چەشتوویەتی سوپاسی بوێ، ئەگەر ئەرکی سەرشان نەبێ بۆی دابین بکرێ، بۆیە نایانەوێ چیتر خۆشباوەڕ بن، لەپاش جێبەجێ کردنی بەڵێنەکان، تەشەکوراتی خۆی دەنێرێ.

* (لە مەسائیلی ئیداری حازرەدا هەرچەندە لە تەعین بوونی (تۆفیق وەهبی بەگ) بۆ متەسەریفی سلێمانی نا مەمنوون نین، چونکە ئومێد و ئینتیزاری چاکەی لێدەکرێ)، ڕاستە (تەوفیق وەهبی بەگ) لەگەڵ (شێخ مەحموودی حەفید) نەبووە و زیاتر هەڵوێستی میانڕۆ لەگەڵ سیاسەتەکانی (شێخ مەحموود) (ودسەت) بووە، بەلام شاری سلێمانی وەک لە شارەزایانی مێژوو و سیاسەتی ئەو سەردەمەم بیستووە زۆریان پێ خۆش بووە کە ئەو منەودرەیان هێناوە و کردوویانە بە (متەسەریف)،

بەپێی زانیارییەکانی نێو ئەو دۆسییەی (تەوفیق وەهبی بەگ)یش کە لە ناو دەیان و سەدان دۆسیەی ساڵانی پێش (١٩٥٨) لەناو ژوورێکی جەمەلۆن دروست کراو لە بەڕێوەبەرایەتی خەزێنەی شاری سلێمانی دەرم هێناو دۆزیمەوە، ئەو پیاوە پێش ڕووداو و کارەساتی (٦)ی ڕەشی ئەیلوول (١٩٣٠) دەستی لە کاری متەسەریفی سلێمانی هەڵگرتووە، بۆیە ئەو پەڵەیەش کە ویستیان بینێن بەنێوچەوانییەوە گوایە ئەو کارەساتە لەسەردەمی متەسەریفیی ئەودا ڕوویداوە، لە ڕاستییەوە زۆر دوورە و تەنیا بوختانێکی بۆ هەڵبەستراوە و هیچی دیکە نییە.

* هەر لەو ساڵەدا کە (تۆفیق وەهبی) لەسەر کارەکەی دوورخرایەوە، لە شوێنی ئەو بۆ جاری دووەم **(ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ)** دانراوە، کە پێشتر لە ساڵی (١٩٢٥)دا هەر ئەو متەسەریفی شاری سلێمانی بوو، چونکە لەوکاتەدا لەتۆڵەی ڕووداوەکانی (٦)ی ڕەشی ئەیلوول (١٩٣٠) شێخی نەمر دەستی بە شۆڕش کردەوە و لەژێر فشاری خەڵکی شاری سلێمانی و ڕووداوە گەرمەکانی ئەو سەردەمە کەوتەوە خەباتی چەکداری، (ئەحمەد بەگ) لەبەر ئەوەی خزمایەتی لەگەڵ عەشایری پشدەردا هەبوو، ئەوکاتەش عەشایری پشدەر بە زۆری لەگەڵ ئینگلیزەکان بوون، بۆیە دەستنیشانی (ئەحمەد بەگ) کرا، کە هەر بۆ خۆشی پیاوێکی خاوەن کەسایەتی بەهێزو و چالاک بوو، پیاوێکی پاک و بەڕەوشت و خۆشەویست بوو، ئینگلیزەکان دەیانویست لە ڕێگەی ئەوەوە لەگەڵ شێخ مەحموود ڕێکبکەون و لێی نزیک ببنەوە، لەدواییشدا هەروا شکایەوە و لە ماڵەکەی ئەودا تەسلیم بوو و بردیان بۆ بەغدا، ماوەیەک لە باشووری عیراق دەیهێڵنەوە و پاشان هێنایانەوە بۆ گەڕەکی (ئەعزەمییە) لە شاری بەغدا.

(تۆفیق وەهبی) کە لە ساڵانی (١٩٣٣- ١٩٣٤) فەسڵ کرابوو و لەسەر کار لابرا بوو، لە شاری بەغدا لە (سنەک) لەژێر چاودێری بوو، واتە وەک هەندێ نووسیویانە بەند نەبوو، دەست بەسەربوو، هەروەها نەفییش نەکراوە، چونکە خۆی لە ساڵی (١٩٣١) چووە بۆ (سووریا) و (لبنان) و لەوێ پێوەندی بە جەماعەتی (خۆیبوون)ەوە کردبوو و (کامەران بەدرخان و جەلادەت بەدرخان)ی دیبوو، کە ئەوانیش تەقەللایان دەدا و نامەیان بۆ (کۆمەڵەی گەلان) دەنووسی، تا ئاسوورییەکانیش پاڵپشتی لە کوردەکان بکەن و لە (کۆمەڵەی گەلان)دا یارمەتییان بدەن، هەرچەندە تۆمەتبارىشیان دەکرد، بەتایبەتیش لەلایەن (مەعرووف جیاووک)ەوە گوایە ویستوویەتی ئاسوورییەکان هاندا بۆ دروستکردنی دەوڵەتێک بۆ خۆیان، بەڵام ئاسوورییەکان داوای ئەوەیان دەکرد (ئۆتۆنۆمی)یەکییان لە عیراقدا هەبێ، بەتایبەتی لەناوچەی (شەرگات) کە لەولای مووسڵەوەیە و ئەوکاتە دەیانویست هەوڵەکانیان یەکبخەن بۆ وەرگرتنی مافەکانی خۆیان لە (کۆمەڵەی گەلان)دا. شێخ مەحموودی حەفید لەلای خەڵکی پیاوێکی خۆشەویست و جێگەی باوەڕو متمانە بوو، بەڵام موونەوەرەکانی ئەو سەردەمە بەردەوام تکایان لێدەکرد لەگەڵ ئینگلیز ڕێک بکەوێ، بۆیە کەسانی نزیک لە شێخی نەمر وەک خوالێخۆشبووان: (سەید نووری نەقیب، ئەحمەد خواجە، مەحموود شەوقی، فوئاد ڕەشید بەکر، جەلال ئەمین بەگ) بۆ منیان دووپات کردەوە کە لەدوای سییەکانەوە بەدواوە پێوەندیی نێوان شێخ مەحموود و تۆفیق وەهبی زۆر خۆش بووە و تەنانەت ئەحمەد خواجە گوتی: لە ساڵی (١٩٣٤) من شێخ مەحموودی نەمرم لە ماڵی تۆفیق وەهبی دیوە کە بۆ زیارەت کردنی چووتە لای، ئەو وێنەیەش کە پێکەوە گرتوویانە هی ساڵانی دوای سییەکانە کە ئێستا لەبەردەستایە.

* لە ساڵی (١٩٣١) لە شاری سلێمانی کۆمەڵەیەکی نهێنی لەلایەن تۆفیق وەهبی تەشکیل کراوە و ئەو بووە بە سەرۆکی ئەو جەمعیەتە، بەڵام تا نووسینی ئەو بابەتەم و سۆراخ کردنم ناوی جەمعییەتەکەم بۆ ساغ نەکرایەوە کە ناوی چی بووە، لەو جەمعییەتەدا هەموو ئەو کوردە نیشتمانپەروەرانەی تێدابووە کە لە نووسینی ئەو یاداشتەدا ناویان هاتووە و بەناوی (کورد) ئیمزایان کردووە، هەر لە (شێخ قادری حەفید)ی برای شێخ مەحموودەوە بگرە تا (تۆفیق قەزاز، حەماغای ئەوڕەحمان ئاغا و عەزمی بەگ بابان و عیزەت بەگی وەسمان پاشا) تێیدا چالاک بوون و ئەو لەگەڵیان خەریک بووە و ڕێنمایی و سەرو کاری کردوون، بەلای منەوە هەرگیز ناکرێ ئەو جەمعییەتە خۆی لە شێخ مەحموودی نەمر بە دوور گرتبێ کە ئەوکاتە لە (پیران) دانیشتووە.

* هەڵوێستەکانی (تۆفیق وەهبی) هەرچۆنێ لێک بدرێنەوە، نابێ ئەوەمان لەبیر بباتەوە کە نامە و عەریزەکانی داویەتی بە (کۆمەڵەی گەلان-عصبە الأمم) هەرچی بووبن داوای مافەکانی کوردی کردووە و لە وەزیفەکەی دوورخراوەتەوە، ئەوکەسانەش کە

پشتیوانییان لێکردووە و لەو یاداشتەدا نووسیویانە: (ئومێد و ئینتیزاری چاکەی (لێدەکرێ) کەسانێکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆزی کورد بوون. وا لێرەشدا بەڵگەنامەیەکی دیکە دەهێنینەوە پێش چاو کە گەواهی بۆ (تۆفیق وەهبی بەگ) دەدا: **(ملخص وقائع جلسة العشرين المنعقدة من قبل لجنة الانتداب الدائمة عدد س ٤٢٢م ١٦٧ في ١٩٣١ السادس پی پی ٢٢٠-٢٢٢ سی. پی ١١٩٨:**

**١- عريضة من اكراد العراق نقلت الى لجنة الانتداب من قبل الحكومه العراقية في ٢٠ فبراير ١٩٣١.**

**٢- عريضة توفيق وهبي بك المؤرخة في ابريل ١٩٣١ (سی ١١٩٢پی ایم ١٩ نيسان ١٩٣١ توفيق وهبي بك]**

**تقرير المستر راپارد**

**بناء على رغبة رئيس اللجنة لي الشرف ان أقدم الى زملائي الملاحظات الاتية التى خطرت لي بعد قراءتي العرائض الكردية المتعدده التي طلب مني ان اتفحصها و تعليقات الدولة المنتدبة-عليها (العراق).**

**ولو أن المواد التى وضعت أمامي كانت في حجم مجلدات الا ان ملاحظاتي ستكون وجيزه جدا.**

**مطاليب أصحاب العرائض بعضها تطلب إقامة دولة كردية مستقلة تحت الانتداب البريطاني، أو غيرها من الدول التى تختارها عصبة الأمم.**

**و بعضهم يطلبون بأن هذه المنطقة يقضي ان تكون مملكة مستقلة يحكمها الشيخ محمود تحت حماية الدولة البريطانية. أما توفيق وهبي بك فيقتصر من جهة أخرى في رسائله و عرائضه المتعدده بطلب ادارة ممتازة راقية للمنطقة الكردية في العراق.**

* لایەنێکی دیکەی گرنگی ئەم دۆکیومێنتە کوردێتی شاری (کەرکوک)ـە کە لەپاش دانانی (تۆفیق وەهبی) بۆ شاری سلێمانی داوایان کردووە **(لەعەینی وەقتدا وامان ئەویست بۆ لیواکانی تریش پیاوانی دڵسۆز و حاڵ شوناسی و کورد خواهو کورد نەژاد تەعێن بکرایە و بکرێ)** ئەم پێداگرتنە لەسەر کورد خواهی و کورد نەژادی، دانانی متەسەریفێکی کورد نەژاد و کورد خواهە بۆ کەرکوک. کە بۆ ئەو شارە ئەم حوجەتە لەبەرچاو نەگیراوە، هەروەک چۆن داوا دەکەن ئەو سیفەتانە لەو کەسەدا بێ کە دەکرێتە متەسەریفی شاری هەولێر، بگرە ئەوانەش بە (حوسنی نیەتی) حکومەت دەزانن، کە نەبوونی ئەو (حوسنی نییەتە) لە هەنگاونانی حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عیراقدا کە نەخشەی سیاسەتی عیراقییان دارشتووە و تا ئەمڕۆکە بەڕێوەیان بردووە بەو نیەتە خراپ و پیسەوە کارێکی کرد عیراقی گەیاندە کۆڵانێکی دەرنەچوو و دووچاری کۆمەڵێ قەیران و تەنگژەی سیاسی کرد و بەرەو دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری-تۆتالیتاری برد و گەلانی عیراقی تووشی مەینەتی و ماڵوێرانی کرد کە لەوانەیە باجی ئەو سیاسەتە تا چەند نەوەیەکیش بژمێرێ و وڵاتی بەرەو وێرانەیی برد.

سەرەرای داواکاری ئەو کەسایەتییە کوردانە لە دانانی کەسانی کورد نەژاد و کورد خواهو شارەزا لە ئەحوال و گوزەران و ژیانی ئەو شارە کوردییانەی کوردستان، تەئکید کردنەوەیان لەوەی متەسەریفی کەرکوک لە ساڵی (١٩٣٠)دا پیاوێکی کورد نەژاد بێ، بەڵگەیەکی دیکەی کورد بووی شاری کەرکوکە و دەچێتە پاڵ بەڵگەکانی ترەوە.

* وا دیارە لەو ساڵانەدا نوێنەرانی کورد لە ئەنجوومەنی نیابیدا زۆر داواکارییان پێشکەش کردووە، یەکێک لەو داوا گرنگ و ڕەوایانە ئەوپێشنیارە بووە کە لەو یاداشتنامەیەدا ئاشکرا کراوە و ئەوانیش پشتیوانییان لەداواکەیان کردووە کە ئەویش پێکهێنانی لیوای (دهۆک) و (باجەڵان)ـە، کە پاش دابەشکردنی سنجاغی (باجەڵان) و (دەرنە) لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێراندا، بەشی ڕۆژهەڵات کە (زەهاو) و (دەرنە)یە لەگەڵ (قەسری شیرین) کەوتە ژێر دەستی ئێرانەوە، ناوچەی (خانەقین) و (هۆرێن) و (شێخان)یش بەپێی ڕێککەوتننامەی ئەرزەڕۆم کەوتە ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانی، کە لەنێوان هەردوو وڵات لە ساڵی (١٨٤٧)دا مۆرکرا.

ئنجا بنەماڵەی میرانی (باجەڵان) کە متەسەریفە سنجاغەکە هەر لەوان بوون، هاتنە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی کە خانەقینە، پاشان دەوڵەتی عوسمانی لیوای خانەقینی دروست کرد، کە هەر لیوای (باجەڵان)ەو باجەڵانیشی پێ دەوترا.

* (کفری) و (خانەقین) و (مەندەلی) ئەو قەزایانە بوون کە سەر بە لیوای (خانەقین) بوون، ئەم لیوای (خانەقین)ەش تا ماوەیەک پاش داگیرکردنی ئینگلیز بەردەوام بوو. ئیتر ئینگلیز لە دەوروبەری ساڵی (١٩١٩ - ١٩٢٠) ناوچەی حاکمییەتەکانی ئینگلیزی دروست کرد، ئەوەبوو (بەعقووبە) و (خانەقین)ی کرد بە یەک حاکمییەتی سیاسیی خۆی.

* پاش دروستکردنی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی (١٩٢١)، هەردوو ناوچەیان کردە یەک ناوچەی ئیداری (خانەقین = بەعقووبە)، ئنجا مەڵبەندی لیوایەکە بووە (بەعقووبە) و لیوای خانەقین نەما، کوردیش بەردەوام دەیانویست لیوای خانەقین زیندوو بکەنەوە، وەک لە کاتی عوسمانلییەکان و سەرەتایەکانی داگیرکاری ئینگلیزەوە هەبووە، بەڵگەش ئەوەیە کە لەو بەڵگەنامەیەدا هاتووە (کە ئەمە داواکارییەکی مەندووبە کوردەکانیشە).

مەتڵەبی یەکەم جێبەجێ بووە، بەڵام بەهۆی پرۆسەی تەعریبەوە داوای دروست بوونی لیوای (باجەڵان) بە ئەنجام نەگەیشت، ئەمرۆکە دەنگێکی کز لەم لاو ئەولا دەبیسترێ لە پێکهێنانی پارێزگای (گەرمیان)، کە پێویستە، ئەو پرۆژەیە جدی تر جەختی لەسەر بکرێتەوە پارێزگایەک بەناوی (باجەڵان)ەوە دروست بکرێ، بەمەش ئەو ئاوات و خەونە بەدی نەهاتووە دێتەدی کە بەر لە حەفتاو چوار ساڵ نائیبە کوردەکانی پەرلەمانی عیراق و کەسایەتی و پیاوماقووڵ و سیاسەتوانانی کورد هەوڵیان بۆ داوە و بۆی تێکۆشاون.

* مایەوە سەر ئەوەی بڵێین کە ئەو ڕستە و دەستەواژە و بیروبۆچوون و داوا و پێشنیارانە کە لە ساڵی (١٩٣٠)دا پێشکەش بە وەزارەتەکەی نووری سەعیدی بە ڕەچەڵەک کورد کراوە، تا ئەمرۆکەش تەئیسر و کاریگەری خۆیان لەدەست نەداوە و هەر ئەو ماف و داوایانە تا بە ئەمرۆکە دەگەن بەشێکی زۆریان بەدی نەهاتوون، ئەگەرچی رووبارێک خوێن و فرمێسکمان بۆیان ڕشتووە و لەپاش دەیان کارەساتی وەک کیمیاو ژەهرباران کردن و جینۆساید و ئەنفال و گۆڕی بەکۆمەڵ، کەچی تا ئەمرۆکە ئەو داوا ڕەوایانە ڕەوایەتی خۆیان لەناو عەقڵی شۆڤینیستاندا وەرنەگرتووە و نە بە نییەتی پاک و نە بەمافی ئینسانیی ئێمەیان نەزانیوە، ئێستاش هەر بە برا بچووک تەماشا دەکرێین و بە مافی برا گەورەی دەزانن وەک زەروو دەمی بژەنێتە ناو خوێنی کوردەوە و مافی بڕیاردانی لەسەر چارەنووسی ئەو میللەتە هەبێ و هیچی پێ ڕەوا نابینێ و بە شایستەی ژیانێکیی سەربەرزانەی نازانێ، بۆیە زیاتر ئەو ڕستانەی وەک **(لە ئەقوال زیاتر ئینتیزاری ئەفعال ئەکرێ)** و **(کوردیش قسەی خۆی بۆ دوایی هەڵگرتووە)** و **(میللەتی کورد نایەوێ ئەوقاتی خۆی بە تەفرەدان زایع و بە وەعدی ئەمرۆ سبەی خۆی ئیغفاڵ بکا)** و **(بۆ ئەوەی ئیمان بە حوسنی نییەتی وەزارەت بهێنێن)** گشت ئەو ڕستانە لەپاش حەفتاوچوار ساڵ و دوای هەموو دەردەسەری و نەهامەتییەکان، کەم ڕۆژ هەیە لەلایەن کوردەوە بەکارنەهێنرابێ و بەکارنەیەت و کاتێ خوێنەر ئەو دۆکیومێنتە دەخوێنێتەوە زۆرتر برینی دەکولێتەوە، چونکە ئەمرۆکەش کورد هەر بەو تەفرە و بەڵێنانەوە گرفتار بووە کە تا ئێستا هیچ دەردێکی بۆ تیمار نەکردووین و هەموو خەون و ئاوات و داوایەکی بە هەڵپەسێردراوی هێشتووەتەوە.

* مایەوە بڵێین ئەو دۆکیومێنتەی بەردەستمان زۆر هەڵدەگرێ قسەی لەبارەوە بکرێ، من تەنیا خوێندنەوەیەکی سەرەتاییم بۆ کردووە، دەکرێ چەند جارێکی تریش بگەڕێینەوە سەری و بە سەرنج و تێبینی دەوڵەمەندی بکەین، هەروەک دەکرێ نووسەرانی تریش زیاتر لەو بەڵگەنامەیە وردبینەوە و دەرس و پەند و عیبرەتی لێ هەڵێنجن و دەرەنجامی زیاتری لێ بەدەست بخەن، ناکرێ لێرەدا دووپاتیشی نەکەینەوە کە زیاتر لا لە بەڵگەنامە فەرامۆش کراوەکانمان نەکەینەوە، کە بەشێکی بایەخداری مێژووی کۆن و نوێی ئەم میللەتەی ئێمەن، پاراستن و بلاوکردنەوە و لێوردبوونەوەیان ئەرکێکی نەتەوەیی و مێژوویی و نیشتمانیی سەرشانمانە نابێ بەهیچ بیانوویەکەوە پشت گوێیان بخەین و چیتر دوا بکەوێ.

# تیۆرییەکانی ڕێنمایی و ئاراستەکردنی دەروونی

د. کەریم شەریف قەرەچەتانی
(زانکۆی سەلاحەدین- کۆلێژی پەروەردە)

### تیۆری جەختکردنە سەر فاکتەر و سیماتەکانی کەسایەتی

ئەم تیـۆرە بەپلەی یەکـەم جـەخت دەکـاتە سـەر تاووتوێکردنی سایکۆلۆژی کەسایەتی و ئەو جیاوازییەی کە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵدا هەیە.

بەپێی ئەم تیـۆرە، دەتوانرێت شـارەزایی کـەسایەتی و باری دەروونی مـرۆڤ ببین لە ڕێگەی دیاریکردن و پێوانەکردنی ئەو فاکتەر و سیماتانەی کە کەسایەتیان دیاری کردووە و کاریگەرییان لەسەر کەسایەتی و باری دەروونی مرۆڤ هەیە، ئەویش لە ڕێگەی بەکارهێنانی تاقیکردنەوە و ڕاپرسی و کەسایەتی و زیرەکی پێوەوە، بە مەبەستی زانینی جیاوازییە تاکایەتییەکانی نێوان کەسەکان و دەستنیشانکردنی ئەو فاکتەر و سیماتانەی کە دیار و کاریگەرن لەسەر کەسایەتی. شایانی ئاماژە بۆ کردنە کە سیمات بریتییە لەو سیفات و خاسیەتە (جەستەیی یان عەقڵی یان هەڵچوون یان کۆمەڵایەتییە) وەرگیراو یان بۆماوەییانەی کە تاک خاوەنیەتی و جیای دەکاتەوە لە کەسەکانی تر، کە ئەم سیماتانەش بریتین لە ئامادەباشی و توانایەکی نیمچە نەگۆڕ کە ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکان بەشێوازێکی تایبەتی ئاراستە دەکات.

بەپێی ڕابەر و لایەنگرانی ئەم تیـۆرە، دەتوانین شـارەزای کـەسایەتی و باری دەروونی مـرۆڤ ببین لە ڕێگەی زانینی جۆر و پێکهاتە و سیماتە سەرەکی و زاڵەکانی کە کاریگەریان لەسەر ڕەفتار و بیرکردنەوەی هەیە، بۆ نموونە دەتوانین پێیان بڵێین کە (زیرەکە یان دەبەنگە یان گۆشەگیر و دوورەپەرێزە یان کەسێکی کراوە و کۆمەڵایەتییە یان دەست پاک و بەوەفایە یان دەمارگیرە...تاد).

هەردوو زانا ولیامسۆن و دارلی (Willamson & Darley) شەش هەنگاویان بۆ پرۆسەی ڕێنماییکردن بەپێی ئەم تیۆرە دیاری کرد کە بریتین لە:

١- ڕێنماییکردنی کەسی خاوەن گرفت بە مەبەستی باشترکردنی پرۆسەی خۆگونجاندنی خاوەن گرفت لەگەڵ ژینگە و دەوروبەر و گرفتەکانی.

٢- شیتەڵکردنەوەی زانیارییەکانی تایبەت بەکەسی خاوەن گرفت.

٣- پێکەوە گرێدان و بەستنەوەی ئەو زانیارییانەی کە لەسەر کەسی خاوەن گرفت کۆکراوەتەوە، بەشێوەیەک کە بتوانین خاڵە بەهێز و لاواز و توانا و لێهاتوویەکانی کەسی خاوەن گرفت دیاری بکەین.

٤- دەستنیشانکردنی گرفتەکە.

٥- پێش بینیکردنی ڕێنماییکاری دەروونی دەربارەی چۆنێتی تەشەنەکردن و گۆڕانی گیروگرفتەکە لە داهاتوودا.

٦- بەدواداچوون و دواکەوتنی حاڵەت و گیروگرفتەکە و بەردەوامبوونی یارمەتیدانی کەسی خاوەن گرفت و زانینی دەرئەنجامی پرۆسەی ڕێنماییکردنەکە. (طاهر والجردي، ١٩٨٦، ص٤٧).

## تیۆری خود

تیۆری خودی کارڵ ڕۆجەرز بە گرنگترین و بەناوبانگترین تیۆری ڕێنماییکردنی دەروونی دادەنرێت. هەرچەندە ئەم تیۆرە تایبەتە بە خود و بواری کەسایەتی مرۆڤ بەڵام سوودێکی زۆری لە بواری ڕێنماییکردنی دەروونیدا لێ وەرگیراوە. ئەم تیۆرە زیاتر بە ئەوە ناسراوە کە بە دەوری خودی کەسی خاوەن گرفتدا دەخولێتەوە واتە جۆرێکە لە ڕێنماییکردنی ناڕاستەوخۆ، لەبەر ئەوەی بوارێکی زۆر بۆ کەسی خاوەن گرفت دەڕەخسێندرێت و لەسەر قسە و گوزارشتکردن لە خود و دەربڕینی خەم و خەفەت و ئازارەکانی هان دەدرێن و ئەگەر هەڵچوو و تووڕەش بوو ئەوا ڕێنماییکاری دەروونی بە ئەوپەڕی دڵفراوانی و لێبووردنەوە قبوڵیان دەکات و گوێ بۆ ئازار و گیروگرفتەکانی ڕادەگرێت. ئەمەش مانای ئەوەیە کە زۆر ڕێزی کەسی خاوەن گرفت دەگیرێت و ڕۆڵی ڕێنماییکاری دەروونی ئەوەیە کە کەش و ئاو و هەوای دەروونی گونجاو و لەبار بۆ کەسی خاوەن گرفت بخوڵقێنێ بۆ ئەوەی خودی خۆی بدۆزێتەوە و شارەزای خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ببێت و بتوانێت لە گیروگرفتەکە ڕزگاری بێت و حەز و ئارەزوو و پێداویستییە گرنگەکانی بهێنێتە دی. مەبەستی سەرەکی چارەسەرکار و ڕێنماییکاری دەروونی گەشەپێکردنی چەمکی خودی پۆزەتیڤی واقیعی و نزیک کردنەوەیەتی لە چەمکی خودی نموونەیی سەرەڕای ڕزگارکردنی کەسی خاوەن گرفت لە هەستکردن بە کەمی و بڕوا بەخۆنەبوون، لەبەر ئەوەی پێوەندییەکی بەهێز لەنێوان چەمکی خود و خۆگونجاندنی دەروونی هەیە و دەرکەوتووە کە بەدخۆگونجاندن و خۆنەسازاندن دەرئەنجامی نزم سەیرکردنی خود و هەستکردن بەهەڕەشە دژی خودە، واتە دەبێت تاک پێش ئەوەی کار و پیشەیەک بکات ئەو بڕوایەی لەلا دروست ببێت کە ئەو کار و پیشەی هەڵیدەبژێرێ لەگەڵ خود و تواناکانی ئەو گونجاوە.

بەپێی پرانسیپەکانی ئەم تیۆرە، دەبێت چارەسەرکار و ڕێنماییکاری دەروونی جەخت لەسەر ئێستای کەسی خاوەن گرفت بکات و زۆر خۆی بەڕابردوو و ڕووداوەکانی ژیانی کەسی خاوەن گرفتەوە خەریک نەکات، تەنیا ئەوەندە نەبێت هەتا چەند ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی ڕابردوو و ئێستا کاریگەرییان لەسەر باری دەروونی و بەردەوامبوونی ئەو گرفتەی هەیە، واتە درککردن و تێگەیشتنی کەسی خاوەن گرفت گرنگە واتە چۆن لە ڕووداوەکان دەگات نەک ڕووداوە واقیعییەکە چۆنە. بۆ نموونە ئەگەر باوک و دایکێک زۆر باشیش بن و لەو بڕوایەدا بوون کە هیچ کەمتەرخەمییەکیان بەرانبەر منداڵەکەیان نییە، بەڵام بەپێچەوانەی واقیعەوە ئەگەر منداڵەکە هەست و سۆز و تێگەیشتنێکی خودی و تایبەتی لەلای دروست بوو بوو کە باوک و دایکی خراپن و ڕێزی ناگرن، ئەوا منداڵەکە لەبارێکی دەروونی نائاساییدا دەژی و ئەو تێگەیشتن و لێکدانەوە خودیەی زۆر گرنگتر و کاریگەرترە لە واقیع لەسەر ڕەفتار و بیرکردنەوەی.

لەلایەکی ترەوە ڕۆجەرز لەو بڕوایەدایە کە مرۆڤ هەر لە کاتی لەدایکبوونیەوە پاڵنەر و حەز و ئارەزووی تایبەتی بۆ هێنانەدی خودی خۆی و خۆش گوزەرانی هەیە و کاری ڕێنماییکاری دەروونی ئەوەیە کە بارودۆخی دەروونی گونجاو بۆ گەشەکردن و هێنانەدی ئەو پاڵنەر و حەز و ئارزووە بڕەخسێنێ و کەسی خاوەن گرفت تێگەیەنێ کە تەنیا خۆی بەرپرسیارە لە چاکبوونەوە و ڕزگاربوونی لەو گرفتەی ئەویش لە ڕێگەی تێڕامانێن و تێگەیشتنی گرفتەکەی و هەوڵدان بۆ ڕزگاربوون لێی. ئینجا هەر چ کاتێک ڕێنماییکاری دەروونی توانی بارودۆخی دەروونی گونجاو بۆ کەسی خاوەن گرفت بڕەخسێنێ و ڕێزی گرت و لەترس و هەڕەشەکردن ڕزگاری کرد و زۆر بە ڕاستگۆیانە گوێی بۆ گیروگرفت و ئازارەکانی کەسی خاوەن گرفت شل کرد و لەسەر ڕادەربڕین و گوزارشتکردن هانی دا، ئەوکاتە کەسی خاوەن گرفت بەبێ ترس و هەڕەشە و شەرم و شاردنەوە و نکۆڵی لێکردنی ڕووداوەکانی ژیانی گوزارشت لە ناخ و دڵ و دەروونی خۆی دەکات و ڕووداوە واقیعی و ڕاستەقینەیەکان ناشێوێنێ و بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە گوزارشتیان لێدەکات، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕێنماییکاری دەروونی شارەزای باری دەروونی و پێکهاتەکانی خودی کەسی خاوەن گرفت ببێت و دواتر هەوڵبدات کە کەسی خاوەن گرفت دووبارە بەشێوەیەکی تر خودی خۆی ڕێک بخاتەوە و ئاشنایەتی لەگەڵ خۆی پەیدابکات و وردە وردە لە کێشە و گرفتەکانی ڕزگاری ببێت. (القاضي و آخرون، ١٩٨١، ص٢٤٥).

واتە دەبێت وا لە کەسی خاوەن گرفت بکرێت کە ببێت بە گەورەی خۆی و نەبێت بەنێچیری لێکدانەوە و بۆچوونە هەڵەکانی. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە بوار بۆ کەسی خاوەن گرفت بخوڵقێندرێ بۆ ئەوەی خۆی چارەسەری گرفتەکەی بکات و بەرپرسیاریەتی تەواو بخاتە ئەستۆی خۆی، لەبەر ئەوەی تیۆرەکەی ڕۆجەرز تایبەتە بە ڕێنمایی ناڕاستەوخۆ و ڕۆڵی سەرەکی بۆ کەسی خاوەن گرفتە و ڕۆڵی ڕێنماییکاری دەروونی مام ناوەندییە و ئەرکی سەرەکی ئاراستەکردن و هاوکاریکردنی کەسی خاوەن

گرفتە نەک چارەسەرکردنی راستەوخۆ و دەستنیشانکردنی گرفت و کێشەکانی.

**تیۆری شیتەڵکردنەوەی دەروونی**

زۆرجار تیۆری شیتەڵکردنەوەی دەروونی فرۆید و هاوبیرانی بەسەرچاوە و دایکی تیۆرەکانی تر دادەنرێت و زۆربەی قوتابخانە و رێبازەکانی تر کەم یان زۆر سوودیان لە راوبۆچوونەکانی فرۆید وەرگرتووە. ئەم تیۆرە لەسەر سێ کۆڵەکەی سەرەکی بونیاد نراوە کە بریتین لە:

١- رووداو و بەسەرهاتەکانی پێنج سالی یەکەمی ژیانی منداڵ، لە گرنگترین و سەرەکیترین رووداو و بەسەرهاتن و لە داهاتوودا کاریگەری تەواویان لەسەر چارەنووس و رەفتار و کەسایەتی منداڵ هەیە، ئیتر ئەو رەفتارە ئاسایی بێت یان نائاسایی.

٢- سەرچاوەی سەرەکی دیارکردنی رەفتاری تاک پاڵنەر و حەز و ئارەزووە سێکسییەکانە و بەردەوام پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەوەی پێداویستییە جەستەییەکانی تێر بکات.

٣- زۆربەی زۆری رەفتارەکانی مرۆڤ لەژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی نەستیدا (اللاشعور) و لەلایەن ئەوەوە دیاری دەکرێن.

لەم شێوازی رێنماییکردنەدا پێوەندی نێوان رێنماییکار و کەسی خاوەن گرفت رۆڵی سەرەکی دەبینێ و هیچ گرفت و کێشەیەکی دەروونی لەخۆیەوە سەرهەڵنادات، بەڵکو مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە و رەگ و ریشەی بۆ سەردەمی منداڵی دەگەرێتەوە. فرۆید لەو بڕوایەدایە کە گرفت و نەخۆش و شڵەژانی دەروونی لە ئەنجامی تێکچوونی هاوسەنگی و پێوەندی نێوان (من) و (ئەو) و (منی باڵاوە) دروست دەبێت و تاک لە قۆناغی منداڵی وەک پێویستی فێری دیاردەکانی ژیان نەبووە و بەزۆری پەنای بۆ میکانیزمە بەرگرییە دەروونییەکان بردووە و لە رێگەی کپ و خەفەکردنەوە (کبت) هەموو شارەزایی و رووداوە بە ئازار و ترسناکەکانی قۆناغی منداڵی خەفەکردووە و لەبواری هەستی دووری خستوونەتەوە و لە سەردابی نەستیدا مۆڵیان خواردووە و خۆیان گرمۆڵە کردووە و بەدوای دەرفەتی خۆ دزینەوە و هاتنە بواری هەستیدا دەگەڕێن، کە ئەم حاڵەتەش تاک تووشی دڵەڕاوکێ و ترس و گرژی دەروونی دەکات. واتە بەردەوام مرۆڤ لەحاڵەتی نا رەحەتی و ترس و دڵەڕاوکێدا دەژی و رووبەرووی ململانێی چوونەپێش و پاشەکشێ (إقدام- احجام)دا دەژی، چونکە لەلایەک (ئەو) (الهو) پاڵی پێوەدەنێ و دەیەوێت حەز و ئارەزووە ئاژەڵی و سێکسییەکانی ناوەوەی تێر ببێت و لەلایەکی تریشەوە هێزی (منی باڵا) (الأنا العليا) و دەرەکی سەرکوتی دەکەن و ناهێڵن بەو شێوەی (ئەو) دەیەوێ تێر بکرێن، بێگومان ئەم ململانێ دەروونییەی ناوەوە، مرۆڤ تووشی زۆر گرفت و کێشەی دەروونی وەک دڵەڕاوکێ و وەسواس و شیزوفرینیا و تۆقین و خەمۆکێ دەکەن.

ئامانجی سەرەکی ئەم پرۆسەی چارەسەر و رێنماییە ئەوەیە کە وا لە کەسی نەخۆش بکات، کە بتوانێت ئەو رووداو و کارەسات و پاڵنەرانەی نەستی (اللاشعور) کە کپ و خەفەکراون بهێنێتەوە بواری هەستی (الشعور) و دووبارە رووبەروویان بێتەوە و فرێیان بداتە دەرەوە و رزگاری ببێت لە کاریگەری و مەترسییان.

لەم شێوازەدا رێنماییکاری دەروونی کەش و هەوایەکی ئازاد و سەربەستی دوور لە ترس و تۆقین و هەڕەشە بۆ کەسی خاوەن گرفت دروست دەکات بۆ ئەوەی بەوپەری ئازادی و دوور لە سانسۆر گوزارشت لە ئازار و خەم و خەیاڵ و حەز و ئارەزووەکانی بکات و دواتر رەفتار و بیرکردنەوەی گونجاوتر بۆ خۆی هەڵبژێرێ. کەواتە فرۆید و هاوبیرانی هۆکاری سەرەکی تووشبوون بە نەخۆشی و گرفتی دەروونی بۆ ململانێ و رێکنەکەوتنی کۆمەڵ و داو و دەزگاکانی لەلایەک و حەز و ئارەزووەکانی تاک لەلایەکی تر دەگەرێننەوە نەک بۆ فاکتەری رۆشنبیری و کەلتووری.

ئەوانەی سەرەوە لە گرنگترین تیۆرەکانی رێنمایی و چارەسەرکردنی دەروونین و رێنماییکاری دەروونی دەتوانێت بەپێی پێویست سوودیان لێ وەربگرێت، چونکە هیچ یەکێک لەو تیۆرانە نەیتوانیوە بە تەنیا راڤە و لێکدانەوە و رێگاچارەی گونجاو بۆ هەموو کێشە و گیروگرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان بدۆزێتەوە، بەڵام تارادەیەکی باش هەندێک لایەن و کون و قوژبنی دەروونی مرۆڤی لێکداوەتەوە. ئینجا لەبەرئەوەی هۆکار و سەرچاوەی نەخۆشی و گرفتە دەروونییەکان زۆر و جۆراوجۆرن، بۆیە ناتوانرێت بە تەنیا پشت بە یەکێک لەو تیۆرانەی سەرەوە ببەسترێت، بەڵام رێنماییکاری زیرەک و لێهاتوو دەتوانێت بەپێی پێویست و بەپێی حاڵەت و نەخۆشی و گرفتە دەروونییەکان سوودیان لێ وەربگرێت و ئەو لایەن و شێواز و زانیارییانەی پێویستن بیان دۆزێتەوە و بۆ بەرژەوەندی کەسی نەخۆش و چارەسەرکردنی گرفتەکانی بەکاریان بهێنێ.

# ڕوانینێکی گشتی و مێژوویی بۆ نامۆبوون

محەممەد زەنوون
و/ دیار عەزیز شەریف

دەکرێ بڵێین قورسترین کێشەیەک مرۆڤ دووچاری بێتەوە ئەو پرسانەیە کە ناتوانێت چارەسەرێکی یەکلاکەرەوەیان بۆ دابنێت، بە تایبەتی ئەگەرهاتوو مشت و مڕ لە بارەیەوە لە بازنەی نێوان بیرمەندێک و یەکێکی دیکەدا بێت. نامۆبوون یەکێک لە گرنگترین و زۆرترینی ئەو مەسەلە وروژێنەرانەیە کە جێی مشتومڕکردنە، تەنیا لەبەر تەمومژی ماناکەی نا، بەڵکو بەهۆی ئەو فرە پێناسانەی کە بۆی کراوە، هاوشان لەگەڵ زیاتر فراوانبوون و بەکارهێنانی و زۆری ئەو زانست و ئاراستانەی کە لە بارەی دەستنیشان کردنی سەرەتاکانی نامۆبوون لێکۆڵینەوە و ڕاڤەکردن و جیاوازی دەگرنەخۆ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئەستەمە دەستنیشانی سەرەتاکانی ئەو بیرۆکەیە یان ئەو زاراوەیە بکرێت، ئەوەندە هەیە دەبێ بڵێین ئەو پرۆسەیە بەبێ زەحمەتی نابێت و هەوڵ و کۆششی دەوێ دەرگا بۆ کەسانێک لە بەرامبەریدا والآیە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵمانداوە ڕووناکی بخەینە سەر سەرەتاکانی نامۆبوون و ڕەگ و ڕیشەکانی و بەسەرکردنەوەی هەندێک لە زاناو بیرمەندان، ئەوانەی لەو یەکەمین کەسانە بوون کە ئەو دیاردەیەیان بەدی کرد و بەبایەخەوە لەسەریان نووسی. هاوشانی ئەمەش بەخستنەڕووی کورتەی هزری پسپۆڕەکان لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە پێوەندییەکی نزیک هەردووکیان بە بابەتی لێکۆڵینەوەکە دەبەستێتەوە، ئەم دوو پسپۆڕێتییەش (مرۆڤناسی/ ئەنترۆپۆلۆژیا) و (زانستی پەروەردە)یە، ئەمەش بۆ تەواوکردنی لایەنەکانی بابەتەکە و بەکۆکردنەوەی زۆربەی ئەو تیۆر و ڕاوبۆچوونانەی کەوا چوونەتە بنج و بناوانی بابەتی نامۆبوون و سەرەتاکانی، ئەو بابەتە بۆ خوێنەر ڕووندەبێتەوە. نامۆبوونیش ڕیشەیەکی مێژوویی قووڵی هەیە کە لە ئەفسانە و لاهووتی سەرەتایی و کتێبە ئاینییەکانەوە درێژدەبێەوە بۆ کارە ئەدەبی و هونەرییە هاوچەرخەکان، سەرباری ئەوەی کە لە یاسا و ئابووری و کۆمەڵناسی و زانستی سیاسی و دەروونناسیدا بەکاردێت. بیرۆکەی نامۆبوون لە (گەشتی دروستبوون)ەوە بۆمان دەردەکەوێت، واتە لە چیرۆکی دروستکردنی مرۆڤ و بەروبوومی حەرام و دەرچوونی لە بەهەشت، هەروەها دەتوانین بە وردی ئەم چەمکە لە فەلسەفەدا بەدی بکەین، ئەمەش لەو تێبینیانەی کەوا فەلسەفەکارانی یۆنان تۆماریان کردووە.

دەکرێ لە کارەکانی ئەفلاتون و سوکرات و قەدیس ئۆگستینی لاهووتی دەلالەتە یەکەمینەکان لەسەر چەمکی نامۆبوون بدۆزینەوە، هەروەها لای مارتن لۆثەر کە ئەو زاراوەیەی وا بە کاربردووە گوایە دەلالەتێکە لەسەر

ململانێی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی لەپێناو تێپەڕاندنی شکست و هەرەسەکانی، ئەمەش بە پێوەندداریێتی بە بوونەوەرێکی جیاواز لەناوی خۆی و هەوڵدانیشی بۆ یەکبوون لەگەڵیدا.

بایەخدانی زیاتری لێکۆڵەران بە دیاردەی نامۆبوون دەرەنجامی ئەو گۆڕانە ڕیشەیی و قووڵەیە لەلایەنە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکان کە وەرچەرخانە پیشەسازییەکانی سەدەی نۆزدەیەم هاوڕێیەتی کرد و بووە هۆی توندتربوونی دیاردەی نامۆبوون. بەمەش کێشەگەلێکی زۆر لەبارەی دیاردەی نامۆبوون خرایەڕوو، ئەو کێشە و بارودۆخانەش نوێ نەبوون، هەندێکیان لەسەدەکانی ڕابردووەوە تا سەردەمی نوێ بوونیان هەبوو، بەڵام ئەوکات نەگەیشتبوونە پلەی توندی و ئاشکرابوون و پێگەیشتن، وەک ئەوەی لەسەردەمی نوێدا پێگەیشتن.

بونیادی کۆمەڵگا و کەسایەتی مرۆڤ لە دوا دواییەکانی سەردەمانی ناوەڕاست گۆڕانی بەسەرداهات و یەکپارچەیی کۆمەڵگای سەردەمانی ناوەڕاست مەرکەزیەتەکەی زۆر لاواز بوو، هەروەها بایەخی پارە و سامان و کێبڕکێ و دەسپێشخەری ئابووری تاک برەوی سەند و چینی دەوڵەمەندی نوێ پەرەی سەند، نەزعەی تاکگەراییش لەنێو سەرجەم چینە کۆمەڵایەتییەکان گەشەی کرد و کاریگەریی کردە سەر سەرجەمی بواری چالاکییەکانی مرۆڤایەتی لە هونەر و فەلسەفە و لاهووت و مۆدە و پێوەندی دیاریکراوی تاکەکەس لەگەڵ ئەوی دیکە، سروشتی ڕاستەوخۆ و مرۆڤانەی لەدەست داو ڕۆحی خستنەژێر ڕکێف و گۆڕینی هەموو شتێک بۆ ئامێر دەبێتە ئەو سروشتە، تەنانەت دەبنە بنەما و پێوەر.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا نامۆبوون دەربڕینێکی باو بوو لە بارەی بێنەوایی مرۆڤ لە ئاڵۆزبوونی گەشەسەندنی سەرمایەداری و زاڵبوونی بەرژەوەندییە مۆنۆپۆڵخوازەکانی سەرمایەداری، چارەسەرییەکانی هیگڵ بۆ نامۆبوون هاتە ئاراوە کە لە گرنگترین و ترسناکترین چارەسەرییەکان بوو، هیگڵ مەغزایەکی عیلمانی بەخشییە نامۆبوون لەلایەنی پێوەندداریێتی بە واقیعی گوزەراندنی ژیان، بەو پێیەی لای هیگڵ نامۆبوون واقیعێکی وجودیانەیە لەگەڵ ئەوەی لای هیگڵ نامۆبوون واقیعێکی وجودی ڕیشەدارە لە بوونی مرۆڤ لەم جیهانەدا، شتێکی شیزۆفرینی بەجێماوە لە نێوان تاکێک بەو وەسفەی خودێکی داهێنەری خوڵقێنەرە، گەرەکیەتی دروست ببێت و خودی خۆی دەستەبەر بکات، لەگەڵ ئەو تاکەی بابەتێکی واقیعییە لەژێر کاریگەریی ئەوانی دیکە و خستنەژێر ڕکێفیاندایە. دواتر مارکس ناوەرۆکی عیلمانی ئەم بیرۆکەیەی تەواوکرد، بەشێوەیەک سروشتی مرۆڤ وایە خودی خۆی لە کارەکەیدا بەدەست دێنێت، ئەمەش مەسەلەیەکە ناتوانێ بەدەستی بێنێ بەهۆی سیستەمی ئابوورییەوە کە گەمارۆی داوە. لەپاشاندا کلیلی گشتی ئەو کێشەیە (توێژینەوەی ئێش و ئازارەکانی کرێکارە لەمانەوەی سەرمایەداری). مارکس نامۆبوون بۆ واقیعێکی کۆمەڵایەتی و بونیادی کۆمەڵایەتی قۆناغێک دەگەڕێنێتەوە کە کۆمەڵگا پێیدا تێدەپەڕێت و ناشکرێ لەو واقیعە تێبگەین تەنیا بە تێڕوانین بۆ کۆی بونیاد نەبێت، هەرچی ئاراستەیەکی ترە کە نامۆبوون لەخۆوە دەگرێت لەوە بەرجەستە دەبێت کە بەتیۆری کۆمەڵگای کوتلەیی (Mass society) یان بە کۆمەڵگا دانیشتوانییەکان ناسراوە، واتە (کۆمەڵگا ناتاوێزەکان) بایەخی باو و زاڵێتی لەم کۆمەڵگایانە بۆ پارە و کارکردنە لەپێناو بەدەستهێنانی قازانجێکی بێ سنوور، بەمەش بەهای هزر و ڕۆشنبیری زۆر دادەبەزێت، تاکەکەسیش لایەنە ڕووکەشەکانی شارستانیەت وەردەگرێت، بایەخی سەرەکی خۆی دەداتە کەڵەکەکردنی سەروەت و سامان و موڵکداریێتی و پەیوەستبوونی بە پێویستییە قەبەکان.

هەریەک لە ئەمیل دۆرکهایم و فردیناند تونیز و ماکس ڤێبەر و جۆرج زیمیل ئەو پەرتبوون و بەهەدەرچوونەی کە شۆڕشی پیشەسازی لەسەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەسەر ژیانی کۆمەڵگا دانیشتوانییەکانی داهێنا بۆ هۆکارگەلێکی تایبەت دەگەڕێننەوە، ئەوان پرۆتیستۆی (نائامادەیی داب و نەریتە تەقلیدییەکانی کۆمەڵگە)یان کرد، ئەوەی لەم نائامادەییەش دەکەوێتەوە، نەبوونی هەستی ئینتیمایە بۆ کۆمەڵگا. مرۆڤ بەشێوەیەک گۆشەگیر بوو کە ئیدی نەناسراوە بە تەنیا بوونەوەرێکی ونبووی لێدەرچوو، هەروەها لە ژیانی نوێ وفەزای شار و تێکچڕژاوی دانیشتوانی ناتاوێزە خاوەنی کەسێتی خۆی نەبوو، بەمەش کەسێکی دابڕاو بوو لەو بەها کۆنانەی کە لەسەری گۆشکرا بوو بەبێ ئەوەی بڕوای بە سیستەمی بیرۆکراتی و عەقڵانیەت هەبووبێت کە شوێنی بەها کۆنەکانی گرتبووەوە، تەنگژەی ئەم شارانە لەوێنەیەکی نامۆیی خەمۆکدا خۆی دەنوێنێت کە بارودۆخە کولتووری و ئابووری و کۆمەڵایەتییە دژکارەکانی لەخۆیدا بەرجەستەدەکات ئەوە لێیەوە دۆخێکی دووڕەگی و دابەشبوو بەسەر خۆیدا دروست دەبێت لەنێوان نوێبوونەوە

ڕووکەشییەکان و بەرایی کولتوور و شارستانیەت. ڕەنگە ڕوونترین دەربڕین بۆ وێنەی نامۆبوون لە فەزاو دۆخی ئەو شارانە لەوە دابێت کە دۆرکهایم بە (ونبوونی پێوەرەکان یان ئەنۆمی، یانیش بۆگەنایەتی کۆمەڵایەتی) لە کتێبەکەی خۆی بەناوی (دابەشکردنی کار) دەربڕیوە، مەبەست لێی چەشنگەلێکی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە کە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی و دڵنەوایی بۆ مرۆڤ دەستەبەرناکەن و بەهۆی بوونی فرە پێوەری و دژکاری کاریگەرییەکی نێگەتیڤ دەکەنە سەر تاک، هەروەها لە دروستکردنی پێوەندییە مۆرالییەکان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، تا ئەو شوێنەی ئەو پێوەندییانەی دەبنە سەرچاوەیەک بۆ نائومێدی و مەینەتییەکانی تاکەکەسی و بە سانایی تووشبوونی بە نەخۆشییە دەروونییەکان لە ئەنجامی بێ توانایی بۆ خۆگونجاندنی کۆمەڵایەتی و هەستکردنی بە گۆشەگیری کۆمەڵایەتی، هەموو ئەمانەش بەرەو خۆکوشتن پاڵی پێوە دەنێت.

ئەنۆمیەت وەسفکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتییە لەو تایبەتمەندییانەی کە بەڵگەنەویستن لەسەریەوە: خودپەرستی زیادەڕۆ و شێبوونەوەی بەهاو پێوەندییەکان، دەرەنجامەکەشی ناپێوەری یان بە هەدەرچوونە، یانیش گەیشتنی بە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بۆ قۆناغی هەڵوەشاندنەوە، هەرچی شپنگلەرە لەگەڵ ئەوەی بەلای توێژینەوەی سروشتی جەهەنەمیانەی سەرمایەداری نەچوو کە مرۆڤ بەرەو مەرگی خۆی پەلکێش دەکات لە شوێنە قورس و بارگرانەکان (شارەکان) لەڕێی دابڕانی لەنێوان کولتوور و خاکی دایک،، ئەوە سەرنجێکی بەهێزی لەبارەی نامۆبوونی ڕۆحی مرۆڤایەتی لە چرپی جەستەی کۆمەڵایەتی گەشەکردووی شێرپەنجەیی لەشارە هەلاوساوەکاندا بەدەستەوەدا. شارە سەرمایەدارە مەزنەکان لە لێشاوی کێشە و قەیرانە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا نقوومبوونە کەوا تەنگژە دەروونییەکانی لەخۆیدا بەرجەستەکردووە کە دڵەڕاوکێ و هەستی گۆشەگیری و بەهەدەرچوون و نامۆیی خود و حاڵەتەکانی شڵەژانی دەروونی و نەخۆشییە عەقڵییەکان دەگرێتەوە کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە شار و ناوچە مەدەنییەکان بڵاوبوونەتەوە.

ناونانی دیاردەی نامۆبوون هەمەجۆر بوو لە پێناو گونجاندنی لەگەڵ باری کۆمەڵگا جیاوازەکان و پسپۆڕێتییە زانستی و کۆمەڵایەتی و دەروونییە جیاوازەکان، بەمەش هەریەکە لە ماکس ڤێبەر و سمیل ئەو مانا و ناوەڕۆکەیان بۆ نامۆبوون بەرەو پێش برد. ڤێبەر بەشێوەیەکی تایبەت جەخت لەسەر چوونەناوەیەکییەکی گەوهەریی توند بە ئاراستەی عەقڵانیەت و تەکنیکیی لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دەکاتەوە کە تێیدا پێوەندییە کەسییەکان کز دەبن و لە شوێنیدا بیرۆکراتیەتی ناکەسیی (مەبەست لێی پێوەندداریێتی بە دامەزراوەکان یان کارگەکان) جێگەی دەگرێتەوە، هەروەها سمیل جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە هۆکاری نامۆبوون تێکچوون و شڵەژانی ژیانی کۆمەڵایەتییە، واتە لەلایەک لەنێوان خود و کامە کەسێتیخوازییە، لەلایەکی تر لەنێوان (بەشتکردن) و ناکەسێتی.

هەرچی (توینبی)یە لە ڕاڤەکردنەکەی بۆ دیاردەی نامۆبوون وای دەبینێت کە هەندێک شوێن کەوا شارستانییەت تێیدا سەریهەڵدا، ئەوە شوێنێکی گونجاو و شیاو نەبوو یان خاوەن مەرجگەلێکی هاندەربێت، بەڵکو شوێنگەلێکی دژوار بوون یان لێوان لێو بوو لە سیماگەلی دژوار، بەهۆی ئەمە و هاندەری نامۆیی مرۆڤ لە سروشتی دژوار ئەوە لە سایەی کردەی شارستانی بە ئاراستەی ڕووبەڕووبوونەوەی دژوارییەکان و زاڵبوون بەسەر سروشت پاڵی پێوەنا. بەمەش توینبی نامۆبوونی لە سروشت وا ڕاڤەکردووە کە یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرهەڵدان و دروستبوونی شار، ئەمەشی لە تیۆرێکی بەناوبانگی خۆی بەناوی (مەیدانخوازی و بەرسڤدانەوە) دەربڕیوە. هەر لە بارەی ئەو بابەتەوە ڕەوتێکی تریش گەلاڵە بوو کە شوێنکەوتووانی لە نووسینەکانیاندا ناوەڕۆکی بوونگەراییان بۆ نامۆبوون گەڕاندەوە کەوا هیگڵ جەختی لەسەر دەکاتەوە، بەمەش (سۆرین کیرکیگارد) بە گەڕانەوە بۆ سەر ئەزموونی کەسیی خۆی لە بەرامبەر ئەوەی چ شتێک بابەتگەرییە ئەوەی ڕوونکردەوە کە هەستکردن بە خود لە جیهانێک کە ملکەچی پووچگەرایی و بێ نامانجی و بوونی دڵەڕاوکێ بێت، ئەوە گەوهەری نامۆبوونە. ئەمەش مەسەلەیەک بوو لای مارتن هایدگەر و جان پۆل سارتر و کەسانی دیکە، فەیلەسووفانی بوونگەرایی، ئەوانەی ناوەڕۆکی ئاینییان وەک چارەسەرێک بە دوورزانی. بوونگەراییەکان وا دەڕوانن نە ڕەهاگەری هیگڵی و نە دیکتاتۆریەتی چینی کرێکار نەیانتوانی ئازادی فەراهەم بکەن کە مرۆڤ هەوڵی بۆ دەدات، کە ئەو دوو ڕووگەیە وایاندەڕوانی نامۆبوون نموونەیەکە لە نموونەکانی بوونێکی ساختەی نارەسەن و نامەشروع کە مرۆڤ تێیدا شکست دێنێ و ئازادی خۆی و مانای مرۆڤانەی خۆی و گەوهەری

بوونی لەدەست دەدات. بە پێچەوانەی ئەمەوە ئازادی لای بوونگەراکان بەنامۆبوونەوە گرێدراوە، گرێدانێکی وا توند کە نایەتە ئاراو ناوەڕۆکە ڕاستەقینەکەشی ئاشکرا نابێت تەنیا لە سایەی کردەی زاڵبوونی نامۆبوون نەبێت.

نامۆبوون لەنێو فەلسەفەی بوونگەراکان زەوییەکی بە پیتی دەوڵەمەندە کە لەسەریدا قەڵەمی بوونگەراییەکان پێ دەگات، نامۆبوون پێ لەسەر ئازادی مرۆڤ دادەگرێت، بەڵام ئەم ئازادییە خودی خۆی تێدەپەڕێنێت و دەبێتە ئازادییەکی بێ ئازادی، خودیش وەک پێوەرێک بۆ هەموو شتێک دەمێنێتەوە. نامۆبوون لەگەڵ کیرکیگاردەوە گەشەی کرد، مرۆڤ لە خودی خۆی و دەوروبەرەکەی نامۆ بوو، ئانومێیدیش سیفەتێکی ناوبوونی ئەو مرۆڤەیە، کیرکیگارد وای دەبینێت کە تێپەڕاندنی نامۆبوون لە ڕێگەی ئایینەوە تەواو دەبێت. پاشان ئەو فەلسەفەیە پێشڤەچوو و دوو لایەنی لێبووەوە: لایەنێک کە (فەلسەفەی بوونگەرایی ئاییندار) نوێنەرایەتی دەکرد و لایەنێکی تریش کە (فەلسەفەی بوونگەرایی بێ ئایینەکان) بوون، سەبارەت بە لایەنی یەکەم (بریدیائیف)مان لەبەردەستدایە کە وای بۆ دەچێت (ئازادی ڕەها) بنەمای کەسایەتی ڕاستەقینەی مرۆڤە و کێشەکانیشی بوونگەرایی بە مەسیحیەت چارەسەری دەکات. هەروەها گابریل مارسیل و کارل یاسبرز و مارتن پوپر هەموویان لە خاڵێکدا بەیەک دەگەن ئەویش ئەوەیە مرۆڤ تەنیا لە ڕێگەی تەسلیمبوونی بە ئایینی مەسیحی لەنامۆبوون دەرباز دەبێت. هەرچی لایەنی دووەمە کە هایدگەر نوێنەرایەتی دەکرد مرۆڤی لەبەرامبەر مردن دانا، بەو مانایەی کە هەموو چرکەیەک ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ مەرگدا هەیە، لەبەرئەوە (بەدەست نامۆبوونەوە دەناڵێنێت)، هەروەها کامو کە پێیوایە ژیانی مرۆڤ بێدەربەستە، سارتریش کە خودی مرۆڤ بە ڕۆحی «بنەچەی» بوون دادەنێت، سیمۆن دی بۆڤوار کە لە (شکست)دا ناونیشانێکی فراوان دەبینێت بۆ جوانکردنی ڕوخساری مرۆڤ، ئەمەش دوا نوێنەری ئەو قوتابخانەیە بوو.

بە کورتی بوونگەرایی پشت بە نائەقڵانیەت دەبەستێ کە لەگەڵ دەسپێکی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ئەڵمانیا سەریهەڵدا، لەگەڵ قەیرانی بورژوازیەت و دژکارییە توندەکانی، پاشان لە ڕێی (جان)ەوە لە فەرەنسا بڵاوبووەوە، دواتریش لە هەموو دەوڵەتە بورژوازییەکان. نامۆبوون بەشێوەیەکی هاوارئامێز لە کتێبی نوێنەری (بوونگەرایی نوێ) کۆلن ولسنی ئینگلیزی دەردەکەوێت کە ئەو سیفەتە لە دەروونی زۆربەی ئەو نووسەر و هزرڤان و هونەرمەندانە دایە کە لە سەریانی نووسیوە، ئەمەش لە کتێبی یەکەمیدا (نامونتەمی) دەردەکەوێت، هەروەها لە کتێبی (دوای نامونتەمی) و (هەرەسی شارستانیەت) کە لە سایەی بە دواداچوونی بەرهەمی زۆربەی نووسەر و هونەرمەندانی نموونەی ویلز، هنری باربۆس، کامو، سارتر، نجنسکی، ڤان کوخ، دیستۆڤسکی، باری نامۆیی کە تێیدا ژیاون و لە دەرەوەی کۆمەڵگادا بوونە، بۆمانی ڕووندەکاتەوە، بەڵام بەدواداچوونی ولسن بۆ ئەو کەسانە پەیوەستە بە تێڕوانینی خودێتی بۆ مەسەلەکان، ئەویش لە نوێنەرانی ئەوەی تووڕەیە کە بەهۆی زۆری دژکاری و تێکچوونی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە سەردەمانی جەنگی دووەمی جیهانی لە بەریتانیا دەرکەوت.

لێکۆڵینەوە لە بابەتی نامۆبوون تەنیا لە فەلسەفە و ئایین یان سۆسیۆلۆژیادا کورت نەکرایەوە، بەڵکو بابەت و پسپۆڕێتی تریشی گرتەوە نموونەی پەروەردە و ئەنترۆپۆلۆژیا، توێژینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکان چەمکی نامۆبوون لە گۆشەی دیاردەکانی پێوەندیدار بە سیستمی کۆمەڵایەتی گشتی لەخۆدەگرن کە بە پلەیەکی زۆریش لە لێکۆڵینەوەیدا بەلای گۆشەنیگای بنەماگەریی تەفسیلیی دادەچێت. ئەنترۆپۆلۆژستان توێژینەوەی گرنگیان پێشکەش کردووە کە گەڕانە بەدوای هۆکارگەلێکی پەیوەست بە پوچەڵەکردنەوەی کاریگەری نامۆبوون لەگۆشەی سیستمی خزمایەتی و سرووت و ئایین و پەروەردەکردنی منداڵ و جێبەجێی پاڵپشتیکردن یان هاریکاری کۆمەڵایەتی، هەروەها کاریگەریی زمانی هاوبەش بەسەر پتەوکردنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و گرنگی شوناسی شارستانی وەک هێزێکی کۆمەڵگەرایی کە پاڵپشتی بەهای خودێتی تاکەکان دەکات و پەیوەستگیرییە کۆمەڵایەتییەکانیان بەهێز دەکات، هەروەک لێکۆڵینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکان ڕاوبۆچوونی قووڵیان لە بارەی جۆری پێوەندییە مرۆییەکان لێکەوتەوە کە بە پێگەیشتنێکی زانستی وەسفدەکرێت بە پاڵپشتیکردنی لەسەر ڕاڤەکردنی بنەماگەریی بەراوردکارییانە، لە هەندێ توێژینەوەی بەناوبانگ ئەو ڕووگەیە بەدی دەکرێت وەک ئەوەی ریدفیلد لە بارەی هەردوو چەشنی فۆلکلۆری و شارستانی ئەنجامیدا، یان توێژینەوەی زانا تونیز بۆ گرووپی لۆکالی و کۆمەڵگای مەزن، یان ئەوەی کە هنری مین لێیکۆڵیوەتەوە کۆمەڵگایەک لەسەر بنەمای پێگەو کۆمەڵگایەکیش بگەڕێتەوە سەر (پەیمانبەستن)، لەگەڵ توێژینەوەی ویرس

بۆ پێوەندییە سەرەکی و لاوەکییەکان.

وێڕای ئەوەی ئەو توێژینەوانە ناوەرۆکی جیاوازییان بۆ نامۆبوون و ڕێگەچارەی لەخۆگرتووە، ئەوا لێکۆڵینەوە ئەنترۆپۆلۆژی و ئەتنۆگرافییەکانی تایبەت بە هەردوو چەشنی کۆمەڵگەی بەرایی و مەدەنی بایەخێکی زۆریان هەیە بۆ پەنجەخستنەسەر ئەو گۆڕان و وەرچەرخانانەی کە لە بواری (ڕۆڵ)ەکان لە کۆمەڵگا ئاڵۆز و پێشکەوتووەکان ڕوودەدات کە هەڵگری هەڕەشەیەکە بۆ سەر شوناسی کەسێتی و تەسکبوونەوەی ماناکەی و گەشەکردنی ڕووکەشیانەی و کەمبوونەوەی دەرفەتی باڵابوون و زیادبوونی هۆکارەکانی گۆشەگیری و لادان و نەخۆشییە دەمارگیری و زەینییەکان. هاوکات ئەو توێژینەوانە بزاوتی ڕۆحی و سرووتی قووڵیان ئاشکرا کرد کە وێنەی یاخیبوونێکی ئاشتیانەی کولتووری ئامانجدار وەردەگرێت بۆ دەربازبوون لەژێر دەسەڵاتی بەهاگەری و تەکنۆلۆژی بێگانە، هەروەک لەو بزاوتە ئەهلیانەی کە لەمیلانیزیا و ئەمەریکای باکوور بڵاوبووەتەوە.

بواری توێژینەوەی بابەتی نامۆبوون درێژبووەوە بۆ کۆمەڵگا نەریتگەرا و نووستووەکان و ئەو کۆمەڵگایانەی کە تائێستاش لە هەندێک نووسیندا ناوی کۆمەڵگا (بەراییەکان) یان بەسەردادەبرێت کە لەئێستادا ملکەچن بۆ زۆر فاکتەری گۆڕانکاری و وەرچەرخانی خێرا، ئەمەش دەبێتە هۆی درزبردنی ستراکتۆری کۆمەڵایەتی و کولتووری تەقلیدی و تێکشکاندنی ئەو پێوەر و بەهایانەی کەوا بەسەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتی کەسەکاندا زاڵبوونە. ڕاستە زاراوەی نامۆبوون تا ئەم دواییەش لە نووسینە ئەنترۆپۆلۆژییەکان دەرنەکەوتبوو، بەڵام هەمان چەمک لە زۆربەی زاراوە ئەنترۆپۆلۆژییەکاندا دەبینرێت، بۆ نموونە (دابڕان لە هۆز) یان (تێکشکاندنی ئینتیمای هۆزگەری) و زۆر لەنووسینە ئەنترۆپۆلۆژییەکان کە چارەسەری کێشەکانی گۆڕانی بنەماییان لە کۆمەڵگا ئەفریقییەکان خستۆتەڕوو، ئەوە بەڕاستی لەهەموو ڕەهەندەکانی ناگەین تەنیا لە چوارچێوەی چەمکی نامۆبوون نەبێت. یەکێکیش لەو زانستانەی دەستی بردبێت بۆ بابەتی نامۆبوون (پەروەردەی هاوچەرخە) پرۆسەی پەروەردەی قوتابخانەیی تێیدا پرۆسەی دەرکردنی ڕێوڕەسم و شێوازە بەکارهاتووەکانی پەروەردە و فێرکردنە کە سروشتێکی دامەزراوەیی هەیە نەک خێزانیی، لە وێدا قوتابی تووشی دابڕان دێت لە خێزانەکەی و چالاکییە خۆشگوزەرانییەکان و نارەسمییەکان کە لە گەرەک و لەگەڵ هاوڕێکانیدا لەسەری ڕاهاتووە، ئەو لە قوتابخانە داوای ئەوەی لێ دەکرێت دەسبەرداری تێڕوانینی خودییانەی لایەنگیر بۆ خۆی ببێت کە بەهۆی گۆشکردنێکی تایبەت تێیدا سەریهەڵداوە، ئەویش گرنگی پێدانیەتی لەلایەن خێزان و ناسیاوەکانی، کەچی دۆخی فێرکاری نوێ قوتابی ملکەچ دەکات بۆ دیاردەکانی کێبڕکێ و تەکنیکی و ڕەسمی و، ناکەسیی کە لەهۆڵ یان پۆلەکانی خوێندن ڕوودەدات. وانە ئەکادیمییەکان کە بەمیتۆدە تایبەتییەکانی دەسەپێنرێن، دوورکەوتنەوەیەک لای قوتابیان دروست دەکات، قوتابخانە لە ڕێی پلاندانانی ڕۆشنبیری و پێداویستییەکانی کە دامەزراوە کۆمەڵایەتییە ئاراستەکراوەکانی وەک دەوڵەت دایدەنێن، میتۆدی ئەکادیمی قورسی بەلایەنە زۆرەکانی لە زانیاری چەقبەستوو و دوور لە پێداویستییە هزری و کۆمەڵایەتییەکانی قوتابی دەسەپێنێت، ئەم کەلێنەی کەوا نێوانی ئەوەی لەسەر قوتابیان دەسەپێنرێت لەگەڵ ئەوەی کە خۆیان حەزدەکەن بیخوێنن لە یەکتری جیادەکاتەوە، قوتابخانە دەکات بە دامەزراوێکی کۆمەڵایەتی وا کە کارەکەی خۆی بەشێوەیەکی میکانیکی بەڕێوەببات.

سەبارەت بەماموستا و بەخێوکەرانیش بە لەبەرچاوگرتنی فرەیی فەرمانگە و دامەزراوەکان کە ئەو کەسانە پێیانەوە پێوەندیدارن و جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیریی کە تێیدا خزمەتی خۆیان پێشکەش دەکەن، ئەوە دووچاری ئەزموونی نامۆبوون دەبنەوە، ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکاندا سەرهەڵدەدات بە پشت ئەستووربوونی پەروەردە لەسەر دامەزراوە ئەهلییەکان، ئەو شتەی واقیعی نامۆبوونی ماموستایان زیاتر دەکات هەستکردنیانە بەجیابوونەوەیەکی ڕێژەیی لە سامانی کۆمەڵایەتی کە هەندێک پسپۆڕێتی دیکە چێژی لێوەردەگرن، نموونەی پزیشکی و ئەندازیاری، لەپاڵ هەموو ئەمانەش نامۆبوونی ماموستایان لەوەوە دێت کە پیلان و شێوازە پەروەردەییە بابەتییەکان لە قوتابخانەکانیان ناچنە ژێر باری کۆشش و ڕاوبۆچوونە کەسییەکانی خۆیان، بگرە بەرنامەیەکی ڕەسمی سەربەخۆ و جیان لە نەزعە و ئارەزووە تاکییەکان، هۆیەکی تری نامۆبوونی ماموستایان لەو ڕەخنەیەدایە کە ئاراستەیان دەکرێت بەهۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی لادان و نەشیاوی کۆمەڵایەتی لەنێوان قوتابیاندا، هەروەها دابەزینی ئاستی زانستی و هزری کە هەندێک کەس بۆ کەمتەرخەمی ماموستا و

بەخێوکەرانی دەگەڕێننەوە.
ڕۆسۆ دەڵێت: مەرجی یەکەم و ڕەها کە پێویستە پەروەردەی تەندروست لەسەری بوەستێت ئەوەیە کە نابێت یاساکانی بازاڕیی، واتە یاساکانی کڕین و فرۆشتنی لەسەر پەیڕەوبکرێت. لە ڕوانینی ڕۆسۆدا پێگەیەنەری باش مرۆڤێک نییە بۆ فرۆشتن، نابێت لە پشت پەیامە پەروەردەییەکەی چاوەڕێی دەسکەوتی ماددی بکات، یانیش قازانجخواز بێت. چۆن ئەم مەسەلەیە لەسەردەمی هاوچەرخدا مەیسەر دەبێت، سەردەمی حیساباتی ماددی، چونکە پێوەندییە مرۆڤایەتییەکان لەسەر ئاستی تاکەکان یان دەوڵەت بێت ئەوە ملکەچی تاکە پێوەرێک بووە، ئەویش پێوەری سوودمەندی یان بەرژەوەندیخوازی کە بەشێوەیەک مەترسییە بۆ سەر چەقبەستن و نابووتبوون.
لە کۆتاییدا بێگومان دەبێت خاڵێکی گرنگ پێوەست بەنهێنی بوونی مرۆڤایەتی ڕوون بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ هەرچەندی زانیاری وەربگرێت و گەشە بکات و بەهێزبێت، ئەوە شتێک لە ئارادا دەبێت کە نیگەرانی بکات کە لەناو پێکهاتی بوونیدایە، ئەو شتەش هەتا هەتایە دەمینێت (ئەو پرسیارەی لە بارەی ماناکەی بەو وەسفەی مرۆڤێکی بەهێزی سنووردارە، لە زانیاری و مەعریفەکەیدا ڕێژەییە، تەمەنێکی کورتی هەیە؟). ئەم خاڵەیە کە لێیەوە ئەوەی لێ دەردەکەوێت و لە دایک دەبێت کە ئێمە پێی دەڵێین نامۆبوون، مرۆڤ کەم و زۆر لە نامۆبووندا دەژیت بەتایبەتی لە کۆمەڵگای هاوچەرخماندا، مادامەکی تەمەنی نامۆبوون تەمەنی مرۆڤە، ئەوە ناکرێت هەموو لایەنەکانی وەربگرێت یان لە هەموو بوارەکانی مەعریفە لە سیاسەت و هونەر و ئەدەب و کولتوورە جیاوازەکان، ئەو بابەتەی کتێبی گەورەی لە باردوە دانراوە، بەشێوەیەکی دەگمەن کتێبی گرنگ دەخوێنینەوە کە لەناوەڕۆکەکەیدا ڕیشەیەک لە ڕیشەکانی نامۆبوونی لێ نەدۆزینەوە، بەڵکو نامۆبوون بەشێوەیەک لە شێوەکان لەناویدا دەبێت کە باسمان لێوەکرد. نامۆبوون ئاڵۆزترینی ئەو کێشە و پرسانەیە کەوا ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە، دەبینین هەموو کەسێک بەپێی ڕوانینی خۆی بۆ ژیان بە لایەنە جیاوازەکانی هەڵوێستێکی دیاریکراوی لەبارەیەوە هەیە.

**سەرچاوە:** مجلة ألواح، عدد (١٨).

# سەردەمی ڕۆشنگەری و ڕۆمانتیکی

برتراند ڕسل
و: ڕەحیم سابیر
(سلێمانی)

(٣ - ٣)

فەرهەنگ بۆ کەسایەتییەکان

**١- دیفید هیوم (١٧١١-١٧٧٦)**

لە ئۆسکتلندە لە دایک بووە، لە هیچ پلەیەکی ئەکادیمیدا کاری نەکردووە و زۆر حەزی لە ناوبانگ بووە، لەوکاتەی کە سکرتێری باڵوێزخانەی بەریتانی بووە لە پاریس (١٧٦٣-١٧٦٩) ناوبانگی دەرکردووە، دانی بەبێ ئیمانی خۆی دانا و هەمیشە بە گومان بووە بۆ هەموو دینێک، دوایی ناوبانگی بە زەندیق دەرچوو، دوایی بە فەیلەسوف ناوی دەرکردووە، یەکەم دانراوی فەلسەفی بە ناوی (نامەیەک لە بارەی سروشتی مرۆڤایەتی)یەوەی لە ساڵی (١٧٣٧) دەرکرد کە دە ساڵ پێوەی خەریک بوو، ستێرکی (نامەکە)ی ئەوەبوو کە عەیبی فەلسەفەکانی پێشوو چارەسەر بکات، بنەڕەتی بۆ زانینی ئەزموونی تەواو بۆ سروشتی مرۆڤایەتی دانا، هیوم دەڵێ: ئاوەز تەنیا لە ئیدراکە حسییەکاندا پێک دێن، ئیدراکە حسییەکانیش دوو جۆرن: مۆرکەکان و بیروباوەڕەکان، مۆرکەکانیش هەموویان بەسەر یەکەوە ناو نا هەست و شعوور و هەڵچوونەکان، بیروباوەڕەکانیش ئەوانەن کە پێیان دەوترێ ئەوانەی بە ئاوەزدا دێن، یەکەمیان بەهێزە و ژیانی تێدایە و دووەمیان هیچ لەوەی پێشوو ناگەیەنێ، هیوم زۆرجار ناوی لێناوە (وێنە زەینییەکان).

**٢- تۆماس هۆبز (١٥٨٨-١٦٧٩)**

فەیلەسوفێکی ئینگلیزی بەناوبانگە، بیروباوەڕی کاردانەوەی ئەو ناپشێوییە سیاسییەی سەردەمەکەی بووە لە بارەی مرۆڤەوە کە دوور بوو لە میتۆدی کۆمەڵایەتییەوە کە ڕاڤەی پێوەندی مرۆڤ بە مرۆڤی برایەوە هەیبوو، ئەو وای دەبینی کە ژیانی مرۆڤ سیماکانی گۆشەگیری و هەژاری پێوەبوو، هەروەها خۆویستی و هەمەجیەتیشی پێوەبوو، لەبەر ئەوە ژیانی مرۆڤ کورت بووە ئەویش بە هۆی ئەو شەڕ و شۆڕ و ململانێیە کە لەنێوان خۆی و کەسانی هاوولاتی ولاتەکەیدا هەبووە، هۆبز دروستکردنی دەوڵەتێکی بە پێویست دەزانی بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتانە نەهێڵێ و خەڵک بۆ یاسا و بنەماکانی دەوڵەت ملکەچ بن لەبەر ئەوەی دەوڵەت لە دایکبوونی ئاوەزی مرۆیی و پەیمانی کۆمەڵایەتی نێوانیانە.

**٣- جۆن لۆک (١٦٣٢-١٧٠٤)**

فەیلەسوفێکی بوونگەرایی ئینگلیزیە، یەکەم کەس بووە ڕەخنەی لە (بنەڕەت و سنووری ئەپستمۆلۆژی مرۆیی) گرتووە، جۆن لۆک پێی وایە پەیمانی هاوبەش، بنەڕەتی سەرەکی بوونی دەوڵەت کە خۆی بنەڕەتی بوونی کۆمەڵگا خۆیەتی، کە ئەو پەیمانە هاوبەشە ماف بە گەل دەدات دارشتنی پەیمانی کۆمەڵایەتییان بگۆڕن بەپێی گونجان لەگەڵ ئەو بارودۆخە ئاڵوگۆڕەی کە کۆمەڵگا پێیدا

تێدەپەڕێ.

**٤- دنیس دیدرۆ (١٧١٣-١٧٨٤)**

لە فەرەنسا لەدایک بووە، یەکێک بووە لە دانەران و سەرنووسەری (الموسوعة) لە ساڵی (١٧٤٧) تا (١٧٦٥) هەڤدە بەرگی لە (الموسوعة) بڵاوکردۆتەوە، خۆیشی چەندان بابەتی فەلسەفی و دینی و تیۆری سیاسی و ئەدەبی نووسیوە، فەلسەفەکەشی لەم کتێبانەیدا بڵاوکردۆتەوە (بیروباوەڕەکانی فەلسەفە-١٧٤٦)، (گوتارێک لە بارەی کوێرەکانەوە-١٧٤٩) (هاتوچۆی گومانکراوێک) و (بیروباوەڕەکان لە ڕاڤەکردنی سروشتدا-١٧٥٤) (گوتار لە بارەی کەروڵاڵەکانەوە ١٧٥٩)، (گفتوگۆیەکی فەیلەسووف لەگەڵ دۆقە س. خانمدا- ١٧٧٦)، دیدرۆ ئەزموونگەری بوو، هەموو ڕێبازە میتافیزیکییەکانی ڕەت دەکردەوە، سروشتی مەسیحییانەی ڕەت دەکردەوە، لەبەرئەوەی هەژموونی هەبوو بەسەر ئاوەزدا، یەکێک بوو لە بلیمەتانی ڕۆشنگەری (چینی بیرمەندان) بە گەورەترین بیرمەندی ماددی فەرەنسی سەدەی هەژدەیەم دەژمێردرێ سەرەڕای بیری فەلسەفییانەی، ڕۆماننووس و شانۆنووس و ڕەخنەگری هونەری بووە.

**٥- جۆرج فلهلم فردریک هیگڵ (١٧٧٠-١٨٣١)**

فەیلەسووفێکی ئایدیالیستی ئەڵمانیە، یەکێکە لە کاریگەرترینی فەیلەسووفەکانی سەدەی نۆزدەیەم، کۆی هەموو نووسینەکانی دەگاتە بیست کتێب لە جوانترین چاپکردنیدا گەیشتە سی بەرگ، بەڵام هیگڵ خۆی تەنیا چوار کتێبی چاپ کردووە (زانستی دیاردەکانی ڕۆح-١٨٠٧) و (لۆژیک- ١٨١٢-١٨١٦) و (فەرهەنگی زانستە فەلسەفییەکان-١٨١٧) و (فەلسەفەی یاسا-١٨٢١) دوای مردنی خۆی وانە بێژییەکانی بڵاوکرایەوە لەمانە (فەلسەفەی مێژوو، فەلسەفەی هونەر، فەلسەفەی دین، مێژووی فەلسەفە). کە هەموویان وەرگێردرانە سەر زمانی ئینگلیزی.

**٦- ڤۆلتێر (١٦٩٤-١٧٧٦)**

یەکێکە لە نووسەرە مەزنەکانی سەدەی هەژدەیەمی فەرەنسا، دوژمنی سەرسەختی ستەمکاری بووە، نووسینەکانی تارادەیەکی زۆر بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە ڕەخنەئامێز بوون، زۆرجار بۆچوونە لیبراڵ و کراوەکانی کێشەیان بۆ دروست کردووە، دیارترین نووسینەکانی بریتییە لە مشت و مڕە فەلسەفییەکان و کاندید، هەروەها ژمارەیەکی زۆریش شانۆنامەی نووسیوە..

**٧- ڤیکتۆر کوزان (١٧٩٢-١٨٦٧)**

فەیلەسووف و ڕووناکبیرێکی فەرەنسییە بە دامەزرێنەری فەلسەفەی مۆدێرنی هەڵبژاردەی، ئینتیقائییەت دەژمێردرێت.

**٨- ولیەم ئۆکامی (١٢٨٥؟- ١٣٤٩؟)**

وەکو دکتۆرێکی دڵڕەق ناسراوە ماناکەی بە لاتینی ئەو دکتۆرەی نابەزێنرێت، فەیلەسووفێکی ئینگلیزیە پیاوی ئاینیش بووە، یەکێک بووە لە لایەنگرە سەرسەختەکانی پێڕەوی تاوبزم، چەقۆکەی ئۆکام، یان گوێزانەکەی ئۆکام لەو بۆچوونەوە هاتووە کە دەڵێت بوون بەبێ پێویستی، چەنجارە نابێتەوە.

**٩- مارتن هایدگەر (١٨٨٩-١٩٧٨)**

یەکێکە لە مەزنترینی فەیلەسووفەکانی سەدەی بیستەم، هایدگەر بیریاری بوونە، گەورەترین پرسیار لە فەلسەفەکەی ئەودا بریتییە لە پرسیاری: بوون چییە؟ وەلێ لە دوایین هەوڵیدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەنتۆلۆژییە دەگاتە ئەوەی کە نیگەرانی، بریتییە لە ماهیەتی بوون! ئەمەش دۆڕاندنی ململانێکەیە لە بەرژەوەندی هەبوودا نەک لەبەرژەوەندی بووندا، نوێنەری سەرەکی بوونگەراییە، سەرەڕای ئەوەش ئەو ناونانەی ڕەت دەکردەوە.

**١٠- هیراکلیتۆس- هراقلیطس/ (٤٧٥؟- ٥٤٠؟)**

فەیلەسووفێکی یۆنانیە بڕوای وابووە بنەچەی ماددە و بوونی گەردوون بریتییە لە گۆڕانێکی بەردەوام، بە تەنیا ژیاوە و گەشبین نەبووە، بۆیە هەندێک جار پێی دەوترێت فەیلەسووفە تاریکەکە، یاخود فەیلەسووفە گریۆکەکە هیراکلیتۆس لە کۆمەڵا، کشایەوە و بە گشتی هێرشی دەکردەسەر خەڵکی شار بۆ ئەو گەمژەییەی هەیانە، تیۆری ئەپستمۆلۆژی بۆ یەکەم جار نمایش کردووە بەشێوەیەکی لێڵ، پارمیندس جارێک بیرۆکەکەی دروست کردەوە بۆ ئەنجامی کاریگەریەکەی کە هەیەتی تا سەرهەڵدانی ڕواقیەکان، بنەڕەتی فەلسەفەکەی (بە بەردەوامی گۆڕانە لەشتەکاندا) وەک (تۆ دووجار ناچیتە نێو ڕووبارێکەوە لەبەر ئەوەی ئاوی تازە لە دەوروبەریدا هەمیشە دێن و دەچن).

**١١- پارمیندس (٥١٥-.....؟!)**

فەیلەسووفێکی یۆنانیە لە دەوروبەری (٥١٥)ی پێش زایندا لە دایک بووە لە ئەندامێکی مەزنی قوتابخانەی ئەیلی بوو، دەڵێن لە تەمەنی (٦٥) ساڵیدا سەری لە ئەسینادا وە و سوکراتی بینیوە، پارمیندس یاسای ئیلیبیا- ئیتالیای دارشتووە، ئەفلاتوون بە باشی باسی کردووە و ڕێزی لێگرتووە و یەکێک لە دەمەتەقێکانی بە ناوی ئەوەوە ناو ناوە، پارمیندس فەلسەفەکەی خۆی بە شیعر نووسیوە، تەنیا چەند بەشێک لەو شیعرەی

لەبەردەستدا هەیە کە لە بارەی سروشت نووسیویەتی لەویدا باسی بوونی ڕەها دەکات و پێی وایە نەبوون شتێکە ئەندێشەی ناکرێت.

(زیلر) لەسەر زاری (ثاو فراسطس) دەڵێ (پار میندس یەکەم کەس بووە قسەی لەسەر شێوەی خڕی زەوی کردووە) هەروەها دەڵێ (وای دەبینی کە بارستایی مانگ یەکسانە لەگەڵ بارستایی خۆر و ڕووناکیش لەوەوە وەردەگرێ).

**١٢- سوکرات (٤٧٠-٣٩٩پ.ز)**

یەکەمینی ئەو سێینە فەلسەفییە گرنگەیە کە بنەماکانی فەلسەفەی خۆرئاواییان داڕشتووە، سوکرات و قوتابییەکەی (ئەفلاتوون) و قوتابی قوتابییەکەی (ئەرستۆ)، سوکرات فەلسەفەی بەرەو لێکۆڵینەوە لە ژیان و چالاکییەکانی مرۆڤ برد، هەربۆیە سیسرۆن لە بارەیەوە دەڵێت سوکرات فەلسەفەی لە ئاسمانەکانەوە داگرت بۆ سەر زەوی، دواجار بە تاوانی بێباوەڕی و تێکدانی ڕەوشتی لاوانی ئەسینا حوکم دەدرێت و دەرمانخوارد دەکرێت، هیچ نووسراوێک و کتێبێکی بەردەست نەکەوتووە و هیچیشی لە بارەی نەزانراوە تەنیا ئەو زانیارییانەی مێژوونووسە وردبینەکان نەبێت کە وەسفی سوکرات و نووسینەکانیان کردووە، وەک (ثیوکیدیدس)، هەروەها ئەو زانیارییانەی کە لەلایەن ئەرستۆفان، ئەکسانوفان، ئەفلاتوون وتراوە، سەرچاوەی سەرەکی و باوەڕپێکراو لە بارەی ڕاڤە فەلسەفییەکانی سوکرات، نووسینەکانی زنیۆفۆن و ئەفلاتوون و ئەرستۆیە، زۆربەی بیرمەند و فەیلەسووف و ئەدیبان لە بارەی سوکراتەوە نووسیویانە تا گەیاندیانە پلەی پێغەمبەرایەتی و تراژیدیای شەهیدکردنی بە (مەسیح) دەشوبهێنن، فەیلەسووف و مێژوونووسانی ئیسلامیش بە ئیمام سوکرات (ئیمامی عەلی) و شەهیدی حەق شکۆمەندی دەکەن، لەم بارەیەوە هایدگەر دەڵێ (خاوێنترین بیرمەندە کە خۆرئاوا هەیبووە، هەربۆیە نەینووسیوە!)، بیرو فەلسەفەکانی بە قسە و گفتوگۆ دەربڕیوە، سوکرات دژی سۆفیستەکان و ماتریالیزمی ئیۆنی بووە.

**١٣- ئەفلاتوون (٤٢٧- ٣٤٧پ.ز)**

ناوی ڕاستەقینەی ئەریستۆکلیسە و مەزنترین فەیلەسووفی یۆنانییە، بگرە مەزنترین فەیلەسووفە لە مێژووی فەلسەفەدا بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی فەلسەفەی خۆرئاوایی دەژمێردرێت تاکە فەیلەسووفی جیهانی کۆنە کە هەموو نووسینەکانی پارێزراون و هەموویان لە شێوەی دەمەتەقێدان. سەرجەمی بەرهەمەکانی ئەفلاتوون (٤١) بەرهەمن، بەرهەمەکانی بۆ یەکەم جار لە سەدەی دووەمی (پ.ز)دا لەلایەن ئەریستۆفانی بێزەنتییەوە کۆکراونەتەوە و ڕێک خراون، دواییش لە سەدەی یەکەمی (پاش.ز)دا لەلایەن فراسیلەوە نووسراونەتەوە و بڵاوکراونەتەوە.

**١٤- فیساگۆرس (٥٧٢-٤٩٧پ.ز)**

لە دوورگەی (سامۆس) لە دایک بووە لە شاری (میتاپۆنت) مردووە، لەگەڵ هاتنی فیساگۆرس ڕەوتێکی نوێ لە بیری یۆنانییدا دەردەکەوێ و پەرەدەسەنێ، فیساگۆرس ڕێکخراوێکی ئایینی- ڕامیاری پێکەوە ناوە، دوای خەباتێکی سەخت، ئەو خانووەی ڕێکخراوەکەی تێدابوو، بە ئەندامەکانیەوە سووتێنراوە، زۆرکەم لە بەرهەمی فەلسەفی فیساگۆرس و فەیلەسووفەکانی قوتابخانەی فیساگۆرسی بە ئێمە گەیشتوون، ئەوانەشی ماونەتەوە بریتین لە چەند پارچەیەک و هیچی تر، لەوە دەچێ فیساگۆرس خۆی هیچی نەنووسیبێ، یەکەم کەس کە بە نووسین فەلسەفەی فیساگۆرسییەکانی تۆمارکردبێ (فیلۆلای)یە کە لەسەدەی پێنجەمی (پ.ز)دا لە سەردەمی سوکراتدا ژیاوە، فیساگۆرس خوێندنی فەلەک و ئەندازیاری و نهێنییەکانی لاهوتی لە شاری فیرعەونیەکان خوێندووە و لەوێ فێری ژمێرە و مۆسیقا و شارەزای سرووتە مەجووسیەکان بووە، ئەندامانی فیساگۆرسیەکان یەک پۆشاکیان لەبەرکردووە کە یەک ڕەنگ بوو، ڕەنگە سپی، خواردنی گۆشتیان لەخۆ قەدەغە کردبوو، بەپێی پەتی بوون..تاد، تێڕامانی فیساگۆرسییەکان ڕەگەزێک بوو لە ڕەگەزەکانی باوەڕ کە بنەمای شیکردنەوەی ڕێبازی هەردوو ڕەوتی سوفیێنی و ماتماتیکی لەسەر دامەزراوە کە لە پرسیارەکانی لە بارەی (بوون)ەوە بە (ژمارە) وەڵام دەدەنەوە، وایان دەبینی شتەکان ژمارەن، یان لە ژمارە دەچن، لەبەرئەوەی ئەم ژمارانە شتەکان بەجێ ناهێڵن، بەڵکو لەگەڵیدا یەک دەگرن، بۆیە جیهان هەمووی ڕێکەوتن و ژمارەیە. قوتابخانەی فیساگۆرسی ئەو بیرەی فیساگۆرسیان زیاد کرد و (ژمارە)یان کردە (ژمارەکان) ئەم هەڵوێستەیان لەژێر کاریگەری بیرۆکەی (Limit) بەڕێوەبردووە و بە هۆیەوە ڕاڤەی شتەکان و سەرهەڵدانیان پێ دەکرد، ژمارە (١٠) زۆر پیرۆز بووە لایان کە بە سێ گۆشەی ژمارە (٤) کە بە (تترا کتیسی فیساگۆرسی) ناونراوە، کە کۆی ژمارە سەرەتاییەکان (١+٢+٣+٤=١٠) ئەمەشیان بە نوێنەری کۆی گەردوون دەزانی، فیساگۆرس ئەمانەی بە ژمارە نەدەکرد، چونکە لەو سەردەمەدا ژمارە نەهاتبووە کایەوە، بەڵکو لەسەر لم

و چەوی بەکاردەهێنا، هەروەها سیستەمی دەیی بەکاردەهێنا کە میسرییەکان لە پێشدا بەکاریان هێنابوو، فیساگۆرسییەکان، جیهانیان بە ڕووداو دەزانی نەک بە کۆن، بەم شێوەیە دابەشیان کرد: ئاسمانی یەکەم، پێنج هەسارەکە، خۆر، مانگ، زەوی کە هەموویان لە دەوری ئاگرێکی بنکەیی دەسووڕێنەوە، ئەویش (بیت زیوس)، لەبەرئەوەی شێوەی خڕە، کۆی هەمووشیان (١٠) ژمارەیە ئەمەش جوانی سیستەمەکەی دەنوێنێ، بە ڕای فیساگۆرسیەکان گەردوون پچڕپچڕە و سەرەتای بۆ نییە لە (ژمارە) و (یەک) بنەمای ژمارە و خاڵیش بنەمای شێوە و تەنی (ئەندازەیی)یە لە ئەنجامی بەیەک گەیشتنی (یەک)ەکاندا ژمارە تاک و جووتەکان و لە ئەنجامی کۆکردنەوە و سەرجەمی جووتەکاندا چوار گۆشە و لاکێشە و لە ئەنجامی کۆکردنەوە و ژمارە تاکەکان و جووتەکاندا سێ گۆشە دروست دەبێ و لەکۆتاییشدا هێڵی بۆشاییەکان و ڕووبەر و تەنەکان پێک دێن. هەموو شتێکی ئەم گەردوونە بەپێی یاسای تاک و جووتی ژمارە دروست بووە و دروست دەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شێوە بیرکردنەوە میتافیزیکییە، یەکەم ئایدیۆلۆژیای ماددی ئیۆنییەکان بوو، هەرچەندە لەوە دەچێ لە سەرەتادا فیساگۆرسییەکان ژمارەیان بە (تەن- لەش)دانابێ، بەڵام لە ڕاستیدا لێرەوە هۆی سەرەکی و سەرەتایی هەموو شتێک بە (سەرەتایەکی نموونەیی (ئیدیال) دەزانرێ.

**١٥- ئەرستۆ (٣٨٤-٣٢٣پ.ز)**

قوتابی ئەفلاتوونە و یەکێکە لە بلیمەتترین عەقڵەکانی مێژووی فەلسەفە لەگەڵ مامۆستاکەیدا. هەتا ئەمرۆش سێبەریان بەسەر شەپۆلە فەلسەفیەکانەوە هەیە، لە بەرامبەر ئەکادیمیاکەی ئەفلاتووندا قوتابخانەی لیقونی بۆ وتنەوەی وانە فەلسەفیەکان دامەزراند، ئەرستۆ لە ساڵی (٣٢٣) لەبەر هۆی سیاسی ئەسینای بەجێ هێشت و لە ئەوروپا لە شاری (هالکیدیا) کۆچی دوایی کرد، بە قسەی (دیۆگینی لاریتی) نزیکەی (٤٠٠) کتێبی لەپاش بەجێ ماوە. بەرهەمەکانی ئەرستۆ دەکرێن بە دووبەشی سەرەکییەوە:

أ- ئەو بەرهەمانەی بۆ بەشێکی زۆری خەڵک نووسراون.

ب- ئەو بەرهەمانەی تایبەتی بوون بۆ قوتابیەکانی و فەیلەسووفەکان. بەرهەمەکانی ئەرستۆ بۆ یەکەم جار لە ناوەڕاستی سەدەی یەکەمی پ.ز لەلایەن (ئەندرۆنیک)ی خەڵکی (ڕۆدۆس)ەوە بڵاوکراوەتەوە.

بیروباوەڕەکانی لەبارەی ئەم بیروگوتانەوە بووە:
(مقولات، وێنە و ماددەی دروستکراو، بوون بە کرد

و بوون بە زۆر، هۆدۆزی، پۆلێنکردنی زانست، لۆژیک، فیزیقا، یان سروشت، زانستی ژیان، تیۆری دەروون، ئەودیو سروشت (میتافیزیقا)، ئاکار، سیاسەت، شیعر).

**١٦- ڕینە دیکارت (١٥٩٦-١٦٥٠)**

لە (لاهی) شارێکی بچووکە لە ناوچەی (تۆرین) لە فەرەنسا لە دایک بووە. فەیلەسووف و ماتماتیکزانی فەرەنسی کە ناوبانگی باوکی فەلسەفەی مۆدێرنی پێدراوە، ماوەی نێوان بیرو جەستەی زۆر کورت کردەوە بە تەواوی پشتی بە پرەنسیپە ماتماتیکییەکان دەبەست، دیارترین نووسراوی بریتییە لە کتێبی تێڕامانە میتافیزیاییەکان. لە وێدا وتە ناودارەکەی پێشکەش دەکات کە دواتر بە کۆجیتۆی دیکارت ناسرا (من بیردەکەمەوە..... کەواتە من هەم)

**١٧- ئارثەر شوپنهاوەر (١٧٨٨-١٨٦٠)**

فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە و بە فەیلەسووفی ڕەشبینی ناسراوە، پێی وایە ناکۆکییەک لەنێوان جیهانی عەقڵ و جیهانی ئیرادەدا هەیە، دیارترین کتێبی بریتییە لە (جیهان وەکو ئیرادەو وەکو وێناکردن) دوای ئەوەی نەیتوانی بەرەنگاری هیگڵ و شلینگ و فیختە ببێتەوە، لە زانکۆ وانەکانی بەجێ هێشت و کەوتە دژایەتیان و بە ساختەچی و چەنەبازی لە قەڵەمی دەدان، بەڵام دوو فەیلەسووفی بەدڵ بوو، ئەویش (کانت) و (ئەفلاتوون) بوون. خۆیشی بە وەریسی شەرعی (کانت) دەزانی و ئەمانەشی کە پێی سەرسام بوون، فاگنەر، نیچە، توماس مان، بوون.

**١٨- یۆهان گوتلیب فیختە (١٧٦٢-١٨١٤)**

فەیلەسوف و ڕۆشنبیرێکی ئەڵمانییە، لایەنگیری تیۆرێکی ئایدیالیستانەیە لەباردی واقیع و ڕەفتارە ئاکارییەکان، فیختە ڕۆژانی یەک شەممە، موحازەرەی دەوتەوە و بەشێوەیەکی عەقڵانییانەش باسی ئایینی دەکرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی چەندان کێشە و دوژمنایەتی لە نێوەندە ئایینییەکانەوە بۆ دروست ببێت، هەروەها دەسەڵاتدارانیش زۆر خۆشیان نەدەویست لەبەر ئەو مەیلە شۆڕشگێڕانەیەی کە هەیبوو. دیارترین کتێبی (پێڕەوی ئاکار لەبەر ڕۆشنایی زانستدا- ١٧٩٨) بوو، بە هاوکاری یەکێک لە خاوەن مولکە ناوخۆییەکان توانی لاهووت و فقهی زمان و فەلسەفە لە (یینا) و لیبزگ بخوێنێ. ساڵی (١٧٩١) بە کانت ئاشنابوو بووە قوتابی و نزیکترین هەواخوازی، ساڵی (١٧٩٩) دەرکرا لە زانکۆی یینا بەهۆی وانە وتنەوەی بێ باوەڕییەوە، نیشتمانپەروەرێکی بە پەرۆش بوو فیختە وای دەبینی کە

دوو میتۆدی شیاو هەیە لە فەلسەفەدا کە براوەتەوە و وەرگرتنی بیرۆکەیە لە شتێکدا، یان ئایدیالیزمی کە وەرگرتنی شتێکە لەبیرۆکەوە.

**١٩- جان جاک ڕۆسۆ (١٧١٢-١٧٧٨)**

فەیلەسوف و تیۆریستی سیاسی نێوداری فەرەنسا و نووسینەکانی بە یەک لە هۆیەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسە دادەنرێت دیارترین کتێبی (پەیمانی کۆمەڵایەتییە- ١٧٦٢) هەربۆیە بە باوکی شۆڕشی فەرەنسا دانرا.

**٢٠- ئەمانوێل کانت (١٧٢٤-١٨٠٤)**

یەکێکە لە بیریارەکانی ڕۆشنگەری، هەروەها یەکێکە لە مەزنترین فەیلەسوفەکانی مێژووی فەلسەفە، کارە ورد و کاریگەریەکانی لەبارەی تیۆری زانین، ئاکار، ئێستاتیکا، لە دوای خۆی کاریکی زۆریان کردۆتە سەر ڕەوتی فەلسەفە بەتایبەتی قوتابخانە ئەڵمانییەکەی کانتیزم و ئایدیالیزم، کانت بە گەورەترین و بلیمەتترین فەیلەسوفانی ئەوروپا دادەنرێ فەلسەفەکەی لە چەند کتێبێک دارشتووە، گرنگترینیان (ڕەخنەی ئاوەزی پوخت)، (بنەڕەتی لایەنی میتافیزیقی لە ئاکاردا) و (ڕەخنەی ئاوەزی کردەوەیی).

**٢١- (بندکت دو سبینوزا (١٦٣٢-١٦٧٧)**

لە ئەمستردام لە دوو باوکی یەهوودی لە دایک بووە، لەنێو قوتابخانەیەکی بالا لە ئەمستردام دەیخوێند، کەوتە خوێندنەوەی تلمود و پێنج کتێبەکەی موسا، دوای ئەوە دەستی داوەتە خوێندنەوەی کۆپەرنیک و گالیلۆ و کلیوهارفی هوگنز و دیکارت، هەندێ پلە و پایەی لەلایەن سەرۆکی پەرستگاکانی یەهوودی دراوەتێ لە ساڵی (١٦٧٣) کورسی فەلسەفەی لە زانکۆی هیدلبرگ دراوەتێ، بەڵام هەمووی ڕەت کردۆتەوە و خۆی بە نووسینەوە خەریک کردووە و حەزی لە ژیانێکی هێمن کردووە و نارەزووی کردووە وازی لێ بهێنن بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکانی بکات، لە تەمەنی (٤٥) ساڵیدا مردووە.

**٢٢- جان پۆل سارتر (١٩٠٥-١٩٨٠)**

لە فەرەنسا لە دایک بووە ڕابەری فەلسەفەی بوونگەراییە لە فەرەنسادا، ئەدیبێکی لێهاتووشە دیارترین نووسراوەکانی (بوون و نەبوون-١٩٤٣) هەروەها سارتر ڕۆماننووس و شانۆنووس بووە.

**٢٣- کیرکگارد سۆرین ئابی (١٨١٣-١٨٥٥)**

فەیلەسوفێکی ئایینی دانیمارکییە کە بایەخی بە بوونی هەڵبژاردن زۆر بە قووڵی کاری کردۆتە سەر تیۆلۆجیا و فەلسەفەی هاوچەرخ بەتایبەتی بوونگەرایی، هەندێ کەس نازناوی فەیلەسووفی پێ نادەن.

**٢٤- فریدریک نیچە (١٨٤٤-١٩٠٠)**

فەیلەسووفێکی ئەڵمانیە دوژمنێکی سەرسەختی هیگڵ و هیگڵیەکان بووە، هەروەها دژایەتی ئایین بەگشتی و مەسیحیەتی کردووە. بەتایبەتی فەلسەفەکەی بریتییە لە چاوپێداخشاندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی بێڕەحمانە بە کولتووری مرۆڤایەتیدا و گەیشتن بەوەی مرۆڤ لەم فۆرمەی ئێستایدا مەحکومە بە فەوتان و پێویستە دان بە بەزینیدا بنێت و چاوەڕوانی ئەو مرۆڤە بالایە بێت کە جێی دەگرێتەوە و بەپێی پرەنسیپی ئیرادەی هێزانە هیلزمیەتی پشتەوەی خۆی کاردەکات، فرۆید لە بارەی نیچەوە دەڵێ: (خۆی زۆر بە باشی دەناسی وەک لە مرۆڤێکی تر کە ژیاوە، یان لەوانە بوایە بژیایە) هەروەها دەڵێ: (پێشبینییەکانی دەگونجێ نیچە و تێڕوانینە وردەکانی زۆر بەسەر سوڕمانەوە لەگەڵ ئەو ئەنجامانەی کە شیکردنەوە دەروونییەکان دوای زەحمەتییەکی زۆر پێی گەیشتوون) نیچە کاریگەری کردۆتە سەر بوونگەراییەکان و خاوەن شیکردنەوە دەروونیەکان، هەروەها کاریگەری کردۆتە سەر، **هارتمان**، شیللەر، شبنجلەر، ورلکە، بیوبر، **توماس مان**، **مالرۆ**، جید، خاوەن بیرێکی هەژێنەری توندوتیژ بوو، هەروەها خاوەنی بیری بالامرۆ بوو، بەشێتی مرد، لەدوای خۆی چەند کتێبێکی فەلسەفی بەجێ هێشت کە تا ئێستاش کاریگەری بەسەر بیرو فەلسەفەی جیهانی هەیە.

بۆ پێناسەکردنی زاراوە فەلسەفیەکان و ژیاننامە و بیروباوەڕی کەسایەتییە ناودارەکان، سوودم لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگرتووە!


١- تطور النظرة الواحدية الى التاريخ، جورج بليخانوف، ترجمة: محمد متجيد مصطفى، مراجعة د. مراد وهبه، بيروت، بێ مێژوو.

٢- الاشتراكية والفابية في ثلاثينيات القرن العشرين. للپروفيسور العلامة، ج.هـ.و. كول، ترجمة: عبدالحميد الاسلامبولي، بێ مێژوو.

٣- فلسفة الانوار/ ف. فولغين، ترجمة: هنديت عبودي، الطبعة الاولى، بيروت، (١٩٨١).

٤- الثورة الفرنسية وامتداداتها (١٧٨٩) روبرت بالمر، ترجمة: هنديت عبودي، الطبعة الاولى، بيروت، (١٩٨٢).

٥- يوتوبيا، توماس مور، ترجمة وتقديم، د. انجيل بطرس سمعان، دارالمعارف بمصر، (١٩٧٤).

٦- ما هى المادية الديالكتيكية؟ اكرابيضين،

دارالتقدم، (١٩٨٦).
٧- ئایین و کەسایەتی، دانیاڵ. ل. پاڵس/ وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە ئاوات ئەحمەد، لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم سلێمانی/ ٢٠٠١.
٨- فلاسفة یونانیون من طالیس الی سقراط، الطبعة الثالثة، د. جعفر آل یاسین، بغداد، (١٩٨٥).
٩- رووناکبیر و دەسەلات/ لێکۆڵینەوەیەک لەبیری فەرەنسی هاوچەرخ محەمەد ئەل- شێخ/ لە عەرەبییەوە، ئاوات ئەحمەد مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتییەکانی (ی.ن.ک)، (٢٠٠٢).
١٠- معجم علم الاجتماع، تحریر البروفیسور دینکن میشیل، ترجمة: د. احسان محمد الحسن، دارالحریة للطباعة، بغداد، (١٩٨٠).
١١- الموسوعة الفلسفیة المختصرة، نقلها عن الانجلیزیة، فؤاد کامل/ جلال العشري/ عبداالرشید الصادق، دارالقلم، مکتبة النهضة، بغداد، ١٩٨٣).
١٢- سەرەتایەک لە فەلسەفەی یۆنانی کۆن/ چاپی دووەم نووسینی:
أ- س ئەخماتۆف.
ب-ن. ی گرا بەریاسیک.
ج- ف. أ. پیتر رۆفسکی.
وەرگێرانی لە رووسییەوە جەلال تەقی چاپی یەکەم (٢٠٠٠) لە بلاوکراوەکانی کتێبخانەی بەستە.
١٣- الفلسفة لکل الناس، د. عادل البکري، بغداد، (١٩٨٥).
١٤- الرومانتیکیة، د. محمد غنیمي هلال، دارالعودة بیروت، (١٩٧٣).

**فەرهەنگۆک:**

١- قبول/ گەوار
٢- التطرف/ پەڕگیر
٣- الهدف/ ستێرگ
٤- الوضح / ڕەوش
٥- المرکب/ تێکەڵ
٦- مقولات/گوتەکان
٧- ذهني/ زەینی
٨- المطلق/ ڕەها
٩- لفظ/ فۆنەتیک
١٠- ثنائیة/ دوالیزمی
١١- التأمل/ تێڕامان
١٢- الطابع/ مۆرک
١٣- العقل/ ئاوەز
١٤- الفکر/ هزر
١٥- فکرة/ بیرۆکە
١٦- وهم/ وێژنگ
١٧- المزیف/ قەڵپ
١٨- المنفعة/ سوودخواز
١٩- المنطق/ لۆژیک
٢٠- وسیلة/ کەرەستە
٢١- اخلاق/ ئاکار
٢٢- الوجودیة/ بوونگەرایی
٢٣- اتجاه/ ڕەوت
٢٤- انفعال/ هەڵچوون
٢٥- المعرفة/ ئەپستمۆلۆژی
٢٦- تشائم/ ڕەشبین
٢٧- نرڤان/ عەدەم
٢٨- مایا/ هێمای وەهم و پووچەڵبوونەوە دەگەیەنێ
٢٩- النزعة/ مەیل
٣٠- التجربة/ ئەزموون
٣١- التجریبیة/ ئەزموونگەری
٣٢- مذهب/ ڕێباز
٣٣- المثالیة/ ئایدیالیستی
٣٤- المادیة/ مەتریالیزمی
٣٥- المأساة/ تەراژیدیا
٣٦- قبلي/ پێش وەخت
٣٧- جدل/ مشت و مڕ
٣٨- کنە/ ئەو سیفەتەی کەسێک پێی دەناسرێ
٣٩- التأمل/ تێڕامان
٤٠- التنویر/ ڕۆشنگەری
٤١- ڕێنیسانس/ سەدەی زێڕین، سەدەی بووژانەوە
٤٢- الذات/ خود
٤٣- الذاتي/ خودی
٤٤- الذاتیة/ خودیەتی
٤٥- الوعي/ هۆش
٤٦- التصور/ وێناکردن
٤٧- الأیمانیة/ باوەڕبوون
٤٨- المفهوم/ چەمک
٤٩- الوجود/ بوون
٥٠- المنهج/ میتۆد

**زاراوە فەلسەفییەکان**

**١- ڕۆشنگەری**

جووڵانەوەیەکی ڕۆشنبیریی سەدەی هەژدەیە لە ئەورووپای خۆرئاوادا سەری هەڵداوە، سەراسیمەیی عەقڵ

و زانست بوو لە فەلسەفە و لێکۆڵینەوەی کولتووری مرۆڤایەتی و جیهانی سروشتدا، نوێنەری ئەو جووڵانەوەیە، ڤۆلتێر، ڕۆسۆ، مونتسکیو، شیللی، گۆتە، بوون، هەمووویان باوەڕیان وابوو کە هۆش ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێ بۆ بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگاو هەموو ڕەزاڵەتی و نەهامەتییەک دەگەڕێننەوە بۆ نەزانینی کۆمەڵگا و ناهوشیاری خەڵک، بۆیە نەیانتوانی دەلالەتێکی تەواو بدۆزنەوە بۆ ئەو بارودۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتیەی کۆمەڵگا تێی کەوتووە و نەیانتوانی یاسا بابەتییەکانی بدۆزنەوە، بۆیە هەوڵیان دا لە ڕێگای ڕۆشنکردنەوەی خەڵک بە بیروباوەڕی چاک و دادپەروەری و زانست کە لە نووسینەکانیاندا ڕەنگی دابۆوە کاریگەری بخەنە سەر کۆمەڵگا بەبێ جیاوازی، هەروەها کاریگەری کردەسەر کەم کردنەوەی ئایدۆلۆژی کەهانەت و دەرەبەگ و سەر ڕێبازی سۆشیالیستی یۆتۆپی کە بیرمەندە ڕووسەکان دووچاری ببوون و بایەخێکی گرنگ دەدرا بە ڕۆشنگەری.

**٢- سەردەمی ڕۆشنگەری**

ئەم زاراوەیە بۆ پێناسەکردنی ئەو مەیلە بەکارهێنراوە لە بیرکردنەوە و نووسینی بیریارەکانی ئەورووپا و کۆڵۆنیە ئەمریکییەکاندا کە لە ماوەی سەدەی هەژدەیەم و دوای شۆڕشی فەرەنسی برەوی هەبووە، ئەم زاراوەیە لەلایەنی نووسەرانی سەردەمەکەی خۆیەوە بەکارهێنراوە و ئەوان لەو بڕوایەدابوون کە لەوڵاتانی بیرە تاریک و نادانەکانەوە هاتوونەتە دەرەوە بەرەو ڕۆشنایی بەهۆی عەقڵ و زانست و ڕێزگرتنی مرۆڤایەتییەوە.

**٣- ڕۆمانتیکی**

ڕێبازێکی ئەدەبییە و بەمەترسیترین ڕێبازی ئەدەبی جیهانی دادەنرێ چ لە فەلسەفیە سۆزداریەکەیدا، یان لە پرەنسیپە مرۆڤایەتیەکەیدا، یان لە کاریگەرییە ئەدەبی و کۆمەڵایەتییەکەیدا، لەبەر ئەوەی ڕێبازێکی ئاڵۆزبووە نەتوانراوە پێناسەیەکی پوختی تەواوی بۆ بکرێ، فریدرش شلیجل لە نامەیەکدا بۆ براکەی وای نووسیوە «هەوڵی داوە کە پێناسەی ڕۆمانتیکی بکات لە (١٢٥) لاپەڕەدا» مێژوونووسانی ئەدەب لە ساڵی (١٩٢٥) هەژماری (١٥٠) پێناسەیان بۆ ڕۆمانتیکی دۆزیوەتەوە، بەرهەرحاڵ ڕۆمانتیکی لە ئەدەب و هونەر و شانۆ و شیعر و تەنانەت فەلسەفە و سۆزی هەڵچوونی تاکدا دەرکەوتووە. ئەمەش دژی ئەدەبی کلاسیکی کۆن و ژیانەوەی پێشووی نیشتمانی، سەرهەڵدانی ئەدەبی ڕۆمانتیکی، یان ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە دژی ڕێبازی کلاسیکی ئەورووپا هاتە کایەوە و لە سەدەی هەڤدەیەمدا تا کۆتایی سەدەی هەژدەیەم درێژەی کێشا لە زۆر وڵاتانی ئەورووپا تا سەدەی نۆزدەیەم درێژەی کێشا، بیرمەند و شاعیر و هونەرمەند و فەیلەسووف و مێژوونووسان بۆ ژیانەوەی ئەدەبی گەلەکەیان و ڕووبەڕووبوونەوەی سیستەمی دەرەبەگ و کلاسیکی باو جوانترین ڕێبازیان دامەزراند کە بەهۆیەوە توانییان ئازادی و ئازادی تاکەکەس و سۆزە نیشتمانیەکان بورووژێننەوە و ژیانێکی نوێ بۆ گەلەکەیان بگەڕێننەوە، ڕۆمانتیکیەت هێمایەک بوو بۆ ئەو کەسەی خاوەن هەڵچوون و تاکڕەو و خودیەتی خۆی بوایە و دەیتوانی کاریگەری بکاتە سەر کۆمەڵگا، تەنانەت فەیلەسووفانیشی گرتەوە، سۆز و هەست جێگای عەقڵی گرتبۆوە و سەرکردایەتی درابووە دەست دڵ کە سەرچاوەی ئیلهام بووە، لەبەر ئەوەی نیشتمانی هەست شوێنی ویژدان نەبووە، ڕۆمانتیکیەکان دەگەڕان بە شوێن جوانیدا، لای ئەوان جوانی ئەو ئاوێنە ڕاستەیە کە ئاواتەکانیان دەهێنێتە دی، خەونیان بە کۆمەڵگایەکی ئیدیالەوە دەبینی کە هەموو مافێکی تێدا دەستەبەر کرابێت بێ ئەوەی هەوڵ بدەن و ئەرکەکان جێبەجێ بکەن، بەڵام ئەو سۆز و هەستی پێیان دەنووسی وایان لە خەڵک کرد هەوڵی تەواو بدەن بۆ دادپەروەری و یەکسانی و توانییان سیستەمێک لە دادپەروەری بهێننە کایەوە، ڕۆمانتیکیەکان ڕۆڵەی شۆڕشەکانی فەرەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزی بوون. گرنگیان بەتاک و مافەکانی تاک دەدا، لە پێشەوایانی ئەم ڕێبازە: ڕۆسۆ، لۆک، کوندورسیە، بۆتە، مدام دی ستال، شاتۆبریان، بلیرۆن، جان بول ریشتر، (ننشاردسنی) ئینگلیزی، (شیللەر)ی ئەڵمانی، ئەم فەیلەسووف و بیرمەندانە بە جۆرێکی سۆزدارانە و بە ویژدانەوە لە نووسینەکانیاندا گوزارشتیان لە کۆمەڵگاکەیان کردووە.

**٤- ڕێنیسانس**

قۆناغێکی نوێی فکری بوو لەدوای سەدەی ناوەڕاست سەری هەڵدا، واتە سەدەی پازدە و شازدە لە ئەورووپا و هەڵگری ڕێنیسانس بۆرژوازیەکانی ئەورووپا بوون کە دژی سەدەی ناوەنجی و بیروباوەڕی کۆن و کڵێسە و سیستەمی دەرەبەگایەتی دەجووڵایەوە بە ماوەی یەک ساڵ ئەو بیروباوەڕەی ڕێنیسانسی هێنایە کایەوە لە زانست و فەلسەفە و ئابووریدا باڵی بەسەر ئەورووپادا کێشاو هەموو چەمکی ژیاریی و ژیانییەکانی گرتەوە، واتە قۆناغێک بوو لە قۆناغەکانی ڕەوتی گەشەکردنی فکر لە ئەورووپادا، ڕێنیسانس بە سەردەمی بووژانەوە و بەسەردەمی زێڕین ناودەبرێ. گەورەترین ئامانجی ڕێنیسانس دروست بوونی زمانی نەتەوەیی یەکگرتوو بوو

له ئەوروپادا، ئیتالیا لانکەی ڕێنیسانس و فلۆردنسا بە (پایتەختی ڕێنیسانس) ناودەبرا، بیری ڕێنیسانس بریتی بوو لە ڕەخنەگرتنی کلێسەی کاتۆلیکی ڕۆماو بەهیچ شێوەیەک دانوویان لەگەڵ کلێسەدا نەدەکولا، لەسەردەمی ڕێنیسانسدا یەکەم جار مێژوو بەپێی قۆناغ دابەش کرا و پێشەوایانی ڕێنیسانس یەکەم کەس بوون زاراوەی سەدە ناوەنجییەکانیان بەکارهێنا، بیرمەندانی ڕێنیسانس لە هەموو چەمکەکان دەیانکۆڵیەوە، مێژوو، زانست، گەردوون، سروشت، دوای سروشت، مۆسیقا، شانۆ، ئەدەب، کولتوور، شیعر، زمان، دین، فەلسەفە، مرۆڤ، سیاسەت، پێشەوایانی ڕێنیسانس، دانتی، میکیاڤیللی، لۆرێترۆڤالا، کویجاردینی، برونی، جان بۆدین، فرانسیس بیکۆن.

**٥- ئاوەز**

بیری حەدسەی پوخت

**٦- عەدەم**

لە وشەی (Nihli)ی لاتینیەوە هاتووە کە ماناکەی هیچ نەبوون (العدم) دەگەیەنێت.

**٧- خود**

هەڵگری چالاکی ماددی کردارەکی و ئەپستمۆلۆژی (تاک، یان کۆمەڵ)ە و سەرچاوەی ئەو چالاکییەیە کە ئاراستەی بابەت دەکرێ.

**٨- خودی**

ئەوەی لە خود جیانابێتەوە، یان لە چالاکییەکانیدا پەیدا دەبێ سیفەتێکە بۆ ئەپستمۆلۆژی گوزارش لەو توخمانە دەکات کە ئەپستمۆلۆژی تیا دەژیێتەوە بە هەموو وردەکاریەکەوە و بە هەموو لایەنی بابەتیانەوەی.

**٩- خودیەتی**

هەڵوێستێکی بیروباوەڕانەیە خۆی لە یاسا بابەتیەکانی سروشتی کۆمەڵگا دەدزێتەوە یەکەم سەرچاوەی عیرفانی ئایدیالیستییە و بنەمای فەلسەفەی لادەر و داواکاریەکانە لە سیاسەتدا.

**١٠- شتێک**

بابەتێکە لە واقعی ماددیانەیە کەمێک سەربەخۆیی هەیە، هەروەها بە سەلماندنی بوون جیادەکرێتەوە.

**١١- بیرۆکەی ڕەها.**

چەمکێکە لە فەلسەفەی ئایدیالیزمیدا لە بارەی پرەنسیپی ڕۆحییە کە لەسەروو سروشتەوەیە و بەهیچ شتێکەوە مەرجدار نییە، بۆ بوونەوەرێکی پێش سروشت، ناوەڕێک ئەدگاری نەبێ، جیهانی ماددی کردارەکی دروست دەکات، واتە سروشت و مرۆڤ و کۆمەڵگا، هەروەها بیرکردنەوەی مرۆییش.

**١٢- بنەڕەت**

بنەڕەتیە گشتییەکان بۆ هەموو کردەوەکان و دیاردەکان.

**١٣- زانین**

ئەنجامی زانینی واقیعە کە چالاکی کردار ڕاستییەکەی سەلماندووە و ئاوەژوویەکی ڕاستیانەی واقیعە لەبیرکردنەوەی مرۆڤدا.

**١٤- هۆش**

یەکێکە لە چەمکە بنەڕەتیەکان لە فەلسەفە و سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژیدا، هێمایە بۆ توانای مرۆڤ کە دەتوانێ واقیع لەبیرکردنەوەدا بژیێنێتەوە، ژیاندنەوەیەکی بیرکردنەوانە.

**١٥- وێناکردن**

وێنەی شتێک کە پێشوو دەرکی پێ کرابێ، یان دیاردەیەک کە پێش وەخت دەرکی پێ کرابێ (وێناکردنی یادەوەری- یاداشت) هەروەها ئەو وێنانەی کە ئیدیال بەرهەمی دەهێنێ شێوەی باڵای هەستی پێچەوانەیی ئەو کەسەی کە ناسراو و ڕوونە- مەجازییە.

**١٦- تێرامان**

کردارێکی فکرییە ستێرکی ئەوەیە کە دەروونی مرۆڤ وا لێدەکات بچێتە حاڵەتی قووڵ بوون و جەخت کردنەوە، کە پشوویی و شلی جەسەدیشی لەگەڵدایە هەروەها نەمانی دیاردە هەڵچوونەکان و خۆدەربازکردن لە بابەتە دەرەکییەکان، ڕێگاکانی تێرامان زۆر شێوەی هەیە، تێرامان ڕۆڵی گەورە دەبینێ لە فەلسەفەی هیندی و دیندا بەتایبەتی لە (یۆگا)دا، لە یۆنانی کۆنیشدا (فیساگۆرسی، ئەفلاتوونی، ئەفلاتوونی نوێ) لە سۆفیەتی سۆفینیزمدا، بەشێک لە سۆفیێتی ئەرثۆدۆکسیەت (کرداری ئاوەز) و کاتۆلۆکیەتە، گرنگی پێدانی تێرامان و لایەنە چارەسەریە دەروونییەکان لە هەندێ شەپۆلی شیکردنەوەی دەروونیدا (Psychoamalgse) هەیە (یۆنگ).

**١٧- باوەڕبوون**

باوەڕێکی دینییە جەخت لەسەر زاڵبوونی ئیمان دەکات بەسەر ئاوەزدا، دینە دامەزراوەکان بەکاری دینیانەوە دەگرێتە خۆ.

**١٨- لۆژیک**

یەکەم شیکردنەوەی بلیمەتیانەی ئەرستۆیە کە خستیە سەر بواری لۆژیکی وێنەداری، واتە تیۆرەکەی لەبابەت پێوانە، پێوانەش نەسەقێکی وێنەداری پوختە لەگەڵ لایەنێکی گەورەی پتەودا، بەڵام بوارەکەی دیاری کراوە، هەندێ زاراوەی تر لەخۆ دەگرێ وەک (استنباط/ ئەنجامگیری، یان لێ وەرگرتن)، (استقراء/ تێ

حوێندن).

**١٩- وههم (وێژنگ)**

بریتییه له تێگهیشتنێکی ههڵه، یان دهرک پێکردنێکی ههڵهی ئهزموونێکی ههستی، دهرککردن بریتییه له پرۆسیسێک که تێیدا بیرکردنهوهیهکی شڵهژاو بههۆی زانیارییهکهوه هێور دهبێتهوه، زانیارییهکهش بهشێوهیهکی ههستی وهردهگیرێت نهک به شێوهیهکی عهقڵیی، وههم کاتێک دهردهکهوێت که مێشک ههست به ژمارهیهک خهسڵهتی جیاواز دهکات که له بابهتێکدا یان پاڵنهرێکدا کۆدهبنهوه، دهشێت وههم لهسهر ههموو ههستێکی مرۆیی دهربکهوێت که بینین و بیستن و دهست لێدان و بۆنکردن و تامکردنیش دهگرێتهوه، دیاره لهپاڵ دهرککردنی عهقڵییانهشدا بهشتێک که لێرهدا مهبهسته سهرهکییهکهی فرۆیده، ههر چۆنێک بێت له بهکارهێنانی گشتیدا زاراوهکه زیاتر بهکارهێنراوه بۆ وههمی بینین- که پێوهندیهکی راستهوخۆی به ئایینهوه ههیه له تۆنهمییهکاندا راستهوخۆیه و له ههموو ئایینهکانی تریشدا بهشێوهیهکی ناراستهوخۆ لهلایهنی پهیامبهرێکی ههڵبژاردهوه ئهو بینینه روودهدات.

**٢٠- مهیل**

١- ئاراستهیهکه له پێشکهوتنی دیاردهیهکدا، یان له بیرۆکهیهکدا، یان شتێک لهوانه.

٢- له هونهردا:

أ- پارچهیهکه له نموونهی هونهری جیانابێتهوه، ئاراستهیهکی ئایدیالیستی ههڵچوونه لهبهرههمدا. بههای دانراو بۆ مهسهله و مۆرکهکان له رێی سیستهمێکی وێنهدارهوه تێپهردهبێ.

ب- به مانایهکی کورتتر، هونهرمهندی کۆمهڵایهتی، یان سیاسی، یان ئاکاری رادهکێشێ که به ئاشکرا ئاوهژوو دهکرێت له دهرهوهی وێنهکان و له بهرههمی کردارهکیدا که ئاراستهی بابهتیه پێکهاتهکان و وێنهدارهکان دهکرێن.

**٢١- چهمک**

شێوهیهکی بیرکردنهوهیه، کاکڵهی تایبهتییهکان وپێوهندییهکان لهشت و دیاردهکاندا ئاوهژوو دهکات، وهزیفهی بنهڕهتی چهمکی لۆژیکی جیاکردنهوهیهکی گشتییه که له رێگایهوه دهتوانین پێ بگهین. بههۆی دامالینی ههر شێوه توێژێکی تایبهت له ههموو تایبهتمهندیتی.

**٢٢- بوون**

بوون گوتهیهکی فهلسهفیه، واتای بوونی جیهانی بابهتی دهگهیهنێ، ماده، سروشت بهشێوهیهکی سهربهخۆیی لههۆش، له کۆمهڵدا واتای رهوتی ژیانی ماددی خهڵکان دهگهیهنێ، کێشهی پێوهندی نێوان بوون و هۆش کێشهیهکی بنهڕهتیه له فهلسهفهدا.

**٢٣- بوونگهرایی**

بریتییه له جووڵانهوهیهکی فهلسهفی یاخود مهیلێکی فهلسهفی که جهخت دهکاته سهر بوون و ئازادی و ههڵبژاردنی تاکهکهس، کاریگهری لهسهر زۆرێک له نووسهران و بیریارانی ههردوو سهدهی نۆزده و بیست ههبوو، دیارترین رابهرانی ئهم مهیله سارتری فهرهنسی و هایدگهری ئهڵمانییه.

**٢٤- لاهووتی**

کۆی ههموو رێبازه دینییهکانه له کاکڵه و کردهوهی خودا، گریمانهی چهمکی خودای رهها/ تاک/ کهسی که مرۆڤ دهگاته ناسینی خۆی له سروشتدا، به مانای تهواو، لاهووت بهو مۆرکه هەژموونگهریه و بهو کرۆکه بیروباوهڕهی لهگهڵ رێبازی بیری فهلسهفهی زانستی و ئازاددا ناگونجێ و دانوویان لهگهڵ یهکتر ناکوڵێ. ئهم وشهیه یۆنانیه واتای (زانین لهبارهی خودا) رێبازێکی دینییه و ههوڵ دهدات، بههۆدۆزی و شیکردنهوهی زانستییانه ئاکار و بیروباوهڕ و سرووته دینییهکان له مێتۆدێکدا دابنێ.

**٢٥-یۆتۆپیا**

بریتییه له کۆمهڵگای ئیدیال یاخود کامڵ له ههموو روویهکهوه، ههندێک له نووسهران شوێنی نموونهییان خوڵقاندووه بۆ پیادهکردنی بیروبۆچوونه خهیاڵیهکانیان و دامهزراندنی کۆمهڵگایهکی نموونهیی ههندێکی تریش بهشێوهیهکی گاڵتهجاڕانه باسیان لهو تهرزه کۆمهڵگایه کردووه زاراوهکه به شێوهیهکی گشتی بهکاریش دێت بۆ ههموو بیرکردنهوه، یان رهفتارێکی خهیاڵیانهش، ئهم وشهیه سیاسهتمهداری ئینگلیزی سیرتۆماس مۆر (١٤٧٧-١٥٧٥) دایهێنا که ناونیشانی کتێبێکی بهناوبانگی بوو، تۆماس مۆر به (پیاوی ههموو سهردهمێک) دانراوه، ئهم بیروباوهڕهی کاریگهری کرده سهر زۆربهی فهیلهسووفان بهتایبهتی فهیلهسووفهکانی عهرهب وهک ئهلفارابی که لهژێر کاریگهری ئهو بیرهدا کتێبی (المدينة الفاضلة)ی دانا، خۆیشی کاریگهری ئهفلاتوون و ئۆگستین و بلوتارک و سینکاو زینفۆن و ئهرستۆ و شیشرۆنی پێوه دیاربوو. به تایبهتی (کۆمار)هکهی ئهفلاتوون و (شاری خودا)ی قهشه ئۆگستین.

**٢٦- شوێن و کات**

دوو شێوهی گشتیبوونی ماددهن، شوێن، شێوهیێ

بوونی بابەتیە ماددی کردەوەکانە «کە جیاوازی ژێرخان و درێژە پێدەرانەی سیستەماتیکی مادییەتە»، کات، شێوەیەکی پشکنین و بەدواداچوونی دیاردە و حاڵەتەکانی ماددەیە (جیاوازی وەختی بوونی هەیە) شوێن و کات بە مۆرکێکی بابەتی سیما دەکرێن، لە مادده جیانابنەوە هەردووک بە یەکەوە پێوەندن جیابوونەوەیان لە بزاوتندا نییە، بەشێوەیەکی بێ کۆتایی خاوەن چەندایەتی و چۆنایەتین، تایبەتێتی کات (هەموو- درێژی) دووبارەنەبوونەوە، ناگەڕێتە دواوە، تایبەتێتی شوێن، گشتی، بە درێژایی، یەکەی بەردەوامی، دابران.

**٢٧- تۆماویەت**

ژیاندنەوەی فەلسەفەی (تۆماس ئەکوینی) بوو کە بەناوی توماویەت ناسرا لەسەر دەستی فنشنزو بوزتی (١٧٧٧- ١٨٢٤) وەک بزووتنەوەیەک سەری هەڵدا لە ئیتالیا و فەرەنسا و بەلجیکا و ئەڵمانیا و ئیسپانیا بڵاوبووەوە.

**٢٨- دوالیزمی**

ڕێبازێکی هزرییە، هەموو شتێک دابەش دەکات بۆ دوو ڕێگا، یان بۆ دوو گوتە، یان بۆ دوو توخم، یان هەموو شتێک لە دوو بنەڕەت وەردەگرێ، هەر کاکڵەیەک، یان هەر شێوەیەک لە کاکڵە بە زیادەیی، یان کەمی ڕەت دەکاتەوە و وەرناگرێ، ساڵی (١٧٠٠) هیوم مەسەلەی دوالیزمی هێنایە بەرباس بۆ ئەوەی ڕای لاهووتیەتی مانوی تێ بگات.

**٢٩- جەدەل**

ئەم ناوە لە کرداری یۆنانییەوە هاتووە واتای (دیالۆگ) دەگەیەنێ بە ڕەگەز ماناکەی (هونەری دیالۆگ)ی دەگەیاند، یان (قسەکردن)، یان (مشت و مڕ) ئەرستۆ وتی کە (زینون ئەلئەبلی) جەدەلی هێناوەتە بەر باس کە بەو جیاوازیانە وای لە بەرامبەرەکانی کردووە هەندێ ئەنجامی دەستگیر ببێ کە خۆبەدەستەوەدانی پێوە دیار نەبووە، بەڵام سوکرات جەدەلی پراکتیزە کرد.

**٣٠- ئەنجامگیری**

یەکێکە لە زاراوەکانی لۆژیک، بۆ ئەو ڕێگایانە بەکاردەهێنرێ کە پێشەکییەکانی ڕاستیان تێدایە لە ڕووگەی لۆژیکیشەوە دەبێ ئەنجامەکەشی ڕاست بێت، هەروەها کردارێکی هزرییە لەسەر بنەڕەتی پێوانەکانە (normes) ئەنجامەکانی ئەو پێوانانەی کە پێوەندن بە هۆشی تاک و لە زۆر لایەنەوە لەگەڵ بنەماکانی لۆژیک و یاساکانیدا وێک دەچن.

**٣١- حەتمیەت**

ڕێبازێکی فەلسەفیە لە بارەی ئەو پێوەندییە ئاڵوگۆڕە شەرعیە و بابەتیەی لەنێوان هەموو دیاردەکان و هۆی ئەو مەرجدارێتییەی هەیانە بەرامبەرەکەی ڕێبازی ناحەتمیەتە ln determinisme کە مۆرکی هۆکارەکی گشتی نکوڵی دەکات،

**٣٢- سوودگەرایی**

قوتابخانەیەکی فەلسەفی ئینگلیزییە داهێنەرەکەی فەیلەسووفی ئینگلیزی جیرمی بینشام (١٧٤٨-١٨٣٢) بووە، کە وای دەبینی زانستی ئاکار و زانستی دەروونی پاڵپشت دەبن بە ڕاستی بە کاکڵەکان و دەقەکەشی دەڵێ بەختیاری لە ناخۆشی و ئازار و تاڵی باشترە لە پرەنسیپی ڕێبازی سوودگەراییە لای جیرمی بینشام.

**٣٣- میتۆد**

فێرکردنێکە لە بارەی ڕێکخستنی لۆژیکی ژێرخانی چالاکی ڕێگاو کەرستەکان، میتۆدەکانی زانست ڕێبازێکە لە بارەی پرەنسیپی ژێرخانی ئەپستمۆلۆژی زانستی و شێوە و ڕەفتارەکانی، میتۆدیانەی لێکۆڵینەوەی زانستی گشتی- مادیەتی دیالێکتیکی و مێژوویی.

**٣٤- ئەپستمۆلۆژی**

لقێکە لە فەلسەفە کە سەرقاڵی ئەو گرفتە فەلسەفیانەیە کە لە تیۆری زانیندا دەردەکەون، ئەپستمۆلۆژیا بایەخ بە پێناسەکردنی زانین دەدات و ئەو چەمکانەی پێوەندیان بە زانینەوە هەیە سەرچاوە و پێوانەکانی زانین چەشنە شیاوەکانی زانین لەگەڵ پلەی هەر یەکێکیاندا، هەروەها ئەو پێوەندیەی لەنێوانی ئەوەدا کە دەزانێت و ئەو بابەتەشدا کە زانراوە.

**٣٥- ئەزموونگەری**

لە وشەیەکی یۆنانییەوە هاتووە، بەکارهێنانی ئەو میتۆدانەی کە لەسەر ئەزموونی کردارەکی هەڵدەستن، واتە ئاراستەیەکی فەلسەفییە ئەزموونی هەستپێکراو بە یەکەم سەرچاوە دادەنرێ بۆ ئەپستمۆلۆژی تەواوەتی، ئەزموونگەری بەشێوەیەکی تایبەت بەرهەمی چەند فەیلەسووفێکی یەک لەدوای یەکەکان بوو پێشەوایانی (لۆک، بارکل، هیوم، مل)، (ئەزموونگەری ئایدیالیستیانە بارکل، هیوم، ماخ) ئەزموونگەرایی لۆژیکی لە هەموو هەستەکاندا قان دەدرێت و نکوڵیش لەوە دەکات کە جیهانی بابەتی لەسەر بنەمای ئەزموون دادەمەزرێ. (ئەزموونگەرایی مەتریالیزمی بیکۆن، هۆبز، لۆک، سەنتریالیزمە فەرەنسییەکانی سەدەی هەژدەیەم)

جیهانی دەرەکی کە بابەتیانە بوونی هەیە لەسەرچاوەی ئەزموونی هەست دادەنرێ. سنووردارکردنی ئەزموونگەری لە سیفەتی ڕەهایی میتافیزیکی بۆ ئەزموون و بۆ ئەپستمۆلۆژی هەستی دیاری دەکرێ و بۆ کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئەپستمۆلۆژی عەقڵانی (چەمکەکان/ پێوەرەکان)..

**٣٦- عەقڵانیەت**

ئەو بیرکردنەوە و ڕەفتارە هوشیاریەیە کە لەگەڵ بڕیارەکانی لۆژیک و ئەپستمۆلۆژی ئەزموونگەری دەگونجێ، فەلسەفەی خۆرئاوایی بۆ ماوەیەکی درێژ کە لە (٢٠٠٠) ساڵی ڕەبەق بە پاڵپشتی ئەو فەلسەفەیە دەڕۆیشت، دەقەکەشی دەڵێ (عەقڵانیەت، یان هۆکار سیفەتێکی کاکڵەییە کە جنسی بە شەریەت جیادەکاتەوە) زانای کۆمەڵناسی بەریتانی پرۆفیسۆر (هوب هوس) لە تیۆرەکانیدا پشتی بە پرەنسیپی عەقڵانی بۆ پێشکەوتنی بەشەریەت بەستووە و بەکاری هێناوە، وای دەبینی کە پرەنسیپێکی توخمانەیە و دەتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ بۆ ئەنجامگیری هاوکێشەی نێوان لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی، هەروەها زانای کۆمەڵناسی ئەڵمانی (ماکس ڤێبەر) زاراوەی عەقڵانیەتی بەشێوەیەکی زۆر بەکارهێناوە و زیاتر لە زانا کۆمەڵناسەکانی تر.

**٣٧- پۆستیڤیزم**

پێڕەوێکی فەلسەفیە کە پێی وایە بیری مرۆڤ تەنیا دەرک بەو دیاردانە دەکات کە بەرهەڵستێ لەگەڵ ئەو یاسا و ڕێسایانەی ڕێکیان دەخات، دامەزرێنەری ئەم پێڕەوە ئۆگست کومت (١٧٩٨-١٨٥٧)، پرەنسیپی ستێرکی فەلسەفەی پۆستیڤیزم پێشکەوتنی مێژوویی کۆمەڵگا و سروشتی سۆسیۆلۆژی وەک زانستێکی سەربەخۆ ڕاڤە دەکات، ئەم بیروباوەڕەی ئۆگست کاریگەری کردە سەر زۆربەی فەیلەسوفان بەتایبەتی لە ئینگلتەرا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەندێ فەیلەسوف زاراوەی پۆستیڤیزیان بەکارهێناو توانیان قوتابخانەیەکی فەلسەفەی سەربەخۆ دروست بکەن بەشێوەی قوتابخانەی (پۆستێڤیزم)ی لۆژیکی، یان قوتابخانەی ئەزموونگەری لۆژیکی.

**٣٨- گوتە**

ئەو چەمکە سەرەکی و بنەڕەتیانەیە کە تایبەت و هەڵوێست و دیاردە و کاکڵە گشتییەکان لە واقیع و ئەپستمۆلۆژیدا ئاوەژوو دەکات لە ئەنجامی گشتاندنی پێشکەوتنی ڕاستەقینەی ئەپستمۆلۆژی مومارەسەی کۆمەڵایەتی دروست بوو، گوتە بنەڕەتەکانی مەتریالیزمی دیالیکتیکی (مادده، بزاوت، شوێن و کات، چۆنایەتی، چەندایەتی، دژبەیەک، هۆکاری، پێویست و ناکاوەکی، کرۆک و فۆرم، توانایی و واقیع، کاکڵە و دیاردە.. تاد، لەگەڵ پێشکەوتنی واقیعی بابەتی و زانینی زانستیانە، ئەرستۆ لە زاراوەیەکی یاساییەوە هێناویەتی کە واتای (تاوانبارکردن)ی دەگەیاند تا وای لێ هات چوار چێوەکەی گەورەکرا و بەو هەموو شتە دەوترا کە لە بارەی شتێکەوە بوو کە درۆ، یان ڕاست بوایە، گوتەزاکانی ئەرستۆ بە چەند دامەزراوێک پۆلێن دەکرێن ئەوەی بوونی هەیە ئەوا لەژێریدا دەنووسرێ، یان ئەوەتا کاکڵە بن، یان چۆنایەتی، یان چەندایەتی بن، ئەرستۆ (١٠) گوتەزای باس کردووە، بەڵام زۆرجار ناوی هەندێکیانی دەهێنا، (ئەلکندی) لەزمانی یۆنانیەوە لە کتێبێکی ئەرستۆوە گۆڕیویەتیە سەر زمانی عەرەبی و ناوی لێناوە (قاطیغوریاس- المقولات) (بیرس) ئەو گوتەزایانەی پۆلێن کرد بۆ سێ بەش:

أ- گوتەزای پلەی یەکەم (ڕووکەشی خۆرسکی شتەکان).

ب- گوتەزای پلەی دووەم (توخمی دوالیزمی لە پسپۆریدا).

ج- گوتەزای پلەی سێیەم (بەردەوامییە لە هزردا).

**٣٩- ئینسکلۆپیدابیەکان**

دەزگای چاپکردن و بڵاوکردنەوەی لوبریتونی پاریس هەر لەسەرەتاوە مەبەستی گۆڕینی (الموسوعە)ەی ئینگلیزی بوو کە (افرایم تشیمبرز ١٧٢٧) بڵاوی کردەوە، کاتێ دیدرۆ و دالمبیر سەرنووسەرێتی مەوسوعەیان دابەش کرد، چوارچێوەی پرۆژەکەیان گەورەکرد تابووە (مەوسوعە و فەرهەنگی میتۆدی بۆ زانست و هونەر و پیشەکان) (١٧٥١-١٧٦٥) ئەم دانراوە، حەقدە بەرگی گەورە بوو کە گەورە فەیلەسووفان و بیرمەندانی فەرەنسا نووسراوەکانیان تێیدا بڵاودەکردەوە، ستێرک لەو مەوسوعەیەدا مەبەستی دانی زانیاری بوو بە خوێنەر لە هەموو بوارێکی زانستیدا بە تایبەتی گرنگیان بە ئاراستەکردنی پراکتیکی زانستیانەدا بوو لە بواری پیشەسازی و بازرگانی و هونەردا، ئەم بیرمەند و فەیلەسووفانە شتیان تێدا دەنووسی، دیدرۆ، جان جاک ڕۆسۆ، مونتسکیو، ڤۆلتێر، مارمونتیل هاوڕێی ڤۆلتێر، بوخون، دی هولباخ، سەرەڕای ئەو تەنگ و چەڵەمانەی تووشی دیدرۆ و مەسوعەکەی دەبوونەوە، بەڵام دیدرۆ کۆڵی نەدەدا و لە ساڵی (١٧٦٥) دوا ژمارەی دەرکرد کە هەموو مەوسوعەکەی لە حەڤدە بەرگدا گرتبووەوە، مەوسوعە وەک بزووتنەوەیەکی فەیلەسووفەکان سەری هەڵدا و

سەرەڕای جیاوازی نێوانیان، بەڵام داهێنانێکی ئاوەزی بەهێز و زەینی بەشەری بوو کە فەرەنسا لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا بەرهەمی هێنا، بەمەش مەبەستە گەورەکەی دیدرۆ هاتە دی کە ئەمە بوو (گۆڕینی ڕێگاکانی بیرکردنەوەی باو) مەوسوعە شوێنێکی گرنگی هەبوو لە مێژووی پێشکەوتنی ئایدیۆلۆژی بۆرژوازی فەرەنسادا لە سەدەی هەژدەیەم کە هەموو شتێ دەگەڕێتەوە بۆ دیدرۆ (١٧١٣- ١٧٨٤) کە بە گەورەترین فەیلەسووف و بلیمەتترین بیرمەندی مادی فەرەنسی سەدەی هەژدەیەم دادەنرێ.

**٤٠- پێشوەخت**

گوزارشتێکی لاتینییە واتای ئەوەی لەپێشدا هاتووە، لە بەرامبەر (بعدي) دوایی (ئەوەی دوای ئەوەدێ) ئەرستۆ ئەم دوو زاراوەیەی لە ماوەی ئەسکولاتیەدا کردە نێو ئەپستمۆلۆژیاوە بۆ گۆڕینی دوو گوزارشی زاراوەیی، ئەرستۆ جیاوازی کردە نێوان ئەوەی لە پێشەوەیە لە سیستەمی سروشتدا، یان چ شتێک زیاتر لە پێشەوەیە لەوەی کە لە پێشووترە بۆ ئامادەیی هەڵماڵین، یان ئەوەی لە پێشوودا زانیمان پێش هەر شتێکی تر. هەندێ ڕاستی هەیە بۆ نموونە: وەک (ئاگر دەسووتێنێ) یان (ئاو لە خوار دامەنی چیاوە سەرناکەوێ بۆ لووتکە) ئەمانە لە ڕێی زانینمانەوە دەیزانین پێش ئەوەی توانایی ڕاڤەکردنمان هەبێ بۆی وەک، بۆچی دەبێ وابێ؟ بۆ ئەوەی هۆکارەکانی بدۆزینەوە، پێویست ناکات کە زانینمان بەرامبەر یان ئەزموونی بێت، ئەمەش زانستی نییە بە مانایەکی تەواو، لە سەدەی حەڤدە هەموو وشەی (قبلي) واتای (هەمووی) پێویستی دەگەیەنێ، سەربەخۆیە لە خیبردوە، بەڵام وشەی (بعدي) بەکارنەهێنرا، وشەی (قبلي) چووە جێگەی کە بەرامبەر وشەی (ئەزموونی) بوو کە واتای هەر شتێک ڕاوەستاوە لەسەر خیبرە، تا وای لێهات وشەی (قبلي) بەسەر سێ چەمکدا دابەش دەکرێ:

أ- ڕێ نیشاندەرەکان.
ب- کێشەکان.
جـ- بیروباوەڕەکان.

**نووسەر لە چەند دێڕێکدا**

* برتراند آرثر وليم ايرل رسل)ی سێیەم (١٨٧٢- ١٩٧٠) فەیلەسووف و زانای لۆژیک و کەسایەتیەکی بەناوبانگی بەریتانییە، ماتماتیک و فەلسەفەی لە زانکۆی کیمبردج خوێندووە و لە ساڵی (١٩٨٤) لەوێش وانەی وتووەتەوە و دەرچووی هەمان زانکۆ بووە و لە زۆربەی زانکۆکاندا وانەی وتووەتەوە. بەشدارییەکی مەزنی لە پێشکەوتنی لۆژیکی ماتماتیکی نوێدا کردووە، لەگەڵ وایتهدی فەیلەسووفدا هەوڵی داوە بنەڕەتی لۆژیکی بۆ ماتماتیک تەواو بکەن. هەروەها هاوبەشیان لەگەڵ یەکتریدا کردووە لە کتێبی (بنەڕەتەکانی ماتماتیک)دا زۆر بابەتی فەلسەفیانەی لە بارەی تەنگ و چەڵەمەکانی زانستی سروشتی نووسیوە، زۆری بەرهەم هەبووە لە ئاکار و سیاسەت و پەروەردەدا، لە ساڵی (١٩٥٠) خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی وەرگرتووە، بە هەڵوێستی ئاشتیانە و چەکداماڵین و دارمانی چەکی ئەتۆمی بەناوبانگە لەپێناو ئەوەشدا دووجار زیندانی کراوە بەتایبەتی کە دژی هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو، لە زینداندا دوو کتێبی دەرکردووە (دەروازەیەک بۆ فەلسەفەی ماتماتیکی) و (شیکردنەوەی ئاوەز) و فەلسەفەکەی لە ئایدیالیستی سەرەتاییەوە بەرەو ڕیالیزمی توند چوو. جیهانی بە چەند ڕووداوێک دەزانی کە جیاوازی نەبوو لەنێوان ئاوەز و ماددەدا تەنیا لە ڕێگەی دروستبوونەوە نەبێت، ئەو کاتەی کە ڕووداوەکان نە ئاوەز بوون و نەماوە، ڕێبازەکەی ناونا (یەکانیەتی بێ لایەن).

**سەرچاوە:**

کتێبی: حكمة الغرب، الجزء الثاني، الفلسفة الحديثة والمعاصرة.
تاليف: برتراند رسل- ترجمة فؤاد زكريا- ص١٤٣-٢٠٦.

# زمانەوانی نوێ و (فەردیناند دی سوسێر)ی ڕابەر

ئا: عاطف عەبدوڵلا فەرهادی

زمان ڕەنگدانەوەی بیرو ڕۆشنبیری مرۆڤایەتییە، لە کۆمەڵگا دوو کاری گرنگ ئەنجام دەدات: کاری یەکەمیان کاتی ئێستاییە، بەوپێیەی کە هۆیەکی پێوەندیکردنی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگایە، واتا لە قسەکەرەوە بۆ مێشکی گوێگر دەگوازتەوە، کاری دووەمی کاتە مێژوویییەکەیەتی وەکو هۆکارێک بەکاردێت بۆ پاراستنی کەلتووری زانستی و هونەری و ڕۆشنبیری کۆمەڵگا و گواستنەوەی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر. لەبەر ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە لە ژیانماندا هەیەتی بووەتە مایەی سەرنجڕاکێشانی لێکۆڵەر و زانایان بە درێژایی سەدەکان و لە چەند ڕوانگەیەکی جیاوازەوە تێی بڕوانرێ و بخرێتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە. لێکدانەوەی زمان ڕێگایەکە بۆ تێگەیشتن لە مێشکی مرۆڤ، ئەم بابەتەش بابەتێکی فراوانە و تەنیا پێوەندی بە زانستی زمانەوە نییە، بەڵکو پێوەندی بە زانستەکانی تریشەوە هەیە. بۆیە زۆربەی زانایان و شارەزایان دەیانەوێ بەهۆی زمانەوە بگەنە ڕاستی و لە دیاردەکان بگەن و کێشەکان چارەسەر بکەن.

کێشەی پەیدابوونی زمانیش یەکێکە لەو کێشانەی تاوەکو ئێستا یەک لا نەبووەتەوە، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەگەڵ پەیدابوونی زمان نووسین نەبووە، بەڵکو ماوەیەکی دوور دوای ئەو نووسین پەیدابووە، بەڵام نەزانراوە دەقەکانی سەرەتایی چۆن بووە و کامە شێوەی نووسین بەسەرەتای نووسین دادەندرێت تا لێی بکۆڵدرێتەوە.

بەم پێیە کە زمان ئاڵۆزترین دیاردەیە و زمانەوانیش هەوڵدانە بۆ لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی ئەو دیاردە ئاڵۆزە، هەر لەکۆنەوە مرۆڤ بایەخی بە زمان داوە و هەوڵی داوە لە چۆنیەتی پێکهاتن و کارکردن و گۆکردن و گۆڕانی زمان بکۆڵێتەوە، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیش ئەم لێکۆڵینەوانە لە سەدەیەکەوە بۆ سەدەیەک و لە شوێنێکەوە بۆ شوینێکی تر و لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر گۆڕانی بەسەرداهاتووە. بەگوێرەی (بیروڕا و بۆچوون و فەلسەفە و ئایین و زانستەکان و تاد)ی هەر سەردەمێک لە ڕوانگەیەکی دیاریکراو ڕوانراوەتە زمان، واتە لە هەر ماوەیەکی مێژوویی دیاریکراو لەپاڵ شتێکەوە لە زمانیان کۆڵیوەتەوە تا وای لێهات زمانەوانی سەربەخۆیی خۆی وەرگرت و وەکو زانستێکی سەربەخۆ سەیر کرا. لە ئەنجامی ئەمە چەندین بیروبۆچوونی جیاجیا و ڕێباز و قوتابخانە بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی زمان هاتوونەتە ئاراوە، کە هەر ڕێباز و قوتابخانەیەکیش چەند بنەما و تایبەتییەکی ڕوون و ئاشکرای هەیە.

ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەماندا هەوڵمان داوە بەپێی توانا باس لە یەکێک لەم قوتابخانە زمانەوانییانە بکەین

که (قوتابخانەی نوێ)یە و تیشک بخەینە سەر ڕابەری ئەم قوتابخانەیە کە (فەردیناند دی سوسێر)ە لەگەڵ ئەو کارانەی ئەنجامی داون لە بواری زمانەوانی.

### فەردیناند دی سوسێر

دامەزرێنەر و بناغە دارێژی زانستی زمانی تازە فەردیناند دی سوسێر مامۆستای فەلسەفە لە پاریس و جەنەوا«١». لە جنیف لە دایک بووە، لە ساڵی (١٨٧٩) بابەتێکی بەناونیشانی (نامەیەک دەربارەی ڕێکخستنی سەرەتایی دەنگەکان لە زمانی هیندۆئەوروپی)«٢» بڵاوکردۆتەوە لە ساڵی (١٨٨٠) پلەی دکتۆرای بە دەست هێنا کە نامەی دکتۆراکەی دەربارەی زمانی سانسکریتی بوو. لە ساڵی (١٨٨١) وەکو مامۆستا لە پەیمانگای خوێندنی باڵا لە پاریس دەستی بە وانەوتنەوە کرد، بابەتی بەراوردکاری زمانی هیندۆئەوروپی دەگوتەوە. دوای (١٠) ساڵ واتە لە ساڵی (١٨٩١) گەڕایەوە جنیف بوو بە مامۆستای زمانەوانی گشتی، لە ساڵی (١٩١٣) کۆچی دوایی کرد«٣».

سوسێر سەرەتا لەناو کۆمەڵگای زانستی بەهۆی هەڵوێستەکانیەوە ناسرا کە بەشدارییەکی بەرچاوی کرد لە زانستی زمانی هیندۆئەوروپی و بەراوردکردنی هەردووکیان. دوای خوێندنی لە (لیبزج) لەگەڵ ئەندامانی قوتابخانەی ڕێزمانی نوێ.

سوسێر هەوڵی ئەوەی داوە کە لێکۆڵینەوەی زمانەوانی بکاتە کارێکی زانستی ورد، بەهۆی ئەو هۆکار و ڕێبازانەی کە لە زانستەکانی تر بەکاریان هێناوە، بۆ نموونە شیلایشەر بیروبۆچوونەکانی لەژێر کاریگەری داروین داناوە«٤» بە هەمان شێوە سوسێر لەسەر دەستی زمانەوانە ناودارە نوێیەکان پێگەیشت، بەڵام لەوان زیاتر تێیپەڕاند و بیر و بۆچوونی ئەوانی ڕەتکردەوە و ڕێبازێکی تایبەت بەخۆی و جیا لەوانی گرتەبەر، زانیارییەکی تەواوی هەبوو لەسەر بیر و بۆچوونی شلایشەر (زانای زمانەوانی سروشتی) و جیبرون (زانای زمانەوانی جوگرافی) و تیۆرەکانی زانای کۆمەڵناسی دۆرکایم کە زانایەکی فەرەنسی بوو لە زانستی کۆمەڵناسی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر سوسێر هەبوو«٥». لە ڕێگەی ئەمەوە بنەمای لێکۆڵینەوە زانستییەکانی لەسەر زمان دانا لە سەدەی بیستەم. دوای ئەوەی زانستی کۆمەڵناسی بەرەو سەربەخۆبوون ڕۆیشت.

(دۆرکایم) بانگەوازی ئەوەی کرد کە زانستی کۆمەڵناسی سەربەخۆیە، چونکە لە کۆمەڵی دیاردە دەکۆڵێتەوە کە هیچ زانستێکی تر بەشداری تێدا ناکات، هەروەها بنەما و بیری نوێی ئەم زانستەی دانا و هەنگاو و یاساکانی دەستنیشان کرد بەپێی ئەو بۆچوونەی کە تێیدا دەڵێ (ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییانە ڕەوشت و هەڵسوکەوت و هەستن کە چەندین تایبەتمەندیی هەیە و دەتوانرێ بە ئاسانی تێبینی بکرێ و لە دەرەوەی هەستی مرۆڤدایە، بەڵام هێزێکی وای هەیە کە بیانەوێ و نەیانەوێ خۆی بەسەر کەسەکاندا پێ بسەپێنێ)«٦». ئەم بیروڕایانەی (دۆرکایم) کاریان لە سوسێر کرد بەتایبەتی لە ڕووی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانەوە، سوسێر هەوڵی دا لێکۆڵینەوە زمانییەکەی زانستی بێ و خۆی لە کارەکانی (دۆرکایم) دۆزییەوە.

بایەخ و گرنگیدان بە بابەتەکانی زمان بەشێوەیەکی گشتی لە محازەرەکانیدا بە ڕادەیەکی زۆر دەردەکەوێ، بەناوبانگترین و گرنگترین کتێبی (چەندین وانە لە زانستی زمانەوانی گشتی- محاضرات في علم اللغة العام)«٧» کە کۆمەڵێ محازەرات بوو، دوو لە قوتابییەکانی کە (شارل بالی و کلود سیشیهای)«٨» بوون کۆیان کردەوە و لە ساڵی (١٩١٦) بەرگی یەکەمی دەرچوو، بەرگی دووەمیش لە ساڵی (١٩٢٢) دەرچوو. لە تەمەنی (٢١) ساڵیدا کتێبێکی نووسیوە بەناوی (Menoirosurlesyestam)، کە لە پاریس بڵاوکرایەوە، ئەو ڕێبازە بنچینەییانەی سوسێر کە کاریان کردووەتە سەر سەرهەڵدانی زمانەوانی ئەمانەن:

١- زمان بابەتی لێکۆڵینەوەی زمانەوانییە.
٢- ڕەهەندی زمانەوانی ناوەوە و ڕەهەندی زمانەوانی دەرەوە.
٣- لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئێستایی.
٤- زبان و قسەکردن.
٥- زمان کۆمەڵێ پەیڕەوە.
٦- زمان و نووسین.
٧- سیمولوجیا.

بەشێوەیەکی گشتی بیروڕا نوێیەکانی سوسێر و کارە گرنگەکانی لە (٣) تەوەرەدا خۆی دەگرێتەوە کە کارێکی زۆریان کردۆتە سەر دارشتنی بیری زمانەوانی ئەوروپی ڕۆڵێکی باڵای هەبوو لە بەرەو پێشبردنی زمانەوانی کە ئەوانیش:

١- زمان دوو لایەنی هەیە مێژوویی ئێستایی.
٢- زبان و زمان و گوتن.
٣- پەیڕەو لە زماندا.

**١- لایەنی ئێستایی و مێژوویی:**

سوسێر گرنگی بەوە دەدات کە دەبێ لە دوو لایەنی تارادەیەک جیاواز و بەرامبەرەوە سەیری زمان بکرێت، ئەویش لایەنی ئێستایی و مێژوویی زمانە.

**أ- لایەنی ئێستایی**

سوسێر لایەنی ئێستایی زمان وەک تەنێکی زیندوو دەبینێ کە لە بارێکدا دەژی و خاڵێک لە کاتی داگیر کردووە.«٩» واتە لێکۆڵینەوەی وەسفی زمان بە کورتی لایەنی ئێستایی کەرەستەکان و پێوەندی نێوانیان دەستنیشان دەکرێ لە رێگای (٣) تەوەرەوە ئەنجام دەدرێ (کات، شوێن، چین).

**١- کات/** دەبێ ئەو ماوەیە دیاری بکرێ کە لێکۆڵینەوەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت، کات گرنگە، چونکە زمان بە تێپەڕبوونی کات دەگۆڕێ بە شێوەیەک کە هەستی پێناکرێ، چونکە گۆڕانەکە زۆر لەسەرخۆیە و لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕان کارێکی بەردەوامە. ئێمە لەکاتی لێکۆڵینەوەکەدا زمانەکە وا دادەنێین کە نەگۆڕ و چەسپاوە بۆیە لێکۆڵەر هەوڵی ئەوە دەدا کە ماوەی لێکۆڵینەوەی زۆر نەخایەنێ، ئەگەر زمانە لێکۆڵراوەکە ئێستایی بێ.

**٢- شوێن/** کاتێ لێکۆڵینەوە لەسەر زمانی کۆمەڵگایەک ئەنجام دەدرێت پێویستە شوێنی ئەو کۆمەڵگایە دەستنیشان بکرێ، چونکە زمان بەپێی گۆڕینی شوێن دەگۆڕێ.

**٣- چین/** زمان تەنیا بە گۆڕینی کات و شوێن ناگۆڕێ، بەڵکو هۆکاری تریش هەیە دەبێتە هۆی گۆڕینی ئەویش ئاستە و زمان لە ئاستێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ. ئەو شێوازەی کە قسەکەر بەکاری دێنێ بۆ پێوەندیکردن یان ئەو بوارانەی کە زمانی شیعر و پەخشان و...تاد، تیایدا جیادەکاتەوە. واتە زمان بەپێی ئاستی قسەکەر دەگۆڕێ. وەک زمانی ئەدەبی لەزمانی بازاڕی جودایە، یان زمانی قوتابخانە.

**ب- لایەنی مێژوویی**

مانی وەسفکردنی بەردوپێشچوون و گەشەی زمانە بەپێی تێپەڕبوونی کات.«١٠» مەبەستی خستنەڕووی ئەو گۆڕانکاریانەیە کە تووشی زمانێک هاتووە لە شوێنێکی دیاریکراودا بەپێی تێپەڕبوونی چەند قۆناغێکی مێژوویی جیاواز. کەواتە زمان بریتییە لە زنجیرەیەک گۆڕانی بەدوای یەکتر داهاتوو کە بەردەوام لە گۆڕاندایە. ئەگەر بڕوانینە زمانە زیندووەکانی ئێستا دەبینین زۆر گۆڕانکاری تێدا کراوە و ڕێژەی گۆڕانکارییەکانیش لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێ. بۆ نموونە ئێستا بە گرانی دەتوانرێ لە دەقێکی کۆنی وەک ئاوێستا بگەین و بیخوێنینەوە، چونکە زۆر گۆڕانی بەسەرداهاتووە.

لایەنی مێژووییش پشت بە لایەنی ئێستایی دەبەستێ، چونکە ئەگەر بە پێویستمان زانی لە لایەنی مێژوویی زمان یان لە گۆڕانکاری مێژووی ئەو زمانە بکۆڵینەوە ئەوا پێویستمان بە لایەنی ئێستایی زمانەکە دەبێ و دەبێت وەسفی قۆناغێکی پێش ئەو زمانە و دوای ئەو زمانە بکەین. سوسێر بۆ ئەم مەبەستە باشترین نموونەی خستۆتە ڕوو کاتێ کە زمانی بە یاری شەترەنج چواندووە، بۆ ئەوەی یاریکەرەکە شوێنی داشەکان بزانێ پێویستی بە شوێنی داشەکان دەبێت، داشەکان بەردەوام لە گۆڕاندانە و پێویستیمان بەوە نییە کە ئەو داشانە چۆن گەیشتوونەتە ئەو شوێنە، زمانیش بەردەوام وەکو یاری شەترەنج دەگۆڕێ«١١».

سوسێر پێوەندی نێوان لایەنی ئێستایی و مێژووی زمان لە هێڵکارییەکی وەک ئەمەی خوارەوە دەبینێ کە (أ ب) تەوەرەی ئێستایی زمانە و (ج د) تەوەرەی مێژوویی زمانە. (أ ب) بارێکە بە ئارەزوو هەڵبژێردراوە لە کاتدا لەسەر هێڵی (ج د) کەوتووەتە سەر خاڵی (م).

(ب ج) ڕێڕەوە مێژووییەکەی زمانە کە هەر بەردەوام دەبێ.

(م) وەک بارێکی نەگۆڕە دەبینرێ.

شایانی سەرنجە کە ئەم دوو لایەنەی زمان دژ بەیەکتر ناوەستن و هەمیشە دەبێ لە خاڵێکدا یەک بگرنەوە و گرنگ لەوەدایە کە ئەم دوو تەوەرەیە دەبێ لە یەکتر جیابکرێتەوە، چونکە هەریەکێکیان ئامانجی خۆی هەیە و جیاکردنەوەیان دەبێتە هۆی تێکەڵی و سەرلێشێوان.



## ٢- زمان و زبان و گوتن

یەکێکی تره لە کاره گرنگەکانی سوسێر جیاکردنەوەی ئەم سێ بەشەی زمانە و زوو پەی بەوە برد کە زاراوەی زمان تەماوییە و چەندین واتا دەگرێتەوە لەم بارەیەوە سێ واتای جیاواز لە یەکتری جیاکردۆتەوە و لە پاشان گرنگی بە دوانیان داوە، لای سوسێر زمان لە دوو لایەن پێکهاتووە (زبان و گوتن).

**زمـــان/** بریتییە لەو توانایەی کە لە مرۆڤدا هەیە، بە لای سوسێر لە دوو لایەن پێکهاتووە (زبان و گوتن)، دیاردەیەکی گشتییە و دوو لایەنی هەیە کۆمەلایەتی و تاکی، پێویستی بە بارودۆخێکی گونجاو هەیە بۆ سەرهەلدانی، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەڕوا، ئەم توانایە وای لە مرۆڤ کردووە سوود لە بەشەکانی ئاخاوتن وەربگرێ بۆ دروستکردنی دەنگ هەرچەندە لەسەرەتا ئەم کۆئەندامە بۆ هەناسەدان دروست کراوە، زمان بەم پێیە تایبەتییەکی ڕەوشتییە و بابەتێکی بلاوە و زانستەکانی تری وەک زیندەوەرناسی و دەروونناسی و... تاد سوودی لێ وەردەگرن، بەکەلکی زمانەوانی نایەتن، چونکە کاری زمانەوانی دۆزینەوەی یاسا و دەستوور و کەرەستەکانی زمان و پێوەندی نێوانیانە.

**زبـــان/** دیاردەیەکی کۆمەلایەتی هاوبەشە، مرۆڤ بەکاری دێنێ، بەلام ناتوانێ کاری تێبکات و بیگۆڕێ و لەژێر دەسەلاتیدا نییە و بەشێوەیەکی گشتی یەکسانە بە (ڕێزمان+ وشە+ گۆکردن)، بوونێکی فیزیاوی نییە جگە لەوەی کە یاساکانی تێدا بەشێوەیەکی ڕاست و دروست بەکارهاتووە.

زبان لای سوسێر لە توانستی لای چۆمسکی نزیک دەبێتەوە، بەوەی کۆمەڵێک پێڕەوە لە نیشانەکان کە پێوەندی بیرو وێنە دەنگییەکانە لە هۆشی مرۆڤدا هەلگیراون و خاوەن ڕۆنانێکی سەربەخۆیە.

زبان لای سوسێر وەکو کۆگای هۆشی وایە لای (دۆرکایم)، کە بەشێوەیەکی تەواو و هەراش لای هیچ کەس بەدی ناکرێ، هەموو کەس هەولی ئەوە دەدا کە چۆن بیەوێ ڕێک بکەوێ بۆی بەو شێوەیە بدوێ، ئەمەش سەد لەسەد نایەتە دی، لە هەمان کاتدا پەیڕەو کردن و پابەندبوونی یاساکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت (زبانیش لە گوتندا نەبێت دەرناکەوێت)«١٢». زبان هەمـایەتی زمـانە و خـود و ناوەڕۆک و تەودرەی زمانە، سوسێر دەقاودەق بە کۆگای دادەنێت لە مێشکی مرۆڤدا هەیە و لە کۆگاکەدا بەشەکانی ئاخاوتن بە ڕیز و ڕێک و پێکی دانراون، وەک (ناو، ڕاناو، ناوەلناو،.. تاد) لەسەر یاسایەکی تایبەت ڕیزکراون، تا ژینگەکە فراوان بێ کەرەستەکان زۆرتر دەبن و کۆگاکە فراوانتر دەبێت.

کەواتە زبان چونکە کەرەستەکانی قسەکردنی تێدایە و هەموو کەرەسە و یاساکانی تێدا کۆبووەتەوە، بەشی هەرە گرنگە و ئیشی سەرەکی زمانەوانە، هەر لەبەر ئەمەشە سوسێر گرنگی بەم لایەنە داوە و کردوویەتی بە بنەمای لێکۆلینەوە زانستییەکەی.

**گـوتن/** ئەو چالاکییە هەستپێکراوە کەسییەیە کە دێتە گوێ. لەکات و شوێنی دیاریکراودا و لەژێر دەسەلاتی قسەکەردایە و تارادەیەک سەربەستە لە هەلبژاردنی وشە و ڕێکخستنی لەکاتی گۆکردنیدا«١٣». گوتن ئەو زمانەیە کە مرۆڤ بەکاری دێنێ لەیەک کۆمەلگادا و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ، بەلام هەموویان ڕێزمان و بنەما و یاسایەکی زمانی و ڕەوشتی گشتی بەیەکەوەیان دەبەستێت.

ئاشکرایە زبان دەرناکەوێ لە ڕێگای گوتنەوە نەبێت، زمـــانەوان بۆ لێکۆلینەوەی زبان پەنا دەباتە بەر ژمارەیەکی زۆر لە گوتن، چونکە بریتییە لەو دەنگانەی کە مرۆڤ بەکاری دێنێ بۆ دەربڕینی واتاو کەرەستە دەنگییەکان، شتێکی بەرجەستەیە و لێکۆلینەوەیان لەسەر دەکرێ چونکە تەنیا لە هەموو زماندا گوتم بەرچاو دەکەوێ و دەتوانرێ لێی بکۆلدرێتەوە.

سوسێر زیاتر بایەخ بەگوتن دەدا بایەخێکی ئەوتۆ بە نووسین نادات، چونکە نووسین ڕەمزە بۆ گوتن و دووجار لە ڕاستییەوە دوور دەکەوێتەوە، بۆ نموونە ئەو شتەی لە مێشکدا چەسپاوە بە گوتن دەری دەبڕین کە هێمایە بۆی، پاشان نووسینیش ڕەمزی گوتنەکەیە.

**دی سوسێر جیاوازی گوتن و زبانی لەم خالانەدا خستە ڕوو:**

١- گوتن چالاکییەکی تاکەکەسییە، جۆراوجۆر و تێکەلاوە بەکەلکی لێکۆلینەوەی زانستی نایەت.

٢- لێکۆلینەوەی زانستی پێویستی بە بابەتێکی دیاریکراو هەیە بۆ ئەوەی شیبکرێتەوە بەشەکانی لێکبدرێتەوە، لەبەر ئەوەی گوتن چالاکییەکی دیاریکراو نییە و تاکییە، واتە بابەتێکی دیاریکراو نییە ناتواندرێ لێکۆلینەوەی زانستی لەسەر ئەنجام بدرێ.

٣- زبان لە شێوەیەکدایە کە پێکهاتووە لە کۆمەلێ وێنەی دەربڕین لە مێشکی مرۆڤدا هەلگیراوە، ئەم وێنانە هاوبەشن لەنێوان قسەکەراندا و لەژێر دەسەلاتدا نییە، ناتوانرێ کاری تێبکرێ بەشێوەیەکی گشتی یەکسانە بە (ڕێزمان+ وشە+ گۆکردن).

٤- زبان کـۆمـەڵێک داب و نەریتـە بەشـێـوەیەکی ئامـادەکراو لە نەوەکـانی پێشـەوە وەردەگـیـرێن لەگـەڵ ئەوەشـدا تووشی گـۆڕانکاری زۆر کـەم دەبێ کـە دەکرێ لەکـاتی لێکۆڵینەوەدا پشـتگوێ بخـرێ، بەڵام گـوتن تووشی گۆڕانکاری وادەبێ کە ناتوانرێ پشتگوێ بخرێ.

٥- لێکۆڵینەوە لە گـوتن بە مـەبەسـتی لێکدانەوەی زبانە، واتە هۆیەکـە بۆ گـەیشتن بە زبان کـە زمـانەوان لێکدانەوەی بە ئەرکی سەرەکی خۆی دادەنێ.

**پەیڕەو لە زماندا**

داهێنانی سـێـیـەمی سـوسـێـر ڕوونکردنەوەی بیـری (پەیڕەو)بوو کـە بەلای زۆر لە زمـانەوانەوە گـەورەترین کاری کردۆتە سەر زمانەوانەکانی دوای خۆی. بۆ ئەوەی لە هەڵوێسـتی بگەین دەبێ یەکـەم جـار بە کـورتی لە بیروڕای سوسـێر دەربارەی واتا بکۆڵینەوە. سوسێر وای بۆ دەچێ کـە واتا دوو لایەنی هەبێت: فـۆرم و واتا یان ناو و ناولێنراو، بەڵام لەسـەر ئەوەش سـووره کـە ئەم دووانە لە یەکـتـر جـیـاناکرێنەوە و پێـوەندی نێـوانیـان لەخۆوەیە. سوسێر پێوەندی نێوان فۆرم و واتا بە (ڕەمز) دادەنێ و بە لایەوە ڕەمـز یان هێـمـا دانەیەکی سـەرەکی پێوەندیکردنە. لەبەر ئەوەی (هێما) بەشێکە لە (زمان) خۆشی بریتییە لە پێوەندی. هێما دانەیەکی هۆشەکییە. بەم جۆرە زمان بەلای سوسێرەوە بریتییە لە (پەیڕەوێکی هێمایی).

ئەم پێناسەی سوسـێر بۆ زمانی کرد کە دەڵێ (زمـان بریتییە لە پەیڕەوێکی هێمایی کە تێیدا هێماکان یەکتری تەواو دەکـەن) بیـرێکە زۆربەی زمـانەوانەکـانی ئەمـڕۆ لەسەری ڕێک دەکەون هەرچەندە کەمیان زاراوەی (هێما) بەکـاردێنن. ئەم بیـرە لای سـوسـێـر زۆر گـرنگە، چونکە بۆچوونی بۆ (ڕۆنان) دیاری دەکـات. هەمـوو ڕسـتـەیەک لای سوسێر کۆمەڵە هێمایەکە کە بەدوای یەکتر دادێن، هەر هێـمـایەک هەندێ واتا دەدا بە ڕستـەکە بەگشـتی یا هەر هێـمـایەش لەگەڵ هەمـوو هێـمـاکـانی تری زمانەکـەدا بەرامبەر دەوەستێ، ئەم زنجیرە هێمایە پێوەندی ئاسۆیی دروست دەکەن پێوەندی دراوسێتی لە ڕستەدا بۆ نموونە لە ڕستەیەکی وەک (کاوە ئەمڕۆ دێت) پێوەندییەکی ئاسۆیی بەدی دەکرێ کە سێ هێماکە بەهۆی ڕێزبوونەوە دەیدەن.

ئەم زنجیرە هێمایە کە لە ئاستێکی قووڵتر و ڕوونتردا لە (ناو+ ئاوەڵکاری کات+ کار) پێکهاتووە بە (ڕۆنان) ناودەبرێ. جگە لەم پێوەندییە پێـوەندییـەکی سـتـوونیش هەیە کە بریتـیـیـە لە پێوەندی هەر هێـمـایەکی ناو ڕستـە لەگەڵ هێمایەک یان چەند هێمایەکی تر کە لەم ڕستەدا نابینرێن، بەڵام بەشێکن لە زمانەکە هەمووی. بۆ نموونە هەر لەم ڕستەدا هێمای یەکەم (کاوە) لەگەڵ هێمای تری وەک (دارا، قـوتابی،.. تاد) پێـوەندی دەبەسـتێ. ئەم کۆمەڵە هێمایە پەیڕەوێکی بچووک دروست دەکەن کە (ناو)ە، کـە تەنیـا ئەندامـێکیـان لەم ڕسـتـەیەدا بەکارهاتووە. بە هەمان شێوە هێماکانی تریش هاوشێوەی خۆیان هەیە و پەیڕەوێکی بچووک دروست دەکەن وەک (ئاوەڵکاری کات، کار،...تاد).

**کۆتایی**

لە کـۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەتوانین ئەم خـاڵانە دەستنیشان بکەین:

١- بەهۆی ئەم قوتابخانەیەوە و لەسەر دەستی سوسێر زمانەوانی بوو بە زانستێکی سەربەخۆ بەهۆی ئەو ڕێباز و دەستکەوتانەی کـە زانسـتـەکـانی تر بەکـاریان هێناوە بەتایبەتی زانستی کۆمەڵناسی.

٢- بیـر و بۆچوونەکـانی ئەم قـوتابخـانەیە کـاریـان لە زمانەوانی سەدەی بیستەم کرد و بووە بناغەیەکی پتەو بۆ دامـەزراندنی قـوتابخـانەی ڕۆنانکاری (بلۆم فـیلد) و بەرهەمهێنان و گواستنەوەی (التحويلي و التوليدي)ی (چۆمسکی).

٣- زمـانەوانی لەژێر دەسـەڵاتی بەراوردکـاری و مـێـژوویی ڕزگـارکـرد و توانی تا ڕادەیەکی زۆر گیروگرفتەکانی زمانەوانی چارەسەر بکات.

٤- سـوسـێـر زوو پەی بەوە برد کـە زاراوەی (زمـان) تەمـاوییە و توانی (زمـان و زبان و گـوتن) لە یەکـتـر جیابکاتەوە و گرنگی بە دووانیـان بدا و زمان لای ئەو لە دوو لایەن پێکدێت (زبان و گوتن).

٥- دوو لایەنی زمـانی لەیەکتر جـیـاکـردەوە، لایەنی ئێستایی و لایەنی مێژوویی، بەپێویستی زانی وەک دوو لایەنی جیاواز تەماشا بکرێن.

٦- زمان بە پەیڕەو دادەنێ، بەڕای ئەو زمان بریتییە لە پەیڕەوێکی هێـمـایی و هێـمـاکـان یەکـتر تەواو دەکەن و پێوەندی ئاسۆیی و ستوونی هەیە لەنێواندا.

**پەراوێزەکان:**

١- د. وریا عـومـەر ئەمین، دیسـاسـۆر دامـەزرێنەری زمانی تازە.

٢- د. میشـال زکـریا، الألسنة (علم اللغـة الحديثـة) المبادىء والاعلام، الطبعة الاولى، (١٩٨٠)، ص٢٢٣.

٣- د. وریا عومەر ئەمین، هەمان سەرچاوە.
٤- ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی، مێژووی زمانەوانی، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٦٦)، کانوونی یەکەم ٢٠٠١، ل٤٥.
٥- د. وفاء محمد کامل، ص٢٢٦.
٦- ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی، هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.
٧- أ. عمر الحسن، اللسانیات والترجمة، مجلة الاداب الأجنبیة، دمشق، العدد ١١٥، صیف(٢٠٠٣).
٨- د. هـ. روبنز، ترجمة د. احمد عوض، موجز تأریخ علم اللغة في الغرب، عالم المعرفة، الكويت، تشرين الثاني (١٩٩٧)، الفصل الثامن، ص٣١٩.
٩- د. محەمەد مەعرووف فەتاح، (زمانەوانی)، موحازەراتی خوێندنی باڵا (ماستەر)، (١٩٩٣).
١٠- د. محمد حسین عبدالعزیز، مدخل الى علم اللغة، جامعة القاهرة، (١٩٨٣)، ص٣٠٤.
١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٤٩.
١٢- د. میشال زكریا، نفس المصدر، ص٢٢٨.
١٣- د. میشال زكریا، نفس المصدر، ص٢٢٨.

**سەرچاوەکان:**


١- د. وریا عومەر ئەمین، دیساسۆر دامەزرێنەری زمانی تازە.
٢- د. میشال زكریا، الألسنة (علم اللغة الحدیثة) المبادئ والاعلام، الطبعة الاولى، (١٩٨٠).
٣- ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی، مێژووی زمانەوانی، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٦٦)، کانوونی یەکەم، (٢٠٠١).
٤- د. وفاء محمد کامل.
٥- أ. عمر الحسن، اللسانیات والترجمة، مجلة الاداب الأجنبیة، دمشق، العدد ١١٥، صیف (٢٠٠٣).
٦- د. هـ روبنز (ترجمة: د. احمد عوض)، موجز تأریخ علم اللغة في الغرب، عالم المعرفة، الكويت، تشرين الثاني (١٩٩٧).
٧- د. محەمەد مەعرووف فەتاح، (زمانەوانی)، موحازەراتی خوێندنی باڵا (ماستەر)، (١٩٩٣).
٨- د. محمد حسین عبدالعزیز، مدخل الى علم اللغة، جامعة القاهرة، ١٩٨٣.

# ئەوەی مێژوونووسان و ڕۆژهەڵاتناسان و گەڕیدەکان لە بارەی کورد و وڵاتەکەیان نووسیویانە (١٢٥٨ - ١٩٢٠)

نا: خالید سابیر
(سلێمانی)

لە دوای داگیرکردنی بەغدا لەلایەن مەغۆلەکانەوە بەرابەری سەرکردەکەیان (هۆلاکۆ) لە ساڵی (١٢٥٨) زایینییدا و پاشتریش بوونە هۆی ماڵ وێرانکردنی گەلانی عیراق و بەتاڵانبردنی سەروەت و سامانەکەی، لە دوای مەغۆلەکانەوە داگیرکەرانی وەک جەلائیریبەکان و تەیموری لەنگ و دوا حوکمڕانی لەلایەن (ئاق قۆینلۆ - بەرخی سپی)یەوە بە هەمان شێوەی پێش خۆیان درێغیان لە کوشتن و بڕین نەکرد دەرحەق دانیشتوانی عیراق بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی. دواتر سەفەوییەکان لە ساڵی (١٥٠٨ز)دا دەستیان بەسەر عیراقدا گرت و ئەمانیش بە هەزارانیان لەخوێندا گەوزاند و موڵک و ماڵی هاووڵاتیانیشیان زەوت کرد، لەوکاتەی کە گەلانی عیراق سەرتاپا لە دژی ئەو حوکمڕانییە زۆرداره جەنگان، لەلایەن ئەو دەستە ستەمکارەوە بە ئاگر و ئاسن وەڵام دەدرانەوە. ئەوەندەی نەمابوو گەلانی عیراق لە چنگ ئەوانە ڕزگاربن و لەولاوە و لە ساڵی (١٥٣٤ز) داگیرکەرێکی ناوچەکە- عوسمانیەکان- دەستیان بەسەر سەرانسەری خاکی عیراق و کوردستاندا گرت. لە سەردەمی ئەمانەدا عیراق لە جیهان و ناوچەکە دابڕا و بواری کشتوکاڵی و بازرگانی بەشێوەیەکی گشتی دووچاری تەنگ و چەڵەمە هات. لەسەردەمی والی (بەکر صوباشی) لە ساڵی (١٦٢٢ز)دا گەلانی ناوچە ژێر دەستەکان و بە تایبەتی گەلی کورد داوای سەربەخۆییان دەکرد و بەردەوام بەگژ عوسمانیەکاندا دەچوونەوە، لەو سەروبەندانەدا بۆ جارێکی تر سەفەوییەکان ناوچەکەیان داگیرکردەوە و ماڵوێرانی و سەرگەردانییان بۆ خەڵکەکە هێنایەوە، ئەوانە تەنیا کوشتن و کاولکردن نەبێت هیچی تریان پێنەبوو، لەپاش حوکمی (٢٠) ساڵی دڕندانەیان، بۆ جارێکی تر عوسمانییەکان عیراقیان داگیرکردەوە و ئەمجارەیان وا چاوەڕوان دەکرا کە بارودۆخی دانیشتوانی وڵاتەکە خۆش بکەن، بەڵام باجێکی زۆریان خستە سەر هاووڵاتییان و ئەو کارەیان تا ساڵی (١٧٤٨) زایینی درێژەی کێشاو لەم ساتەدا (مەمالیکەکان) فەرمانڕەواییان گرتە دەست و ناوچەکە تارادەیەک ئارامی باڵی بەسەرداکێشا و ئەم ئارامییە بە زۆری لەنێوان شوورای شاری بەغدادا خۆی بینییەوە نەک بەشی زۆری ناوچەکە کە تووشی شەڕی خێڵایەتی و تایەفەگەری بوودوە و لە ئەنجامی ئەوەدا ژمارەیەکی زۆر سەرگەردان و پەراگەندە و تیاچوون. لەسەردەمی ئەواندا ژمارەیەک ئینگلیز بە دەرکەوتن لە شێوەی وەکالەتی بازرگانیدا کە لەلایەن کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات لە بەسرە فەرمانیان بۆ دەچوو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ناوچەکە. حوکمی مەمالیکەکان لە ساڵی (١٨٣١ز)دا کۆتایی پێهات و بۆ ماوەی (٨٣) ساڵ گەلانی عیراقیان دووچاری نەهامەتی و هەژاری و ناکۆکی و شەڕی خێڵایەتی کرد. پاش ئەمان عوسمانیەکان بۆجاری سێیەم عیراقیان گرتەوە و تا ساڵی (١٩١٧) تێیدامانەوە، کە

لەو ساڵەدا لەلایەن سوپای ئینگلیزەکانەوە بەرابەری جەنەراڵ (ستانلی مۆد) توانرا لەشکری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە باشوور و ناوەندی عیراقدا وەدەربنرێت.

جەنەراڵی ناوبراو کە هاتە ناو شاری بەغداوە بە دانیشتوانی ئەو شارەی ڕاگەیاند (سوپاکەمان نەهاتووەتە ناو شار و زەویەکانتانەوە بە مەبەستی داگیرکردن و دوژمنایەتی کردن، بەڵکو بە مەبەستی ئازادکردن هاتوون). سروشتی بارودۆخی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری گەلی کورد هەر لە هاتنی هۆلاکۆوە تاوەکو (هنری دوبس) مەندوبی سامی بەریتانی لە عیراق، واتە بە درێژایی (٦٦٨) ساڵ، تەنیا دواکەوتن و ماڵوێرانی و نەهامەتی بووەوە، جگە لە چەند جارێک نەبێت کە توانیویتی لە چەند شوێنێکی کوردستاندا میرنشین بۆ خۆی پێکەوە بنێت و جۆرە ئازادییەک بەرقەرار بکات، وەک میرنشینی سۆران، بۆتان، ئەردەلان و دواهەمینیان میرنشینی بابان بووە، بەلام ئەو میرنشینانە بە تەواوی سەربەخۆ نەبوون و نەشیان توانیوە ئاوات و ئامانجەکانی خەڵکی کوردستان بەدی بهێنن، بەلام جار ناجار هەوڵی چڕیان داوە بۆ ئەوەی بتوانن ئەو ئامانجانەی گەلەکەیان- کە سەربەخۆیی کورد و ڕزگارکردنی خاکی کوردستان بووە- وەدی بهێنن و گەلەکەشیان لە چاوچنۆکانی دوژمنان بپارێزن، لەو سەروبەندانەدا ئەوەی نووسرابێت لەسەر مێژووی عێراق و نەتەوەی کورد نووسراوی هەندێک مێژوونووسی کورد و فارس و عەرەب و تورک و گەشتکەرە ڕۆژهەلاتیەکان و ئەوروپییەکان و تۆمارەکانی کۆمپانیای هیندی- ڕۆژهەلاتی و گەڕیدەکان و ساڵنامە و چەندین نووسراوی ترە لەو بارەیەوە. لەنێو ئەوانەدا کەسانی زانستخواز و ئایینی و خولیایانی گەشتکردنی تێدایە، هەروەها ئەوانەشی کە ژیانیان دەخستە مەترسییەوە بۆ دۆزینەوە و گەڕان بە دوای خاکی تر و خەڵکانی تردا. ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین لە نووسراوی بەشێکی زۆی ئەو گەشتکەر و گەڕیدە و کارمەندی کۆمپانیایانەی کە لەناوچەکەدا بوون، دردەکەوێت کە یاداشت و بیرەوەرییەکانیان بوونەتە هۆی چاوکردنەوەی حکومەتەکانیان بە زانینی بارودۆخ و ڕەوشی ئەو خەڵک و وڵاتانەی کە بۆی چوون و هاوکات ئەو نووسراوانەیان بوونەتە ڕێ خۆشکەرێک بۆ دانانی پلانی داگیرکردنی ئەو وڵات و ناوچانەی کە سەردانیان کردووە. زانایانی کۆمەڵناسی بە پێی ئەو نووسراوانە هەستاون بە توێژینەوە لەسەر زمان و کەلەپوور و نەریت و هەڵسوکەوتی گەلانی ناوچەکە بە گەلی کوردیشەوە. هەموو ئەوانە چوونەتە ناو خەڵکەکەوە و فێری زمانەکەیان بوون و دەرکیان بە نهێنی بیروبۆچوون و مەبەستیان کردوون، لەو گەڕیدە و گەشتکەرانە (کلۆدیۆس جیمس ریچ، فرایزەر، والیس برج، ج.س.بکنگهام، مێجەرسۆن، س.ج ئەدمۆندز). لە مێژوونووسانی کورد لەو بوارەدا، شەرەفخانی بەدلیسی (١٠٠٥) کۆچی بەرانبەر (١٥٩٦)ی زاینی لە کتێبی (شەرەفنامە)«١»دا، عەبدولقادر ئیبن ڕۆستەم بابان لە کتێبەکەی (سیر الاکراد)دا، ئەم دوو مێژوونووسە بە فارسی کتێبەکانیان داناوە.

مێژوونووسانی عەرەب لەدانراوەکانیاندا بایەخیان بە نووسینەوەی کەسایەتییەکان و وەسفکردنی مەزارگاکان و شوێنە پیرۆزەکان داوە، هەموو ئەمانە دوورن لە واقیعی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەو سەردەمانە. هەروەها بە داخەوە هەندێک لەو مێژوونووسە عەرەبانە باسەکانیان تەنیا بۆ شەڕی فارسی- صەفەوی- و عوسمانیەکان تەرخان کردووە، لەلایەکی تریشەوە ئەو ڕاپەڕین و جوولانەوە نەتەوەییانەی ئەو سەردەمانە کە لە دژی داگیرکەران بەرپاکراون، پشتگوێ خستوون و هەتا هەندێک جار بە جوولانەوەی جوداخوازی و یاخییان لە قەڵەم داون و وەسفی خاقانی سەفەوی، یان سولتانی عوسمانی کردووە،(٢) لەنێو ئەو مێژوو نووسانە، لەسەدەی حەڤدەیەمدا (فتح الله بن علوان الكعبي)، (١٦٤٥) لە کتێبی (زادالمسافر)، لە سەدەی هەژدەیەمدا (مصطفى بن كمال الدين الدمشقي ١٧٢٦)، لە کتێبی (كشط الصدا وغسل الران) و (عبدالرحمن السويدي)، (١٧٣٩) لە کتێبی (حديقة الوزراء) عثمان بن السند البصري (١٧٧٤) لە کتێبی (مطالع السعود). لە سەدەی نۆزدەیەمدا، یاسین بن خيرالله العمري (١٨٠٥) لە دانراوەکانیدا:

١- غاية المرام.
٢- الدر المكنون.
٣- غرائب الأثر،

محمد بن أحمد المنشيء البغدادي (١٨٢٠) لە گەشتەکەی (رحلة المنشيء البغدادي،«٣» عبدالواحد باش أعيان لە کتێبی (زبدة التواريخ) محمد أفندي العمري لە کتێبی (منهل الأولياء)، محمد بسام التميمي لە کتێبی (الدر الفاخرة)، سليمان الصائغ لە کتێبی (تأريخ الموصل)، عباس العزاوي لە کتێبی (تأريخ العراق بين احتلالين) لە هەشت بەرگدا. لەم بارەیەوە مێژوو نووسە عوسمانییەکان بەوانەشەوە کە خەڵکی عیراق بوون و بە زمانی تورکی دەیاننووسی دووبەش بوون، بەشێکیان- کە ڕەسمی بوون-

نووسینەکانیان تەرخان کردبوو بۆ پیاهەڵدان بە سوڵتانی عوسمانییەکان، بەشی دووەمیان کە نارەسمی بوون، چی بە بیریاندا بهاتایە دەیاننووسی، هەردوو بەشەکە ئاوڕیان لە گەلانی عیراق نەدەدایەوە لە نووسینەکانیاندا و بە زۆری باسی جەنگی نێوان سەفەوی و عوسمانیان دەکرد. لە مێژونووسە ڕەسمییەکان ئەمانەبوون: (نعیما ١٥٩٢-١٦٢٩، راشد ١٦٦٠-١٧٢١، (چلبي زاده ١٧٢٢-١٧٢٨، صبحي ١٧٣٠-١٧٤٣، عزي ١٧٤٤-١٧٥٠. لە مێژوونووسە نارەسمییەکان: ئەمیرالی تورکی (سیدی عەلی ریس ١٥٥٣ لەکتێبی (ئاوێنەی مەمالیکەکان)، حاجی خەلیفە (١٦٢٥) لە کتێبی (جیهان نامە)، ئەولیای چەلەبی (١٦٥٥) لە (گەشتەکانیدا)«٤»، مورتەزا ئەفەندی نەزمی (١٦٧٧) لە کتێبی (گوڵشەن خولەفا)، ڕەسول حاوی کەرکوکلی (١٧١٨) لە کتێبی (باخچەی وەزیرەکان لە مێژوو و ڕووداوی بەغدای زەورادا)، دەوری ئەفەندی (١٧٢٠) لە (گەشتەکەیدا) سلێمان طالب کەهیە (١٨٨٠) لە کتێبەکانی:

(١) جەنگی ئێرانییەکان.
(٢) حکومەتی مەمالیکی.
(٣) ئاوێنەی زەورا.

سەبارەت بە گەشتەکان و تۆمارەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی و دانراوە بیانییەکان، هەندێ: لەوانە نزیکن لە خەیاڵ و نامۆیی و ئاوەژووکردنی ڕاستییەکان، بەشی زۆربەی ئەو نووسراوانە لە بارەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و شوێنەوار و ڕامیاری و مژدەدەر و سەرچڵی و بەکارهێنانی هونەری و سەربازی و گەشتکردن و زانینی ناوچەکان بووە. گەشتکەرەکان دووبەش بوون، یەکەمیان گەشتکەرە- گەڕیدە- ڕۆژهەڵاتییەکان وەک: عەبدولکەریم کشمیری (١٧٣٦)، میرزا ئەبوتالیب خانی هیندی (١٨٠٨)«٥»، ئەم دووانە گەشتەکەیان بە زمانی فارسی نووسیوە، جۆزیف ئەمین ئەرمەنی (١٧٦٨)، سالدانهای هیندی (١٩٠٦)، ئەمان گەشتەکەیان بە زمانی ئینگلیزی نووسیوە، حەبیب شیحا (١٩٠٨) گەشتەکەی (ویلایەتی بەغدا)ی بە زمانی فەڕەنسی نووسیوە.

بەشی دووەم لەگەڕیدەکان، گەڕیدە ڕۆژئاواییەکان و سەرچڵەکان- المغامرون- و کارمەندانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی و سیخوڕانی نووسینگە بیانییەکانە، ئەمانە بە بیرەوەری و تۆمار و نووسراوەکانیان بەناوبانگن، لە ناودارترینیشیان ئەمانەن بەپێی سەدەکان.

لە سەدەی سێزدەیەمدا: گەڕیدەی ئیتاڵی (مارکۆپۆلۆ ١٢٩٨)«٦»، لە سەدەی شازدەیەمدا: بازرگانی بوندوقیە (قەیسەر فیدریگۆ ١٥٦٣)، پزیشکی ئەڵمانی (لیونهارت راوولف ١٥٧٢)«٧»، دەوڵەمەندی ئیتاڵی (گاسپار و بالبی ١٥٧٩)، بازرگانی لەندەنی (جۆن نیوبری ١٥٨١)، سەرچڵی ئینگلیزی ناسراو (ئەنتونی شیرلی ١٥٨٩).

لە سەدەی حەڤدەیەمدا: پورتوگالی (پدروتەکسیرا ١٦٠٤)، (دیللاڤالە)، ئیتاڵی (١٦١٦)، کەرملی فەڕەنسی (ر.ب. فیلیپ ١٦٢٩)، (جان باپتیست تاڤرنیە)ی فەڕەنسی (١٦٣٨)«٨»، (دولوا ١٦٣٩)ی فەڕەنسی، فەڕەنسیەکی تر (سیوربویلی لۆگوز ١٦٤٩)، (جوزیە سبستیانی ١٦٥٦)ی ئیتاڵی، ڕاهبی باوک (ڤنشنسو ١٦٥٦)ی ئیتاڵی، قەشەی فەڕەنسی (م. کاریە ١٦٧٢)، (و. داپر ١٦٨١)ی ئەڵمانی. لە سەدەی هەژدەیەمدا: (پول لوکاس ١٧٠٤)ی فەڕەنسی، کاپتنی سکۆتلەندی (أ. هاملتۆن ١٧٢١)، (م. ئوتەر ١٧٣٦)ی فەڕەنسی، (دومینیکو لانزا ١٧٥٤)ی ئیتاڵی، برین پیچ لەکۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی (د. ئیڤز ١٧٥٨)، زانای دانیمارکی (کارستن نیپور ١٧٦٠)«٩»، ئیبراهام پارسونز ١٧٧٤)ی ئینگلیزی، (ئیلیس ئاروین ١٧٧٦)ی ئینگلیزی، (م.د. دانڤیل ١٧٧٩)ی فەڕەنسی، کارمەند لە کۆمپانیای هیندی، ڕۆژهەڵاتی (د. کامپل ١٧٨١)، (دومینیکو ستینی ١٧٨١)ی ئیتاڵی، (کونت دی فیریە سوڤبون ١٧٨٥)ی فەڕەنسی، فەرمانبەر لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی (س. هاول ١٧٨٨)و هاوڕێکەی (مێجەر ج. تایلور ١٧٩٠)، (ج. أ. ئۆلیڤیە ١٧٩١)ی فەڕەنسی«١٠»، (د. ولیەم ڤنسنت ١٧٩٢)ی ئینگلیزی، اج. جاکسون ١٧٩٧)ی ئینگلیزی«١١».

لە سەدەی نۆزدەیەمدا: (جان جۆزیف مارسیل ١٨٠١)ی فەڕەنسی، (ئەدرین دوپەر ١٨٠٧)ی فەڕەنسی، (جۆن ماکدوناڵد کینیر ١٨١٠)ی ئینگلیزی، (ج. س. بکنگهام ١٨١٦)«١٢»ی ئینگلیزی ، مولازم لە دامەزراوەی قوتابخانە سەربازییەکان (ولیەم هور ١٨١٧)، وێنەکێشی ئینگلیزی (سێر ڕۆبرت کیر پورتەر، ١٨١٨) و (ج. ریمۆن ١٨١٨)ی فەڕەنسی، فەرمانبەر لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە بەغدا (کلۆدیۆس جیمس ریج ١٨٢٠)«١٣»، کارمەند لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی (جۆرج کیپل ١٨٢٤)، سەربازی ئینگلیزی لە کەشتیگەلی هیندی

(ج.ر.ویلستسد ١٨٣١)، مژدەدەری ئینگلیزی (ئەنتونی نوریس گروفز ١٨٣١)، نێردراوی دیپلۆماسی (جیمس بیلی فرەیزەر، ١٨٣١)«١٤»، (د. جیمس روس ١٨٣٤)، عەقیدی ئینگلیزی (ر. أ. چسنی ١٨٣٥)، (ث. فونتانیە ١٨٣٥)ی فەڕەنسی، جێگری سەرۆکی نێردراوی سەربازی بەریتانی بۆ ئێران موقەدەم (ج. شیل ١٨٣٦)، مێجەری ئینگلیزی (دبلیو ث. ئانسۆرس ١٨٣٧)، کاپتن لە سوپای هیندی (ر. مینیان ١٨٣٩)، شوێنەوارناسی ئینگلیزی (ئۆستن هنری لایار (١٨٣٩)، (کۆماندەر لە دەریاوانی شاهانەی هیندی، ئەفسەر (جیمس فیلکس جۆنز ١٨٤٨)، (و.ک. لوفتس ١٨٤٩)ی ئینگلیزی، (هـ. پیترمان ١٨٥٤)ی ئەڵمانی، نێردراو لە دەستەی جنێفی جوگرافی (ئا. لکیمنست ١٨٥٦)، ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی (گوی ئۆبرت ١٨٦٣)، (جۆن ئاشەر ١٨٦٤)ی ئینگلیزی، (جۆزیف سیرنیک ١٨٧٥)ی ئەڵمانی، سێر (والیس بدج ١٨٨٦)«١٥»ی ئینگلیزی، خاتوو (مەدام دیولافوا ١٨٨٧)«١٦»ی فەڕەنسی، (أ. بلوینا-(١٨٩٠)ی بەریتانی، (هـ.س. کوپر ١٨٩٢)ی ئینگلیزی، کاپتنی ئینگلیزی (ف.ر. ماونسل ١٨٩٢)، قەشەی سکۆتلەندی (دبلیو أ. ویگرام ١٨٩٧)«١٧».

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا: ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسی الکیمان هوار ١٩٠١، نەقیبی ئینگلیزی (مارک سایکس ١٩٠٢)، سەرچڵی ئینگلیزی خاتوو (لوسا جیب ١٩٠٩)، نەقیبی ئینگلیزی لە کەتیبەی تۆپ هاوێژی شاهانە (برترام دیکسن ١٩٠٩)، مێجەری ئینگلیزی (نای. ب. سۆن ١٩٠٩)«١٨»، نەقیبی ئینگلیزی لە کەتیبەی (٤٠) لە سوپای هیندی (ت. فاول ١٩١٠)، (داڤید فرەیزەر ١٩١٠)ی ئینگلیزی، (چارلس باربەر ١٩١٦)ی ئینگلیزی، (سی. ج. ئەدمۆندز ١٩١٩)«١٩»ی ئینگلیزی، خاتوو (گرترودبیل ١٩٢٠)«٢٠»، (دەبلیو، ئار. هی ١٩١٨-١٩٢٠)«٢١»، (سێر ئارنۆڵد ویلسن ١٩٢٠)«٢٢». ئەم سیانەی دوایییان بەریتانین.

**پەراوێزەکان:**

١- ئەم کتێبە شاعیری ناسراو (هەژار موکریانی) کردی بە کوردی و لە ساڵی (١٩٧٣)دا لەلایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە لە بەغدا چاپ کرا.

٢- هەندێک لەوانە لەو بوارە دەردەچن وەک (ئیبن بەتوتە) لە گەشتەکەیدا لە ساڵی (١٣٠٤) زایینی.

٣- بەفارسی نووسراوە و (عەباس عەزاوی) کردوویەتی بە عەرەبی و ساڵی (١٩٤٨) لە بەغدا چاپ کراوە.

٤- ئەدیبی ناسراو (سەعید ناکام) چەند بەشێکی کرد بە کوردی و لەژێر ناوی (کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا) لە ساڵی (١٩٧٩) چاپی کرد.

٥- ناوی کتێبەکە (رحلة أبي طالب خان الى العراق و أوروبة سنة ١٧٩٩)یە. د. مستەفا جەواد لە فەڕەنسییەوە کردوویەتی بە عەرەبی، لە ساڵی (١٩٦٩) لە بەغدا چاپی کردووە.

٦- وەرگێڕی کتێبەکە (عەبدولعەزیز جاوید)ە، (١٩٧٧) قاهیرە.

٧- سەلیم تەها تکریتی کردوویەتی بە عەرەبی و بەناوی (رحلة المشرق) چاپی کردووە، (١٩٧٨)، بەغدا.

٨- وەرگێڕی کتێبەکە (گورگیس عەواد)ە، لەژێر ناوی (العراق في القرن السابع عشر). (١٩٤٤)، بەغدا.

٩- (مەحموود حوسێن ئەمین) کردوویەتی بە عەرەبی بە ناوی (رحلة یئبو- الی العراق فی القرن الثامن عشر). بەغدا، (١٩٦٥).

١٠- وەرگێڕی کتێبەکە (یوسف حەبی)یە. لەژێر ناوی (رحلة أولیڤیە الی العراق (١٧٩٤-١٧٩٦)، (١٩٨٨)، بەغدا.

١١- گۆڕینی بۆ عەرەبی لەلایەن (سەلیم تەها تکریتی) لە دووبەشدا بەناوی (رحلتي الی العراق). (١٩٦٨-١٩٦٩) بەغدا.

١٢- (بەهادین نوری) مستەسەریفی سلێمانی کردوویەتی بە عەرەبی و (محەمەد حەمەباقی) کردوویەتی بە کوردی (گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠) سەقز (١٩٩٢).

١٤- (جەعفەر خەیات) هەندێک بەشی بەناوی (رحلة فریزر الی بغداد (١٨٣٤) کردووە بە عەرەبی، ئەدیبی کورد (ئومێد ئاشنا) ئەو بەشەی باسی کوردستان دەکات، کردوویە بە کوردی و لە ساڵی (١٩٩٨)دا لە چاپی داوە.

١٥- (فوئاد جەمیل) ئەو کتێبەی کردووە بە عەرەبی و لە دوو بەشدا چاپی کردووە بەناوی (رحلات الی العراق).

١٦- ناوبراو چەند گەشتێکی بۆ شارەکانی (بەسرە- بابل- بەغدا) کردووە.

١٧- ناوی کتێبەکە (مهد البشریة أو الحیاة في شرق کردستان)ە. پارێزەر (جرجیس فتح الله) کردوویەتی بە عەرەبی. لە بڵاوکراوەکانی کتێبی (التآخي)یە.

(١٩٧١). بەغدا.
١٨- ناوبراو چەندین وتار و کتێبی تری لەسەر کورد هەیە. بەناوبانگترینیان (رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين و كردستان). وەرگێڕ (فوئاد جەمیل) لە دووبەشدا چاپی کردووە.
١٩- ناونیشانی کتێبەکە (كرد و ترك و عرب). پاریزەر (جرجيس فتح الله) کردوویەتی بە عەرەبی و لە بلاوکراوەکانی کتێبی (التآخي)یە. (١٩٧١) بەغدا.
٢٠- چەندین کتێبی لەسەر عیراق و نەتەوەکانی هەیە لەوانە (فصول من تأريخ العراق القريب (١٩١٤-١٩٢٠). (جەعفەر خەیات) کردوویەتی بە عەرەبی، چاپی یەکەم (١٩٤٩)، چاپی دووەم (١٩٧١) بەیرووت.
٢١- (فوئاد جەمیل) ئەو کتێبەی لە دووبەشدا بەناوی (سنتان في كردستان ١٩١٨-١٩٢٠) چاپ کردووە. بەغدا (١٩٧٣).
٢٢- وەرگێڕی کتێبەکان (جەعفەر خەیات) و (فوئاد جەمیل)ە. یەکەمیان بەناوی (الثورة العراقية) و دووەمیان (بلاد ما بين النهرين بين ولاءين) لە سێ بەرگدا.

لەم دوادواییانەدا، چەند کتێبێک لە وانە وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی عەرەبی لەلایەن چەند نووسەرێکی کوردەوە. لەوانە (رحلة المستر جيمس برانت الى المنطقة الكردية عام ١٨٣٨). لەلایەن (حوسێن ئەحمەد جاف) کراوە بە عەرەبی و لە سالی (١٩٨٩) لە بەغدا چاپ کراوە. هەروەها (یوسف حەبی) کتێبی (رحلة الى كردستان في بلاد ما بين النهرين ١٨٨٥)ی کردووە بە عەرەبی و لە سالّی (٢٠٠١) لە هەولێر چاپ کراوە.

**سەرچاوەکان:**

١- الكرد في المصادر القديمة. درايفر. ترجمة. فؤاد حمه خورشيد (١٩٨٦).
٢- صور من تأريخ العراق في العصور المظلمة. الجزء الأول. جعفر الخياط (١٩٧١) بيروت.
٣- تأريخ العراق بين احتلالين. ثمانية أجزاء. عباس العزاوي.
٤- فصول من تأريخ العراق القريب. جرترودبل. (١٩٧١) بيروت.

# بەهاکان و پەندی پێشینانمان

زەیتو شێخانی

هەموو میللەتێکی سەر رووی ئەم زەمینە جا گەورە بێت یان بچووک گەنجینەیەکی لە پەندی پێشینان هەیە، ئەم پەندانەش باس لە داب و نەریت و بەهاکـانی میللەتەکە دەکەن. میللەتی کوردیش ئەسپی خۆی لەم بوارەدا بە باشترین شێوە تاوداوە و ژیانی رۆژانەی خۆی پێ رازاندۆتەوە، هەروەها زۆر جاریش بەپێی ناوەرۆکی پەندەکان هەڵسوکەوتی کردووە.

ئێمەش لەم بابەتەدا گەشتێک بۆ ناو ئەم جیهانە فـردوانە دەکەین. بەپێی ئەو بەهایانەی کەزانایانی دەروونزانی دیاریان کردووە پەندەکان پۆلین دەکەین و شییان دەکەینەوە.

بەهاکانیش لە دەروونزانیدا چەندین پێناسەی بۆ دارێژراوە، لێرەدا هەندێک لە پێناسەکان دەخەینەروو.

بەهاکان بریتین لە رێکخستنی حوکمی عەقلی و هەڵچوونی بەرامبەر تاکەکان و شتەکان و ماناکان و رووەکانی چالاکی.

بەهاکان دەربڕینی پاڵنەرەکانی مرۆڤن و بریتین لەو شتانەی کە بەپێی ئاراستەکانمان و ئارەزووەکانمان ئاراستەیان دەکەین. هەروەها دەتوانین پێناسەی بکەین بەوەی لە گرنگیدان و هەڵبژاردن و حوکمدانە لەسەر شتێکی دیاریکراو، بەپێی کۆمەڵێک لەبیروباوەڕ و پێوەری کۆمەڵ.

دوای خستنەڕووی هەندێک لە پێناسەی بەهاکان، دەتوانین دوا پێناسە دەستنیشان بکەین وەک پێناسەیەکی ئیجرائی بۆ بابەتەکەمان، چونکە پەندی پێشینانیش حوکمدانە لەسەر هەڵسوکەوت و شتەکان بەپێی رێنمایی و ئەزموونی میللەتەکە.

بەهاکان لەسەر چەند بناغەیەک پۆلین دەکرێن کە ئەمانەن:

### لەسەر بناغەی ناوەرۆک

١- بەهای تیۆری: بریتییە لە گرنگیدانی تاک بە ئارەزووی بۆ دۆزینەوەی راستییەکان، بۆیە ئاراستەیەکی زانستی بەرامبەر بەجیهانی دەوروبەر وەردەگرێت. هەروەها لەم یاسایانە دەکۆڵێتەوە کە حوکمی شتەکان دەکات. ئەو کەسانەی ئەم بەهایەیان لا بەهێزە بۆچوونێکی بابەتی و رەخنەیی و زانستییان بەرامبەر هەڵسوکەوت و شتەکانی دەوروبەر هەیە، ئەم بەهایەش لای فەیلەسووف و زانایان دروست دەبێت.

کوردیش لەم بارەیەوە پەندی زۆری هەیە لەوانە:

- سەگ بە قوەتی کلکی هێسک دەشکێنێ.
- رۆژوو هەر دەست ناسووتێنێت رشیشی دەکات.
- دار کە لار بوو سێبەریشی لار دەبێت.
- ئەگەر پشیلە باڵی هەبا کێشکە کۆتا دەبوو.
- ئیشکەرت بمری تەگبیرکەرت نەمری.

ئەم پەندانە هەموویان پەندی فەلسەفین و بەپێی ئەو

هەڵوێست و ڕووداوانەی کە تێیدا دەوترێت، شی دەکرێنەوە.

٢- بەهای ئابووری: بریتییە لە گرنگیدانی تاک و ئارەزووی بۆ ئەو شتانەی کە سوودی ماددیان هەیە. تاک لێرەدا جیهانی دەوروبەری وەک شێوازێک وەردەگرێت بۆ گەیشتن بە پارە و سامان. ئەو کەسانەی ئەم بەهایەیان لا بەهێزە بۆچوونێکی پراکتیکیان هەیە، ئەمانەش بەزۆری پیاوی بازرگان و کارن.

کوردیش لەم بارەیەوە پەندی زۆری هەیە، لەوانە:
- هەتا ئیشی نەبێت کەس بەسەر ناکاتەوە.
- هەم زیارەت و هەم تجارەت.
- ماڵ لەچاڵ ماخۆ لە دیار.
- ساڵ دوازدە مانگ لە کورتانی خۆی دەلەوەڕێ.

پەندی یەکەم و دووەم باسی کەسێک دەکەن هەموو شتێک ئابوورییانە لێک دەداتەوە، ئەگەر سوودی ماددی تێیدا دەست نەکەوێت بۆی ناچێت.

پەندی سێیەم باسی پاراستنی ماڵ دەکات بەهۆی ئاگاداربوون و سەرپەرشتیکردن، ئەمەش یەکێکە لە چەمکە ئابوورییەکان.

پەندی چوارەم لۆمەی کەسێک دەکات کە بۆچوونێکی ئابووری قووڵی نییە، بۆیە ئەو پارە و سامانەی هەیەتی، وەبەرهەم ناهێنێت.

٣- بەهای جوانی: بریتییە لە گرنگیدان و ئارەزووی تاک بۆ هەموو شتێکی جوان لە ڕووی شێوەو گونجان، ئەو کەسانەی ئەم بەهایەیان لا بەهێزە بۆچوونێکی هونەری و داهێنان و خۆشی وەرگرتنیان لە جوانی هەیە. کوردیش هەستی بەم بەهایە کردووە، بۆیە چەندین پەندی دەربارەی دارشتووە، لەم پەندانە:
- جوانی بەدەستی کەس پێی ناوەستێ.
- چاوەک بە خۆی جوان نەبێت، بە کل جوان نابێ.
- جوانی بە نانی ناخورێ.

پەندی یەکەم و دووەم گرنگییەکی زۆر دەدات بە بەهای جوانی سروشتی. ئەو جوانییەی بە دەست دروست دەکرێت بە کەم بەها دادەنێت.

بەڵام پەندی سێیەم هەموو مرۆڤێک بە جوان دادەنێت، چونکە سەیری جوانی ناوەڕۆک دەکات نەک شێوەی دەرەوەی.

٤- بەهای کۆمەڵایەتی: لێرەدا تاک ئەم بەهایە دەردەبڕێت و یارمەتییان دەدات. لەم یارمەتیدانەش خۆشی وەردەگرێ. ئەو کەسانەی ئەم بەهایەیان لا بەهێزە بەوە جیادەکرێنەوە کە سۆز و خۆشەویستییان زۆرە.

ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری بەهای کۆمەڵایەتی تێدا زۆر بەهێزە، بۆیە پەندی زۆری لەم بارەیەوە وتووە، لەوانە:
- شیوی گەرم ئاوی ساردی تێ مەکە.
- شین و شایی دەستەوایی.
- تۆ چاکە بکە و بیدە بە ئاوا.
خەڵکیش نەزانی، لای خوا نووسراوە.
- گندۆرە هاتنە برانێ، خزم هاتنە قرانێ.

پەندی یەکەم لۆمەی ئەو کەسانە دەکات کە کارە کۆمەڵایەتییە تەواوبووەکان هەڵدەوەشێننەوە.

پەندی دووەمیش لۆمەی ئەوکەسانە دەکات کە لەخۆشی و ناخۆشییەکان بەشداری ناکەن.

پەندی سێیەمیش بە هەمان شێوە لۆمەی ئەوکەسانە دەکات کە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ماددیانە لێک دەدەنەوە.

پەندی چوارەم گرنگییەکی زۆر دەدات بە ئەنجامدانی کاری چاکە و چاوەڕوان نەکردنی پاداشت.

بەشێوەیەکی گشتی هەر چوار پەندەکە سۆز و خۆشەویستی پێوە دیارە بۆ دەوروبەر.

**٥- بەهای سیاسی: بریتییە لە گرنگیدانی تاک بە چالاکی سیاسی و کاری سیاسی و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی جەماوەر. ئەو کەسانەی ئەم بەهایەیان لا بەهێزە بەوە جیا دەکرێنەوە کە ئارەزووی سەرکردایەتییان هەیە. توانای ئاراستەکردنی خەڵکیان هەیە.**

میللەتی کوردیش بەهۆی ئەوەی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆی نەبووە و هەستی بە چەوسانەوەیەکی زۆر کردووە، پەندی زۆری لەبارەی بەها سیاسییەکانەوە وتووە، لەوانە:
- دادەنیشم گورگ دەمخوا، هەڵدەستم ئاو دەمبا.
- لەناوەندان دەخوا، لە ڕۆخان پاڵ دەداتەوە.
- ئەگەر کوڕ کوڕ بێت، تاریکە شەو زۆرە.
- دەستت بکەوێتە بن بەردە ئاشی، دەری بێنە بەهێواشی.
- سەد خۆزگە بە کفن دزی.
- دوو سەرە بەران لە مەنجەڵەکی ناکوڵێت.

تاکی کورد بەهۆی ئەو ئازار و ناخۆشییانەی لە چەوسانەوەی سیاسی بینیویە، زۆرجار نەیزانیوە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ داگیرکەران بکات، چونکە لە هەموو لایەک زەردەرمەند بووە. بۆیە پەندی یەکەمی وتووە.

پەندی دووەم لۆمەی کەسانی هەلپەرست دەکات.

پەندی سێیەم باسی ئازایەتی و هاندان بۆ تێکۆشان

دەکات.

پەندی چوارەم گرنگی دەدات بە رەفتاری عاقلانە بەرامبەر رووداوەکان.

هەروەها میللەتی کورد لەو کاتەی کە حاکمێک، یان سەرۆکێکی خراپتری لەوەی پێشوو بۆ دانراوە، وتوویەتی سەد خۆزگە بە کفن دزی.

پێشینانمان هەستیان کردووە کە پێویستە یەک حاکم لە شوێنێک هەبێت نەک دوو، بۆیە وتوویەتی دوو سەرە بەران لە مەنجەڵەکی ناکوڵێت، هەریەک لەم پەندانەی پێشوو باسی بەهایەکی سیاسی دیاریکراو دەکات.

٦- بەهای ئایینی: بریتییە لە گرنگیدانی تاک و ئارەزووی بۆ زانینی بەرد و بناغەی مرۆڤ و چارەنووسی. خاوەن ئەم بەهایە دەڵێت هێزێک هەیە زاڵە بەسەر ئەم جیهانەی تێیدا دەژین، بۆیە هەوڵ دەدات خۆی بەم هێزە بگەیەنێت. ئەو کەسانەی ئەم بەهایەیان لا بەهێزە رێنماییە ئایینییەکان لە هەموو رووێکەوە جێبەجێ دەکەن. هەروەها ئەم بەهایە بەکاردەهێنن بۆ داواکردنی رزق و کاروباری دنیا.

ئەوەی شایانی باسە زۆربەی میللەتی کورد موسڵمانە، بۆیە ئەو پەندانەی وتوویەتی لەگەڵ قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) دەگونجێت، بۆ نموونە کە دەڵێن (تەقدیر تەگبیر هەڵدەبڕێ) ئەم پەندە لەگەڵ دەقی قورئانی پیرۆز یەک دەکاتەوە کە دەفەرمووێت (قل لن یصیبنا الا ما کتب الله لنا...).

هەروەها ئەو پەندەی کە دەڵێت (بووک لەسەر زینی یا رزق و یا نەسیب) لەگەڵ دەقی قورئانی پیرۆز دەگونجێت کە دەفەرمووێت (أو یزوجهم ذکرانا و اناثا..) واتە هەموو کەسێک بەپێی ئەو نەسیبەی خوای گەورە بۆی داناوە، ژیانی هاوسەرایەتی دیاری دەکرێت.

**لەسەر بناغەی مەبەست**

١- بەهای شێوازی: واتە بەکارهێنانی شێوازەکان بۆ مەبەستی دوور وەک گەیشتن بە پلەی بەرز.

کوردیش لەم بارەیەوە دەڵێت:

- ماسی گرتن بەبێ شەرواڵ تەرکردن نابێ.
- وا دامەنیشە تەمەڵ و بەتاڵ
تا نەگری مەمک نادەی بەمنداڵ.

ئەم دوو پەندە هانی مرۆڤ دەدات بۆ هەوڵدان و تێکۆشان تا گەیشتن بە ئامانج.

٢- بەهای ئامانجی: ئەم بەهایانە خۆیان ئامانجن وەک حەز کردن بە مانەوە.

کوردیش حەز بە ژیان و مانەوە دەکات بۆیە وتوویەتی:

- کەس دوو برای پێکەوە لە قەبری نەنایە.
- عومری درێژ شەرمێ لە کەس ناکات.

**لەسەر بناغەی توند و تیژی**

١- بەها باشترەکان: واتە دیاریکردنی باشترین رەفتار، وەک رێزلێنان لە میوان.

بۆ رێزلێنانی میوان کورد لۆمەی ئەوکەسە دەکات کە رێز لە میوان نانێت. بۆیە دەڵێت (میوان چاکی خانەخێ خراپ). هەروەها بۆ رێزلێنان لە میوان، خاوەن ماڵ دڵنیا دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە خواردنی میوان نەترسێت، چونکە (میوان رزقی لەگەڵ خۆیدایە).

٢- بەها میسالیەکان: ئەم بەهایە ئەو رەفتارانە دیاری دەکات کە تکا وایە بەم شێوەیە بێت، وەک ئەو بەهایەی کە داوا لەتاک دەکات بۆ دنیای کار بکات وا بزانێت هەتا هەتایێ دەژیت، بۆ دوارۆژی هەوڵ بدات وا بزانێت بەیانی دەمرێت.

کوردیش لە بەها میسالیەکانی دەڵێت:

- نانەک و گایەکی لا وەک یەکە.
- ژنم دەوێ ژنانە، پیستە بکاتە هەمبانە.

پەندی یەکەم باسی کەسێک دەکات کە ماڵی خۆی دەبەخشێت، بەڵام شتێکی میسالییە کەسێک بگاتە ئەو رادەیەی نانەک و گایەکی لا وەک یەک بێت.

پەندی دووەم باسی جۆرە کارێکی گران دەکات کە هەموو بۆ هەمبانەیە، چونکە پێستە بە چەندین قۆناغی زەحمەتدا دەروات تا دەبێتە هەمبانە، کەواتە گەیشتن بەم لووتکەیە شتێکی میسالییە.

**لەسەر بناغەی گشتی یان بڵاوی**

١- بەهای گشتی: واتە ئەم بەهایە لەناو هەموو کۆمەڵگە باوە، جا لە شار بێت، یان لادێ، دەوڵەمەند بێت، یان هەژار... تاد. وەک گرنگی ژیانی هاوسەرایەتی. پێکهێنانی خێزان و هاوسەرایەتی لەناو کۆمەڵگەی کوردەواری زۆر گرنگی پێ دراوە، بۆیە دەڵێن (کابرا خزمت کێیە، هێشتا ژنم نەهێناوە).

٢- بەهای تایبەت: بریتییە لەو بەهایانەی کە پەیوەستن بە بۆنە تایبەتییەکان، یان هەڵوێستێک، یان چینێک، یان رۆڵێکی کۆمەڵایەتی تایبەت، وەک بەهاکانی تایبەت بە ژن هێنان.. تاد.

کوردیش لەم بارەیەوە دەڵێت:

- شایی بۆ دووانە گڕ لە هەموانە.

- تیرەکت بەبن هەنگری بکەوی، پیرەکت بەبن هەنگری نەکەوی.
- دایکێ ببینە و دۆتێ بخوازە.
- بەختێ داکان، جەهازێ کچان.
- مالی بەتەنێ بە هەشتێ بەدەنێ.

پەندی یەکەم باسی زەماوەند دەکات کە جگە لە بووک و زاوا دەوروبەریش خۆشی لێ وەردەگرن.

پەندی دووەم جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە ژن و پیاو لە یەک تەمەن بن.

پەندی سێیەم و چوارەم باسی ئەو پێوەندییە بەهێزە دەکات کە لەنێوان و دایک و کچ هەیە، بۆیە زۆر جار لەسەر ئەو بیرۆکەیە کچان داخوازی دەکرێن و بەختیان دیاری دەکرێت.

پەندی پێنجەم باسی ئەو پێداویستییە دەروونییە دەکات کە لەناخی هەموو ئافرەتێکدا هەیە، ئەویش هەستکردنە بە ئازادی و سەربەخۆیی لەمالی خۆی.

**لەسەر بناغەی روونی**

١- بەهای دیار: ئەو بەهایانە دەگرێتەوە کە بە قسە دەردەبڕێن و پەیوەستن بە خزمەتی کۆمەلایەتی و بەرژەوەندی گشتی.

هەندێک لەم پەندانەی لەم بارەیەوە وتراون ئەمانەن:
- لەو کانییەی ئاوی لێ دەخۆیتەوە
بەردی تێ مەخە تێنوو بیتەوە.
- ئاشیش بەنۆبەتە.
- قەرزاری شەرمەزارییە.

پەندی یەکەم هانی خەلک دەدات بۆ هەستکردن بە لێپرسراویەتی بەرامبەر شتە گشتییەکان، چونکە مولکی خۆیانە و پێویستبیان پێی دەبێتەوە.

پەندی دووەم هانمان دەدات کە رێزی دەوروبەر بگرین و خۆپەرست نەبین، ئەمەش لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی.

پەندی سێیەم گرنگی دەدات بە خۆدوورخستنەوە و دانەوەی قەرز بەخێرایی، بۆ ئەوەی کێشەی کۆمەلایەتی لێ دروست نەبێت، بۆیەش ناوی دەبات بە شەرمەزاری.

٢- بەهای نادیار: ئەو بەهایانە دەگرێتەوە کە پوخت دەکرێن و وشەیەکی تر دەردەبڕێن،ئەم دەربڕینەش بە بەهای پەیوەست بە رەفتاری سێکسی.

کوردیش لەم بارەیەوە پەندی زۆرە، لەوانە:
- یەک لە مردنە یەک لە تێوەکردنە.
- دەلێی بیسمیللای لێ نەکرایە.
- لۆ بابت جار و بار بووم، لۆ عالەمێش تەبەرا بووم.
- میری کونێ چ دەبتە ژنێ.
- نێرەکەر ئاگای لە ماکەر نییە.

ئەم پەندانە هەموویان بەشێوەیەکی نادیار باسی رەفتاری سێکسی دەکەن، ئەگەرچی هەندێک جار بۆ مەبەستی تر بەکاردێن.

**لەسەر بناغەی بەردەوامی**

١- بەهای تارادەیەک بەردەوام: ئەم بەهایە ماوەیەکی دوور و درێژ دەمێنێتەوە و لەنەوەیەک بۆ نەوەیەکی تر دگوازرێتەوە. ئەو پەندە کوردیانەی ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە زۆرن، هەندێکیان لەم بابەتەدا خراونەتە روو، بەلام لەم برگەیەشدا هەندێک لەم پەندانە دەخەینە روو:
- مار بە قسەی خۆش لە کونێ دێتە دەرێ.
- دو شمنی ناو خۆت رەگ دەردەکێشێ.
- دار پوزی لەخۆی نەبێ ناقلێشێ.

ئەگەر پۆلینی ئەم دوو پەندە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە پەندی یەکەم بەهایەکی کۆمەلایەتی هەیە و پەندی دووەم بەشی بەها سیاسییەکانە، بەلام بەهاکانیان تارادەیەکی زۆر بەردەوامە.

٢- بەهای سەرپێی: ئەم بەهایانە ماوەیەکی کورت دەمێننەوە لە پاشان نامێنن.

کوردیش چەندین پەندی سەرپێی هەیە بۆ کات و شوێنی دیاریکراو وتراون؛ لەوانە:
- سوار ئەگەر عارەب نەبێت بارە، شیر ئەگەر میسری نەبێت دارە، ژن ئەگەر ئامۆزا نەبێت یارە.
- نە ژنی کۆفی لار نە سالی دوو بوار.
- ژنی شەرمن شارەکی دەبنی، پیاوی شەرمن شەیەکی دەبنی.
- جاشکی کولکن، گۆلکی هورگن، مندالی چلمن، پەسند نییە.

پەندی یەکەم باسی چەندین بەها دەکات لەوانە (سوار و شیر و ئامۆزا) کە بۆ کات و شوێنی دیاریکراو وتراون ئێستا باویان نەماوە.

پەندی دووەم باسی دوو جۆرە شت دەکات کە پەسەند نینە ئەویش ئافرەتی هەوری خوار و سالی دوو بوار، ئەوانیش بۆ کات و شوێنی دیاریکراو وتراون.

پەندی سێیەم ستایشی ئافرەتی شەرمن و پیاوی بێ شەرم دەکات کە ئێستا بە تەواوی گۆراوە.

پەندی چوارەم باسی هەندێک بەها دەکات کە ئێستا لە کۆمەلگەی لادێیش باوی نەماوە.

هەروەها هەندێک لە زانایانی دەروونزانی باسی

هەندێک بەهای تر دەکەن وەک بەهای کارکردن، لەبارەی ئەم بەهایەشەوە کورد چەندین پەندی وتووە، لەوانە:
- ئیشکەری خۆت، خۆشەویستی خەڵکی.
- مەعاشی بەلاش، بێ پیت و بێ خێر.
دەستی ماندوو لەسەر زگی تێر.
پەندەکان هەردووکیان ستایشی کرێکار و دەستی ماندوو دەکەن. دوای خستنەڕووی بەهاکان و پۆلێنکردنی پەندە کوردییەکان بۆ هەر بەهایەک، پێویستە هەندێک خاڵ ڕوون بکەینەوە:
١- بەهاکان لەوانەیە زۆربەیان لە تاکێک بێتە دی، بەڵام ڕێزکردنی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، یان لە کۆمەڵگەیەک بۆ کۆمەڵگەیەکی تر دەگۆڕێت.
٢- لەوانە یەک پەند بەهای کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی... تاد تێدا بێت.
٣- ناوەرۆکی پەندەکان هەندێک جار دژ بەیەکن.
٤- ئەم بەهایانە کار دەکەنە سەر تەندروستی دەروونی، چونکە بەهاکان ڕۆڵی کاریگەر دەبینن لە گونجانی دەروونی کۆمەڵایەتی هەروەها ململانێی بەهاکان لای هەندێک خەڵک دەبێتە هۆی شڵەژانی ڕەفتار.

**سەرچاوەکان**

١- قورئانی پیرۆز.
٢- د. زهران، حامد عبدالسلام، علم النفس الاجتماعي، ط٤، عالم الكتب، القاهرة (١٩٧٧).
٣- لنداف. دافيدف، (ترجمة د. سيد الطواب، د. محمود عمر و آخرون)، مدخل علم النفس، ط٤، دارمكجر و هيل للنشر، القاهرة، (١٩٨٣).
٤- فائق هۆشیار، مستەفا ساڵح کەریم و هی تر، پەندەکانی پیرەمێرد، چاپی یەکەم، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا (١٩٩٥).
٥- عومەر شێخەڵلا دشتەکی، پەندی کوردی، بەغدا، (١٩٨٥).

# ئافرەت و ئەدەب لە ڕوانگەی ڕەخنە و تیۆری فیمینیستییەوە(*)

و/ لە ئینگلیزییەوە: کاوە عەبدولکەریم شێروانی

لە سەدەی بیستەمدا برەو بە ئاراستەکردنی چەندین کێشەی پەیوەست بە نوێنەرایەتی ئافرەتان لە ئەدەبدا درا، زۆربەی لەلایەن نووسەرە ئافرەتەکانەوە وەکو فرجینیا وۆلف پاشانیش لەلایەن ڕەخنەگرانی ئەدەبی فێمینستی. ئەمە مانای ئەوە نییە کە پێشتر بۆ پرسیار کردن لە شوێنی ئافرەتان لە ناوەندی ئەدەبیدا هیچ هەوڵێک نەبووبێ: (داکۆکیکردن لە مافەکانی ئافرەت ١٧٦٢ی ماری ولستۆنکرافتا) قسە لەسەر چاککردنی پەروەردەی ئافرەتان دەکات، ڕۆماننووسەکانی سەدەی نۆزدەیەم وەکو جۆرج ئلیوت لە بەریتانیا و جۆرج ساند لە فەرەنسا هێرشیان دەکردە سەر هەڵوێستی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان سەبارەت بە ئافرەت، هەرچەندە وەکو جێنشینەکانیان لەسەدەی بیستەم زۆر ڕادیکالییانە نەبوون، ڕەوشی سەرەکی کە زۆر گرنگ بوو ئەوەبوو، تا چەند لە ئەدەبدا ئەزموون و دەنگی ئافرەتان پیشان دراوە؟ چەند ڕەوشێکی تریش پەیوەست بەمە هەبوون، لەوانە ئایا نووسەری نێر دەتوانێ بەشێوەیەکی پێویست کەسایەتی ئافرەت و ئەزموونی مێ بخاتە ڕوو؟ لەلایەکی تردوە ئەگەر پیاو بە شێوەیەکی گشتی زاڵ بێ بەسەر زمان و دەزگای ئەدەبیدا، ئایا ئافرەت ددتوانێ خۆی لەم بەربەستانە ڕزگاربکا و بە ڕەوانی و ڕاستگۆیانە قسە لەسەر وشیاری مێینە بکات؟ ئەم خاڵەی دوایی لەلایەن ڕەخنەگرە فێمینستەکانەوە مشتومڕێکی زۆری لەسەر کراوە، ئەوان پێیان وایە بۆ ناسینەوەی شێوەیەکی دیاریکراوی ئەزموونی مێینە، هەروەکو بۆ نموونە ئیلین شۆلتەر لە (ئەدەبێک تایبەت بەخۆیان ١٩٧٧) باسی کردووە، دەبێ بەشێوەیەک کار بکەین کە کاریگەریەکی پێچەوانە دروست بکەین بۆ بەهێزکردنی ئەو ئەفسانەیەی کە دەڵێ هەموو ئافرەتەکان هەمان زانیاری و ئەزموونیان هەیە.

لە ڕوانگەی مێژووییەوە، ئەدەب بەشێوەیەک کە گفتوگۆ هەڵدەگرێ، هەروەک سەبارەت بە چین و ڕەگەزیش وایە، مەیلی ئەوەی هەیە کە شوێنی ئافرەت کەم بایەخ و بچووک بکاتەوە، ئەمەش بە زۆر شێوە ڕووی داوە، لە تێکستە ئەدەبییەکان ئافرەت بە زۆری ڕۆڵی گرنگ کەمتر لە پیاو دەبینێ، ئەمەش شتێکی گشتی نییە و هەڵاوێردن (Exception) لە بەرهەمی نووسەرە نێر و مێیەکان دەبینرێ، بەڵام ئەو ئەزموونە زاڵ و نموونەییەی کە لە ئەدەبدا پیشان دراوە و فێمینستەکان لە فیرجینیا وۆلفەوە بەدواوە مشتومڕیان لەسەر کردووە، ئەزموونی نێرە، ئەمە تەنیا پرسی کەسێتییە، بەڵکو جۆری ئەو بابەتە گرنگانەشە کە چارەسەر دەکرێن: تاڕادەیەک هەتا بەم دواییانەش کەم بەرهەمی ئەدەبی هەبوو، یان هەر نەبوو، کە باس لە مەینەتی و ئازارەکانی منداڵبوون و بەخێوکردن بکات، کە ئەمە شتێکی سەرەکییە و ڕووبەڕووی بەشێکی زۆری دانیشتوانی ئەم وڵاتانەش دەبێتەوە کە خاوەنی کولتووری ئەدەبین. لە دەزگای کولتووری ئەدەبیدا، هەروەکو لە پرۆگرامە ئەکادیمییەکانی

فێربوون و لەو بەرهەمە هەڵبژاردانەی کە لیستی پیرۆزی نووسەرە نێرەکان پێک دێنن، لە تێڕوانینی نێریشدا زێدەماف، یان مافی پێشەیی (Privileged) پێدراوە. ڕەخنەگرە فێمینستەکان قسەیان لەسەر ئەوە کردووە کە کاتدرائیەت (Canon) ڕەنگدانەوەی گرووپی بەهێز و زاڵە لە کۆمەڵگادا، کە ئەویش نێرە و لە چینی ناوەڕاستە (یان سەرەوە) و سپی پێستیشە. ئەو تێکستانە دەگرێتەوە کە لە لایەن ئافرەتیشەوە دەنووسرێن کە مەیلی ئەوەیان هەیە وەکو (پیاوانێکی فەخری) بن، بسازێن لەگەڵ تێڕوانینی نێر بۆ واقع، یان بەهۆی پیشاندانی ئەزموون و کەسێتی نەگۆڕی مێینە، تێڕوانینی نێر سەبارەت بە ئافرەت بەهێز بکەن. لەم دواییانە چەند هەوڵێک دراوە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو ناهاوسەنگییەی هۆکارەکانی بە دەزگاییکراوەکانی ئەدەب (Institutionalized apparatuses of literature). بۆیە دەبینین هەندێ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە تەنیا ئەو کتێبانە چاپ و بڵاودەکەنەوە کە لەلایەن ئافرەتانەوە نووسراون، بەشێوەیەکی زیاتریش ئەو لێکۆڵینەوە ئەدەبییانەی کە پەیوەستن بە کۆرسەکانی نووسینی ئافرەتان و ڕەخنەی فێمینستی نەک تەنیا وەکو ئارەزوومەندی. دێل سپێندەر لە (دایکەکانی ڕۆمان- ١٩٨٦) پیشانی داوە کە دەکرێ نەریتێکی تر بناسینەوە کە لە ڕۆماننووسە ئافرەتەکان پێک هاتووە، بە پێچەوانەی باڵادەستی نەریتە زاڵەکەی نێر کە لە (سەرهەڵدانی ڕۆمان- ١٩٥٧)ی ئیان وۆت پیشان دراوە.

ڕەخنەی ئەدەبی بوارێکی دییە کە لەلایەن تیۆری فێمینستییەوە خراوەتە ژێر پرسیار، لەو بەها ڕەخنەییە دانراو و بنچینە تەبەنیکراوانەی کە دووبارە تێڕوانین و ئەزموونی نێرینە بەسەرەکی و هی ئافرەتانیش بێ بایەخ دادەنێ. هەتا ئەگەر قوتابییەکی ئافرەت ڕۆمانێک بخوێنێتەوە کە لەلایەن ئافرەتێکەوە دانرابێ و لە بارەی کەسایەتییەکی ئافرەتەوە بێ، شێوازی گەنگەشە کردنە ڕەخنەییەکە، دەبێ لە ڕوانگەی نێرەوە بێ. ڕەخنەگری فێمینستی ئەمریکی ئانێت کۆلۆدنی(١) پیشانی دەدا کە چۆن پەروەردە و پرۆسەی ڕەخنەی خوێنەر ئامادە دەکا بۆ ئەوەی بە چەند شێوەیەکی ڕێگە پێدرا و تێکستەکان ببینێ و دەرکیان پێ بکات، باسی ئەوەی کردووە کە خوێندنەوە، جۆرێکە لە پەیوەستبوون نەک بە تێکستەکان، بەڵکو بە پارادیگمەکانەوە: «ئێمە مانای تێکستێک بە گوێرەی ئەوەی دەمانەوێ (یان ئارەزووی دەکەین) دەگونجێت، یان بە واتایەکی تر بە گوێرەی گریمانە ڕەخنەییەکان، یان ئارەزووەکان (بە ئاگایی یان بێ ئاگا) کە ئێمە بۆی ئامادە دەکەین». خوێندنەوە چالاکییەکی فێرکاری، یان کۆمەڵایەتییە، خوەکانی خوێندنەوەکانمان هەر بۆیە بە شێوەیەکی نێرانە، دەکرێ لە دەوری هاوکێشەی گریمانەکان و نەریتەکان دیاری بکرێ و بچەسپێ. ئەو وەکو جوولەکەیەک و وەکو فێمینستێک، ئەزموونی خوێندنەوەی خۆی و خۆشی وەرگرتنی خۆی لە (بەهەشتی دزراو- ١٦٦٧)ی میلتۆن باس دەکا. ئەو دوو شتی دژ بەیەکی بۆ دەرکەوت، نەیتوانی نەپشتیوانی لە تیولۆژی (زانستی لاهوتی) یەکەی بکە نەک لایەنە سێکسیەکەی بە پیرۆز بنرخێنێ، ڕوونی کردۆتەوە کە تا چ ڕادەیەک فێربووە ستراتیژیەتیکی ڕەخنەیی وەدەست بێنێ و قۆرخی بکا وەکو- مۆدێلێکی گوزارشتکردنی- کە وای لێ کردووە دەرک بە شیعر بکا، بەڵام لە ڕوانگەی تاخمێکی دیاریکراوی ڕەگەز و ئەو نەریتە تیولۆژییانەی کە هی خۆی نەبوون؛ لە (فێربوونی خوێندنەوەی دەقێک بە چاکی) بەرهەڵستی و گوزارشتە ڕکابەریەکانی بەشێوەیەکی کاریگەرانە هەڵوەشێنراوەتەوە، هەروەک ناسنامە تایبەتیەکەی خۆی.

(ژوورێکی تایبەت بە خۆی)ی فرجینیا وۆلف- هەرچەندە بە مانا تەقلیدییەکەی کارێکی تیۆری نییە- بەڵام، وەکو خاڵی دەسپێک و سەرەتای ڕەخنەی ئەدەبی، خزمەتی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ئافرەتان دەکات. لەم خاڵەوە، شایانی ئەوەیە کە تێبینی ئەوە بکەین هەندێ ڕەخنەگری فێمینستی بە دووریان زانیوە کە گوتاری تیۆری ئەدەبی بە دڵنیایی و دەسەڵات و هەتا تایبەتمەندی زمانەوانی زۆر لە نووسینە تیۆرییەکانیش ئەم شوێنە شەرعیەیان بۆ دروست کردبێ. لە مەوە وەدەردەکەوێ کە زۆر هەڵەیە تیۆری فێمینستی وەکو گوتارێکی یەکگرتوو وەسف بکرێ؛ زۆربەی نووسینە فێمینستییەکان، هەر بە سروشتی خۆیان، هەوڵ دەدەن لە تاکگەرێتی و بەناوەندکردنی ڕوانینەکان دووربکەونەوە و بەرەو زیاتر کۆمەڵی و پانتایی بەربڵاوی ڕێبازەکان بچن. ئێستا لێرەدا زۆر گونجاو و لە بارەی فێمینیزم قسە بکەین. فیرجینیاوۆلف، جگە لەمانەی باسمان کرد، ڕۆڵیشی لە بزاڤێکی گەورەتری ئافرەتانی نووسەر هەبوو، کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بەشێوەیەکی دیاریکراو تێڕوانینی ئافرەتانیان تەبەنی دەکرد، وەکو کاترین مانسفێلد، ڕێبیکا ویست و درۆتی ڕیچاردسۆن. زۆر هەڵەیە، هەروەک لەگەڵ مارکسیزمیش وایە، وەسفی نووسینی فێمینستی بکەین وەکو کارێکی تاکەکەسی، دەبێ بەشێوەیەک سەیری نووسینەکانی فرجینیاوۆلف

بکەین، کە بەشێکە لە بزاڤێکی گەورەتر، یان گوتارێکی نوێ کە دەستی بەرەنگاربوونەوەی گوتاری زاڵی ڕەگەزی کـــردووە، هەروەهـا هەوڵێکە بۆ هێنـانەوە بەرباس و دۆزینەوەی چەند خـــاڵێـک کـــە لەلایەن ئافــــرەتە نووسەرەکانی تریشەوە ئاماژەیان پێکراوە و تا ئێستا پشتگوێ خراون. گفتوگۆی سەرەکی فیرجینیاوۆلف لە بارەی کەمی (نەبوونی) ئافرەتی نووسەر زیاتر ڕەوشێکی ماتریالیە کە ئافرەت تیایدا دەژی: «هەبوونی کەمێک، یان هەر نەبوونی سـەربەخـۆی دارایی»، بەشـێـوەیەکی سـەرەکیش وایان لێ چاوەڕوان دەکرێ کـە لە خزمەت پێویستییەکانی پیاوان دابن، ئەمە لەبەر ئەوە نییە کە ئافرەت توانای نووسینیان نەبێت، بۆ سەلماندنی ئەمە ئەفـرابێن (Aphra Behn) بە نموونە دەهێنێـتـەوە، پاش مردنی مێردەکەی، ناچار دەکرێ بۆ مانەوەی خۆی بنووسێ. پاشان قسە لەسەر زیادبوونی ژمارەی ئافرەتانی نووسەر لە سەدەکانی هەژدەیەم و نۆزدەیەم دەکات، بەڵام زۆربەی ئەم ئافرەتانە «پسپۆر» نەبوون، بەڵکو لە زۆربەی کـاتەکـاندا بۆ کـات بەسـەربردن دەیاننووسی: هێـشـتـا بەشـێـوەیەکی بنەڕەتی دەزگـاکـانی ئەدەب هەر لەژێر کـۆنتـرۆڵی نێـردا بوون، هەروەک کـاروباری خـێـزانیش هەروابوو، فرجینیاوۆلف گریانەی خوشکەکەی شکسپیر بە نموونە دەهێنێـتـەوە، ئەگەر ئەو بوونی هەبوایە و وەکـو شکسپیری پیـاو خاوەنی بەهرە و بلیمەتی بوایە، هێشتا لەو کـاتـیـدا ڕێـیـان پێنەدەدا کـە خـۆی پێ بگەیەنی و بتوانی لەسەر کاغەز تەعبیر لە خۆی بکات. ئەو لەگەڵ گەورەی قەشان (Bishop) هاوڕایە کە دەڵێ ئاستەمە و ناکرێ ئافرەت بەهرە و بلیـمـەتی شکـسـپـیـری هەبێ، نەک لەبەر ئەوەی ئافـرەت ئەم جـۆرە سـیـفـاتانەی نییـە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگایەکی ئەوها نێرسالاریدا، ناتوانن تەعبیر لەخۆیان بکەن.

یەکێک لە گرنگترین بەشداریەکانی فرجینیا وۆلف کە لەپێش زۆربەی کـارەکـانی ئەم دواییـەی دێ لە ڕەخنەی فێمینستی، قسەکردنیەتی لەسەر زمان، ئەمە لەوانەیە ڕێبازێکی ناتیۆری زمان بێت، چونکە ئەو باسی ڕستەی (نێر) و (مێ) دەکات بەبێ ئەوەی بە گوێرەی ئاستێک لە ئاستەکانی تێڕوانین و ئادگارە تایبەتمەندییەکانیان شـیـبکاتەوە. هەر چۆنێک بێ ئەو ڕۆڵی ئایدۆلۆژیانەی زمان لە بنیـادنانی ڕەگەز دەناسێنێ. ئەمە لە دوایـیـدا گەشەی کرد و لە لایەن ڕەخنەگرە فێـمینسـتـەکانی وەکو دێل سـپـێـندەر لە (پیـاو زمـانی دروست کــردووە-١٩٨٠)(٢) بە تیۆر کرا:

«ڕێسای سیـمانتیـکی کە بەرپرسیـارە لە دەرکەوتنی سێکسیزم لەزماندا، دەکرێ زۆر بە سادەیی بەیان بکرێ: دوو کـاتیـگۆری بنەڕەتی هەیە: نێـر (male) و نانێـر (minusmale) بۆ ئەوەی پەیوەیست بێ بەنێر، دەبێ پەیوەست بێ بە کـۆمـەڵێک مـانای پۆزەتیف و چاک، بۆ ئەوەش پەیوەست بێ بە (نانێـر) دەبێ ئەم کـوالیـتـانەی نەبێ... پێکهاتەی سیـمانتـیکی زمانی ئینگلیـزی لە سیستـەمێکی پاتریاریکیدا بڕێکی زۆر لە بارەی ئەوەی پێی دەڵێن مێ (female) ئاشکرا دەکا...»

هەروەکـو بینیـمـان زمـان، وەکـو گـوتار، پـیـشـاندەری مـەعـریفـەیە، دەکرێ پێشـەی (امـتـیـاز) شـوێنی نێـر و دامـەزراندنی سـیـسـتـەمی پاتریاریکی بەشـێـوەیەکی بەرفـرەتر و مـێـژوویەکی ڕاسـتـەوانەتر (لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی تر) و هەروەها لە زمـانی ڕۆژانە و لە ئەدەبدا ببـینرێ. لە (ئافـرەتانی نادیار-١٩٨٢) دیێل سـپـێـندەر قـسـە لەسـەر ئەوە دەکـات کـە مـەعـریفـە بە شـێـوەیەکی سەربەخۆ لە خەڵکدا نییـە (چاوەڕێی پیـاوانی زیرەک بکا بۆ ئەوەی بێن بیـدۆزنەوە و بێـلایەنانە تۆمـاری بـکەن، بەبێ ئەوەی بە بیروبۆچوونەکانی خۆیان ڕەنگرێژی بکەن) «بەڵکو بە گـوێرەی ئەو بەهاو باوەڕانە بنیـادنراوە کـە لە سەرەتادا لەگەڵی هاتوون»(٣). بەم شێوەیە فەلسەفە و زانست و هەموو شێوەکانی مەعریفە کە لە ڕاستیدا لە ڕوانگەیەکی باڵادەستـانەی نێرەوە و بە زمـانێـک کە هەر بەخۆی پاڵپـشـتی ئەم جۆرە بۆچوونە دەکـات، نێـر دەبێـتە سـەنتـەر و لە ئافـرەتان جـیـادەبێـتـەوە (جـیـابوونەوەی ڕەگەزی). لە ڕوانگەی هێز و دەسەڵاتەوە، سپێندەر قسە لەسـەر ئەوە دەکـات کـە لە قـازانجی گـرووپی باڵادەسـتـدا نیـیـە، لە بنچـیـنەدا بەرەنگاری چەوسـاندنەوەی ئەو گـرووپانە بن وەکـو چینی خـوارەوە و بێ ئـەزمـوون وەسف کراون.

ڕەخنەی ئەدەبی وەکو جۆرێک لە گوتار و شێوەیەک لە مەعریفە، لە زۆر ڕووەوە سیستـەمی پاتریاریکی بەهێز کــردووە. هەروەکــو بینیــمـــان بنیــادنانی (کــانوونی نێرسالاری)(٤) یەکێکە لە سیـماکانی، بەڵام سـیمای تریش هەیە کـە لەلایەن ڕێبازە فێـمـینسـتـیـەکـانەوە بەرەنگاری کــراوە، یان کــێــشـــەی دروست کـــردووە. ئەفسـانەی ئەدەب وەکو پیشـاندانی تەواوی واقیع، لە ناوەندی لاسـایـیکردنەوەی ڕەخنەی هیـومـانیـسـتی (مـرۆڤـدۆسـتی) وەرگـیـراوە و لەپێش هەمـوو ڕێبـازە تیۆریەکانەوە دێت و ئێستاش دەسەڵاتی هەیە، بوارێکی سەرەکی و توێژەکانی تیۆری فێـمـینسـتـیـە. ڕۆمـانی سـەدەی نۆزدەیەم شـێـوازێکە کـە تەکنیکی ڕیالیـزمی کلاسیکی بەکاردێنێ و تێیدا نووسەرەکانی ئافرەتان وەکو

چارلۆت برۆنتی، یان جۆرج ئیلیوت خووین بەوەگرتبوو لە بارەی ئافرەتانەوە بنووسن، بەڵام ئەم تێڕوانینەی ئەدەب چییە کە حسابی بۆ ناکرێت، هەروەک لە (گۆڕانەکانی دەریا)ی کۆرا کەپلان: کولتوور و فێمینیزم- ١٩٨٦ گفتوگۆی لەسەر کراوە، پیشاندان و ڕوونکردنەوەیان لەسەر ئەو کولتوورە مێژووییە دەوەستێ کە دەوری داون: هەروەها بانگەشە ڕەخنەییەکەی ئەدەب لە بارەی ڕاستگۆیی و ڕەسەنییەوە لەلایەن ئەو کولتوورەی کە لێیەوە سەری هەڵداوە دیاری دەکرێت.

کاپلان ڕەگەز بە چین و خودێتییەوە دەبەستێتەوە و پێی وایە کە ئافرەتانی نووسەر، بە گونجاندنی گوتاری ئەدەبی ڕیالیزم، وەکو دەڵێن، نوێنەرایەتی ڕاستەقینەی ئافرەتان مسۆگەر دەکەن، هەروەها ڕەخنەی فێمینیستی لە کاتێکدا بەشێوەیەکی گشتی بەرەنگاری سیستەمی پاتریاریکی دەبێتەوە، یادی ئەو نووسەرانەش دەکاتەوە. هەروەها دەستی هەیە لە نکۆلیکردنی لە نوێنەرایەتی ئافرەتان لە دەرەوەی سنووری ڕیالیزم:

«زۆر ئەستەمە بۆ فێمینیزم بەو ڕوونکردنەوە واقیعیەی ڕیالیزم ڕازی بێ، هەر تەنیا لەبەر ئەوەی ئەدەب گوتارێکە لەو گوتارە گشتییانەی کە تێیدا ئافرەتان ڕێگەی قسەکردنیان بۆ خۆیان هەیە و ناشبنە هێمای خەیاڵی پیاوان. سەرەڕای ئەمەش خودی ئافردتانی چینەکانی تر و گەلەکانی تر، لەگەڵ خۆ گونجاندنە سێکسیە جیاوازەکان، ناکرێ بابەتیانە، یان بەشێوەیەکی ڕەسەن لە دەقە ئەدەبییەکاندا لەلایەن ئافرەتی نووسەری سپی پێست و [هێتروستکیسوەل(٥)]ی چینی ناوەڕاست، پیشان بدرێ، هەرچەندە بەشێوەیەکی گونجاویش ئەم جۆرە ئافرەتانە لە گێڕانەوەکانیاندا دەخولقێنن» (٦)

ئەم جۆرە مشتومڕە لەناو ڕێبازەکانی فێمینستیدا نابێ وەکو خاڵی لاوازی ڕەوشی فێمینستی سەیر بکرێت، لە ڕاستیدا هەروەکو تۆریل مۆی لە سیاسەتی سێکسی/ تێکستی ئاماژەی پێکردووە لە (تیۆری فێمنیستی ئەدەبی-١٩٨٥): پیشاندانی تیۆری فێمینستی وەکو لاشەیەکی تاک واتای مەعریفی، نابەجێ و زینابەخشە بۆ فێمینیزم. لەگەڵ ئەوەشدا تۆریل مۆی دوو جۆر تیتالی فکری لە تیۆری فێمینستیدا دەناسێنێ: ئەنگلۆ، ئەمریکی و فەرەنسی. مۆی یەکەمیان وادەبینێ کە زیاتر بایەخ بە گەشەسەندنی ڕەوشی سیاسی دەدات وەکو بەرەنگاربوونەوەیەک بۆ شێوازی نێرسالاری لە دامەزراوە ئەدەبی و لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکاندا، بەتایبەتی لەکانوونی ئەدەبیدا. ڕەخنەگر و تیۆرستەکانی فێمینستی وەکو ئیلیەن شۆلتەر و ئیلین مۆرس ماندووبوونێکی زۆریان کردووە بۆ دامەزراندنی ئەلتەرناتیڤێک بۆ ئافرەتانی نووسەر، بە گەڕانەوە بۆ کاری ڕۆماننووسەکانی وەکو چارلۆت پێرکنیس گلیمان یان کێت چۆپین، بەڵام مۆی پێی وایە ئەوان تەنیا شوێنی کانوونێکیان گۆڕیوە بە یەکێکی تر بەبێ ئەوەی بەرەنگاری بیرۆکەی هەرەمیەت بکەن، وەکو ڕێگەیەکیش بۆ گواستنەوەی ئەزموونی جیهانی مرۆڤ لە دەسەڵاتی تێکست گەیشتوون. خوێنەری فێمینستی جێ ناهێڵرێ بۆ ئەوەی هەڵسێ بەرەنگاری ئەو دەنگەی مێینە بێتەوە: تێکستی مێ بە هەمان زۆرداری تێکستی کۆنی نێر حکوم دەکا(٧). هەرچەندە مۆی سروشتی ڕادیکالی تیۆر و ڕەخنەی ئەدەبی فێمینستی ئنگلو ئەمریکی بە پرۆژەیەکی سیاسی بوێرانە دادەنێ، هەروەها وەکو بەندکراوێکی ڕێبازەکانی هیومانستی نەریتگەرایی سەیری تێکستەکە دەکات، کە بەهۆی پێوەندی نووسەر- خوێنەر بەرەنگاری ناکرێ و ئەزموونە ڕەسەنەکەی ناو تێکستەکەش بەکاردێنی بۆ بە شەرعیکردنی ئەو چەمکانەی ئافرەتان کە مۆڵەتی بەجیهانیبوونیان هەیە. بە پێچەوانەوە مۆی بۆ لای ئیتالی فێمینستی فەرەنسیەوە وەردەچەرخێ، کە تایبەتمەندی ئەوەی هەیە زیاتر گرنگی بە تێکستەکە خۆی دەدات و ئارەزوویەکی زۆریشی لە تیۆری شیکردنەوەی دەروونی هەیە، وەکو پێویست ئەوە نابینێ کە ئافرەتانی نووسەر دەنگی مێینە بەرهەم بێنن، یان بە تەواوی نووسینی نێر بکەنە دەرەوە. بەشێوەیەکی گشتی تیۆری فەرەنسی پشت بە ژمارەیەک لە کاریگەری جۆر بەجۆر دەبەستێ، وەکو هەندێک فێمینستی ئەنگلۆ- ئەمریکی ڕاشکاوانە ڕەوشی چەقبەستیو تەبەنی ناکا: یەکێک لەو ڕەخنانەی کە ڕووبەڕووی جولیا کردیستیڤایان هێلین سیخوا (Helen Cixous) دەکرێتەوە، ئەوەیە کە ئەوان لە نووسینەکانیاندا ڕەوشی گێرەشێوێنی و دژ بەیەک بەرهەم دێنن، بەڵام بۆ ئەوەی بە دوای ئەو ڕەوشانەدا بڕۆین کە گوتاری نەریتگەری (نێر) بۆ نووسین و خوێندنەوە پێشکەشی کردووە دەکرێ ئەم نادیاریە بەراییە بە ئەدگارێکی زمانەکەیان دابنێت، بە پێچەوانەی ڕوونی و سادەیی گوتاری ڕادیکالی نەریتگەری ئەنگلو- ئەمریکی، هەروەها فشاری فێمینستی فەرەنسیش بۆ سەر تێکست جەختکردنێکی باوە بۆ نووسین و ئەو خۆشییەی کە لە نووسین و خوێندنەوە بەرهەم دێ، لەوانەیە مێینە هۆی جەختکردنی هەمەجۆر و هەمەچەشنی بابەتی کە لەلایەن ڕێبازی ئەنگلۆ- ئەمریکی هان نەدەدرا. بەم شێوەیە گوتاری پاتریاریکی چاڵی لێدەدا لە

ڕێی یاریکردنەوە نەک ڕووبەڕووبوونەوە، یان هەڵاوێردن و قەدەغەکردن. بە گوێرەی ڕێبازی فەرەنسی کانوون، یان جۆرە جیاوازیەکانی ئەدەب کە زیاتر مۆرکی کولتووری ڕۆژئاوایی و لێکۆڵینەوە ئینگلیزییەکانیان پێوە دیارە، پێویست نین.

**ژێدەر:**

Studing Literary Theory An Introduction Roger Webster.

**پەراوێزەکان:**

(*) ئەم تایتلە لە بنچینەدا دوو تایتلە لەیەکم داون.

1- Annette Kolodny «Dancing Through the Minefield: Some obseruations on Theory, Practice, and politics of a Feminist Literary Criticism»..... (London, Virago, 1986).

2- Dale Spender, Man mede language (London, Routledge, 1980) P.23.

3- Dale Spender, Invisible womwn: The Schooling Scandal (London, Writers and readers) 1982. P2.

٤- (Canon) پێشتر بۆ کاتدرائیەت بەکار دەهات، کە دەبوایە نێر بێ و سپی پێست بێ و لە چینی سەردەش بێ، بەڵام ئێستا بۆ کۆمەڵە، یان ڕێکخراو، یان یەکێتی نووسەران بەکاردێت.

٥- ئەوەی لەگەڵ ڕەگەزەکەی تردا سێکس دەکا (سێکسکردنی ئاسایی).

6- Cara Kaplan, Sea Changes, Cultare and feminism (London, Verso, 1986) P.78.

7- Toril Moi, Sexual/ Textual Politics, Feminist Literary Theory (London, Methuen, 1985) P.78.

# پێشکەوتنی ڕەخنەی ئەدەبی مۆدێرن

بیل ستیفلەر
و/ لە ئینگلیزییەوە: گۆران سەباح

«ئێم. ئێچ. ئەبرامس» لە کتێبەکەی بە ناوی «چرا و ئاوێنە: تیۆری ڕۆمانتیک و نەریتی ڕەخنەیی» باس لەوە دەکات کە ڕەخنەی ئەدەبی لەسەر چوار کۆڵەگە بەندە: گەردوون، کار، هونەرمەند، خوێنەر. باسی ئەوە دەکات کە تیۆری ڕەخنەیی زوو جەختی لەسەر پێوەندی ئەدەب بە جیهانەوە و خولیای ئەدەبیش بۆ لاساییکردنەوەی حەقیقەتی ژیان، یان گاڵتەپێکردن دەکرد. بەهۆی کاریگەری ئەرستۆ و مەسیحییەت، ڕەخنە دەستی کرد بە تەرکیز کردن لەسەر کاریگەری ئەدەب لەسەر خوێنەر. هەروەها ئەو کاریگەرییە بەهایەکیشی بە ئەدەب بەخشی کە کاریگەرییەکی ئەخلاقی، یا پۆزەتیڤی لەسەر خوێنەر و گوێگر هەبوو.

لە سەدەی هەژدەدا، ڕەخنە گۆڕا بۆ تەرکیزکردنە سەر پاڵنەری داهێنەرانەی هونەرمەند. ئەدەب دەربڕینێکی خەیاڵ و هەستەکانی هونەرمەند بوو.

تیۆری ڕەخنەیی سەدەی بیستەم لەسەر بنچینەی زانستی سروشت و فەلسەفە گەشەی کردووە. پەرەسەندن مرۆڤی لە چەقی گەردوون دوورخستەوە، زانستی سروشتی مۆدێرن پرسیار لە بابەتی و بێ لایەنانە دەکا و پێشنیاری ئەوەش دەکا کە (هەقیقەت) خۆی لەخۆیدا لێڵە و کێشە و وزەش هەمیشە لە گۆڕاندان و دووڕووی هەمان هەقیقەتن. هەرچەندە ئەنشتاین بەرگری لە میکانیزمی چەندایەتی کرد کە دەڵێ: «خودا یاری بە زار ناکات! کەچی گەردوونی کۆنی نیوتنی جێگاکەی گیراوە بە گەردوونی ناسووری و هەردەمەکی ئاشکرا». زانستی ڕێژەیی و میکانیزمی چەندایەتی ئەوەیان پێشنیار کرد کە ماتماتیکی ڕەها و ورد مەحاڵە، چونکە لەبری ئەو، گەردوون دەتوانرێ بەهۆی پێودرەکانی ئامار وەسف بکرێت. لە جیهانی ئەتۆمی لاوەکیدا، زانست دەتوانێ تەنیا مەزەندە گوتراوەکان بخاتە ڕوو لەباردی سروشتەوە.

هەمان دوودڵی زانستی زمانەوانی و مرۆناسیشی گرتەوە. بە لێوردبوونەوە لە ئەسڵی زمان و واتا، ئەو دوو زانستە گەیشتنە یەک پرسیار: ئەویش ئایا وشە بە ڕوونی واتا و سنووری پێناسە کردووە؟

سۆسەر دەڵێ: «هێماکان گەشە بە واتا دەدەن بەهۆی جیاوازییان لەگەڵ هێماکانی تر». بە واتایەکی دی، وشەکان تەنیا بە پێوەندییان بەیەکتردوە مانایان هەیە. بۆ نموونە، پیتەکانی (d, o, g) ناکاتە (dog - سەگ»،

بەڵکو ئەم پیتانە چەند سیمبولێکن، چەند کەسێک بڕیاریان لەسەر داوە کە واتاکەی ببێتە «سەگ». کەواتە، وشەی (dog) تەنیا مانای سەگ دەبەخشێت، واتا دژی هەموو شتێکە کە (سەگ) نەبێت، یانی وشەی یاخود هێمای (dog) جیا دەبێتەوە بە ماناکەی کە سەگە لە هەموو ئەو شتانەی کە (سەگ) نین، چونکە تەنیا خۆی ئەو مانایە دەبەخشێت.

نموونەیەکی دی، وا دانێ: منداڵێک دانیشتووی شار بێت و هەرگیز باخچەی ئاژەڵانی نەبینیبێت، کاتێک لە ڕێگا لە ناو ئۆتۆمبیل، لە پەنجەرەوە چێڵێک دەبینێت لەناو باخچەکە، یەکسەر هاوار دەکات «سەیرکە دایکە، ئەها سەگ!»، دایکیشی وەڵام دەداتەوە «نەخێر کوڕەکەم، ئەوە چێڵە!» کەمێکی تر، منداڵەکە ئەسپێک دەبینێت بە گومانەوە پرسیار دەکا «دایکە، ئەوە چێڵە یان سەگە؟» دایکی وەڵامی دەداتەوە «نا، کوڕەکەم». بەم شێوەیە، تێگەیشتنی منداڵەکە بۆ مانای وشەی «سەگ» گەشە دەکات.

ئەبرام دەڵێ: (ڕەخنەی مۆدێرن لە پەرچدانەوەی مۆدێرنیزم چەقی خۆی قایم کردووە بەهۆی ستوونی «کار»). بەڵام پرۆسەی جیاکردنەوەی سۆسەر کاریگەری لەسەر ڕەخنەی مۆدێرن هەیە لەو ڕوانگەیەی کە واتا لە هەندێ ڕووەوە هەمیشە نادیار و لێڵە. واتای دەق لەودیو سنوورەکانی «کار» دەست بە فراوان بوون دەکات و کۆڵەگەکانی وەک گەردوون، هونەرمەند، بینەر (خوێنەر) لە خۆ دەگرێت.

شێوەخوازی (فۆرمالیزم) هەموو ئەو شتانەی لە دەرەوەی چوارچێوەی دەقی نووسەر، کولتوور، پێشینەی مێژوویی پشت گوێ خست و هەوڵێکیش بوو بۆ ئاشکراکردن و تێککردنەوەی شتە نادیارەکانی دەق.

فۆرمالیزم بۆ ئەوەی جەخت لەسەر گرنگی دەق بکاتەوە، بەدوای شێوازی دژایەتی و گرژی لەناو دەقدا گەڕا تاوەکو پەرە بە واتایەکی یەکگرتوو بدات.

فۆرمالیستەکان میتافۆر (واتای مەجازی) چێژ لە وشە، یاخود یاری بە وشەکردنیان پێ سەرنجڕاکێش بوو و وای لێکردن مانایەک لەنێو ماناکان بدۆزنەوە ململانێی دەق بکات. لەبەر ئەم هۆیەیە، فۆرمالیزمی ئەمریکی، یاخود ڕەخنەی ئەدەبی جەخت لەسەر خوێندنەوەیەکی ورد بۆ دەق دەکات، لە هەمان کاتدا هەندێ فۆرمالیست پێ لەسەر گرنگی دەق دادەگرن، ئەمە لە کاتێکدا هەموو هەوڵەکانی ڕەخنەی مۆدێرن بە تەکنیکی خوێندنەوەیەکی ورد بۆ دەق دەست پێ دەکەن.

بونیادگەرایی بە شێوازێکی نوێ ئیش لەسەر دەق دەکات دوور لە بایەخدان بە وشەکانی دەق، بەڵکو مانای ڕووکەش و مانا قووڵەکە شی دەکاتەوە. دەقی فردواتا لەنێو ئەدەبدا شتێکی ئاساییە و وشەکانیش هەر هەمان مانای خۆیان هەیە لەنێو دەقەکە. ڕەخنەی ئەفسانەیی چارەسەری بێ ئاگایی بە کۆمەڵ، ئەفسانە بەراییەکان، دابەزینی شکۆمەندی و قوربانیدان لە دەق بەدی دەکات کە دەقیش شتێکی گشتییە، هەموو خەڵکیش پێی دەزانێت. گرفتی پۆست ستراکترالیستەکان ئەوەیە کە ئەگەر مانای هەر وشەیەک بەپێی جیاوازی لەگەڵ ئەوانی تر بێت، ئەوا ئەو مانایە لە هەمان ئەو وشەدا پەیدا نەبووە، بەڵکو پشتی بە تەونی گەشتی زمان بەستووە کە پۆست ستراکترالیستەکان بە دەقی دادەنێن. ئەگەر پۆست ستراکترالیزم دێڕ بە دێڕی دەقەکە بخوێنێتەوە، ئەوا دەقەکە بە شێوازێکی نوێ پێناسە دەکرێتەوە و مەودای ئەوەندە فراوان دەبێت کە هەر سێ دەقەکەی تری جیهان و هونەرمەند و بینەر (خوێنەر) لەخۆ دەگرێت.

ئەم جەختکردنە سەر جیاوازی و گۆڕینی واتا، خوێندنەوەیەکی تێکدەرانە دەخاتەڕوو بۆ خودی دەق. شیکردنەوەی زمان لەسەر ئەو ڕێگایە ئیش دەکات کە دەقەکان خۆیان شاراوەیی و لێڵی دروست دەکەن. ئەو هەقیقەتە دەردەخەن کە سیستەمی یەک بیرۆکە پشت بەوەی بەرامبەری دەبەستێت.

ڕەخنەی سۆسیۆلۆژی بەشێوازێک دەق شی دەکاتەوە کە ڕەچاوی جیهانی ئەو ئایدیۆلۆژیایە دەکات کە دەقەکەی تێدا نووسراوە، هەروەها کار لەسەر کاریگەرییە نەرێییەکانی ئایدیۆلۆژیای هونەرمەند دەکات، هەروەها ئەو ڕێگایانەشی کە سیستەمی بەها کولتوورییەکان خۆیان لەنێو دەقدا دەدۆزنەوە.

ڕەخنەی فێمینیستی ئیش لەسەر دەقی فرەڕەگەزی و پێوەندییەکانیان دەکات. هەروەها ئەو دەقانەشی کە ڕەگەزی نێر تێیدا زاڵە و هەوڵ دەدات دەقێکی ئەلتەرناتیڤ کە تێڕامانی ڕەگەزی مێ تێیدا زاڵە، شی بکاتەوە. ڕەخنەی مارکسی ئیش لەسەر کاریگەرەکانی سۆسیۆپۆلیتیکەڵ و ململانێی کۆمەڵگا، ئاشکراکردنی مەودای ململانێ ئایدیۆلۆژییەکان دەکات.

مێژوناسی نوێ دەق شی دەکاتەوە و ئیشی لەسەر

دەكات بە ڕەچاوكردنی ئەو كاتەی دەقەكەی لێ نووسراوە و ئەو كاتەشی كە دەقەكە هەڵسەنگێنراوە. ئەدەب لاسایی جیهانی دەرەوە ناكاتەوە، بەڵكو لاسایی جیهانی دەرەوەی مێژوو و كولتوور دەكاتەوە كە هەندێ جار خوێنەر بەند دەكات، هەندێ جاریش ململانێ دروست دەكات كە مشتومڕێكی زۆر هەڵدەگرێت لەبارەی هەر ماوەیەكی مێژوویی، یان كولتوورییەوە.

ڕەخنەی دەروون شیكاری مەودای واتای دەق ئەوەندە فراوان دەكاتەوە كە بیری نووسەر بگرێتە خۆی، هەروەها سەیری دەق دەكات وەك دەربرینێكی خەیاڵی كە لەنێو ناخی مێشكی مرۆڤەوە هەڵقوولابێت. بەكارهێنانی بنەماكانی زانستی چارەسەری نەخۆشی عەقڵانی لەلایەن فرۆیدەوە دەستی پێكرد، زانستی دەروون شیكاری سیمبول و میتافۆرەكان شی دەكاتەوە و لێكیان دەداتەوە. هەروەها زمان و مانا قووڵەكانی دەق وەك دەربرینی بێ ئاگایی تاك بۆ بابەتە سێكسی و ئەخلاقییەكان و ویژدانی و غەریزییەكان شی دەكاتەوە.

لە كۆتاییدا، ڕەخنەی وەڵامی خوێنەر، مەودای نێوان خوێنەر و دەق ون دەكات، بۆیە وەڵامی بێ وێنەی خوێنەر كە نیشی لەسەر بكات تەنیا دەقە. هەرچەندە تیۆرە مۆدێرنەكان مەودای واتای دەقەكە فراوان دەكەنەوە تا وەكو دەقی فراوانی نووسەر و جیهان و خوێنەر بگرنە خۆ، بەڵام كار ئێستاش تاكە هێزێكی پاڵنەرە بۆ شیكردنەوەی دەقەكان، بۆیە هەر لێكدانەوەیەكی هەر كارێك دەبێ بە كارەكە خۆی پشت ئەستوور بێت. ڕاستی و دروستی هەر لێكدانەوەیەك پابەندە بە چۆنیەتی ئاشكراكردنی كارەكە و پشت ئەستوورە بە دەستەواژەی وەرگرتوو لە هەر كورتەیەكی كارەكە.

تیۆرەكانی ڕەخنەی مۆدێرن هەموو جۆرە كەرەستە و پێداویستییەك دەخەنە بەردەستی قوتابی تاوەكو بەدوای ئەدەبدا بگەڕێن. قوتابی سەربەست دەكات كە پشت ببەستێت بە [illegible]ـزموونە بێ وێنەكانی خۆیان، كولتوورییەكان و تێڕامانیان و كاردانەوەیان، بەڵام بۆ ئەوەی لێكدانەوەی قوتابی باوەڕپێكراو بێت، دەبێ لەژێر چاودێری و لێكۆڵینەوە دابێ.

# ئاقابزورگ
# دواکەسی (گرووپی چوار) بوو، ئەویش ڕۆیشت

محەمەد بەهارلوو
و/ لە فارسییەوە: کەریم سۆفی

لە ساڵی (١٩٩٠)دا لەسەر پێشنیاری یەکێک لە دەزگاکانی بڵاوکردنەوە، بڕیاربوو هەڵبژاردەیەک لەبەرهەمەکانی وەچەی یەکەمی ئێران (جەمالزادە، هیدایەت، عەلەوی، چوبەک) وەک ڕەخنەو لێکۆڵینەوە لەبەرهەمی هەریەکێکیان بەجیا بۆ چاپکردن ئامادە بکەم. پێشنیارێکی تازەو نوێ بوو. تا ئەوکاتی لەنێو ئەدەبیاتی هاوچەرخماندا، تەنیا هەڵبژاردەی شیعریی چەند شاعیرێکی ناسراوی نوێخواز بڵاوکرابۆوە، بەڵام کارەکە لەگەڵ ئەو دەزگای بڵاوکردنەوەیەدا نەچووە پێش.

هەڵبژاردەیەک لەبەرهەمەکانی هیدایەت بەناونیشانی (کۆمەڵە بەرهەمێکی سادقی هیدایەت) لەڕێی بڵاوکارێکی دیکە چاپ کرا، بەڵام دابەش نەکرا.

هەڵبژاردەیەکی بەرهەمەکانی (محەمەد عەلی جەمالزادە)ش لە لایەنێکی دیکە چاپ و بڵاوکرایەوە، بەڵام هەڵبژاردەی بەرهەمەکانی (ئاقابزورگ) لە قۆناغی پیت چنی ڕاوەستاو توانای لە چاپدان و بڵاوکردنەوەی هێشتا مەیسەر نەبووە. هەروەها لەبارەی هەڵبژاردەیەک لەبەرهەمەکانی (چوبەک) لەو بڕوایەدا نیم کە بەهۆی بارودۆخی ئێستای چاپەمەنی بەم زووانە بڵاوبکرێتەوە.

وەختێ پێڕستی چیرۆکە هەڵبژاردەکانی کۆمەڵە چیرۆکی (توێشەبەرە، کوتە کاغەزەکانی زیندان و نامەکان و میرزا)م بۆ ئاقابزورگ نارد تا لە چۆنیەتیی کتێبەکە ئاگادار بێت، ئەویش لە نامەیەکدا کە بە قەڵەم پاندان بەخەتێکی خواروخێچ بۆی نووسیم: «بەپێشنیارەکەتان ڕازیم، نازانم بۆچی ناوی چیرۆکی (احسن القصص- باشترین چیرۆکەکان)ت لەنێو چیرۆکەکانمدا نەهێناوە؟ ئەم چیرۆکەم خۆش دەوێ، چونکە وەسفی حاڵی خۆم و دۆستانی ئەوان ڕۆژگار دەکەم.» (أحسن القصص) چیرۆکێکی ناو کۆمەڵە چیرۆکی (میرزا)یە. لەبەرگرتنەوەی چیرۆکی پیرۆز و ناسراوی بەکۆیلایەتی فرۆشراوی حەزرەتی یووسفە بە عەزیزی میسر. مێژووی نووسینی چیرۆکەکە لە بەرلین لە مانگی شوباتی (١٩٧١)دا بوو، هەروەک ئاقابزورگ نووسیویەتی «أحسن القصص- ڕوو نووسی نووسراوەکانی دوێنێ و ئەمڕۆیەو من تەنیا بە یەکتریەوەدم گرێ داون.» مەبەستی ئاقابزورگ لە (نووسراوەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ) کتێبە پیرۆزەکانی چاخی کۆن و چاخی نوێ و قورئانی پیرۆزو ئەو تەفسیرو بەڵگەنامانەیە کە لە دەیەکانی ئەم دواییەدا لەڕێی تۆژەران و شوێنەوارناسان وەدەست هاتوون. من لە پێشەکییە درێژنووسییەکەی خۆمدا لەسەر (ئۆتۆبیۆگرافی- ژیننامە نووسی خود) لێکۆڵینەوەدم ئەنجام داوە.

بەهەر حاڵ لەسەر پێشنیاری خاکەڕایی ئاقابزورگ


بزورگی عەلەوی

(أحسن القصص)م خستە نێو پێرستی چیرۆکە هەڵبژاردەکانی ئەو.

ئەمە تەنیا ڕاسپاردەو پێشنیاری ئەو بوو سەبارەت بە نووسینەوەو پۆلێن کردنی کتێبە بڵاونەکراوەکەی بەناوی (هەڵبژاردەیەک لە بەرهەمەکانی بزورگی عەلەوی.)

وەختێ داوام لێی کرد کە چەند وشەیەک بۆ پێشەکیی کتێبەکە لە بارەی ژیانی خۆی بنووسێت، ئاوای نووسی: «ناتوانم شرۆڤەی ژیانی خۆم بنێرم، ئەگەر دەمتوانی، ناچارەبووم کە باسی خەوشەکانی خۆم بکەم، چونکە لایەنی چاکم نییە.» پاشان هەروەک داوام کردبوو، دوو وێنەی خۆی بۆ ناردم، یەکێکیان ڕەنگاوڕەنگ و ئەوی دی ڕەش و سپی. هەروەها داوام لە (ئاقابزورگ)کرد کە دانەیەکی فۆتۆکۆپیی کتێبە بڵاو نەکراوەکەیم بۆ ڕەوانە بکات کە ناوی (تێپەڕینی ڕۆژگار)ە کە گێڕانەوەو یادەوەریی سیاسیی سەردەمی لاوێتیەتی، تا وەک بنەمایەک لە ڕێکخستنی شرۆڤەی حاڵ و ساڵنامەی ژیانی سوودی لێ ببینم. ئاقابزورگ پێشنیاری کرد کە لەبەر ئەوەی کتێبی (تێپەڕینی ڕۆژگار) بەشێوەیەکی گشتی یادەوەریی سیاسییانەیەتی، بە پێویستی زانی بەشێکی تایبەتی بۆ گفتوگۆ و چالاکییە ئەدەبییەکانی تەرخان بکرێ، منیش بەوپەڕی ئارەزووەوە پێشوازیم لێ کرد.

بۆ ئەوەی بەوردی ئاگاداری چالاکییە ئەدەبییەکانی بم، ئاقابزورگ چەند لاپەڕەیەکی تایبەت بەکارنامەی ئەدەبیی خۆی بۆ ڕەوانە کردم کە لەلایەن یەکێ لە برادەرەکانی خۆی و لەبەر ڕۆشنایی تێڕوانینەکانی خۆی ئامادەی کردبوو، ئەوەی کە ئاقابزورگ ڕەوانەی کردووە، بە بڕوای من، تەواوترین و وردترین ساڵنامەی ژیانی ئەوە.

بڕیار وابوو ساڵی پێشتر(*) بۆ ئێران بگەڕێتەوەو منیش بەوە دڵخۆش بووم کە ئەو گفتوگۆیەم بەزووترین کات شێوەی واقیعی بەخۆوە بگرێت، بەڵام بەداخەوە بەهۆی نەخۆشی، نەیتوانی بۆ ئێران بگەڕێتەوە، زۆر بێ ئارامانەش لە چاوەڕوانیی باشتر بووندا بوو. ئەم چاوەڕوانییە درێژەی کێشا. دوای ماوەیەک لە نووسینگەی کاک (مەهدی ڕۆشەن دڵ) هاوڕێ و جێگرەکەی، بەتەلەفۆن پێشنیاری کرد، ئەگەر من بتوانم لە ئەڵمانیا بچمە لای، بۆ ئەو مەبەستەش (ڕۆشەن دڵ) یەکسەر داوەتنامەیەکی بۆ ناردم و (عەلەوی) خۆیشی داوانامەیەکی نووسی تا من بەبێ دەردەسەری و گرفتی ئاسایی، دوور لە بگرەو بەردەی بڕیاری کارگێڕی و ڤیزا وەربگرم، بەڵام وەک دەڵێن لە تواناداا نەبوو ئەو گفتوگۆیە بە ئەنجامی واقیعییانە بگات.

لەگەڵ ئەوەی کە زۆر پرسیارم لە مێشکمدا ئامادە کردبوو، وەک دیاربوو، ئاقابزورگ-یش خۆی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی من تەیارکردبوو، بەڵام بەداخەوە بەدرێژاییی تەمەن ئەم گفتوگۆیە سەری نەگرت -ڕەنگە من کە بڕیار بوو دوای پشووی ساڵی نوێ بچمە خزمەتی و سەردانی بکەم- درەنگ وەئاگاهاتم و ڕەنگە کەمتەرخەمیشم کردبێ و بەڕەوای دەزانم لۆمەو سەرزەنشت بکرێم.

لە ساڵنامەی ژیانیدا کە لێرەدا بۆ یەکەمین جار چەند گۆشەیەکی لێ دەخەینە ڕوو، ئاقابزورگ نووسیویەتی: «پازدە ڕۆژ دوای کۆچی دوایی باوکی گەورەم، لە (٢)ی شوباتی ساڵی (١٩٠٤ز) لە تاران لە دایک بووم. ناوی باوکی گەورەم (موجتەبا)بوو، ناویان لەمن نا (موجتەبا ئاقابزورگ) کە پاشان نازناوی (ئاقا) لە پێناسەکەم لادرا، لەوە بەدواوە، چونکە نەیاندەویست ناوی باوکی گەورەم دووبارە بکەنەوە، منیان بە (ئاقابزورگ) بانگ دەکرد. هەمان ناوم بەسەردا بڕاو تا ئێستاش هەتا لە ئیش و کارەکانی (بانک)یش هەر بەناوی (ئاقابزورگ عەلەوی) ئیمزا دەکەم.» ئاقابزورگ، قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندیی خوێندنی لە قوتابخانەکانی (فەرهەنگ و ئەقدەسیە و دار ئەلفنوون) بەسەر دەبات. پاشان لەساڵی (١٩٢٢ز) بۆ تەواوکردنی خوێندن دەچێتە ئەڵمانیاو لە شارەکانی (برسلا)و (میونێخ) قۆناغی پەروەردەو فێربوون بەسەر دەبات. لەساڵی (١٩٢٨ز) دەگەڕێتەوە ئێران و لە قوتابخانەی پیشەسازیی شیراز لەشاری شیراز بە مامۆستایەتی خەریکی وانەوتنەوە دەبێ. ساڵی دوایی لە قوتابخانەی پیشەسازیی تاران تەنسیب دەکرێ و پاشان بەپلەی مودەڕیس لە زانکۆی

هونەری ئێران و ئەڵمانیاو تەکنیکی تاران خەریکی وانەوتنەوە دەبێ. ئاقابزورگ لە تاراندا دۆستایەتی و تێکەڵاویەتی لەگەڵ ڕۆشنبیران و لاوانی دەرچووی کۆلێژەکان پەیدا دەکات و وەک گەڕانەوەیەک بۆ ڕۆژگاری ڕابردووی ئەدەبی و شۆڕشگێڕێتیی خاو خێزان و بنەماڵەکەی خۆیان کە لە سەیدەکانی عەلەوی بوون، ڕوو لە دنیای چالاکیی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکات. باوکی (سەید ئەبولحسەنی عەلەوی) لە کەسە چالاکەکانی سەرەتای (مەشروطە)و خاوەنی کتێبی (گەنجینەی بەڵگەنامەکانی مێژووی ئێران)ە کە لە پیاوانی سەردەمی مەشرووتییەت دەدوێ.

هەروەها (مورتەزا عەلەوی)ی برای کەلە تێکۆشەرانی بزاڤی کۆمۆنیزمی جیهانی بوو. بووە یەکێک لە قوربانییەکانی یەکلاکردنەوە مەرگبارەکانی ستالین لە سۆڤیەتی جاران.

ئاقابزورگ سەربردەی ژیانی سەیرو چارەنووسی مەینەتباری براکەی لە کتێبە بلاونەکراوەکەی خۆیدا بە ناوی (تێپەڕینی ڕۆژگار)(**) باس کردووە.

ئاقابزورگ لەگەڵ (سادق هیدایەت، مەسعوود فەرزاد، موجتەبا مینەوی) گرووپێکیان پێک هێنا کە پاشان بە (گرووپی چوار) ناوبانگی دەرکرد. گرووپێک کە لە بواری ڕۆشنبیری و ئەدەبیدا نوێخوازبوو، لە بەرامبەردا (گرووپی حەوت) هەبوو کە بریتی بوو لە (ڕەشید یاسەمی، نەصروڵلای فەلسەفی، عەلی ئەسغەر حیکمەت، حەسەن تەقی زادە، عەباس ئەقبال، محەمەد قەزوینی و بەدیع ئەززەمان فرووزانفەر.) هەڵبەتە گرووپی حەوت، لە حەوت کەس زیاتر بوو، هەروەها گرووپی چواریش، لە چوار کەس زیاتر بوو، بەڵام بەو ناوە ناسرابوو. هیدایەت زمانی فەرەنسی دەزانی، ئاقابزورگ ئەڵمانی، فەرزاد ئینگلیزی و مینەوی عەرەبی، بەم جۆرە چاویان بە ئەدەبیات و ڕۆشنبیریی جیهانی کرابۆوە.

ئاقابزورگ چیرۆکی (دیو، دیو)ی لەنێو کۆمەڵەی (ئەنیران) لەگەڵ (هیدایەت و شین پرتەو)بلاوکردەوە لە هەمان کاتدا هیدایەت پێشەکیی بۆ کتێبی (کچی ئورلیان)ی شیللەر نووسیوە کە ئاقابزورگ وەریگێڕاوە کە هەم وەرگێڕانەکەو هەم پێشەکییەکە، مایەی تێڕوانینی خوێنەرێکی زۆربوو. پاشان ئاقابزورگ کۆمەڵە چیرۆکی (توێشەبەرە)ی بلاوکردەوە کە کاریگەریی ئەدەبیاتی ئەورووپاو چیرۆکەکانی هیدایەتی پێوە دیارە.

لەسەرەتای بلاوبوونەوەی گۆڤاری (دنیا) ساڵی (١٩٣٥ز)، ئاقابزورگ هاوکارییەکی نزیکی لەگەڵ (دکتۆر تەقی ئارانی)دا هەبووەو بەناوی خوازراوی (فەرەیدوون ناخدا) وتارەکانی خۆی بلاودەکردەوە.

هاریکاری و هاودڵیی ئەو لەگەڵ دکتۆر ئارانی و هاوڕێیەکانیدا، بووە هۆی وەستاندنی گۆڤاری (دنیا)و دەستگیرکردنی گرووپی ناسراو بە (گرووپی پەنجاوسێ کەس). ئاقابزورگ بیرەوەرییەکانی ئەم هاریکارییەو چوار ساڵ زیندان بوونی خۆی لە زیندانەکانی ڕەزا شادا (١٩٣٧- ١٩٤١ز) لە کتێبە ناودارەکەی خۆیدا بەناوی (پەنجاوسێ کەس) نووسیوە.

دوای ئازادبوونی لە زیندان و لەگەڵ دامەزراندنی حزبی تودەی ئێران ئاقابزورگ وەک ئەندامی سەرکردایەتیی حزب لە جاران زیاتر خۆی دەداتە چالاکی سیاسی و بەپلەی بەڕێوەبەری گۆڤاری (پەیامی نوێ) بلاوکراوەی ناوبەندی ڕۆشنبیریی ئێران و سۆڤیەتی پێشوو، چالاکیی ڕۆشنبیری خۆی درێژە پێ دەدا، کۆمەڵە چیرۆکی (کوتەکاغەزەکانی زیندان و نامەکان) لە هەمان ڕۆژگاردا بلاودەکرێتەوە کە ڕاڤەی بیرەوەرییەکانی ساڵانی زیندانی کردنیەتی. هەروەها لەگەڵ بلاوبوونەوەی ڕۆمانی (چاوەکانی)، ناوی ئاقابزورگ وەک نووسەرێکی بەتواناو لێهاتوو جێگیر دەبێ.

لە (١٩٥٣/٣/٣١)دا بۆ وەرگرتنی خەڵاتی ئاشتی دەچێتە ڤیەننا.

دوای مانەوەی لەوێ بۆ چەند مانگێک، لەگەڵ ڕوودانی کودێتای (٢٨)ی مورداد (تەمموز)، ناچاردەبێت لە ڤیەنناو پاشان لە ئەڵمانیا بمێنێتەوە. لەوکاتیشدا هەروەک ئەندامی کارای ڕێبەری حزبی تودەی ئێران، لە کۆبوونەوە گرنگەکانی حزبی لە دوورە وڵاتیدا لە (کۆبوونەوەی چوارەم)و (کۆبوونەوەی یەکێتی) یەکێتی حزب لەگەڵ گرووپی دیموکراتی ئازەربایجان بەشداری دەکات.

ئاقابزورگ نووسیویەتی: لێرە بە دواوە ئیدی بۆ کۆبوونەوەکانیان داوەتیان نەکردم یان داوەتیان کردووم و من نەڕۆیشتووم. جارێکیان چووم و لە ناوەندی کار گەڕامەوەو بیانووم هێنایەوە کە ئیشم هەیە. بە (سکرتێری یەکەمی حزب)م وت؛ دەبێ زووتر بڕۆم، لە کۆبوونەوەکەدا زیاتر قسە لەسەر کێشە کەسێتییەکان بوو، وەک ئەوەی بۆچی فلانەکەس خانووی هەیەو ژیانی باشە، بۆچی من نیمە!؟

ئاقابزورگ لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٤)بووە مامۆستای یاریدەدەر لە زانکۆی هومبولت کە لە بەرلینی

ڕۆژهەڵات بوو. لە ساڵی (١٩٦١)پلەی ئوستادی وەرگرت و وانەی تایبەت بە ئەدەبیات و ڕۆشنبیریی نوێی فارسی دەوتەوە. لە دەیەی چلەکانی ساڵی هەتاویدا، وردە وردە لە حزب دوورکەوتەوە یان بە دەربڕینی خۆی «زۆربە ڕێزەوە» وەدەریان نا: من بە پاسپۆرتی ڕەسمی ئێرانی لە وڵات دەرچووبووم، نەک وەک پەنابەرێکی سیاسی، بۆیە هاتوچۆی باڵیۆزخانەم دەکرد، بەتایبەتی لەگەڵ فەرەیدوون فەرۆخ، باڵیۆزی ئەوسای ئێران لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا، پێوەندییەکی دۆستانەم هەبوو کە پێشتریش جارێکیان لە کەنەداوە بۆ سەردانم هاتبوو.

هەتا جارێکیان لە بەرلین بەشێوەیەکی تایبەتی بەمنی وت: «ئەوانە- واتە داروودەستەی شا- دەڕۆن، بەڵام تۆ دەمێنیتەوە.» وەختێ لە کەنەداش بووم ڕۆژنامەنووسێک- ئەگەر هەڵەنەبم، ئیرەج ڕەبیعی ناوێک- داوای کرد کە دیمانەیەکم لەگەڵدا ساز بکات، فەرۆخ ڕای سپاردم کە تێکەڵ بەم دیمانەو گفتوگۆیە نەبم! منیش دیمانەکەم ئەنجام نەدا.

بەرەبەری کۆتایی دەسەڵاتی شابوو، دوای (شەوانەی شیعری گۆتێ) دیسان جەنابی ڕەبیعی لەبەرلین هاتەوە لام و وتی: «من مەبەستم دیمانە سازدان نییە لەگەڵ تۆ، تەنیا حەزدەکەم زیاتر لەگەڵ تۆدا ئاشنابم» منیش ڕەتم نەکردەوە، هات و لە بابەت زۆر شتانەوە قسەمان کرد، قسە لەسەر ئەو دیموکراتییەتە بوو، وتم: «وڵاتێک کە دوو هەزارو پێنجسەد ساڵە لەژێر دەسەڵاتی زەبروزەنگ ژیابێت، ناتوانێت لە میانەی شەوو ڕۆژێکدا ببێتە دیموکراتی.»

ئەوەندەی پێنەچوو کە یەکێک لە ڕۆژنامە ڕێ پێدراوەکانی ئەو سەردەمەی بەتەواوی لەبیرم نییە (کەیهان)یان (اطلاعات)یان هەردووکیان، دوو لاپەڕەی تەواویان لە- قسەکانی من- پڕکردبووەوە. ئەوەبوو کە حزب زۆر بەڕێزەوە، وابزانم لە زمانی (ئەسکەندەری)یەوە (سکرتێری یەکەمی حزب) یادداشتێکی بەم ناوەرۆکە بڵاوکردەوە: «لەبەر ئەوەی ئاغای بزورگ عەلەوی چەند ڕاو بۆچوونێکیان دەربڕیوە کە لەگەڵ هەڵوێست و ڕێبازی حزبی تودەی ئێران ناگونجێت، بڕیار درا لە ئەندامێتیی حزب دوور بخرێتەوە.»

ئاقابزورگ لە (١٢)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٦٣)بووە سەرپەرشتیاری ئێرانناسی لە ئەنستیتۆی ئاسیایی و هەروەها لە ئابی (١٩٦٩)دا بوو بە مامۆستای پسپۆر لە بواری کولتووری ئێران و زمانی فارسی. لە (٤)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٦٩) خانەنشین کرا.

لێرە بەدواوە تا ساڵی (١٩٨٨) لە زانکۆی ناوبراو خەریکی وانەوتنەوەی تایبەت بە کێشەکانی ئێران بوو. هەروەها مامۆستای ڕاوێژکارو سەرپەرشتیاری بڕوانامەی قوتابییانی زانکۆ بوو. لە ساڵی (١٩٨٨) بەسەرەوە لە زانکۆکانی گوتینگن، توبینگن، فرایبورگ، هامبورگ، ئولدنبورگ، زاروبروکن (ئەڵمانیا)، لینینگراد (یەکێتیی سۆڤیەتی جاران)، کۆپنهاگن (دانیمارک)، ستۆکهۆڵم، کوتبورگ، ئوپسالا (سوید)، ئۆکسفۆرد (بەریتانیا)و زانکۆی هارڤارد-ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە پلەی مامۆستا میوانداریتیی دەکرا.

## بەرهەمەکانی بزورگی عەولەوی بە زمانی فارسی

- دیو، دیو (کۆمەڵە چیرۆکی ئەنیران)، ١٩٣١، تاران.
- چمدان- تویشەبەرە (کۆمەڵە چیرۆک) ١٩٣٢، تاران.
- چاوەکانی، (کۆمەڵە چیرۆک) ١٩٣٢، تاران.
- پەنجاوسێ کەس (یادەوریی ناوزیندان) ١٩٤٢، تاران.
- کوتەکاغەزەکانی ناو زیندان (کۆمەڵە چیرۆک).
- چاوەکانی (ڕۆمان) ١٩٥٢، تاران.
- میرزا (کۆمەڵە چیرۆک) ١٩٧٨، تاران.
- سالاری ها- سەروەرییەکان (کۆمەڵە چیرۆک) ١٩٧٩، تاران.
- مۆرانە (ڕۆمان) ١٩٨٨، تاران.

## بەرهەمە وەرگێردراوەکان

- کچی ئورلیان- ژاندارک- نووسینی شیللەر لە ئەڵمانییەوە.
- باغچەی ئالووباڵوو- چیخۆف- لە ڕووسییەوە.
- کاروکاسبیی خاتوو ڤارێن- لە ئینگلیزییەوە.
- دوازدە مانگ- لە ڕووسییەوە.

## وەرگێردراو بۆ زمانی ئەڵمانی

- عەلویە خانم- نووسینی هیدایەت.
- ئەفسانەی خەڵقکردن، هیدایەت.
- کوندەبۆی کوێر، هیدایەت.
- حاجی ئاقا، هیدایەت.
- بەشێک لە چوارینەکانی خەییام.
- حەوت پەیکەری نیزامی.

**بەرهەمەکانی بە زمانی ئەڵمانی**

- ئێرانی تێکۆشەر.
- خاکی گوڵ و بلبل.
- وەرچەرخان و مێژووی ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئێران.
- مێژوو و تەواوکاری ئەدەبیاتی نوێی فارسی.
- فێربوونی زمانی فارسی.
- فەرهەنگی زاراوەی ئەڵمانی بۆ فارسی.
- ناساندنی شاعیران و نووسەرانی ئێرانی لە دایرەتولمەعاریفی ئەدەبی ئەڵمانیدا.

«ناساندنی بەرهەمەکانی ئێرانی بەگوێرەی ناوی کتێب (نزیکەی ١٢٠-١٣٠ ناونیشان) کە لە سالانی (١٩٦٥- ١٩٧٢) بە هەوڵ و کۆششی بزورگی عەلەوی ئەنجام درا.

لە ساڵی (١٩٩٢)دا هەمان کتێب بەگوێرەی ناوی نووسەران لە بیست بەرگدا بە زمانی ئەڵمانی بلاوکرایەوەو ڕاڤەی ژیان و بەرهەمەکانی (٣٠) نووسەری دیکە لە نووسەرانی هاوچەرخی تێدا زێدەکراوە.

ئەمەو دوای تەمەنێکی پڕ لە بگرەوبەردەی سیاسی و ئەدەبی، بزورگی عەلەوی ڕۆژی یەک شەممە (٢٨)ی ڕێبەندانی (١٣٧٥)ی هەتاوی بەرامبەر بە (١٦) شوباتی ساڵی(١٩٩٧) لە تەمەنی (٩٢)ساڵیدا لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی ئەڵمانیا بەهۆی دڵ وەستان، کۆچی دوایی کرد.

**(*) ئەم وتەیە بۆ بەر لە کۆچکردنی دەگەڕێتەوە.**
**(**) ئاگادارنیم ئەم کتێبە بلاوکراوەتەوە یان نا.**

**سەرچاوە:**
**گۆڤاری «دنیای سخن، شمارە (٧٢)، بهمن سال ١٣٧٥، (١٩٩٦ز)، ص ١٢-١٣.**

# هەندێ تێبینی و سەرنج لەبارەی دەسەڵات و ئەرشیفکردنی مێژوو و نووسینەوەی مێژوو

پ. د. غانم محەمەد ئەلحەفو*
وەرگێڕانی: ئازاد عوبێد ساڵح

* مێژوو زانین و زانیارییەکی سەرلەبەری تەواوی کار و چالاکییە هزری و مایەکییەکانی مرۆڤە، چەندین دەروازەی هەمەڕەنگی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هزری... تاد هەیە، باشە کێ مێژوو دروست دەکات؟ تاک یان کار و کۆششی بەکۆمەڵ؟ یان دەسەڵات لە پەرەسەندن و ڕەنگاوڕەنگیدا؟ بە درێژایی مێژوو هەر دەسەڵات خودان جڵەوی ڕێبەدیکردنی شێوازە شارستانییەتە هزرییە فرە ڕووەکان بووە...

* دەسەڵات هەمیشە هاوشانی مێژووی سیاسییە، کە هەنووکەشی لەگەڵدا بێت هەر پێشەنگە لە ڕێبەریکردنی کۆمەڵگاکانی مرۆڤدا. وەلێ هێشتاکە دژوارییەکە لە پێچاوپێچی ئەو دیرۆکە سیاسییە دایە. تەنانەت تێدا نووسینی کۆسپ و تەگەرەی زۆری لەبەرە.

ئەوەی مێژووی سیاسی دروست دەکات هەر بەتەنیا مایەوە، جا چ تاک یان دەستە بژێری جڵەوگری دەسەڵاتی دیاریکراوی جووڵەی ژیاری بن لە بوونە هەمیشەییەکەیدا. دەسەڵات هەر لە تەک خۆیدا ناکۆکییە مێژووییە درێژخایەنییەکەی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ ئەوانی دیکەدان و بەدوو ڕووکاری پێچەوانەی یەکدیدا دەڕۆن: ستەم و دژەکەی، داد و وێرانی و کلۆری و هەرەس و دژەکەی هەڵچنین و دامەزراندن و خستنە سەری هەردوو ڕەهەندی چەندایەتی و چۆنایەتی، بەڵام خستنە سەری جۆری شێوەی شارستانییەت هێزی ڕاکێشانی کاریگەری لێک هاوێرکردن و بەخشین پێکدەهێنێت.

* ئەوەی سەروکاری بە دەسەڵاتەوە هەیە ئەوەیە، داڕێژەرانی ڕووداو و کردەی مێژوویی لە شتە شاردراوە دیاریکراوەکان نادوێن کە کاریگەریی یەکلاییکەرەوەی لە تێگەیشتن و بوونی ڕووداوەکەدا هەیە، دوور لە لێڵی، ڕەنگە پێیان وابێت واباشترە ئەو بیرو هزرە هەر بە نهێنی بمێنێتەوە، ئەوەش هەر بەخۆی هەمان ئەو ئاڵۆزییەیە کە نەک هەر تەنیا بەسەر مێژوونووسدا دەشکێتەوە، بەڵکو بەسەر جووڵانەوەی کۆمەڵیشدا بەرەو لای ڕاست و دروستدا. ئینجا ئەو وێنە مێژووییەی ئەو کردارە مێژووییە هەر بە لێڵی و تاریکی دەمێنێتەوە، ئەو دەمەی ماڵئاوایی لەو ژیانە دەکەن، بە زۆری، بۆ هەتایە لەگەڵ خۆیانی دەخەنە ژێر گڵەوە. ئالێرەدا ڕووداوی سیاسی وێنەیەکی ڕێژەیی لەسەر حیسابی ڕاستیدا هەیە، کە کاریگەری زانین و زانیاری مێژووییە.

* بەهرەو توانا و لێهاتوویی تایبەتی مێژوونووس خۆشی کاریگەری لەسەروبەندی داڕشتنی پەیکەری گشتی کاروکردەی مێژوویيدا هەبە ئەوەش ڕوونادات مەگەر وردەکاریی ڕووداوەکە ڕادەی هەرە نزمی پەیبردن بەکردارە مێژووییەکە وەربگرێت، بەڵام مێژوونووس کۆشش بۆ ڕادەی هەرە بەرز دەکات، بۆ ئەوەی بە قووڵی ڕووداوە مێژووییەکەمان تێبگەینێت و لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا دەرەنجامی پوخت و ئامانجدار و بەجێمان پێدەبەخشێت.

* دووبارە بوونەوە لە ڕووداوی مێژوویی، مێژوونووس سەرگەردان دەکات بۆ زانینی بە کەڵکی مێژوو. ڕووچوونە نێو ئەو چەمکە بەرەو کۆن و کەلەبەری جۆراوجۆری بەرنامەو ئامانجە فەلسەفییەکانمان دەبات. لەگەڵ ئەوەش هەمیشە ڕووداو دووبارە دەبێتەوە، ئەگەر

دروستکەری ڕووداو بەشێوەیەکی تایبەتی ڕەفتار لەگەڵ وێنەی مـــایەکی مـــێـــژوودا بکات. هەرچی وێنە هزرییـەکـەیە، گـەر دووبارە بوونەوەی تێدا ڕوویدا ئەوا یەکەمجار دەچێتە ژێر باری میناکایەتی ڕەها و دواتریش خـــستنە سـەرو لێ لابردن لە داڕشتن و پێکهـاتەی بیرەکەدا.

* کـارلێکردنی ژیارییـەکـان بەقـەد کـۆنی ژیارییـەکـان خۆیانە. وێنەی جـێگرەوەی ئەو کـارلێککردنە لە وێنەی ژیاری شـــێـــرازەیەکی دیاریکراو لە هەردوو کـــرداری هـەرسکردن و داهـێـنـانی شـــێـــوازە ژیارییـــە جۆراوجـۆرەکـاندایە. ئەمـەش سـەروکـاری بەهەنـاسـەی ئیمپراتۆریەتەوە هەیە لای مێژوو دروستکەران لە بواری سیاسەتدا. زۆرجاران بە درێژایی مێـژوو هاوڕەفـتاری و هاوژیاری لەو پێکهاتەیەدا دێتەدی.

ئەوەش بەنۆرەی خۆی پشت بە هاوکێشەیەکی جەدەلی دەبەستێت کە ڕێڕەوی وێرانکردن و دژەکـەی بووژانەوە و داهێنان وەردەگرێت.

* مێژوو تژی ڕووداوە بەوێنەی چاک و خراپ و ڕێژەی ڕەهاوە، لێکۆڵینەوە بە پێزەکانی ئەو ڕووداوانە پێشەنگە داهێنەرەکـان نووسیـوویانەتەوە. هێـشتـاکـەش لە ڕەوشی بووندایە و تا ئەوەی گوتە هەرە باشەکان ڕێژەیین.

* زۆر جـاران مـێــژوونووس ڕووبەڕووی کـۆسپ و ئاسـتـەنگ دەبێــتـەوە لەوانەش خـۆیەتی و ئەندازەی ڕەفتـاری لەگەڵ ڕووداو و پرکێشی و ئەو بۆشاییـەی کە دەوری مـێـژوونووسی داوە بۆ ئەوەی پیـشـەکـەی خـۆی پەیڕەو بکات. لە تەکـیـشـیـدا شـێـوەیی و قـۆرخکردنی بلاوکردنەوەو دەگمەنی ئەو بەڵگەنامانەی کە سەروکاریان بە ڕەفـتـارکـردن لەگـەڵ داڕشـتنی ڕووداوەکـەوە هەیە و چۆنیـەتی ڕەفـتـارکـردن لەگـەڵ بەڵگەنامـەو داڕشـتنی ڕووداوی مێژوویی پوخت و ڕێک بۆ ئەوەی ڕاستی تازەو نوێمـان بۆ دەربکەوێت، لەگـەڵ ڕەخـسـانی سـەرچاوەی تایبەتی یان گشتی بەدەر لەوەی کێ خاوەنیەتی.

* هەندێ مـەسـەلەی بنەڕەتی دەمـێنن بەرەو ڕووی پیشەی مێژووی هاوچەرخ دەبێـتـەوە، ئەویش ڕووکـاری ئایدیۆلۆژییـەکـانە لە نووسـینەوەی مـێـژوو هەر یەکـەیان فێرگەی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام بەتەنیا لەبەرچاوگرتنی و لێکنەدانیــان لەگـەڵ لایەنە مــێــژووییــە ئاڵۆز و تێکەڵبووەکان، ڕەنگە ئەو مێـژوونووسە بشـێوێنێت کە گەرەکـیـەتی بابەتیانە لە ڕاسـتیـیـەکان بگەڕێت. لەگەڵ ئەوەش بارودۆخی مـێــژوونووس و بۆچوونە بابەتی و زانیـارییـە گـشـتـیـیـەکـانی و توانای داهێنانی خـۆی، کـاریگەری زۆریان لەسـەر ئەرشـیـفکردنی مـێـژوو و نووسینەوەی مێژوودا هەیە.

*** بەڕێوەبەری مـەڵبـەندی تۆژینەوەی تورکـیـیـە لە زانکۆی موسڵ.**

# قەقنەس

جەلال مەلەکشا
(بۆکان)

تاریکە و شەوە زەنگ
گەلەگورگ
دەورەیان لێداوم
چرایەک ناسووتێ.
چرای دڵی خۆم نەبێ!
روون ناکا ترووسکەیەک
رێگەی بەرهەنگاوم!
* * *
سەگ وەڕەو لوورەی گورگ.
کەوتوومە گەمارۆی چەند جەردەی پەتیارە...
یەکێ لەو بنارە
یەکێکیان لەم گردە
یەکێ تر لەو دۆڵە
یەکێ لەم کنارە!
* * *
چرایەک ناسووتێ
باش رێگا نابینم
پەروانەی بێ ئۆقرەم
چەواشەی ئەوینم
گەلەگورگ، خێڵی سەگ
رێگەیان تەنیوم
لە بۆسەن بۆ خوێن و پێناسەی شیرینم.
دانیشم بەهیوای کام ناکەس؟!
هەڵدەستم، خۆم ئەکەم بە ئاگر
مەرگ ئەکەم بەگەرای ژینی نوێ وەک قەقنەس!

## هەزار و دووهەمین چیرۆکی شەهرزاد

تۆ لێرە چی دەکەی؟
ئەی رۆحی ئاوارەو
غەریبتر لە دیجلە
بەسواری گژەبای دڕی کام کارەسات
هاتیت و لە بەغدا دابەزیت...
لەم کولجە خەڵوەتەی ئەم بەری دیجلەوە
گوێ بگرە..
لە «دار الخلافە»
شریخەی شەللاخ و هەڕەشەی مردنە
دەزانم،
هەزار و دووهەمین چیرۆکی شەهرزاد
چیرۆکی ئەوینی کەسێکە
کە خولیای عەشقێکی ئاورین
سەری پێ هەڵگرت و
قەراخی دیجلەی کرد بە ژوانگەی فرمێسک و تەنیایی!
چیرۆکی ئەوینی کەسێکە
شەواشەو...
تەک ئەبوو نەواسی سەوداسەر
لە خەڵوەی شەوانی بەغدادا
شەراب و خەم و ژان دەنۆشن
کاتێکیش سەرخۆش بوون
لە خەمی غوربەت و فەراقدا
هێند دەگرین، هێند دەگرین...

دەبن بەشەپۆل و
لە ڕووبار دەدەن و
تێکەڵی ئاو دەبن!

## ڕەشماڵێکی قەرەجانە

لەم جیهانە، پەلەوەریش
نیشتمانی بۆ خۆی هەیە
دارستانێ، تاقەدارێ
ئاوارەش بێ،
نێو ئەشکەوتێ،
بن پاسارێ!
چۆن شێت نەبم؟
نەچم بەگژ کوێستانێکاو
چوار ڕێیانی گەردوون نەگرم
هێشتا بستێ خاک شک نابەم
تێیدا بژیم، تێیدا بمرم!
چۆن شێت نەبم؟
هەموو ڕێگام لێ بەسراوە
بەهەر جادە و شەقامێکا ڕادەبوورم
تەپۆلکەیەک
کلاوێکی سەربازانەی لەسەرناوە
دڵ و گیرفان دەپشکنێ
بەڵکەی خوایشم لەگەڵدابێ ڕێگام دەگرێ
نەکا نەخشەی وڵاتێکم لە گیرفان و
ڕەمزی نهێنی ناوێکم لە دڵدابێ!
چۆن شێت نەبم؟
تووڕەم، تووڕە، وەک ئاگرم
شمشێرێکی هەڵکێشراوم
لەناو بریسکەی خوێنی خۆما ئەزریکێنم.
هەتا کالان نەدۆزمەوە
ئۆقرە ناگرم!
خوا ئەزانێ
من حەز ناکەم، وەک ئەشقیا
سەرگەردان بم لەم کوێستانە
ڕێگام بدەن بێمە خوارێ!
هیچم ناوێ لەم جیهانە
جگە نەختێ سەربەستی و
بستێ خاک و
ئالآیەک و
ڕەشماڵێکی قەرەجانە!



# حەوت زەخرەفە

عەباس عەبدوڵلا یووسف

-١-

پەیژەیێک هەڵدەپەسێرم
پەسیرە لێدەکەمەوە
هەڵدەپەسێرم پەیژەو
حەپینی مانگ ڕادەگرم
لەبۆ کۆنە کتێبێکی یەکووشە
پەیژەم بەسەر ڕەفکەدا
هەڵپەسارد
نووسرابوو: هەڵمەپسێرە
بەهەڵپساردنی پەیژە

-٢-

فیل و بەرمیل
پیل و پیل
بەرمیل و فیل

-٣-

خوێن و خوێ
خوێ و خوێن
گەردوونیان دابەش کردووە
خوێ گیانی بێگیانانە
خوێن گیانی بەگیانانە
خوا مافی بوونی هەردووک دەدا
خوێن و خوێ
خوێ و خوێن

-٤-

ویبق how؟
ویبق when؟
ویبق where؟
ویبق why؟
ویبق what؟



-٥-

دیس... هەمدیس
هەمدیس... دیس
دووبارە و سێبارە و چەندبارەو تا دواجارە
ئەو بارە بارەیە بۆ دۆمینە باشە!

-٦-

جۆلانەی بەتاڵ دەهەژێتەوە
مرۆڤ دەڵێ من نیم
با دەڵێ من نیم
ئەجندە دەڵێ من نیم
گیاندار دەڵێ من نیم

ڕووەک دەڵێ من نیم
زەوی دەڵێ من نیم
موگناتیز دەڵێ من نیم
کارەبا دەڵێ من نیم
شەو دەڵێ من نیم
جۆلانەی بەتاڵیش،
لەخۆڕا، توندتر دەهەژێتەوە

-٧-

سیرم خوارد، زوڕنام لێدا
دەوروبەرم پڕ قاز بوو
سیرم خوارد، فلووتم ژەنی
دەوروبەرم پڕ عەلەلیش بوو
سیرم خوارد، دووزەلەم لێدا
دەوروبەرم پڕ مریشک بوو
سیرم خوارد، نەیم فووکرد
دەوروبەرم پڕ کەڵەشێر بوو
پیوازم خوارد، میلۆدیکام ژەند
خێرا گشت ئەوانەم لێ ڕەوینەوە

* پیل = خۆم مانای نازانم و هەوڵیش نادەم بیدۆزمەوە،
لێرە لە بۆ زەغرەفەدارکردنی هۆنراودکە بەکار هاتووە.
* ویبیق= دەنگە.
* عەلەلیش= عەلەشیش، قەلەموون.

# عەتریکی کەم

کەریم دەشتی

بۆ عەبدوڵڵا قادر گۆران
زیندووێ هەموومان دەبینێ
کەسمان ئەو نابینێ

خەونێکی منداڵانەیە
قسەیێکی سادەیە من دەژیم
وەسوەسەیێ هەیە دەمگرێ پەی بە نهێنییەکانی نابەم
هەندێ جار لە دوای خەونێکی غەریب
لەدوای خەمێکی خەست و شەوێکی درێژ
دوای داڕژانی ئەو ئەستێرانەی بەختی خۆمان پێ گرێدەدا
وەک کەسێ تەنهاو هەمیشە تەنها
ڕۆحمان بەتاڵ دەبێ و خاڵی دەبێ لە پرسی مانەوە
ئەو شوێنانەی دەکەونە نێوان دوو گومان
گومانێ کە شەوقی خۆی داوەتەوە ناو فەرشی یەقین
گومانێ لە هزری بێ ماناو لە هەڵەکانی زمان
ئەوکاتە تەلەزمێ لە دارستانی جوانی
ئاگرێ لە دۆزەخی جاویدانی
ئاوازێ کە لە ڕەنگی شەراب دەچێ
هەڵدەڕژێتە ناو پووشی غوربەتی دڵمان
دەچینەوە ناو لێکدانەوەی خۆڵەمێشی جاری جاران
کە لە قووڵایی دڵمان هەمیشە کتێبێ هەیە
زمان لە بەنداوی وشە قفڵی داوە
هەمیشە خەیاڵێ هەیە ڕاستیێ کەوڵی کردووە
ڕاماندەکێشێتە ناو وەسوەسەیێ
وەسوەسەیێ لە گیاو دەوەن
لە بادەمی قسەیێ هەموومان چاوەڕوانی پشکووتنی دەکەین
وەسوەسەیێ لە حیکمەتێکی پەنهان
پەنهانێ لە پەلکە ڕێحانێ بۆنی لە نهێنی چنرابێ
من تازە شەپۆل فرێی داومەتە کەنار و باس لەمەلە دەکەم
بە باڵی شکستەوە هەڵنیشتووم باس لە فڕین دەکەم
بە مانگی هەزار پارچەی سەرخۆشیەوە هاتووم باس لە بێداری دەکەم
قسەیێکی سادەیە من دەژیم
خەونێکی منداڵانەیە بەرەو پیری ڕامدەپێچێ
حیکمەتێ لەسەر پەلکە لیمۆیێ شیرینی خۆی دەگێڕێتەوە
قسەیێکی ئاڵۆزە سەرخۆشەکان لە مەیخانە بێدار دەبنەوە
بێدارەکان لە مەیخانەکان سەرخۆش دەبن
ئێمە هەموومان سەفەرین
سەفەرێکی سادەو ئاڵۆز
ئاڵۆزییێکی سەفەری سادە
سادەییێکی ئاڵۆز و سەفەری
ئەی
دۆست



# عەشق

ئەفشین موحەمەدی
(سنە)

تۆ.. شیعرێکی سەرکەوتوو
لەم ڕۆژانەی کە ڕقم لە تەنیاییە، نا
لە ساتە قەرەباڵغەکاندا نووسیتمەوە
ئێستاش
بەو نیازم
دووبارەو دووبارەو دووبارە
بتنووسمەوە
تا چی ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەو جیهانەیە بڵاوت کەنەوە
ئاخر... خۆشڕەنگترین بریسکەی هزرم
دنیا پڕ بووە لە شەهوەتی پرسیار و
تۆ...
دوایین وەڵامی ئەم قەرنەی!

## پێت وایە کێی؟

پێت وایە کێی...؟
وا دەت هەوێ لە هەستی گوناحەکانتدا
ببیە جەللاد.
لە خەونی هەزار ساڵەی سڵاوەکاندا ڕاپەڕە
بە ئەزموونی گیرفانەکانت
بپەڕە نێو کۆنە بازاڕی پێکەنینە پووکەڵەکان
ئاستەمە ڕزگاریت بێ لەم حەشامەتە مێرووله.
لە چەکمەی سەربازە کوژراوەکاندا خۆت حەشاردە
دڵنیا بە..
لە زیلەت سپی تر نادۆزیەوە
باوەڕت بێ..
فەلانژەکان دەت شکێنن.!
پەیکەرە وێرانەکەت
لە قەرابەیێکی پڕ لە سرکە
بەیادی حەوهەش ساڵ لەمەو پێشتر قووت ئەدەن
- .. بە بە... وەکو کەرە دەتوێتەوە...!-
چاوت کەوە..
تەرمە هەڵواسراوەکەت
حیزتر لە دیوە دارینەکەت
بە دیواری وەهمەکانتدا ئاوێزانە
پێت وایە کێی...؟
لە کونی دەرزی ئەم باوەڕە تیژانەوە
دەبێ ڕەت بی
پێت وایە کێی...؟



# کەنی قومارا لێڤێن تەیە

عەبدوڕەحمان بامەڕنی
(دهۆک)

دناڤ رەنگێن
کەڤالدکێ
پەرواز شکەستی دا!.
جەمبازێن
هیبونەکا هەرۆ
شەڤەکا سەقەم
گوڕ دکەنە
بسەرو چاڤێن تەڤە..
ل جادێ
سترانێن عشقێ
هلباسکی دزینا کەنیا تەدبن
ڤرێن سوبەهییەکا نەزۆکی
خازگینییێن خۆ
دکەنە ستڤانک
بچار لەپکا ل گەردەناتە
ئاشێ کولافێن دکێڕن
تو خەونی و
دهێڤێنێ خەونێن مندا
سحر بەندی
تو سەرچەڤا هزرێن منی
تو سیتافکی و
خۆ لباوشکێن شەڤا
دکەیە رەشە...

هەر شەڤ تامیسکان
دکەیە تبەرکێ
لێڤێن من یێن قەشاڤی
مکیاج
دوێنەیێن خەیالا مندا
تە هی دکەنە راتەڤانێ و
دبیە کلدانکا شەرمێ
تو و شەڤ
تراجیدیا کریارەکێ
هلباسکی یەک بەرۆک دکەن
گەهەکێ دگرن
لدیوانەکێ دبنە گزیر
بشاباشەکێ
بەریکێن خۆ تژی دکەن ژکلی
بخۆهدانەکێ
پەروازێ شەڤەکا سرۆکی
دکەنە ترانەو ژبەرێک دبەن
تو
دبیرێن مندا
زێمارا خۆ کوشتنێ
دکەیە ستران و
من و خۆ دبەیە سەمایێ
ڤیتییێن شەڤەکا درێژ
بزەنگا دەمژمێرێ ڤە
دبنە کلوڤە
چنک..
چنک...
ئەڤە شەڤەکا دهێتە قنارەدان
ئەڤە ناڤێ شەڤەکێ یە و
قومارە یا دهێتە دانان
ئەڤە زەنگا
دەمژمێرەکا پەیتە و
دوازدە جارا یا دهێتە لێدان
ئەڤە سەمایەکا نوی یەو
کەنیا بلێڤێن تەڤە
دبیتە دام..

تێبینی:
دکۆڕەکێ هوزان خواندنێ دا لباخچێ بنگەهێ لالش یێ کۆمەلایەتی و رەوشەنبیری لدهوکی هاتە خاندن کو ل رۆژا ١١- ٥- ٢٠٠٢ هاتبوو سازدان.

# مەرگی هەست

**ڕزگار لوتفی**
**(کوردستانی ئێران)**

.. قەڵەم مووەکەی لە ڕەنگە خۆڵەمێشییەکە هەڵکێشا. نێوانی برۆ و پێڵووە چاوەکانی ڕەنگ کرد. هەستاو چەند هەنگاو بۆ پاشەوە کشایەوە. دیوارەکە باوەشی بۆ گرتەوە. بەداری قەڵەم مووەکە، پشتە سەری خوراند، سووکە خەنینێکی وشک لێوەکانی داگرت. چووە پێشەوە. قەڵەم مووەکەی لە ڕەنگەکە هەڵکێشاوە و بە هێمنی دەستی بۆ تابلۆکە برد و گۆشەی سەرووی ڕەنگ کردەوە. دوای سەرنجێک هەڵی گرت و لەبەر ڕۆشنایی پەنجەرەکە ڕای گرت. ئەم جارەیان هەوڵەکەی بە فیرۆ نەچوو بوو. خۆی بوو ئەو شتەی دەیویست. ئەو شتەی کە چارەسازی خۆ خواردنەکەی بوو. خۆ خواردنێک کە تەنیا ئێسکەکانی هێشتبۆوەوە- دوو چاوی خورمایی ئەفسووناوی ئەو هەرکاتێک چاوە خورماییەکانی بیر دەکەوتەوە، مات و بێدەنگ ئەحەپەساو مێشکی ئەوەستا. تابلۆکەی لەسەر سێپایەکە داناوە و خۆی لەسەر کورسییەکەی بەرانبەری دانشت. لەپی دەستێکی ژێر چەناگەی دا، ڕوانییە ئەو دووچاوەو..

* * *

لەژێر سێبەرە قورسەکە ڕاکشابوو. قۆڵی کردبوو بەسەرین و تەماشای گەڵازەردبووەکانی درەختەکەی دەکرد. هەستی بە بۆنێکی خۆش کرد. سەری هەڵێنا، ژنێکی جلوبەرگ سپی ڕاوەستا بوو. شنەبا لەگەڵ زولفە ئاڵۆزەکانی مشتومڕی دەکرد و بۆنێکی حەزاوی و دڵڕفێنی بڵاودەکردەوە. دووچاوی خورمایی دەدرەوشایەوە. بریسکەیەکی پڕ لە ڕازیش ڕوخساری نەخشاندبوو.

بۆ ساتێک حەزێکی لە بڕان نەهاتوو، سەراپای لەشی داگرت. بڵێسەی ئەو حەزە مێشکی ئاگردا. خۆی بۆ نەگیرا بەخشکە خشک چووە پێشەوە. ئارام دەستی بۆ بردە پێش و کراسەکەی گرت. دەستی بە لەشیدا هێنا، گەرم بوو، گەرمایەکی سووتێنەردا. هێواش لە راندییەوە. مەتەقی لێوە نەهات هەستا دەستی سەرشانی خست و داینیشاند و هەستی بە جم و جووڵێکی گەرم کرد. دەستی بەرز کردەوە لەپی دەستی سوور ببوو. سەیری شانی کرد. جێ زامێکی قووڵ بەشانیەوە دیاربوو. شوێنی چەقۆ بوو، قەڵاشتبووی. خوێنی لێ ئەتکا. ڕانەوەستا، دەستێکی ژێر جومگەکانی لاقی داو دەستەکەی تری ژێر گەردنی. بە ئەسپایی هەڵیگرت و ڕێگای ماڵەوەی گرتەبەر..

لەسەر قەرەوێڵەی ژوورەکە ڕای کێشا. بەدەم هەناسەیەکی قووڵەوە سەیری ڕوخساری کرد. خەوی لێ کەوتبوو، خەوێکی قورس، بە پەرۆیەکی پاک زامە قووڵەکەی بەست. لەشێکی گەرم، ژنێکی زامداری تەنیا و دوو چاوی خورمایی ماندووی بێ هێز. هەزار فکر و خەیاڵ لە ساتێکدا وەک دیمەنی فیلمێک بە مێشکیدا تێپەڕی، شڵەژابوو، نەیدەزانی چ بکات. دەستە لەرزۆکەکانی کەشەلاڵی خوێن ببوون بردە پێشەوە و لەسەر سینگ و مەمکە قوتەکانی دای نا: بڵێی شیری تیا بێت؟!... پەنجەکانی ئارام خزینە نێوان مەمکەکانی.. دڵە خورپەیەکی تێکەڵ بە هەوەس لەشی ڕاتڵەکاند. لە



گەرمای ئەو لەشە ئاسمانییە سەری سوورمابوو، بۆ یەک سات جەزمەگرتی. بیری وەستا حەزی کرد لەشی لێ جووت کات و گەرمای لەشە ئاسمانییەکەی لێ وەرگرێ. بە دەستە لەرزۆکە خوێناوییەکانی، کراسە سپییە ئەبریشەمییەکەی دڕی. دەستە سپییە کۆترییەکانی کەوتبوونە سەر مەلافەکە. بەلەرزەوە دەستێکی خستە نێو پەنجە خوێناوییەکانی و گووشی. جموجۆڵێکی توند و سووتێنەر، سەرتاپای ژنەکەی هەڵگرت. سینگی سەرتەپین کەوت. جووڵەی توند و شەپۆل ئاسایی. مەمکەکانی، خەرمانەی زوڵفە ئاڵۆزەکانی کە وەکو کەڵافەی ئەبریشەیی بەسەر سینگیدا شۆڕ ببوونەوە، خستە سەر لەرزین. دوو دەستی لە گەردنی ژنەکە ئاڵاند و پەنجەکانی تێکەڵ بە زولفی بوون. ماچێکی شەهوەتی لە ڕوومەتی کرد. دەستەکانی لێک پچڕاند و لەنێو چاڵایی کەمەری ژنەکەدا، جێگایان کردەوە. سینگی بە سینگییەوە چەسپاند. دەنگی کرتە کرتی مەمکە گەرم و سووتێنەرەکانی ژنەکە بیسترا. لەشی وەکو لاسکی لاو لاو بە دەوری لەشی ژنەکەدا پێچاند. ژنەکە لە باوەشی زامێکدا ئەیناڵاند و هیوا لە ئامێزی چێژێکدا کەیفی دەکرد! هیواگێژ و واژ، لەگەڵ ناوی فکرێکدا تاسابوو، فکرێک کە بۆ ساتێک پێی گەیشتبوو.. ژنەکە لە خەوبوو قورسایی کەسێکی هەست پێ کرد، کە چاوی هەڵێنا بە قەد قورسایی دنیا ئازاری بوو. هیوا کە نوقمی چێژێک ببوو، گوێی نەدایە. نووزەیەکی شاردراو، لە گەرووی ژنەکەوە دەرپەڕی. هیوا خۆی کێشایەوە، سەیری ڕوخساری ژنەی کرد، چاوی هەڵێنابوو. فرمێسکی خەم تەقیبوون و بەسەر ڕوومەتە ئاسمانییەکەیدا بە گورجی دەڕژایە خوارەوە. فرمێسکەکانیش لە شەرمان خۆیان دەشاردەوە و لەنێو جێگەکەیدا ون دەبوون. فرمێسکی ژنێکی ئاسمانی کە زوڵفە ئاڵوزەکانی وەکو قیرِی کوڵا و بەسەر شان و ملیدا دەخزایە خوارەوە چاوەکانی بە گیراییەکی سەیرەوە دەیانڕوانی و پەردەی نێوان خاوەنی خۆیان و تەماشاچییان دەدڕی و وەکو ڕمێک دڵی ئینسانی دەبڕی. ئایا لەو چاوانە دەبووایە فرمێسک بڕژێتە خوارەوە؟ یان زەردەخەنەیەکی تاڵوتفتی تێدا وەدۆزرێت؟ ئایا ئەو چاوانە کە هەردەم دەدرەوشانەوە وە دەبوایە ئادگاری پێکەنینی وەخۆوە بگرن و تەماشاچییەکان بەژیان هیوادار بکەن یان مرۆڤێکی ماندوو بچەزێنن؟ ئایا ئەو چاوانە هی ژنێکی گەڕاوەی لەدنیا تەریک بوو یان ژنێکی تەماعکار و ئەهلی کەیفە و گەمە کە بە دوای پارووییەکی چەوردا دەگەڕا یان هەموو شتێکی تێدا شاردراوە بوو؟ ئایا ئەو چاوانە نمای پاڕانەوەیان بوو یان نەفرەتیان لێ دەباری؟

بێدەنگییەکی وشک و جەرگبڕ حاکم بوو. ژنەکە لەسەر تەنیشتی ڕاکێشابوو. بە پەنجەکانی مەلافەکەی جیرِ دەدا. بۆنی خوێن و فرمێسک و شەهوەت هەوای دیوەکەی ڕاگرتبوو.. هیوا لە پەنجەرەی دیوەکەوە، سەیری دەرەوەی کرد ئاسمانێکی تاریکو ڕوون. پەڵە هەورێکی ڕەش و چڵکن، شارەکەی لە باوەش گرتبوو. کەس شەقەی باڵی باڵندەیەکی نە دەبیست. ناچار حەتەری دەکرد، دارتەل و چیمەنتۆ، دوکانەکەی ڕووبەڕوو ماڵەکەش داخرابوو. ئێوارەبوو. کاری ناو دووکانەکە تەواو ببوو. قەساب بۆ ماڵەوە گەڕابۆوەوە تا جلوبەرگە خوێناوییەکانی بگۆڕێت و خۆی بۆ پێناسەیەکی کورت حازر بکات و فریای خۆنواندنێک بکەوێت.. ژنەکە ئۆقرەی نەدەگرت.. ئەیناڵان. بەزامە قورسەکەوە دەتلایەوە، دەنگی نووسا بوو. لەنێو جێگەکەدا ئەم دیواو دیوی دەکرد. لە جێ زامەکەیەوە کرمی بچووک بچووک دەهاتنەدەر. کرمەکان تێکئاڵابوون و دانە دانەشیان دەکەوتنە سەر فەرشی دیوەکە... هیوا دەترسا، لە ناڵە ناڵی ژنەکە و لە دەنگە نووساوەکەی. دەیوت: نەکات پارێزەری شار و دەستە و تاقمەکەی ئاگاداربن. بە خوا ئەگەر پێم بزانن ملم بە تەناخەوەیە! دەشترسم ئەم ژنە گیانی دەرچێت و بەسەرمندا ساغوە بێت، بەڵام هەرچی دەیکرد و دەسووتا نەیدەزانی چۆن لەو گێژاوە ڕزگاری بێت. فکرێکی برووسکە ئاسا بە مێشکیدا هات: لێی دەگەڕێم تا تاریک بێت. ئەوکات دەم دەخەمە ناو دەمی و هیندێک هەناسەی ئەدەمێ، بەشکو و گیانی دەرچێت و هەم خۆم ئاسوودە بم و هەم ئەویشم لەو دەرد و مەینەتە ئازاد کردبێت. دوایی لە تاریکیی شەودا جەنازەکەی دەرفێنم بۆ دەری شار و..! بێ یەک و دوو لێی نەوەستا. چووە پێشەوە. بەلەپی دەستێکی، چەناگەی گرت و بە پەنجەکانی دەستەکەی تری ڕێگای هەناسەی لووتی بەست. بۆنی زولفە خوێناوییەکانی دەهات. چاوە خورماییەکانی گلەییان لێ دەباری. ڕقوقینی لێ بڵاودەبوونەوە. بێزاری، نەفرەت و هەزار ڕازی شاردراوەش... لەشی جیڕدەکردەوە. دەستە سپییە کۆترییەکانی پەلیان دەهاوێشت و لاقەکانی لە یەک دەئاڵاند. تەکانی لەخۆی دەدا و دەیویست نەمرێت. ئەم جارەیان چاوەکانی نەفرەت و پاڕانەوەیان تێدا دیار بوو. بێزاری و لالانەوە. ڕق و دادوا، بەڵام هیوا دەیویست خۆی و ژنەکەش ڕزگار بکات!

... ئاسمان گرمەی کرد، شەوقی لێ بووەوە، شیشە و پەنجەرە و چیمەنتۆی خانووەکانیش لەرینەوە. هەورێکی ڕەش و چڵکن نسەبارانێکی لێ هاتە خوارەوە. بایەکی تووڕەش، خۆی بە دەلاقەی دیوەکە داکوتا و تێکەڵ بە دەنگی هەورە تریشقە بوو.

ژنەکە دوایین پەلە قاژەی کرد و ئارام و بێدەنگ، خامۆش بوو، بەڵام چاوەکانی تیشکی ئەفسووناویی نهێنییەکی قووڵی دەهاویشت و ڕوومەتی، شوێنەواری

زامێکی کۆنی پێوە دیاربوو! زامێک کە ڕەنگە کەس نەیدیبێت و نەیبیستبێت. لەوکاتەدا مشتێک لائوبالیی مەست لە شەقامی بەرخانووەکەوە تێدەپەڕین و قاقایان دەکێشا و گۆرانییان دەوت:

دڵ شکا، گۆزە شکا و پیاڵە شکا
لەم سەراپەردەیە هەر خەم نەشکا
..........

هیوا خۆی لەسەر جەنازەی ژنێکی ئاسمانی دۆزیبیەوە. ژنێک کە خاوەنی دوو چاوی خورمایی کاریگەربوون. نیگاری چاوە ئەفسووناوییەکان، لە مێشکی هیوادا نەخشیان بەستبوو. هەردەم بڵێسەیان لێ دەبووەوەو مێشک و دەروونیان ئاگر دەدا. تاریکاییەکی ئەنگوستەچاو دەسەڵاتداربوو. هیوا دەترسا و تەنانەت نەیدەویرا سەیری ئاوێنەکەش بکات. خۆی کۆکردەوە و دیوەکەی بەجێ هێشت. لە پێپلیکەکان چووە خوارەوە. بە وردی هەنگاوی نا، نەکا پارێزەری شار و دەستە و تاقمەکەی ئاگاداربن و دەست بەستی بکەن. بۆ شانۆیەکیش بێت دەیگرن و پارە و پوولی پێ دەردەهێنن. دەرگای حەوشەکە بە ڕوونی شەقامەکەدا دەکرایەوە. بە ئەسپایی کردییەوە و سەیری ئەملا و ئەولای شەقامەکەی کرد. تەنانەت شەوق و ڕووناکییەکی بەدی نەکرد. بە هەڵی زانی و گەڕایەوە بۆ دیوەکەی جەستەی ساردوەبووی ژنەکەی سەرشانی خست.. بە دڵە خورپەیەکی تێکەڵ بەترسەوە، بەدەودەردەوە هەنگاوی هەڵێنایەوە. جەنازەکە قورس بوو. شان و ملی ئازار دەدا. خوێنی زامەکە، هێشتاش هەر گەرم بوو، تنۆک تنۆک دەچۆڕایەوە و بەدوای هیوادا ڕێچکەیەکی دروست دەکرد جلوبەرگەکەشی ڕەنگی خوێنی گرتبوو، بۆنی خوێن و ترس و تێکەڵاو ببوون.. لاقی خستە ناو شەقامەکە. سەیری ئەملاو ئەولای کرد، کەس دیارنەبوو. تاریک تاریک. ڕێ کەوت. دارتەل و دیوارە چیمەنتۆکان، چوار چێوە و دەرابەی دوکانەکان و دەرگا و پەنجەرە ئەندازەییەکانی لێ ببوونە دەستەو تاقمی پارێزەری شار. هەناسکە هەناسکی پێکەوتبوو. خیسە خیسی لێوە دەهات «بۆنی خوێن سەرتاپای شاری داگرت. خوێن و تاریکی، دەستیان لە دەستی یەکتری خستبوو، لەناو شەقامەکەدا پیاسەیان دەکرد».

هیوا کەوتبووە داڵغەیەکی سەیرەوە. بیری دەکردەوە و بە جەنازە قورسەکەوە هەنگاوە ماندووەکانی دادەنا: لە گۆڕستانە پیرەکەی شار، چاڵێکی بۆ هەڵدەقەنم و ژێرگڵی دەدەم.. نا.. نا.. دەم چۆمی بدەم باشترە. زەحمەتی کەمترە و کەسیش نازانێت کە من ئەو کارەم کردووە.

گەیشتە قەراغی گۆڕستانە بەتەمەنەکە، دوو دڵ بوو. شڵەژانێکی سەیر ئەژنۆکانی، ئەلەرزاند، لە ساغ بوونەوەدا بوو کە بەرەو چۆمەکە وەڕێ کەوت. لە تەنیشت پردەبازەکەوە، ڕۆیشتە خوارەوە. دوو سەگی لاواز و چڵکن لەژێر پردەکەوە دەرپەڕین و بێدەنگییان شکاند. زۆر ترسا. لەسەر خۆ و ئارام جەنازەکەی دانا. هەستی بەخۆشی کرد، سووک ببوو، هەناسەیەکی قووڵی کێشاو سییەکانی پڕ لە هەوای فێنک و گەنیوی دەم چۆمەکە کرد، ئەو چۆمەی کە ئاوەڕۆی مەباڵەکانی شاری لەسەر بوو. لەوە زیاتر ڕانەوستاو دوو دەستی جەنازەکەی گرت و تالیواری چۆمەکە ڕای کێشا بۆ دوایین جار، سەیرێکی چاوە خورماییەکانی کرد و دەستی بە زوڵفە خوێناوییەکانیدا هێناو ڕوومەتی ماچ کرد!. پاڵی پێوەنا. دەم ئاوکەوت. خوێنی جەنازەکە، ئاوەکەی تەنییەوە. شەپۆلی ئاسکی چۆمەکە، جەنازەکەی لەباوەش گرت. زیندەوەرەکانی ناو چۆمەکە زەماوەندیان گێڕاو بە دەوریدا خڕبوونەوە.. دەستێکی نامۆ کەوتە سەرشانی هیوا! ئەژنۆکانی سست بوون و واقی وڕما بەترسەوە ئاوڕی دایەوە، پیاوێکی گەڕاوەی چەماوە و گورجوگۆڵ بە زەردەخەنەیەکی ژەهراوییەوە وتی: «مەترسە! من قەسابەکەی ڕووبەڕوو ماڵەکەتانم، خووم بە بۆنی گۆشت و خوێن گرتووە. بە بۆنی خوێنەکە و ڕێچکەکەی گەیشتوومەتە ئێرە، هیچ نیگەران مەبە. کەس دیار نییە. ئێستا ئەگەر ئیشت ماوە با یاریدەت بەم؟ دۆست بۆ وەختێکی وانەبێ کەی چاکە!» هیوا نەیدەزانی چی وەڵام بداتەوە: «نا.. ز...ۆ.. ر..سپا..س، کارم تەواو بوو، تەنیا کەمێک ماندووم». قەسابەکە وتی: «من پیاوی بە جورئەتم خۆش دەوێ، دوێنێکە ژنەکەم بە چەقۆ کوشت و لەدەری شار فڕێم دا!.. پاداشتی ئەو کارەی تۆش لای منە... ها ئەو قەمە دەم ئێسقانە جوانە... یادگاری باوکمە.. ئەویش لە باپیرەی وەرگرتووە و بۆ من ماوەتەوە. منیش خەڵاتی تۆی دەکەم.. جوان بیپارێزە.. ئەوە من ڕۆیشتم... نەترسە.. ها.. ها.. ها...» قاقایەکی بەسام لە گوێی هیوادا زرینگایەوە!

هیوا چاوی لە تابلۆکە هەڵگرت. لە ڕوانینی چاوە خورماییەکان شەرمی کردبوو، شەرمێکی قووڵ کە ئارەقی پێ کردبوو. شەرمێک کە کەم کەس دەتوانێ هەستی پێ بکات، هەستە شەرمنیەکەم ڕەنگ کراوەکەی، بە قەڵەم مووەکەی ڕەنگ کردەوە و گەرد و خۆڵەکەی بە قۆلەکراسەکەی سڕییەوە!

لە پەنجەرەی دیوەکەوە، سەیری دووکانی قەسابەکەی کرد. قەسابەکە زۆر بە حەزەوە بە چەقۆ، ڕانە گۆشتەکەی لەت لەت دەکرد و کڕیارێکی زۆری لە دەور ئاڵا بوو!.

# ا د م

**دیدار کەریم**
**(کەنەدا)**

(فیردەوسەکان لە ڕۆژهەڵات نین؛ فیردەوسەکان لە ڕۆژئاوانین لەم ڕێگایەدا بگەڕێ کە لێیەوە هاتیت؛ دەبینیت هەر هەمووی لەناو ناخی خۆتدان).

**لە فەلسەفەی زن**



چۆن کەوتم و بەچی؟! زەمین بەستەڵەک، سارد و سڕ، پان و بەرین. ئەوە پرسیاری کەوتنمە ترسمە لە بینین و خزان بۆ ناو ئەو شەقڵە سەوزەی دەمێکی دیکە قووتم دەدات و دواییش بە بەردەوام دروستم دەکاتەوە. بۆ نێو ئەو جەنگەڵە، تۆیە خرە نامۆیە. تازە هەر دەکەوم؛ با هاوار بکەم لەم سێوەی دەمێکە گەرووی گرتووە ڕزگارم بێت؛ با بڕشێمەوە بە ڕووی دونیادا لە تەقلە لێدانی کەوتنم ئاخێک هەڵدەکێشم. سەرم ئاسمان؛ بنم ئاسمان دونیایە لە بنەوەم.... دونیایە لە سەرەوە. چەرخ و فەلەکی دونیا و ئاسمان.. دونیا و ئاسمان!

شتەکان لەگەڵ کەوتنم دەگۆڕێن و تێکەڵ دەبن. چیدیکە ئاسمان ناکەوێتەوە دوام، نابێتە یادگار. هەموو شتەکان دەگۆڕێن؛ خۆشم لەگەڵ کەوتنم دەگۆڕێم. لەگەڵ کەوتنم لە چارەی خۆم دەگەڕێم. لە ناوی خۆم دەپرسم. با چیرۆکێک و خەونێک بۆ خۆم و ناوم دابڕێژم. با بۆ گەیشتنەوەم بۆ ئاسمان تەونێک لە قسە بچنم.. لە حیکایەت! وای لە ئاسمان.... لە خەون... لە خۆم...! ئەو باڵندانە چەند سەیرن کە لە گەڵ کەوتنی من دەفڕن! چەند سەیرن...!

هیچیان لەمن ناچن...! وەک منیش ناکەون...! بۆیە لە حەوادا بۆ حەوا ناگەڕێم.

داخۆ ئەویش شەقڵی چ ئەستێرەیەک بەختی قووت داوە. دەکەوم! دەکەوم! بۆ هەوێنی ناوم سەیری هەموو شتێک دەکەم. ا.....د....م!

چ ناوێکی سەیرە....! چەند کورتە....! چەند قووڵە....! لە کوێ لە ناوی خۆم. لەم ئاسمانەی فڕێم دەدات، یان لەم جەنگەڵەی لێی دەکەوم. وا دەکەوم... کەوتم! ئێرە چ جەنگەڵێکی ترسناکە، چەند شێدارە...! ئەوە شەوە؟! ڕۆژە...؟! ڕۆژە...! شەوە....! وای هەناسە... هەناسە....! وا هەناسە دەدەم. لە ترسی هەناسەدان ڕادەکەم... ڕا.....! سێو دەبێتە لێدانی دڵم. شیرین و تاڵ؛ سوێر و ترش؛ تفت... تفت! سێو دەبێتە مێشکم. پڕ و لووس؛ یان کرماوی... کرمێ!

ڕادەکەم... ڕادەکەم....! دەوەنە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ دەکەونە ناو غاردانم. ناوەستم. هەر غاردەدەم. غاردەدەم.... هەر... غار. دڕکێک لە قوڵی چەپم دەچەقێت و ڕامدەگرێت.

دەمگریێنێت؛ بۆ یەکەم جار خوێنی خۆم دەبینم سوور... سوور، وەک پەڕی ئەو گوڵانەی هەژان و ڕژانە نێو هەردوو لەپم سوور. خوێنی خۆم دەلێسمەوە، هەتا دڵۆپێکی دەبێتە فرمێسکی حەوا... چاوی حەوا... حەوا! با هێواشتر بڕۆم و گوێ لە لێدانی دڵم بگرم و لە ڕۆخ ئەم کانییە سپییە، بن ئەو دارە

هەنجیرە ڕابکشێم. هەنجیرێک دەکەوێتە زارم، قووتی دەدەم.. خەوێکی خۆش! ئاوێکی گەرم ڕانی چەپم تەڕ دەکات و ڕامدەچڵەکێنێت...! لەم ئاوەوە هەڵمی بۆنێکی دژوون دەتنێتە ناو هەناسەم و سیەکانم پڕ دەکات. دەستم دەبەم بۆ پەلکێکی دار هەنجیرەکە و شوێنی ئەو بۆنە دژوونەی پێ دادەپۆشم. دیسان دەگریێم....!

ڕووی خۆم لە ئاوی کانییەکە دەبینم. ڕووم دەبێتە ناوم.. دەبێتە پیتەکانی ا د م. کەپووم ئەلفە و چاوەکانیشم....؟! نا ئەوە لە ناوی من ناچێت. چ تێکەڵ و پێکەڵێکە ناوم و ڕووم...! هەڵدەستم و تنۆک تنۆک میزم لێدەڕژێت و بازنان لەناو ئاوەکە پەیدا دەکات. بازنەکان هەتا لێواری ئاوەکە دەچن. دەشکێن و جارێکی دیکە لە ناوەند بازنەکان لە جێی ڕژانی میز دروست دەبنەوە. بازنەکان لەلام سەیر و جوان دەبن، بەڵام هەرگیز تێیان ناگەم..! با بوەستم هەتا کانیاوەکە دەخەوێت؛ ئینجا پەلکی هەنجیرەکە لە لەشم دەکەمەوە، لەنێو ئاوی کانییەکە شوێنی ژێر پەلکە هەنجیرەکە دەبینم کە کت و مت ڕوومە. وەک ڕووشم دەبێتە ناوم... نابێتە ناوم...! سەیری ئەو شوێنە دەکەم و بیری لێ دەکەمەوە....!

ئەوە مەتەڵێکی سەیرە، چ ناوێکی ئاڵۆزە تووشی بووم...! ئەگەر ئەوە ئەلفەکە بێت، ئەو دوو هێلکەیە چین کە لەهیچ ناچن. لەسەر و بنی ناوم ناچن، لە دال و میمەکەی ا د م ناچن لە هیچ ناچن....!

هاژەی بایەک... ئەوە دوو هێلکەی هەق و قەتلن....! سەری هابیل و قابیل...! لە تەنیشت ئاوی کانیەکە ڕەشبین دەبم و پاشماوە هەنجیرەکە لە زارم تاڵ... لە گەرووم، لە هەناوم....! بۆیە لە خۆم و لێکدانەوەکانم دەغەزرم.... لە کەوتنم.

لە کانییەکە تووڕە دەبم و دەڕۆم.... دەڕۆم... بۆ سەرەوە دەڕۆم... دەڕۆم....! لەپڕ سەرم بۆ ئاسمان هەڵدەبڕم وا هەر باڵندەکانی جاران بەسەر سەرمدا دەفڕن. وا دەفڕن و... دەفڕن. نابن بە حەوا..! نابن بەهیچ....! نابن بە ....! مەلەکان تەنیا بەسەرکەوتنی دەفڕن؛ بەسەرچارەی من....! وا ئاوێکی شین دەبێتە هاوڕێم دەبێتە ڕێم، وا بۆ سەردوە دەمبات و دەمبات...!

بە پێچەوانەی تەوژمی ڕووبارەکە مەلەدەکەم، کەچی هەر بە حەوا ناگەم. بەهیچ ناگەم! ئەو ڕووبارە ناو دەنێم فورات.... فوراتی خۆشی و خەم... فورات فێری زۆر شتم دەکات. لە ناخیدا ڕەوە ماسی زوبەیدی بەسەرهاتی ئەوم بۆ دەگێڕنەوە.... بەسەرهاتی فورات، بەسەرهاتی من...! فورات دەبێتە ڕۆحم... دەبێتە من. من و فورات دەبین بە یەک و بەدوای حەوادا دەگەڕێین.. بەدوای دیجلە....!

بە کەناری فورات بۆ سەرەوە دەچم، بە کەناری خۆم بە سێبەرم. پەلکی وەریوی دار بەڕووی گەورە گەورە بە بنی پێیەکانمەوە دەنووسێن. دەبن بە پێڵاو.... دەبن بە پێم. پەلکێکیان لە شوێنی ئەو گەڵا هەنجیرەکە دادەنێم کە ئاوی وەک مرواریم لەسەر دانا و خستمە سەر ئاوی فورات و فوراتیش بۆ دوور بردی. ئەو باڵندانەی سەر سەرم هەر دەفڕن و منیش هەر لە هیچ ناگەم... لەخۆم... لەناوم. بێزار دەبم و دەگریێم... بەدوای ئەو مرواریییە سپییانەی سەر پەلکە هەنجیرەکە، چەند ڕوندکێک دەڕێژمە ناو ئاوی فورات... هەناوی فورات... هەناوی خۆم! دەی بەشکو مەتەڵی ناومم پێدەڵێت... هیچم پێ ناڵێت...! ناچار گەڵا بەڕووەکان لە بنی پێیەکانم دەکەمەوە و بەسەر دارخورماییێکدا هەڵدەگەڕێم. دەستم لە باڵی یەکێک لەم مەلانە گیر دەکەم کە دەمێکە بەسەر مندا دەفڕن. بەسەر کەوتنم.... بردنم... گریانم. بەسەر غاردانم. باڵندەکە کە پێش ئەوەی بمخاتە سەر باڵەکانی باسی ناوێکم بۆ دەکات.. باسی دیجلە.

(دیجلە ڕووبارێکە لە فورات باریکتر، سپیتر و بە لەنجە و لارتر. حەوای تۆ دەستی لە ملی دیجلە کرد و کەنار کەنار بۆ دوور چوو....!) باڵندەکە پێم دەڵێت.

(توخوا لەسەر باڵەکانی خۆت دامبنێ.... توخوا! با لەم مەتەڵە بگەم... لە خۆم و لە حەوا. با بگەم بە دیجلە، بە حەوا... بەخۆم) بە مەلەکە دەڵێم و دەگریێم.

مەلەکە لەسەر باڵەکانی خۆی دامدەنێت و جارێکی دیکە بە ئاسماندا دەفڕم. لە ترسی ئەوەی نەکەوم دەستەکانم لە ملی باڵندەکە دەکەم و پاژنەی هەردوو پێیەکانیشم لە بن زگی باڵندەکە لە یەکتر گرێ دەدەم... ئیتر ناکەوم.

فورات و فورات دەفڕین.... بڵند دەمفڕێنێت. دیجلە.... ئەوە دیجلەیە لەنێو ئەو شاخانەدا سەر هەڵدەبڕێت و ون دەبێت. ئەوە دیجلەیە... دیجلە... حەوا...! کە دەکەوتم ئەو جووتە عاشقەم نەدەبینی. بە تەنیا دەکەوتم و هەموو شتێکم تاق و تەنیا دەدیت. هەر بە تەنیا شەقڵێکی چڕ و سەوزم دەبینی کە لەناویدا ڕوودەچم و ون دەبم. ناگەمەوە بە حەوا....!

لەم بەرزاییە چاوم لێیە وا فورات و دیجلە لەگەڵ یەکترا بە شاخ و دۆڵ و دەشت و بیاباندا دەخشێت، سەما دەکەن... و بۆ دوور دەچن. چاوم لێیە وا دەست لە

ملی یەکتر دەکەن و تێکەڵ دەبن؛ وا لە دوور سەر و بنی هەردووکیانم لێ دیارە. وا دەمدەخەنە ناو دەمی یەکتر، وا تێکەڵ دەبن و دەبن بە دونیایەکی بەرین... ئاوێکی بێ بن.

لە دوور وا لە شوێنی ژووان تارمایی حەوا دەبینم، حەوا... حەوا.. ئەوە حەوایە و وا گەڵای دار هەنجیرەکەی لایە کە من لەسەر ئاوی فوراتم دانا..

ئەو گەڵا هەنجیرەی تنۆک تنۆک ئاوی وەک مرواریم لە ڕشت...!

دەبێت حەواش وەک من بۆ ئاوی خۆی گەڕابێت...؟! لە ڕووی....؟ لە لەشی...! لە ناوەندی.....! دەبێت بۆ حەوا گەڕابێت... بۆ من...؟!

ئەویش گەڕاوە، خۆی بینیوە و ناسیوە. وەک من خۆی داپۆشیوە. ناوەکەشی لەسەر ڕووی داناوە، لەسەر سنگی.. مەمکەکانی. ئای کە جوانن گۆی ئەو مەمکە سپییانە. ڕەنگیان لە خوێنی قوڵی چەپم دەچێت. لەو گوڵە سوورانەی کە هەژان و پەلکەکانی کەوتنە نێو لەپم و دڕکەکانیشیان لە قوڵی چەپم چەقین، ئەو گوڵانەی برینداریان کردم بە جوانی و ڕقییان! گۆی مەمکەکانی حەوا چەند جوانن... چەند خڕن! ئەوانیش وەک هێلکەکانی من یەکیان شیری هەق دەڕێژن و ئەوی دیکەش هی قەتل. یەکیان بۆ دەمی هابیلێکە و ئەوی دیکەش بۆ زاری قابیل. ئەو دوو مەمەیە چەند لە یەک دەچن، وەک لە یەکچوونی هێلکەکانی من؛ سەر و بنی ناوم. گۆیەکانیشی چەند لە یەک دەچن، ئای کە جوانن... بە بریقەن.. سوورن! مەلەکە وا بە میهرەبانی لە تەنیشت حەوادا دامەدنێت و بە هێواشی بە جێدێڵێت. بۆنی ئارەقەی ژێر باڵەکانی بەسەر هەردووکمان دا دەبارێت، نەشئەیەکمان پێ دەدات تەڕ. ئێمەش وەک دیجلە و فورات دەست لە ملی یەکتر دەکەین، یەکتری دەلێسینەوە، دەم دەخەینە ناو دەمی یەکتر. من پەلکی دار بەرووەکە فڕێ دەدەم ئەویش هی گەڵای هەنجیرەکە. یەکتری توند دەگرین و هەناسەشمان تێکەڵ دەکەین. خۆمان تێکەڵ دەکەین....! هەروەکو دیجلە و فورات دەڕژێینە ناو یەکتر، دەبین بە یەک دەخزینە ناو خەوێک کە زۆر قووڵ... ئاوێک کە بێ بن..!

بە ئاگادێین و بەری دار خورمایەک دادەوەشێنین. چەند خۆشن ئەو خورما گەییو و نەرم و شیرنانە... وای کە خۆشن! ئینجا بۆ کردنەوەی مەتەڵی ناوەکانمان پێکەوە دادەنیشین. حەوا حەز دەکات هەتا سەر سەما بکەین...

تێکەڵ بیین. نەچین بەلای هیچ مەتەڵێک. تا ئەو ناوی خۆم نەخاتە سەر لەشی، ڕووی مەمکەکانی، شوێنی ژێر گەڵا هەنجیرەکەی کە من پێم دا. هەتا ناوی خۆی نەکات بە حەوا. نەبێت بە حەوا... بە ئاسمان...! حەوا دەبێتە دونیا... حەوا... حەوا...!

هەرچی منم بازنە زۆر زۆرەکانی ناو کانیاوەکە سەرسامیان کردووم و هەرگیز پێش چاوەکانم بەر نادەن. بۆ مەتەڵی ناوم هەر دەگەڕێم و دەگەڕێم حەوت شەو حەوا بە خەوتوویی لەبن دار خورماکە بەجێدێڵم. بۆ ناوی خۆم پرسیار لە مانگ..... لە ئەستێرەکان دەکەم... پرسیار لە با...! دەچم لەسەر لمی ئاوە پان و بەرینەکە، خەوی دیجلە و فورات... من و حەوا ناوی خۆم بە دار قامیشێکی درێژ بە گەورەیی لەسەر لمە تەڕەکە دەنووسم. بە گەورەیی دەنووسم... ا د م! دەنووسم و بە قوولی بیرلەناوەکەم دەکەمەوە... پێش بە ئاگاهاتنی حەوا بۆ کردنەوەی مەتەڵی ناوم بەم تاریکە شەوە هەر دێم و دەچم... داناکەسێم. پیتەکانی ناوم بەسەد شێوە تێکەڵ دەکەم. دەیانخەمە سەر ئەستێرەکان.... سەر گەڵای دارەکان.... باڵی مەلەکان.

دەیانخەمە سەر مانگ. کەچی هەر تێیاننناگەم و ناگەم بەهیچ. بە چیلکەدارێک ناوم وا تێکەڵ و بە بچووکی لە دەوروپشتی ناوی خۆم دەیاننووسمەوە: دام.. امد.....، ماد....! دەنووسم و.... دەنووسم....!

وا دیسان مەلەکەیە بەسەر سەرمەوە و نیوەی شەویشە. وا بە قیژەیەک پێم دەڵێت (ئەو پیتانە تێکەڵ یەکتر مەکە.... ئەو ناوە پیرۆزەت مەشێوێنە... مەیانخە سەر لەشی خۆت... لەشی حەوا.... ئەو ناوە ڕۆحی تۆیە.... تۆیە..!)

ترسام.... لەرزیم.... دیسان گریام. لە تەنیشت ناوی خۆم کەوتم. لەگەڵ کەوتنم لەسەر پشت ڕاکشام و بە پاژنەی پێیەکانم ناوە بچووکەکانی لە ناوی خۆم پەیدام کردن هەموویم سڕینەوە و بە یەکجاری لەسەر ڕووی زەمین لامبردن.

خەو دەمبات و خەوێکی قووڵ دەبینم کە کلیلی کردنەوەی مەتەڵی ناوم بوو

ا د م.....ا د م.........ا د م.......!

ا: منم (آدم) ئادەم، ئەلفی (آب) باوک و بەرزایی ئاسمان...؟!

م: حەوایە، میمی (ماما) دایک و خڕێتی زەمین...؟!

د: کێیە؟ لەنێوان ئەلفی من و میمی حەوا. ئەو داڵە

چییه...؟!
دوو هێلکەی... منە یان دوو گۆی مەمکی حەوا؟!
دوو دەستی مووداری منە یان دوو ڕانی زیوینی حەوا؟!
چاوە ڕەشەکانی منن یان چاوە هەنگوینیەکانی حەوا؟!
ئەو دالە ژمارە دووە، دەبێت دوو بێت. دوو وووو....!
من و حەوا؛ حەوا و من؟!
ئەوە (دال)ی لە دایک بوونە، دالی (ولادەت!)
دالێک لەنێوان من و حەوا، حەوا و من. کانیاوێک لەنێوان دیجلە و فورات.
ئەو (دال)ە مرواریيەکانی سەر گەڵای هەنجیرەکەن لە منەوە چووە بۆ حەوا. لە حەواوە گەڕاوەتەوە بۆ من! سەر کەوتۆتە لای من و پێیەکانیشی بۆ لای حەوا. سەری بۆ من دەبێت و پێیەکانیشی بۆ حەوا. سەری بۆ ئاسمان دەبێت و پێیەکانیشی بۆ زەمین.
ئەو ئەگەر شەوەکانی وەک شەوی من درێژ بوون و بە پێچەوانەی تەوژمی فورات مەلەی کرد بە پێچەوانەی زەمەن بەرەو پیری شەوچوو. کەنار کەنار لە دیار شەو، لە دیار فورات، لە دیار ناوی خۆی دانیشت! نامۆ لە جیهانی نووستن لەگەڵ حەوادا چوو ناوی خۆی بە گەورەیی لە لم نووسی. لەگەڵ مانگ سەمای کرد. ئەوا دال بەلای ئەلفی مندا دەسووڕێت دەبێتە ژمارەی (٧). وەک ژمارە حەفت دال سەری دەچەقێتە زەمین و ڕووشی دەچێتە ئاسمان. دەبێت بە ژمارەی حەفت. سەری بۆ حەوا دەبێت و ڕۆحیشی بۆ خودا! یان ئەو (دال)ە ئەگەر وەک حەوا لەگەڵ تەوژمی دیجلە مەلەی کرد؛ بە ئاراستەی زەمەن جووڵا و تیشکی گەرمی خۆری لە باڵای دا. ئەوا بەلای حەوادا دەسووڕێت و دەبێت بە ژمارە (٨) هەشتی ژیان، خەوی شیرینی حەوا، یەکەمین کۆخی ئەوین، ماڵی دونیا! دەچم حەوا بە ئاگادێنم.
حەفت شەو و هەشت ڕۆژ لەسەر لم مامەوە تا لە مەتەڵی ناوم گەیشتم. لە چارەی خۆم؛ لە حەوا! بابچم حەوا بە ئاگابێنم.... بابچم!

(٢٠٠٠)

# دۆزەخ

موحسن عەبدولڕەحمان
(دهۆک)

بەریٚ وی یێ ل تلپیٚ رۆژێ ئەوا هێش وەریسەکی یا بلند، ئەو سەوکا سۆرکری یا هێدی هێدی خۆ نێزیک لێڤا زەمینی دکر. ئاسۆ وەک تابلۆیەکێ سۆریالی لێکربوو، چەند شۆر دبوو، سار دبوو، مینا کێلەکێ سینگێ خۆ دابوو بای، ب لێڤێن قەشافکی و دچاڤاندا خەمەکا کوور، ب کەسەر ڤە جار جار دگوت: (خودێ بۆچی تنێ ئەم..؟).

ل مال ژن و کچ.. ب بەرهەڤکرنا فتاریٚ ڤە دمژویلن، بەلیٚ وی های ل دەنگێ وان نینە، د دەریا هزرێن خەمۆکیێن رەش دا خەندقی یە، بەریٚ خۆ وەرگێڕا و جاڤخشاندنەک ل گارەی تا کەلا ئامێدیێ کر، خەملا بهارەکا گەهشتی د شەرگەه دایە، ژ دوورڤە.. کەڤرێ فێهرس و د سەردا بازێر و منارا ب بەژنا خۆ یا بلندڤە؛ ئەوا ل بەر گۆهورینێن سەقای و داگیرکەران خۆ راگرتی ژ سەردەمێ بادینا تا.. ئیرۆ دیدەڤانە ل سەر تراجیدیێن ڤێ دەڤەریٚ، و ژ هەر کەسێ خۆ تێبگەهینیت ڤەدگێڕیت.. تێبینیکر کو سیبەرا وی گەلەک درێژ بوو، دەستێ خۆیێ چەپێ بادا (دەه دەقیقە بۆ بانگی ماینە)، لپشت خۆ زفڕی ل ئاسۆی نێزیکە رۆژ دێ ئەردی ماچی کەت، بلەز و گاڤێن سڤک بەر ب مزگەڤتێ چوو. وەک هەر رۆژ لوی دەمی لڤینەک د گوندی دا هەیە، و دگەل بانگی بێدەنگیەکێ ب سەردا گرت، رێزێن نڤێژکەران لپشت وی مزگەڤت پڕ کربوو. ل مال سفرە یا دانای بوو؛ فڕەکا ئاڤێ و لاڤەیەکا درێژ، ب درێژیا شەڤێ تا.. دەمێ پاشیڤێ؛ هند ب خواندنا قورئانێ و هند ب نڤێژان و یامای وەک یێ قولنچێ گرتی؛ ژ تەنیشتەکێ بۆ یادی خۆ وەردگێڕا؛ هەڤژینا وی چاڤدێری دکر؛ هیڤی دخوازتن بکاریت هاریکاریا وی بکەت. پاشیڤ وەک فتاریٚ هەر پاریەک بوو.

ل مزگەڤتا ژنڤێژ کەران پڕ؛ یێ ل رێزا پێشیێ و دهزراندا بەرزەبووی، و دناخێ ویدا شەرەکێ دژوار و بێدەنگ یێ ل دوڕیانا ئەرک و چارەنڤیسی رویدای.

هەر مە ژ بێن دن دەسپێکریە؛ بێن کرمان گیانێ وان لبەری لەشێ وان خواری! ئەڤە ژی ژ هەژی هەولەکێ یە ژ خۆ و بۆ خۆ دەستپێبکەین! تنێ وی دەمی ئەم بشانازی دکارین بێژین ئەم بێن هەین، ئەڤە دناخێ خۆدا دگوت.

- سەیدا... فەرموو گوتاریٚ بخوینە؟ یێ بڕەخڤە گوتێ.

زاخەک داخۆ تاکو رابووی؛ ب زۆری وەک یێ گرانیەک لسەر ملان.. پشتا خۆ راستکر.. ل پایێن منبەرێ بسەرکەڤت؛ ل چاڤێن وەستیایێن نڤێژکەران نێڕی، تێبینیکر کو سالناما ب دیواری ڤە ئاماژە دکەتە (٢٣)ێ گولانا (١٩٨٧). دناخێ خۆدا گوت:

- رۆژا ئەینی یە، مەهاردمەزانێ یە، و تۆ یێ ل جهێ پێغەمبەری راوەستیایی، ئەرێ تۆ یێ ژ هەژی ژێیاتیێ بۆ ڤی پێغەمبەری و بۆ ڤی مللەتێ لێ قەومای؟ ئەڤە ئالیەکێ وەلاتێ تە هاتە ئەنفالکرن و گەڕا ئالیێ دن ژی یانێزیک دبیت، کولەیێ سەر ڕەش ئەگەر بەر سینگێ وی نەهێتەگرتن، ئەم دێ هێینە ژناڤبرن و ژ بیرکرن..؟ ب رەوانبێژی دەست ب گوتاریٚ کر؛ و چەندین بناڤڤە دچوو؛ پتر گەرم دبوو؛ و ئەڤێ وزەی هێزەک



نوی ڤەدرێژا گەهێن وی یێن گیرهەگرتی؛ و دەنگێ وی تیژ تر لێدکر.
– باشترین جیهاد گوتنا پەیڤا راستە لبەرامبەر دەستهەلاتەک زۆردار، شەهید ئەو کەسە یێ د بەرەڤانیا پێنج تشتاندا گیانێ خۆ وندا دکەت، (وەلات و ئایین، ناموس و گیان و سامان). ئیرۆ ل ئالیەک وەلاتێ مە زێدەگاڤی لسەر ڤان هەر پێنج تشتان دهێتەکرن، دچاڤ و هێلێن دێمێ نڤێژکەران دا خەم و بێزاری دبوو کەرب..
– ئیرۆ، جیهاد ل دەرازینکێن مالێن مەیە، ئیرۆ... ئیرۆ... ئیرۆ... پشتی یا دلێ خو دەرێژکری، چاوا ب گرانی ل منبەرێ بسەرکەڤتبوو، بساناهی وسڤکی پەیابوو، رۆژ ئاڤا بلەز بەر ب مال دچوو، ب بێهن برساتی چەندی شیای خوار و ڤەخوار تا حەمەر بووی. گەلەک یێ بێهن فرەهـ و ئارامە، لێ ل کۆژیەکا تەنگا دلێ وی ترسێ جار نا سەرێ خۆ بلند دکر، و بسەر هەمی هەستانڤە زال دبوو. ئەڤێ زڤێریەک لجەم پەیدادکر، هێش دبیردانکێ دا ئەو بیرهاتن یا تەرە؛ ئەو مێرچاکێ یاخیبووی، چاوا ب سوزێن درەو خاپاند؛ خەلک کۆمکرن، و لپێش چاڤان راکێشا، مرۆڤەک هەرشاندی بدەروونەکێ هەلوەشیایی، و ب ستوونێڤە گرێدا و گوللە بارانکر.
مانێ ئەڤە هەر نەڤییێن وان هۆڤانن یێن بخوینەکا سار سەرێ حوسەینی بڕی، یا من ڤیای من گوت؛ و یادی خەما خۆدێ. بۆ خۆ دگوت.
شەڤ ژ نیڤێ بۆری و هزران خەو ژچاڤان رەڤاندی، ل ئالیێ دی و لژێر شاپەرێ تاریێ دوازدە خێزان بەر ب چیایی خۆ دکویساند! رۆژا پاشتر ئەرەفاتێن چەژنێ نە، لبەر مێزێ راوەستاند.
– توی مەلا..؟
– بەلێ.
– ئەڤە گوتنێن تەنە، دگوتارا دوهی دا؟ و ئاماژە کرە زرتەکێن خۆ؛ چاڤێن وی گرێدان، مینا گورگان جل و بەرگ دبەردا دراندن..
– بەس من بێ ستارە نەکەن، بەختێ خودێ ئەز مەلامە، هەتکا من نەبەن.
پشتی چبلاق کری، کێشان ژۆرا کەڤلکرنێ..
لکەلا (باستیل) ل وەلاتێ مە هەر بازێرەکی پتر ژ باستیلەکێ لێ هەنە، هەست ب ئێشانێ ژ دەست دا، خوینێ خۆ دلەشێ وی نەدگرت. لپێش شانۆگەریا دگوتنێ دادگەها شورەشێ خوە دیت، تەلیسەکێ هەستیێن لالکری، رێزگرتن بۆ ئایینی و دلوڤانی ب زەلامێن وێ؛ ب پازدە سالێن زیندانێ.. ل ڤاتێ ژێری ژ دۆزەخا میعراجێ ل (ئەبو غرێب) چاڤێن خۆ ڤە کرن.

**هزر ژ پەرتووکا (ئەنفالکرنا بادینان) وەرگرتیە، ب دستکاریڤە.**

# وەسوەسە

**میدیا کاشیگر**

**و/ لە فارسییەوە: هاشم داوودی (خانەقین)**

«پیرم و خانە نشین. بێکارم و شەوانە دڵتەنگ و سەغڵەت دەبم.

ئەم ئوتومبێلە شڕو بێ سەروبەرە هەڵدەکەم و بەڕێ دەکەوم. ئیشی کرێی پێ ناکەم. ئەگەر کەسێکم بەرچاو کەوت سواری دەکەم و ڕاستییت بۆ باس کەم، تۆم کە بینی گۆڕام: کەوتمە یادی یەکێ لە هاوڕێیەکانم، چەند تەماشای تۆ دەکەم هەر دەڵێی سێوێکن و کراونەتە دوو لەتەوە.

نازانم ناویت بیستووە، یانە لەسەر دەمی گەنجایەتیمدا نووسەرێکی بەناو بانگ هەبوو، ئەگەر بڵێم ناوبانگێکی جیهانی هەبووە، زیادەڕۆییم نەکردووە.

هەڵبەتە تۆ زۆر گەنجی و بەدووری دەزانم کە نووسەرەکانی ئەو سەردەمە بناسی.

– ناوی هاوڕێیەکەت چ بوو؟

– خۆی لە پاریس لەسێدارەدا.

– وەک بڵێی ئەو نووسەری بووف کوور بێ؟!

– دروستە ناویت بیستووە؟

– بۆ کەس هەیە نەیناسێ؟

– کەواتە دەیناسی؟ کتێبەکانی چۆنن...، کتێبەکانیت خوێندۆتەوە؟

– هەموو بەرهەماکانیم خوێندووەتەوە.

– کاتێ تۆم بینی کە بەم شەوە لە گۆشەی شەقام ڕاوەستاوی، تیشکی گڵۆپی ئوتومبێلەکە کەوتە سەرچاوت وەک سادق هاتیتە پێش چاوم کتومت وەکو ئەو بووی.

– بەڕاستی نازانم چ بڵێم... هەڵبەتە تەمەنم ئەوەندە زۆر نییە کە ئەوم بینیبێ، بەڵام بەگوێرەی وێنەکانی، بڕوا ناکەم لەیەک بکەین.

– نا، نا باوەڕت هەبێ پێک دەچن، مەبەستم قەدو باڵاو ڕیش و سمێڵ و ڕواڵەتی ڕوخسار نییە. مەبەستم وێکچوونێکی دیکەیە: شێوەی ڕاوەستان، شێوەی ڕوانین و تەماشاکردن، شێوەی قسەکردن....، لە کۆتاییدا شتێکی بە ڕواڵەت بێ بایەخ، بەڵام لە واقیعێکی ڕاستەقینەدا.

– ڕێزت هەیە، بەڵام...

– بێ ئەدەبییە، جەنابت شت دەنووسی؟

– بۆچ،... واتە لە ڕاستیدا وا هەست دەکەم کە تازە لەسەرەتای کارەکەم: چەند چیرۆکێکم نووسیوەو...

– ئەموت: شێوەی قسەکردنیشت هەر وەک قسەکردنی سادقە. هەر کتومت وەکو ئەوە.

– زۆر لێک نزیکن.

– نزیک و بەس؟ زۆر لەوەپێشتر و بەرلەوەی یەکەم نووسینی خۆی بەچاپ بگەیەنێ، هاوڕێی یەکدی بووین و تا ئەو ڕۆژەش کە لە پاریس خۆی لە سێدارەدا پێکەوە بووین.



- ببوورە، ئەم قسەیەتان کە.... «خۆی لەسێدارەدا» دووەم جارە کە دووبارەی دەکەیتەوە. پێشتر نەمبیستبوو کەسێک بۆ خۆکوژی ئەم زاراوەیە بەکاربهێنێ.

- خۆکوژی؟ بەڵێ دروستە. ئیستا ئەوەی نوێ دەڵێ خۆکوژی.

- کاتێ خۆی کوشت، تۆ لە پاریس بووی؟

- هەڵبەتە.

- بێگومان هەواڵی مردنی زۆر کاریگەری لەسەرت دروست کردووە.

- ببوورە، لە مەبەستتان تێ نەگەیشتم.

- مەبەستم ئەو کاتەیە لێی ئاگادار بوویتەوە کە خۆی کوشتووە.... کاریگەری بەسەرتانەوە هەبوو، نە؟

- تێ ناگەم: پێکەوە دانیشتین و ماوەیەک- ئەگەر بەهەڵە نەڕۆیشتووبێتم، لەم بارەیەوە پێکەوە نزیکەی سێ کاتژمێرێک قسەمان کرد کە چۆن خۆی لە سێدارە بدات و دواتر من هاوکاریم کرد کۆنە پەڕۆو جل و شتی لەبن دەرگاکە دانا، پەنجەرەکانی بەتەواوەتی داخست و نووزەی هەوای لێ بڕی و شێرەی غازەکەی کردەوەو پاڵ کەوت. دوایی کە خۆی لە سێدارەدا، من ڕۆیشتم، چ بووە، بۆچ وا بەو شێوەیە تەماشام دەکەی؟

- واتە... واتە تۆش هەر لەو ژوورە بووی کە...

- بەڵێ، بەڵێ ئێمە پێکەوە زۆر دۆست و هاوڕێ بووین: مەحاڵ بوو کەلێی بێ ئاگابم تەنانەت ئاویشی بخواردبایەوە، دەبووایە لێی ئاگادار بم، بەڵام بەم شێوەیە تەماشام مەکە، بیرەوەرییەکی دێنێتەوە یادم.

- باوەڕناکەم.

- کاکی برا، من بە ئەدەبەوە داوات لێ دەکەم بەوشێوەیە تەماشام مەکە! چونکە تەماشا کردنەکەت بیرەوەرییەکی تاڵ دێنێتەوە پێش چاوم و ڕەنج و ئازارم پێ دەگەیەنێت.

- چ بیرەوەرییەک؟

مەسەلەکە دوور و درێژە. جارێ چەند دەقەیەک بێ دەنگ بە. وابزانم بە هەڵە هاتوومەتە ئەم ڕێگایە. ئێرە؟»

«پاسەوانێک هەبوو، کوڕێکی زیرەک و لێهاتوو بوو و لە هەمووی خراپتر کوڕێکی ڕێکوپێک بوو. شەوانە، زۆرجار دەهات و لەگەڵ من و سادق دەستی بە قسە دەکرد. ئیش و کاری لە تەنیشت باخچەی میللی لە بەشی تۆپخانە بوو. هەموو ڕۆژێ سبەینان سەوزە فرۆش و کاسبکارەکان لەوێ کۆدەبوونەوە تا...

- چ کەسانێ؟

- سەوزە فرۆشەکان، دەست فرۆشەکان.

- بەڵێ ڕاست دەفەرمووی.

- بەڵێ سەوزە فرۆشەکان بە عارەبانەکانیانەوە دەهاتن شتومەکەکانیان بفرۆشن و ئەم هاوڕێی پاسەوانەشمان لە ئیش و کاری خۆی زۆر جددی بوو، هەموو ڕۆژێ سبەینان لەگەڵیان تووشی دەمەقاڵ و مشت و مڕ دەبوو تاکو پەرت و بڵاویان بکاتەوە. سەوزە فرۆشەکان پێیان دەیوت وەرەو لەهەر کامێمان سێ ڕیاڵ وەربگرەو دوو ڕیاڵی بدەرە ئەفسەرەکەت کە دەمەو نیوەڕۆ دێت بەسەرمان دەکاتەوەو ئەو یەک ڕیاڵەی دیکەش بۆ خۆت هەڵگرەو لێمان گەڕێ با کاسبی خۆمان بکەین، بەڵام هاوڕێی پاسەوانمان ملکەچیان نەدەبوو و تەنازولی نەدەکرد. دەیوت: «من لاریم نییە بەمەرجێ هەر یەکەو سێ ڕیاڵم بدەنێ و لێرە بمێنن، بەڵام لە جەنابی ئەفسەر دەبێ فەرمان وەربگرم. ئەگەر جەنابی ئەفسەر گوتی هەریەکەو سێ ڕیاڵیان لێ وەربگرە، دوو ڕیاڵی بدەمن و ڕیاڵێکشی بۆ خۆت هەڵگرە و بامێننەوەو شتەکانیان بفرۆشن، ئەوکاتە من لاریم لەسەری نییە، بەڵام تا جەنابی ئەفسەر بەخۆی فەرمانم نەداتێ ئێوە نابێ لێرە ڕاوەستن».

ئیدی با سەرت نەیەشێنم و ئەو هاوڕێی پاسەوانەم ئەو سبەینێیەی کە واجبی هەبوایە، شەوەکەی قسەکانمان لەم بارەیەوە بوو. من بێ دەنگ بووم و شتێکم نەدەگوت، بەڵام سادق هەرجارێ باسی دەکرد و بەهاوڕێی سێیەممانی دەگوت: «کاکی برا سێ ڕیاڵەکە وەربگرەو کارت بە کاریانەوە نەبێت و لەوسێ ڕیاڵە یەکێکی بۆخۆت هەڵگرە، بەڵام هاوڕێیەکەمان ڕازی نەدەبوو. لە دواییدا شەوێک پێش ئەوەی هاوڕێی پاسەوانمان بێ، دانیشتین و مەسەلەکەمان هەڵسەنگاندو دواتریش کاتێ هاوڕێیەکەمان هات، پێم گوت: تۆ بەکەڵکی ئەم کۆمەڵگایە نایەی، چاکتر وایە، یا سێ ڕیاڵەکە وەربگری یاخود خۆت لە سێدارە بدەی.

- بەڕاستی ئەمەت پێ گوت؟

- بەڵێ چونکە وەک واقیعیەت بوو.

- هاوڕێیەکەتان، ئەو پاسەوانە چی کرد؟

- خۆی لە سێدارەدا، بەڵام زۆر بەناپوختەیی. هەر چەندە کە ئێمە ئامادە بووین یارمەتی بدەین زۆر ئاسانتر خۆی لە سێدارە بدات.

- بۆ ئەم شتانەم بۆ باس دەکەی؟

- بۆتی باس دەکەم، چونکە خانەنشینم و شەوانە دەکەومە ڕێ و ئەگەر کەسێک بەرچاوم کەوێ، سواری دەکەم. کەسێک بەرچاوم کەوت ترس دەیگرێ.

- زۆر سوپاست دەکەم، بەڵام ئەمە وەڵام نەبوو.

- ڕاستیەکەم ئاراستەتان کرد.

- بەڕاستی ئەمشەو، دڵم زۆر سەخڵەت بوو و چۆنی دەربڕم،.... یەکەم کە بیستم هاوڕێی نووسەرێکی کە

بەرهەمەکانیم زۆر پێ خۆشە،... زۆر پێی خۆشحاڵ بووم. وتم زانیاری و شتی نوێم لە بارەی دەسکەوت. بەڵام ئێستەیش کە قسەکانت تەواو بووە،....

– دەبینم، دوا قسەی هەر شەوی هەموویان بەمن دەڵێ. هەر بەهەمان شێوە کە مەزندەی دەکەی، من ئەم چیرۆکەم هەمووشەوێ بۆ ئەو کەسەی کەسواری ئوتومبێلی دەکەم، دەیگێڕمەوەو دواییش بەسەرهاتەکە دەگاتە ئەوێ کە ئەوکەسە، دروست وەکو تۆ، ناچارم دەکات مەسەلەی ئەو پاسەوانەی بۆ باس بکەم و لە ناکامیشدا وەکو تۆ دەگەنە ئەو دەرەنجامە کە چاکتر وایە خۆیان لە سێدارە بدەن.

– من، بەڵام من ناڵێم بیر لە خۆکوشتن یا... هەرگیز، من تەنیا وتم کە دڵم زۆر سەختەت ببوو... بەڵام ئێستا کە زۆر سەختەتتر بووە. بۆچ ڕادەوەستی؟

– گەیشتین.

– ئێرە کوێیە؟

– ئەوێ لەپشت ئەوێ، کەلاوەیەکە.

– مەبەستت؟

– تەماشاکە، هەموویان دڵیان سەختەت بووە و هەموویان تەنیا ڕێگەیەکیان لەپێشدایە: لەسێدارەدان. باوەڕبکە. من خۆم پێشتر تۆم نەدەناسی، بەڵام کاتێ تۆم بینی کە بە تەنیایی لەژێر گڵۆپی عاموودی کارەباکە ڕاوەستابووی، تا کۆتاییەکەیم خوێندەوەو لێی ئاگادار بوومەوە. هەر بۆیە سوارتم کرد.

– بۆچ؟

– بۆ ئەوەی نەهێڵم وەک هاوڕێی پاسەوانم بەشێوەیکی خراپ خۆت بکوژی. فەرموو. وەری گرە.

– ئەمانە... ئەمانە چییە؟

– حەب. بە تەواوی پێدەچێ سی و شەش دانەیەک بێ، برۆ بۆ ئەوێ، بۆ ناو ئەو کەلاوەیە. لەسەر خۆت حەبەکان دانەدانە بخۆ، پاشان پاڵ بدەوەو بنوو. دڵنیابە کە تا چل و هەشت سەعات کەس ڕێگەی ناکەوێتە ئەوێ و هەر بۆیە کەسێک نییە ڕزگارت بکات، ئەمەش وەربگرە.

– ئەمە چییە؟

– ئاو بۆ خواردنی حەبەکان.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری (تکاپو) ژمارە(۱۰۰)

اردیبهشت- ۱۳۷۲ (۱۹۹۳ز)

# خۆشترین گۆرانی

ئەحمەد سالار

**کەسەکان:**
مام باپیر
نێرگز
حەمەلاو

**شوێن:**
هۆڵی ئاهەنگە

**سەرنج:** لەلایەن تیپی شانۆی سالارەوە بەشداری شەشەمین فیستیڤاڵی شانۆی کوردی لە شاری سەقز پێ کرا. ئێوارەی ڕۆژی یەک شەممە، ڕێکەوتی (٢٠٠٤/١٠/٣) لە هۆڵی شانۆی بەڕێوەبەرایەتی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی سەقز نمایش کرا، هونەرمەند ئەرسەلان دەروێش دەریهێنا بوو.

**مام باپیر:** ئای بان چاوان، یاخوا بەخێربێن، سەرچاو و سەری باپیر. ئەڵێن واچاکە ماوەیەک چاوەڕوانبین تا میوانەکانی تریش ئەگەن. فەرمووت هەمووان گەیشتوون؟ دەیاخوا هەمووان بەخێربێن. خزمینە ساڵەهایە بوو بەعەزرەت و پەرۆش هاتنی ئەم ڕۆژەوە بووم، سوپاس بۆ خوا ئەوا هات و ئەوا بنیمان. نازانم لە گەشکەی خۆشیانایە، یان ڕادەی تامەزرۆی ئەم حەز و ئۆخەیە کەوا لەناخما گشت ڕۆژانی تەمەنی ورووژاندووم، ئەوە بیرمە و ئەوەی لەبیریشما سڕابوویەوە، هەر هەموویان پاڵەپەستۆی دەرکاندنیانە.

خەڵکینە کە بیر لەم ئێوارە ئاهەنگە ئەکەمەوە تەوژمی شەپۆلی بیرەوەرییەکان ئەمهەژێنێ، چەندە بکەم و چەندە بکۆشم دەربازبوونم نییە و هەر گرفتار و گیرۆدە و ئالوودەی ئەبم، ئەزانن شتەکان لەچی ئەکەن، بۆ نموونە، وتیان ڕۆژێ لە ڕۆژانی، هاوین، یان بەهار، یا پایز بێ، پایز خەزان و گەڵاڕێزان، میوەی بەتام، هەوای خۆش و ئاوی سارد و سەردەمی پەیامی پەپوولە پایزە، ماڵ ڕووەو هەوێنان و مشوورخواردنی پێداویستییەکانی زستانن.

هاوڕێیەکم هەبوو هەرکە پایزان دا ئەهات، بەتایبەتی ئێوارە وەختانی، کۆست کەوتووانە خەم دایئەگرت و ئاخێکی حەسرەت لە سینەیەوە ئەبیسترا، گێڕایەوە: چووبوومە ڕاوە پۆڕ، جووتە پۆڕێک کەوتنە بەر نیشانەی ساچمە زدنەکەم و نێرەکەیانی بەرکەوت ڕایکرد، کە ڕوانیم مێیەکە نابزوێ و چاوی لە هەردوو چاوم بریوە، هەنگاو هەنگاو چوومە پێشەوە، ئەویش زیاتر چاوی لە



چاوم ئەبڕی و دەستم برد پۆرە کوژراوەکە هەڵگرمەوە ئەمجارە فرمێسک لە چاوی هات و لە تەنیشت پۆرەکەی ترەوە بەلادا هات، بەڵام هەر چاوی کراوە بوو، هەر سەیری ئەکردم هەردوو دەستم سڕ بوو، چاوەکان بوونە ئاسمان، زەوی، گەورەبوو، منیش گچکە گچکە و ون بووم. لەو خەمۆکییەوە لە هەستی پڕ لە ئازاری باڵندە گەیشتم، زانیم، زانیم.

ئەمە وەکو ئەوەشە، بڵێن زستان. ئیدی بەفر و باران و کڕێوە و سەرماو سۆڵە و سەهۆڵ بەندان و.. هەر شتەش هەزار و یەک شتی دی لێ ئەبێتەوە کۆڵان و سەربانەکانی کردبوو بەیەک.. زۆرباش لەبیرمە، ئەوەدەمە گەنج بووم، چۆن گەنجێ، ئەو ڕۆژانە بوو، ئاگری ئاگرناسا تێن و گوڕی لە بازوومەوە وەرنەگرت. بەسەر چیای ئەراراتدا هەڵگەڕامایە، لەژێر زەبری هەنگاوەکانی بڕوا بەخۆییما نـاڵە ناڵی و نرکە نرکی دەهات ئای لەو ڕۆژانە و وای لەو ڕۆژانە، ئای لەمن و وای لەمن، ئەو ڕۆژانەبوو، لەبەر نازی چاوەکانی نێرگز چلەی زستانی تەڕو تۆشم بە گوڕەی نەوبەهار کرد، بۆ بەیانی ئاوا تەورەکەم سەر نەڕەی شانم نابوو، دڵم خەبەری دابوو، ببێ و نەبێ ئەمڕۆکە نێرگزەکەی چوار وەرزی ساڵی تەمەنم ئەبینم.

(نێرگز و حەمەلاو دەرئەکەون)

**حەمەلاو:** نێرگز، کچێ نێرگز.. دەنگە، خێراکە، خەڵکەکە چاوەڕوانن.

**نێرگز:** چاوەڕوانی ئێمە؟ باشە حەمە لاو. نازانی مام باپیر بۆچی ئەم عەشاماتەی گردکردۆتەوە؟ ئاهەنگی چییە، ئەبوو بتپرسیایە. سەیرە بچی بۆ ئاهەنگێ و نەزانی هی چییە و چ باسە!

**حەمەلاو:** بە کورتییەکەی، ئەو پیاوە لە مێژە بە ئومێدی مناڵە، من وای بۆ ئەچم و هەر واشە.

**نێرگز:** سەیرە! باوک!؟ تازە بەتازە مناڵیان ئەبێ! پاش چی؟ ئەی باشە بۆ خێزانەکەی.

**حەمەلاو:** کچێ ئارامت بێ، تۆزێکی تر هەمووشتێ ئەزانی.

**نێرگز:** نیو سەدە زیاترە ژنی هێناوە، تۆ لە دایک نەبوویت ئەو نێرگز خانی هێنابوو، باشە نەئەبوو، کەسێک لەو گوزەر و کوچە و کۆڵانەدا بە ئێخەی، پرسیارێ بگرێ، بڵێ مام باپیر گیان، بە قوربان ئەمە ئاهەنگی چییە؟ زەماوەند و شەوچەرەی کێیە؟ هەی نەگبەت تازە تۆ و مناڵ بوون، خوا ڕەحمی پێ بکات، من ئەڵێم هەبێ و نەبێ..

**حەمەلاو:** نێرگز، هەرگیز و هەرگیز مام باپیرم بەو شێوەیە نەبینیبوو. ڕوومەتەکانی ئەتوت پشکۆی ئاگری کوورەی ئاسنگەرن و سوور سوور هەڵگەڕابوون و بریسکە بریسکیان بوو، چاوەکان هەر دەتگوت دوو چاوی نەو هەڵۆیەن لە گاشەبەرد بڕوانی، هەپروون هەپروون ئەبێ.

* * *

**مام باپیر:** کەنیشکە خاسەکەم، دادە نێرگز خان، بڕوا بکە بەزاتو سیفەتی ئەو خوایە، لەو دەمەوەی خەونەکەت بۆ گێڕاومەتەوە بۆتە مەراق و خەو و خەیاڵم و شەو و ڕۆژ لە خولیای لێکدانەوەیام. کچەکەم وابزانم لەم شوێنە و لەم کاتە باشتر نابینمەوە بۆ لێکدانەوەی ئەو خەونە و باسکردنی، بەتایبەت بە بوونی ئەم میوانە ئازیزانە، بە ئومێدی بەشدارییان.. کەواتە: هەبوو، نەبوو، کەس لەخوا گەورەتر نەبوو، لە پێغەمبەر ئازیزتر و لەم کوڕ و کۆمەڵ و مەجلیسە خۆشتر نەبوو، شیرینتر نەبوو.. هەبوونەبوو.. مەلێک هەبوو، بەڵام چ مەلێ! ئەو مەلە لە تەک یەکەم چڵی، یەکەم لقی، یەکەم درەختی دارستانەکەدا هێلانەی کرد.

**حەمەلاو:** باشە ئێمەش ماڵمان نەکرد، خشت بەخشت... ئەڵێم ماڵمان نەبوو... ئەڵێم...

**نێرگز:** ئەوا لەناو خەونەکەما، ئەو دارستانە پڕ بوو لەو باڵندانەی لەسەر خواردنی گۆشتی باڵندە ئەژین.

**مام باپیر:** کچەکەم ئەو باڵندانەی تۆ ئەیڵێی، نازانن بخوێنن، دەبا مام باپیر بۆت لێکداتەوە: مانای ئەوەیە تەنها و تەنها ئەو مەلەی خۆمان ئەزانێ بخوێنێ، بەڵام..

**نێرگز:** وادەی بای وەشت و شکۆفە بوو... ئەگەر مەلە تەریک کراوەکە بیخوێندایە، ئەوا ئەوانەی دی چییان ئەکرد و چی ڕووی ئەدا؟ (دەنگە دەنگ و قریشکە قریشک)

**حەمەلاو:** لە ئەندازە بەدەربوو، لە توانادا نەما، کۆڵانەکان و دەرو دەروازەیان لێ تەنین، ڕێگاکانیان لێ بەستینەوە.. دەرگا.. پەنجەرە...

**نێرگز:** درەختەکانیان ڕووت کردەوە.. هەی ڕۆ شکۆفەکانیان وەران، باخ بێ بەربوو.. باخ... هەی ڕۆ باخ..

**مام باپیر:** کچە سەلارەکەم، من وای بۆ ئەچم و وای لێکئەدەمەوە: مادامەکی ئەوان نایەڵن و لێناگەڕێن زارهەڵبێنێتەوە... باشە چاری نامێنێ، ئەبێ شتێ بکات، کەواتە ئەمجاردیان چی بکات و چی نەکات؟

(حەمەلاو سەرقاڵی دیوار هەڵچنینە و خانوو دروست ئەکات)

**حەمەلاو:** ئادەی، ئادەی خشت بابێ... گەچ بابێ..

بـبێ، بابێ، خشت بابێ، نیمە نیمە خشت بابێ...

**هەرسێکیان:** بابێ بابێ، ئادەی ئادەی...

**حەمەلاو:** ئادەی ئادەی... خێرا خێرا، بە قوربانی شان و قۆڵتان بم.. ئادەی...

**هەرسێکیان:** بابێ بابێ، ئادەی ئادەی..

(ماندووبوون، شەکەتی ژان و گریانی نێرگز....)

**مام باپیر:** کچەکەم هێدی بەرەوە، کەمێک ئارامت بێ، بسرەوە، ئەوا ڕاوچییەکان لە حەشاران و خۆیان بۆ ئاوەتەوە، بڕوانە ئەو ئاسمانە بەرین و بەربڵاوەیان لێهێناوەتەوە یەک و لێیان کردۆتە چەرمەچۆلەکە... ئادەی کچەکەم کاتی ئەوە نییە خێراکە هەستەوە، بابزانم پاشان خەونەکەت بەچی ئەگات و چی ئەبینی.

(نێرگز بەدەم خەوەوە ئەڕواو خەون ئەبینێ)

**حەمەلاو:** نێرگز، نێرگز، کچێ نێرگز، ئەوە کوێوە ئەچی، بۆ کوێ؟

**مام باپیر:** حەمەکە لێی گەڕێ. با ڕانەچڵەکێ، دایەچڵەکێنە، با بە ئاگا نەیەت و لە خەوهەڵنەسێ.. بڕوانە، وەرە لامەوە و تەماشاکە، ئەوا گەیشتە چەقی قەرەباڵغی و عەشاماتەکە.

(نێرگز بەدەم خەوەوە لە خەڵکەکە ئەپرسێ)

**نێرگز:** ئەپرسن هەر ڕەشە سپی ئەبێ و ئەو سپییەش ڕەش ئەبێ و بە جارێکی تر و جارێکی تر... خەڵکینە هەر خەڵوزەو بەزیو ئەبێ، پاشان بەزێڕ ئەبێ، جارێکی تر و جارێکی تر زێڕە و ئەبێتەوە بەزیو.. ئەوسا، ئەوسا ئەبێتەوە بە خەڵوزە ڕەش ڕەشەکە.. بەڵام خەڵکینە ئەو جۆرە خەڵوزە نابێتە ئاگر و چی لە گەڵا بکەیت ناگەشێتەوە، ناسوتێ، ئەمێنێ، نابێتە ئاگر.

خەڵکینە من لێتان ئەپرسم کەی ئەبێتە ئاگر و ئەگەشێتەوە؟ کێ ئەیزانێ؟ بۆ کەس نایزانێ؟ دەکەواتە چاک چاک لە من بڕوانن..

**مام باپیر:** تەواو، تەواو، برایەوە، من پێتان ئەڵێم: حەمەلاو کارەکەت بەچی گەیشت و گەیشتیە کوێ؟ خەڵکینە ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە..

**حەمەلاو:** بیر لە کۆمەڵێ شت ئەکەمەوە، نازانم، تیاماوم، لەکامەیانەوە دەست پێبکەم.

**مام باپیر:** کوڕە خاسەکەم ماڵ، ماڵ ئەوسا منداڵ، ئەوسا..

(دەنگ و هەرای کارکردن)

**هەرسێکیان:**

**ڕۆژێ لەڕۆژان، جارێ لە جاران**
**تەڵێ وەنەوشەی گەردن کەچی ناز**
**بۆی گوڵێنی خۆی بەشەماڵ سپارد**
**چیای گەردن کەش نای بە دڵییەوە**
**ئاڵۆدەی عەشق، گرفتاری کرد**
**کەڵلەی کەیل بوو، کەڵلەی گەرم بوو**
**بیری چوویەوە، چیای سەنگینە**
**پەلی هەوری گرت، سەمای گەرم کرد**
**هەوای ژوانی هێنا بەدڵیا**
**چەخماخەی هات و دایکردە باران**

(گۆرانی باران بارانە)

**مام باپیر:** ئەڵێم، تۆ بڵێی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، مەلەکەمان عاشق نەبێ؟ باشە کوڕەکەم حەمەلاو و ئێستاکە باش لە مانای عەشق ئەزانی؟

**حەمەلاو:** خانمەکەم، نێرگز خان، بەو خوایە، ئەگەر تۆ دڵۆیە شەوغێک بوویتایە، ئەزانی، یان نازانی؟ دەریاکان، ڕووبارەکان، کانی و کانیلەکان، نازی هەر هەموویانم ئەکێشا، ئای گۆرانی پڕ ڕاز و نیاز و جۆش و خرۆشی سەرگەردانی ئەڤینم بۆ ئەوتی.

**نێرگز:** کەی مەلەکەمان گۆرانی خۆی ئەڵێ؟ بۆ کێی ئەڵێ؟ بۆ...

**حەمەلاو:** جارێ سەرقاڵی خوێندنی دەرسی عەشقە، ئەوسا، ئەوسا.

(گۆرانی)

**«موحیبەت زۆر بە ئاشوبە، بەسەهلی تێمەگەن یاران»**
**«کە ئاسان بوو ئەمو ئەوەل، وەلێ ئەفتادە موشکیلها»**
**«بەدەل کەین با بە نەشئەی مەی، خوماری میحنەتی دونیا»**
**«ئەلا یا ئەیهالساقی ئەدر کەئسەن و ناولها»**

**نێرگز:** حەمەلاو: ئەرێ ئەوە بۆ بێ هۆش و گۆش بووی؟ چییە؟ چیت لێ قەوماوە؟ نازانم خوانەخواستە، پاپۆڕەکەت نوغرۆبووە، خەرمانەکەت گڕی تێ بەربووە؟ مەزراکەت شەرا و گڕە هەڵیپرووسکاندووە!

**حەمەلاو:** نێرگز، بیر لەوە ئەکەمەوە، هەر ئەبێ لانەیەکمان هەبێ، هەر ئەبێ ماڵێک پێکەوەنێین. نەبەخوا، بەم حاڵە ناتوانین بیبەینە سەر، خوا یاربێ سبەی دووی، منداڵیشمان ئەبێ، ئەڵێن خوا کڵاوی بۆ بەڕوو کردووە، تۆ ئەڵێی چی؟

**نێرگز:** من بڵێم چی! خۆت لەو سەری هاتوویتەتەوە... جارێ لەوە گەڕێ، وەرە با گوێ لە حەقایەتەکەی مام باپیر بگرین.

(دەم ئەجوولێ و دەنگ نییە)

**مام باپیر:** ئەمجارە، نێرگز خانم، چاک چاک لێم حاڵی

بوو، ئەو ئەیوت و منیش بە جوانی ئەمبینی، کاتێکم زانی..

**نێرگز:** بۆ ئەو باڵندە جوانە ئێسک سووکە بێدەنگە؟ حەمەلاو چ گرفتێکی هەیە؟ ئاڵوودەی چ خەمێ بووە؟ نەخۆشە؟ گەلێک کز و لارەملە، تۆ لەم دارستانە چڕو بێ سەرو سەرحەدە بڕوانە، لە هەموو لایەکەوە هەر واژە واژ و قیرە قیرە، تەنها ئەو کپ و بێدەنگە، بۆ ناخوێنێ؟ خوێندنی لێ زەوت کراوە؟ لەبیری براوەتەوە!

**حەمەلاو:** هەر وابڕوا، ئاوا ژیانم لێ تاڵ وتفت بکرێ و، لێم بکرێتە دۆزەخی دۆزەخ، بیر لەوە ئەکەمەوە، لەسەر ئەو چیا سەر بە هەور و هەڵایە لانەیەک بکەم، بیر لە زۆر شتی تریش ئەکەمەوە.

**نێرگز:** کەی مەلەکە ئەخوێنێ؟ کەی ئەم لانەیە ئەکرێ؟

**حەمەلاو:** کەی مەلەکە ئەخوێنێ! کەی ئەم لانەیە ئەکرێ!

**نێرگز:** ئەو خانووەی تۆ: بڵێی، هێند شوێن بەرز ئەبێ، لافاوی نووحیش هەڵسێ نایگرێتەوە، نە بەخوا نایگرێتەوە.

**حەمەلاو:** جارێکی تریش، ئەو مەلە ئەخوێنێ! یان هەر!

**مام باپیر:** پێشینان هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕیان، جوانیان فەرمووە:

(بزن بۆ شەوێ جێی خۆی خۆش ئەکا، خوا ئەوە بگرێ کە وەک ئەو ناکا).

قسەی پێشینان نەقشی بەردە، ئەزانن بۆ نەقشی بەردە: چونکە هەر ئەمێنێ و هەر کاری پێ ئەکرێ و هەر.... سەبارەت بە مەلە تەریک و لانەواز و بێ نازەکەمان.

**هەرسێکیان:**
ئەو جۆرە نەقشە
وەک خۆشەویستی
وەک باران و خۆر
نە لەبیر ئەچێ
نە ئەسڕێتەوە
چی ڕەشەبایە
چی لێزمەی بەتاو
قووڵتری ئەکات
دیارتری ئەکا
بڵێین و نەڵێین
کلاوی مەحاڵ
لەسەر ئەکات

**نێرگز:** جا حەمە لاو، ئەم تەریکی و بێ نەوازییە، گەیشتە ئەوەی، جام پڕ بێ لێی ئەڕژێ، ئیدی بەر لە سپێدە، ئەو دەمەی هێشتا وەکو مەلان مەیلی چلانیان بەرنەدابوو، ئەت وت ئەو ڕۆژە تەنها ڕۆژی ئەوە و بۆ ئەو بۆتەوە. باڵە تەزگرتووەکانی کەنەفتی ساڵەهای بە یەکادا و تا توانی چلاوچلێ کرد، تا توانی لە دوور و نزیکی ڕوانی.

**حەمەلاو:** نێرگز ئەوە سەرەتا سەرهەڵدانی جۆرە خۆشییەکە، نازانم، نازانم، بڵێم چۆنە..

**مام باپیر:** نێرگزە خانومانەکەم، لە باپیرە عەزرەتخوازەکەی جاری جاران و، ئەمڕۆشت بڕوانە، لەم دەستانەم بڕوانە، ئادەی چاک سەرنج بدە و بەچاکی پەنجەکانم بژمێرە، ئەوەتا یەک، دوو... ئەها دە پەنجە، تەواو؟ نەء، نەخێر، گەر بتەوێ ئەبێتە سەد پەنجە، هەزار پەنجە، سەد هەزار و بگرە پتر لەوەش، ئەمە حەقیقەتێ سوور بوونە لەسەرمان، ئەبێ چاکیش بە ئاگایی لە کات و شوێن و مەبەستی بەکارهێنانیا.

**نێرگز:** ئەڵێم، حەمە لاو، بە ڕاستتە، یان گاڵتە و شۆخیم لەگەڵ ئەکەی؟ دە فەرموو تۆش وەرە لەم دار هەنجیرە بڕوانە و حەیرانی مەبە. ماشەڵڵا لەم هەموو هەنجیرە! وەرە دانەیەکی لێ بخۆ، گەزۆی خاوە و لە زارا ئەتوێتەوە، هەنگوینە. ئادەی حەمەکە، بزانم دەستت ئەگاتە ئەو لقە، نائەوەیان، ئەو لقە بەرزە، ئەوە هەنجیرەکانی زۆر جوان گەییون، ڕاوەستە با ئەو سەبەتە بێنم و هەندێکی لێ بکەینەوە، ئەڵێم هەر ماڵە و.... حەمە ئەوە چیت لێ هات؟

**حەمەلاو:** سەر هەنجیرەکە کەوتبووم.. دەی خێراکە. ب بچم بیبەشمەوە.

**نێرگز:** گاڵتەت پێ نەیە. ئەوەتی بیر لە هەقایەتی مەلەکە ئەکەمەوە و خەیاڵەکەی مام باپیر و..

**حەمەلاو:** ڕۆژ بە ڕۆژ سەرکزتر و سەرکوتتری ئەکەن. چۆن بخوێنێ؟!

**نێرگز:** چۆن ماڵەکەمان تەواو بکەین، ئەبێ دار هەنجیرێکی لەوەی لە شوێنی گیانبەخشینەکەی خاتوو دەلالی پردی دەلال بڕوێنین.

**حەمەلاو:** نەچووە بچێ. ئەزانی؟ با ڕۆژانە لە مەلەکە بڕوانین، بزانین کەی ئەبزوێ ورکەی ئەبێ چریکەی لێوەهەستێ؟ ئەبێ هەموو گیانلەبەرێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان بخوێنێ.

**نێرگز:** ئەبێتە خۆشترین گۆرانی. وانییە مام باپیر؟

**مام باپیر:** نێرگزخان، گۆرانی خۆشت ئەوێ؟ لەداود پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێ) گێڕایانەوە: خۆشترین دەنگ، ئەو دەنگەیە خۆشترین گۆرانی بلێیی، خۆشترین گۆرانیش، ئەو گۆرانییەیە لە هەناسەیەکا شەو و ڕۆژ یەکخا و لە چریکەیەکیا هەر چوار وەرزەی ساڵ بەو جوانە وەرزە بکات کە تەنها شتە جوانەکانی تیا لە دایک ئەبێ و سەرلەنوێ ئەو ژیانە پوختەیەی لێوە سەرهەڵئەدات کە شێلەی زیندەگانی خۆشەویستی لێبچۆڕێ. ئەوە خۆشترین گۆرانییە. ئەو دەمەی نیازی گۆرانی وتنت هەبوو، ئاوا بیلێ، بەکامی دڵ دەنگی لێهەڵبڕە.

**نێرگز:** حەمەکە، لە دار هەنجیرەکە بڕوانە، سەیرە، چۆن دارهەنجیر ئاوا هەڵئەچێ! ئەڵێی پەلی بەدەست هەورەوە داوەو هەڵیان کێشاوە! گەڵای کردووە! ئێستاو گەڵاکردن! سەیرە!

**مام باپیر:** حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێ)، چرای ئەو بەهرە جوانەی لە گیانە بە جۆشەکەی فەقێ تەیرانا داگیرساند، فەقێ تەیران بە زمانی باڵندە ئەدوا و، لە خوێندن و جریوە و چریکەیان ئەگەیشت.

فەقێ تەیران شاعیرێکی کوردە و خەڵکی (ماکۆ)یە لەنێوانی ساڵانی (١٣٠٧-١٣٧٥ز)ی ژیاوە، جگە لە دیوانی شیعر، خاوەنی هەردوو کتێبی (چیرۆکی شێخی سەنعان) و (قەولی ئەسپە ڕەشە). (خانی) مەزن لە دیباجەی مەم و زینەکەیدا بە حەسرەتەوە ناوی ئەبا و ئەڵێ:

**«گەردێ هەبوویا مەزێ خدانەک**
**عالی کەرەمەک لطیف دانەک**
**علم وهنەر و کمال واذعان**
**شعر و غزل و کتاب و دیوان**
**بینالە رحا مەلێ جزیری**
**یێ حی بکرا علی حریری**
**کەیفەک وەبدا فەقیهێ تەیران**
**هاتە بابد بمای حیران»**

خزمینە جاری جاران، هەقایەتخوان، ئاوا وەک ئێستا شەدەی لار دائەناو مشتوی خەنجەرەکەی لە مشتیا چەسپ ئەکرد و قیت دائەنیشت و سەربووردەی مەلەکەی ئێمەی ئاوا ئەگێڕایەوە.

**نێرگز:** حەمە لاو، ئەرێ سۆراغێکی باڵندە مەلوولەکەت نەکرد؟

**حەمەلاو:** تۆ بلێ، فەقێ تەیرانت بینی؟

**نێرگز:** فەقێ تەیران، لە خەوتا!

**حەمەلاو:** باشە ئەگەر تۆ بتبینیایە چیت لێ ئەپرسی؟

**نێرگز:** ئەموت: کاتێ ئەو مەلە بخوێنێ، ئەبێ چی بخوێنێ؟

**حەمەلاو:** وەرامی ئەو پرسیارە، شارە پرسیارێ ئەورووژێنێ.

**هەرسێکیان:**
**پرسیارێکە لە دێرینەوە**
**پێش و پاش ئەکرێ و نابینرێتەوە**
**باشە بزانێن وەرام لای کێیە**
**کێ پێمان ئەڵێ و ئاشکرای ئەکا:**
**شەو یەکەم جاربوو؟**
**یان ڕۆژ سەرەتا؟**
**کامیان پێشتر بوو**
**ئاخۆ کامەیان**
**ئەوەی تریانی هێنایە ئارا؟**
**وەرام لای کێیە با بیلێ خێرا.**

**مام باپیر:** هەر ئەو مەلە کز و مەلوولەی جاری جاران بوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو زەنگی بەیانی زرنگانەوە، هێندە بە جۆش و خرۆش بوو، هەر ئەتگوت ئەو ڕۆژە ئەو خۆری بە ئاگا هێناوەتەوە. خولیایەکی سەیری ئاهەنگ ئامێز مەیلی بازی لە تەک هەستی هەژاویا ئەکرد. ناو بەناو باری سەرنجەکان وردتر و تیژتر ئەبوو، لەو دەمەدا زەردەپەڕ سەرشان و ملی درەختەکان کەوت، باڵەکانی بە یەکادا و بریسکەی چاوانی دا بەدەم تیشکە مس ڕەنگەکانەوە و ئاسۆی ئەرخەوانی باو کرد و گواستیەوە بۆ شان و مل و لاگەردنی ئێوارە، بوو لالەیەکی مینا یاقووتی و سەر باڵی ناو دیلانێی خەیاڵ ڕەنگی بوو.

**نێرگز:** حەمەلاو ئەمە دوا بڕیارە و پاشگەزبوونەوەی تیا نییە؟

**حەمەلاو:** بەڵێ لە سبەینێ زووتر نییە، پشت بەخوا و ئارەقە ڕشتن و شان و قۆڵ کوتانی بێ وچان و پاچ وەشاندنی چەخماخەی ئەمسەر و ئەوسەری وڵات بکات، لەم حەمەلاوی تۆ. بەڵێ، هەر ئەیکەم، خوای ئەکرد گەلەگورگی هەموو مەملەکەتانی گورگ پەروەر گەمارۆی ئەدام.

**نێرگز:** خۆزگە ئەو دەمەمان ئەبینی، ئەو دەمە ئەبێ چی رووبدات؟

**حەمەلاو:** ئەو دەمە گورگەکان، گورگانە شەوێ بۆ خۆیان ئەڵێن و ئێمەش..

**نێرگز:** گۆرانی بۆ خۆمان ئەڵێین.

**مام باپیر:** سجانەڵڵا، کە عەشق لە کەللەی دا، تاقە

پرشنگێکی چاوی دولبەر گوڕ و تینێکی ئەوتۆ بە گیانی دڵبـرا و ئەدات. ڕووبار بە کـەشکەلانی فـەلەکـا سـەر ئەخـات و گـۆنای حـەوت تەبەقـەی ئاسـمـانی پێ مـاچ ئەکات، لە سەهۆڵی بەندانی چلەی زستانی کوێستانان بروانی بە نێرگزە جاڕی گوڕەی بەهارانی ئەکات..

ڕەنگە بڵێن شتێک بووە، بە خۆڕایی نییە قسەکانی مام باپیر بە حەیران ئەچێ، نێرگز گوێت لێیە؟.. نا باس هەر باسی ئەو مـەلەیە، کـە ئەو ئێـوارەیە وادەی وادەی بوو. ئەزانم، ئێـوە هەر هەمـووتان چاوەڕوانی ئاکـام و وەرامی ئەو پرسیارەن کە لەم شوێن و کاتەدا یەکانگیری کردوون. بە هەرحاڵ هەر ئەبێ باسی مەل و زمانی مەل و بەهرەی فەقێ تەیران بکەم.

گێڕایانەوە، گوایە. لە بنمیچی گومەزەکەی مزگەوتی سووری جزیرەدا، جووتە کۆترێکی باڵ نەخشین هێلانەیان کرد، بەرە بەرە سەرنجی خەڵکەکەی ڕاکێشـا، خـوایە خوێندن و تەماشایان لەمەلان ناچێ.

**حەمـەلاو:** نێرگز خەیاڵت بۆ مەم و زین ناچێ؟ ئەزانی بۆ ئەم پرســــیــارەت لێ ئەکــەم؟ ئەمـــەم چۆن چۆنی بەبیراهات؟

**نێرگز:** ئەوانیش بوونە جووتە مەلێ.

**حەمەلاو:** با ئێمەش وەک ئەو خەڵکە بۆ شەوی قەدری ژوانی عـاشـقـە ناکـامـەکـان کـۆبوونەتەوە لەو دوو مـەلە بروانن لەگومەزی ئەم مزگەوتی سووری جزیرەدا هێلانەیان کردووە.

**نێرگز:** بڕوانە ئەوە فەقێ تەیرانیان هێناوە، نازانم گوێم لە شتێکی وابوو.

**حەمەلاو:** کچی فەقێ تەیران لەکەیەوە بە شوێنی هەقی خۆی گەییوە.

**نێـرگـز:** ئەڵێن ڕۆحیـانەتەکەی هاتۆتە خـەونی مـام باپیری خۆمانەوە.

**حـەمـەلاو:** بۆ نابێ مـام باپیر پیـاوێکی دەست و دڵ و دەروون پاکە.

**نێرگز:** ئەبێ لە خەونەکەیا چی پێ وتبێ.

**حـەمـەلاو:** کچێ ئەوە مـام باپیرە قسە بۆ خـەڵکەکە ئەکات.

**نێرگز:** هەر ئەڵێی خۆی فەقێ تەیرانە.

**مام باپیر:** وتم بەخوا لەم هەلە چاکترم دەست ناکەوێ ئەوە زانیـمـان مـەم و زینە ناکـامـەکە بوون و سـەرلەنوێ لەوانەی یەکـەم و گـرو گـاڵی عـاشـقـێنیـەوە دەسـتـیـان پێکردۆتەوە دەم لە باسی ئەوتـۆوە ئەدەن هێـشـتـا کـەس پەی پێ نەبردووە.

سەبارەت بە مەلەکەی خۆشمان نهێنیە گەورەکەی کە لە سۆزەیەی ئەو ڕۆژەیا خوێندبوویەوە، وا چاوەڕوانییەکەی کۆتایی پێ دێ.

**حەمەلاو:** چاوەڕوانی کێ بێ و چاوەڕوانی چی ئەکات؟

**نێرگز:** کەی کۆتایی پێ دێ؟

**نێرگز:** (لانک ڕائەژەنێ و لایلایە ئەکات)

مـەلی تەری و تەریکی ناز، سـەرچڵانی دڵتـەنگی نیشتوو، ئەم ئێوارەیە ئێوارەیەتی، سەیری مانگ بکە و ڕۆڵە لایلایە بۆ خـەوت نایە، مـانگی زبوینی تارا خـەرمـانە، نمە نمە تریفـە بارانە، چاوە چاویەتی، ڕۆڵە لایلایە، لق و چڵ و گەڵا ئاخۆ شنەبا چی بە گـوێیـانا وا چرپاندووە دەستی سەمایان گرتووە، گیان هەڵئەکشێ، هەور لەپێی دەستی بۆ گرتۆتەوە و وا بۆ گـەرمـەی جۆش سـەمـاکـێشی ئەکـاو ئاسـۆی سووری کردە چۆپی و دایە دەستی، دەلایلایە، ڕۆڵە لایلایە، باوە لایلایە، بۆ خەوت نایە؟ گـۆڤـەندێکە عـەرد و ئاسـمـان کـۆنە مـەیلیـان ئەنووسنەوە، گڕی سـەمـا ئێـسکی سووتان، بۆ کرووزی گـەییـە ئاسـمـان، لە ناخەوە ئارەزوویەک چەکەرەی کرد، شیلەی تەمەن چۆڕایە پەیمانەکەی مینا ڕەنگی حەزێکەوە، دەنگ باڵابوو، چریکەیەک گشت کەساسی ساڵەهاکەی بە سـۆزەی ئاوازێ سپـارد، هەمـوو شـتێ، ڕووبار، هەور، شنە، سروە، ئەستێرەکان بەجریوە، مانگ ئەوق بوو، گوڵ و گەڵا و دارستان کەیلی مەستی و حەیرانی بوون، مانگ مـیـوانە تاسـەر مـۆخی بە تەزوویەک وا داخـان بوو، وا وێران بوو، ئاسـمـان گـوڵا و بارانی تازی بوو، مـانگ بوو بە پارچەیە گـوێی پەرۆشی، مـانگ شێت و مـانگ وێڵ و مانگ سەرگەردان. دەلایلایە...

(هەراو هۆریا و دەف ژەنین و زکری مانگ گیرانە)

**مـام باپیـر:** جـاران ئەیان وت، شـەوانە زۆر لە شـەوقی مانگ مەڕوانە.

شەوێ لە شەوانی مانگی خەرمانان بوو، ئەو ئێواردیە نۆرە ئاودێریم بوو، پاشان سەر ساباتەکە کەوتم و لەسەر تەختی پشت لێی ڕاکشام، بۆی پونگە و شێی گژوگیا باوەشێنی گیـانی ئەکـردم و مـەیلی نێرگـزەکـەی خـۆم هەڵیکێشـامە ناو شەوق و خەرمانەی مـانگەکەوە، خۆم بیـرچوویەوە و بوومـە مـیـوانی مـانگەکـە، گـوێم بە دڵی مانگەوەنا، یاران ئەم دەنگە ئازیزە ئەناسم و نامۆ نییە، گـۆرانی مـەلەکـەی خـۆمـانە و بۆتە دەنگی لێدانی دڵی مانگ، ئەڕوانم تریفەی مانگەکەش کەوتوونەتە سەمای توانەوە، ئاشقانی دونیاش پەلی دەستیان بۆ گرتۆتەوە و چاوانی عـەشـقی پێ ئەڕێژن، منیش لەو مـەیەی گـیـان

داگیرسێنەوەیەم هەڵداو جارێکی تر لە عەشقی نێرگز توامەوە...

(سۆزەیەکی دەروێشییانە)

**هەرسێکیان:** ئەو ساتانەی جارێکی تر ژیانەوە ئەبێتەوە، ئەڵێن، ئەڵێن، بەر لە چرکە و لێدانی دڵ، بەر لە خرۆشی هەست و جووڵە و بزواندن، ئەوانەی چۆن خاتوو زین و کاکەمەمن، چرایەکی ڕووناکی ڕەنگ، چلۆن ڕەنگێ، لە ڕەنگێکا ئەرخەوانی و وەنەوشەی خامەکی و خەنەییەکی کاڵ، چاو سەرچڵی گوڵان ئەنێ. ئەو چرایە لەسەر گڵکۆی دامرکاویان دائەگیرسێ و بە زمانی مەلەکەمان بانگی گیانیان ئەکاتەوە، سۆزی نەیەک دەش و سارا بە پۆپەشمینێکی بەهار ڕەنگی دائەپۆشێ. دەنگی ئەو نەیە کەروێشکەی بەسەرا ئەکا، کە مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی لە چامەی نەیەکەی باسی ئەکات.

(دەنگی نەی و سەمای زکر و دەروێشی و ئەڵڵا.....)

**مام باپیر:**

**«گوێ بۆ نەی شلکە، ببیستە سەرگوزشتەی باس ئەکا»**
**«چۆن سکاڵای پڕ لە ئازادی جودایی خۆی ئەکا»**
**«لەو دەمەی لە قامیشەڵانی هەوارم دابڕام»**
**«بۆم لە شین دان، نێرو مێ، وا لە خاک و خۆی کرام»**
**«من بە سینەی پارە پارەی، کون کونی دووری دیار»**
**«دەرد و داخی بێ نەوایی و پڕ لە ئۆفم دێ لە زار»**
**«ئەو کەسەی دوورە وڵات بێ، هەر تەمای دیدارییە»**
**«هەر لە خولیای هەم لە ژانی، ئەو دەمەی ڕزگارییە»**

(دەنگی جوتیاران و گۆرانییەکەی فۆلکلۆری پەیوەست بە کارەوە)

**نێرگز:** ئەوە چییە؟ حەمە لاو ماندوو و شەکەت دیاریت:

**حەمەلاو:** ئەوەی بە ئومێدی ئۆخەی بێ، ماندووش ئەبێ.

**نێرگز:** پیاوەکە، بەیانی جێم مەهێڵە، منیش دێم، پریاسکەیەک کولێرە و ڕۆنەکەرە لەگەڵ خۆمان ئەبەین، تا ئێوارە ناگەڕێینەوە.

**حەمەلاو:** قۆری و چاپەکەش لەوێیە.

**نێرگز:** حەمەکە، نازانم تۆش وەک من هەست بە دڵنیایی ناکەیت؟

**حەمەلاو:** با، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ.

(ئاوازێکی بەجۆش)

**مام باپیر:** شپرزەیی و وێرانە ماڵی مانگ بە خۆرگەیشت، خۆریش کەوتە مەراقی بیستنی ئەو خوێندنەوە، خوا کردی ڕوویان بە ڕووی یەکا تەقییەوە، باشە مانگ و خۆر بە چ زمانێ ئەدوێن، ها؟ دەکەواتە با لێرەوە گوێیان بۆ شل بکەین.

(ئاوازێکی لەسەرخۆ)

**نێرگز:** وەک بۆم باس کردی، ئاوا و...

**حەمەلاو:** چۆن؟ چۆن ئەبێ، باشە ئەگەر، مانگ و خۆر سەربەسەری یەکەوە بنێن و بەکامی دڵ گوێ بۆ ڕاز و نیازی یەکتری شل کەن، ئەی مەسەلە شەو و ڕۆژ چی لێدێ و کوێوە ئەچێ؟! بێگومان نامێنێ و کارەسات ڕووئەدات.

**نێرگز:** ڕاستە، بەتایبەت کە ئێستاکە خۆریش تەواو گرفتار و پەرۆشی بیستنی ئەو دەنگە بووە، ئەمە هەر بە بیستن ئەی ئەگەر گوێی لێبێ!

**حەمەلاو:** کچێ، ئەو مەلە هەر شەوانە و خۆشی ئەزانێ لە چ وادەیەکا دەنگی لێ بەرز ئەکاتەوە. خۆر چی لە شەو بکات، کە ئەو شەونابینێ و پێی ناگات. ئەگەر وابێ ئەوە هەرگیز گوێی لێ نابێ، وانییە؟

**نێرگز:** ئەوە هەر لە باسی بیستنەوە ئەوا شپرزەحاڵ و وێرانەماڵ بووە،

**هەردووکیان:** شەیدا و تامەزرۆی بیستنی بوو، خۆر خۆرە و چاری نەماو دوا بڕیاریەتی، خۆر دوابڕیاری داوە، هەر ئەبێ بە گوێی خۆی گوێی لێبێ.

(ئاوازێکی خەمناک)

**مام باپیر:** نێرگز، ئێستا زانیم، ئێستا بۆم دەرکەوت، بۆچی و لەبەرچی جاری جاران، لە پایزانا و ئەو دەمانەی وادەی نوخشە باران ئەبوو، شنەی با بۆی نمە بارانی لە بەرۆکی ئەدا. باپیر بەر لە هەمووان، بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ، وردە وردە ڕووە و شوێن خەرمانی ئەو ساڵە ملی ئەنا، بەڵێ نێرگزەکەی بەرۆکی گشت ژیانم، ئەرۆیشتم و بست بە بست و هەنگاو هەنگاو ڕۆژانی پڕ عەزرەتی خۆم ئەچنییەوە و دەسکەنە ئەکرد، باران باران، نم نم شەرمنانە وەک ماچی کیژۆڵان، ئەهات و بەخێرایی ئەو شوێنانەی ماچ ئەکرد و بە فرکەیەک لە چاو ون ئەبوو، بۆو بەرامەیە حەیرانی ئەکرد. سەرجەم ژوانەکانی ڕۆژانی دڵداریی دەستەو گەردن ئەکردم. نێرگز ئەمڕۆ زانیم، ئەو شتانە چۆن لە دایک ئەبن و چۆن گەورە ئەبن و چۆنیش ئەگۆڕێن، زانیم چۆن ئەو مەلە دەنگی خۆش بوو، بۆ فێری گۆرانی بوو.. بۆ..

(ئاوازێکی بەجۆش و خرۆش)

**نێرگز:** حەمە لاو، کورە خێراکە، بڕوانە خۆرچی بەسەرهاتووە و چی ئەکات! بڕوانە بیری لە چ شتێ کردۆتەوە تا بتوانێ بە دیداری مانگ بگات و لەشەوا

جێگای ببێتەوە! هەر ئەبێ گوێی لە خوێندنی مەلەکەمان بێ،... باشە ئەبێ چی بکات؟ کێ ئەزانێ با قسە بکات؟ کێ؟ تۆ، ئەو...؟ بەڵێ، بەڵێ....

(ئاوازێکی هێمن، چاکتر وایە سروودێکی قوتابخانە و تێکەڵ بە زەنگی قوتابخانە)

**حەمەلاو:** نێرگز، بادایبنێین من خۆرم و تۆش مانگ، ئەزانی من چی ئەکەم، ئەگەر من خۆربم، باوای دابنێین، ئەو گەواڵە هەورانە نییە، ئەوانە گشتیان گرد ئەکەمەوەو با، ڕائەسپێرم گشت گەواڵە هەورەکانی ئاسمانم بۆ بهێنێ، هەوری هەموو دنیا، ئەوسا، ئەزانی چی ئەکەم؟ ئەزانی چی ئەکەم؟ ئەوە ئەکەم. وەک بتەوێ لە تاریکی شەوا تیشکی چرایەک، بەبێ ئەوەی بیکوژێنیتەوە، بیشاریتەوە و کەس نەیبینێ. هەموو ئەو هەورانە ئەهێنم و لەخۆمیەوە ئەپێچم.

**نێرگز:** چاکە، زۆر چاکە، فەرموو هەر هەموویان بپۆشە، باشە ئەو دەمە چی ڕووئەدات؟

**حەمەلاو:** ئەمە خۆی لەخۆیا گەورەترین پرسیارە، ئەوا گریمان خۆر لە چاو ون بوو، کێ ئەزانێ چی ڕووئەدات؟ ژیان، جیهان، بەرەو کوێوە ئەچێ؟ ئەمەیان کێ ئەزانێ؟

**نێرگز:** بڵێین خۆر خۆی کوژانەوە

**حەمەلاو:** نەک خۆر، بۆ بینراوە، یان بیستراوە:

**هەردووکیان:** بڵێین ڕۆژێ، چرایەک هات، فوولە خۆی کات.

**نێرگز:** بەڵام هەر ئەبێ بە مانگ بگات.

**حەمەلاو:** گەر وا بکات، چی ڕووئەدات؟

**مام باپیر:** ئەوە ئەڵێین چی! ئەو دەمە دونیا بە تاریکستان ئەبێ، ئەو دەمە تین و گەرمی و ڕووناکی نامێنێ، ئەو دەمە دنیا ئەبێتە یەکپارچە شەختە و بەسەهۆڵ بەندان ئەبێ، جارێکی تر لافاوی نووح پێغەمبەر هەڵئەسێ، جارێکی تر، جارێکی تر، خوا نامان.

(زەنگی قوتابخانە، تێکەڵ بە ئاوازی سروودێکی قوتابخانە)

**هەرسێکیان:**

**تەوەرەکان، هەر هەموویان**

**ئەشێوێن و ئەترازێن**

**تەوەرەکان وێران و سەرگەردان، ئەبێ**

**نە ڕۆژ، نە شەو، نەکات و نەسات**

**ئەی چی ئەبێ و چی ڕووئەدات؟**

(دەنگی لایلایەکەی نێرگز دێ و دەبێ بە ئاوازی خاڵەی ڕێبوار)

**مام باپیر:** (ئەگەڵ منەکەی قسە ئەکات)

کوڕەکەم. ژین هەروەک بەچیادا هەڵگەڕان وایە، لەداوێنەوە گەر بسڵەمیتەوە. ئەوە گورگان داوێنگیرت ئەبن، بەڵام لە تەک هەر هەنگاوێکی سەرکەوتنا، دنیا فراوانتر ئەبێ و بەرچاوت ڕوونتر و زیاتر ئەبینی، کاتێ سەر دۆندی چیاکە ئەکەوی، هەست ئەکەی هەناسە بڕکێ بە پشوو ئەگۆڕێت. ئەوسا ئەو پۆلە کۆترە باڵنەخشینە دەورو خولی سەرت ئەدەن، ئەزانی بۆچی؟ باوکەکەی باوکم بۆ ئەوەی بینە پەیامبەرت، نامەت ئەبەن بۆ زۆر زۆر دوور، هەموو ڕێگاکان لەبەردەمی ئەو جۆرە مەلانەدا هێندەی شەقەی باڵێکی لێدێ، باوەکەم ئەها بڕوانە... (ئەڕوات)

(دەنگی شەقەی باڵی مەلان...)

**نێرگز:** ئەرێ حەمەلاو، ئەڵێم بەباشی بیرت لە پەنجەرەکانی ماڵەکەمان کردۆتەوە.

**حەمەلاو:** بەڵێ، بەڵێ لە هەر چوار لاوە، بۆ ئەوەی لە گشت لایەکەوە خۆر بیگرێتەوە. میوانداری لە هەموو شنەباو شەماڵەکانی بەربەیان بکات و گوێسەبانەکانیش بنە هێلانەی ئەو مەلانەی لەو ئاسمانە فراوانەدا ئۆقرە ناگرن بیکەنە هێلانە و لە مەلەکەی خۆمانەوە فێری خۆشترین گۆرانی بین.

**نێرگز:** ماڵێک لەو شوێنە بالآیەوە...

**هەردووکیان:**

**هەر هەموو دنیای لێوەدیاربێ**

**دیاربێ، دیاربێ، دیاربێ**

**وەک خۆر، وەک ڕوومەتی عاشق**

**سووربێ، ئاڵ بێ، گەش بێ**

**دیاربێ، دیاربێ، دیاربێ.**

**مام باپیر:** کاتێ مەلەکە ئاگاداربوو، کاتێکی ڕوانی، دارستانەکەی جارانی، هەوارەکەی، بێ نازبووە، بێ خۆر بووە، هاواری کرد: ئەی خۆرەکە هەڵبێرەوە، بەڵێن ئەدەم سبەینێ زوو، بە خۆشترین گۆرانی دڵ لە دەرگای بەیان ئەدەم، تەنها و تەنها تۆ بێیتەوە، من هەواری گۆرانیم بۆ ڕۆژ ئەبێ، بۆ تۆ ئەبێ. مانگ لەتەکتا، مانگ لە ڕۆژا دەرئەکەوێ نەکەی بڕۆی ئەواهاتم.

شەوی ٢٩/ ٣٠ تابی ٢٠٠٤، عەنکاوە/ هەولێر

# پیتەر بروک
# لە شانۆی هاوچەرخی جیهانیدا

شۆرش محەمەد حوسێن
(سلێمانی)

«شانۆ دەبێتە ئەو بوارەی کە خەڵکی دەتوانن فێری ئەوە ببن چۆن لە نهێنییە پیرۆزەکانی گەردوون بگەن. هەروەها لە هەمان کاتدا دەبێتە شوێنێکی داڵدە بۆ مەست و تەنهاکان»- پیتەر بروک.

لە مێژووی شانۆی جیهانیدا چەندین ناوی درەوشاوە لە بواری تیۆردانان و پراکتیکی هونەری شانۆییدا ناوبانگیان دەرکردووەو بەتێزو بۆچوونە هونەرییەکانیان توانیویانە خزمەت بەبزاڤی هونەری شانۆ بکەن، لەو ناوە دردوشاوانە دەتوانین ئاماژە بەکەڵە هونەرمەندانی وەک (ستانسلاڤسکی و مایرهۆڵد و کرۆتۆڤسکی و برێخت و ئەنتۆنین ئارتۆ و بیسکا تۆر و پیتەر بروک و چەندانی تر بدەین.

هەڵبەت لەم دەرفەتەدا بواری ئەوەمان نییە کە هەریەکەو بەجیا لە ئەفراندن و خزمەتە هونەرییەکانی هەریەک لەم کەڵە دەرهێنەرانە بکۆڵینەوە، بەڵکو گەرەکمانە، لایەک لە یەکێک لەو کتێبە پڕ بایەخانەی شانۆ بکەینەوە کە بە زمانی کوردی لەسەر یەکێک لە ڕێڕسوورە بەناوبانگەکانی جیهان نووسراوە کە بەناوی (پیتەر بروک لە شانۆی هاوچەرخی جیهانیدایە)* و شانۆکار (دانا ڕەئوف) لەوپەڕی وردبینی و هوشیارانە بەکارکردن و پرۆژەکانی ئەم ڕێڕسوورە نووسیویەتی.

هەڵبەت گرنگی ئەم کتێبە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە یەکێکە لەهەرە بەرهەمە ناوازەو بەپێزەکانی نێو کتێبخانەی کوردی و زۆرێک لە کەلێن بۆ هەوادارانی شانۆو بەتایبەت بۆ فێرخوازانی پەیمانگە هونەرییەکان (بەشی شانۆ) پردەکاتەوە بەتایبەت کەوا نەو ئەزموونەکانی ئەم ڕێڕسوورە بەناوبانگە کۆڵەکەیەکی سەرەکی نێو پرۆگرامی خوێندنی بەشی شانۆیە، ئەمە جگە لەوەی ئەم کتێبە هەناسەیەکی درێژی ئەفراندن و ئەزموونە تیۆری و پراکتیکییەکانی ئەم کەڵە دەرهێنەرە جیهانییەی هەڵگرتووە، کە پێشتر لە هیچ جێگەو شوێنێکی ترو بەزمانی کوردی بابەتی لەو جۆردو بەو قووڵی و ورد و درشتییەوە لەسەر ئەم کەڵە دەرهێنەرە نەنووسراوە، بەڵکو ئەو شتەی کە لەنێو کتێبخانەی کوردیدا لەسەر ئەم ڕێڕسوورە جیهانییە بوونی هەبێت بەتەنها چەند نووسینێکی هەناسە کورت بوون کە لێرەو لەوێ لەسەر ڕووپەڕی یەکێک لە ڕۆژنامە یان گۆڤارەکان بەدی دەکرا، لەم ڕووەوە نووسەر دەڵێ: تائێستا هەزارەها کتێب، لەسەر پیتەر بروک و بەزۆربەی زمانەکانی جیهان نووسراوە، بەڵام هیچ سەرچاوەیەک بە زمانی کوردی نییە، هەروەها هیچ کتێبێکیش بەم شێوە پرو درێژە ڕەوتی شانۆی پیتەر بروکی نەگرتۆتەوە.

هەڵبەت ڕەخساندنی ئەم هەلەش بۆ (دانا ڕەئوف) کە هەڵبستێت بە نووسینی کتێبێک لەسەر بەرهەمەکانی پیتەر بروک وەک خۆی دەڵێ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەوکاتەی گەیشتۆتە وڵاتی سوێد ئەو فرسەتەی بۆ



دانا ڕەئوف

ڕەخساوە تا زیاتر لە پرۆژەکانی پیتەر بروک نزیک بێتەوەو هەندێ سەرچاوەی گرنگی وای بەچنگ کەوتووەو توانیویشێتی گەلێک لە پرۆژدکانی ئەم ڕیزسۆرە گرنگە ڕاستەوخۆ لەسەر شانۆ ببینێت.

پاشان نووسەر دەڵێ: گەڕانەکانیشم بەدوای نهێنی و ڕدوتە شانۆییەکەی پیتەر بروک ڕێچکەو مەودایەکی تری لەخۆ گرت. بەتایبەت کە توانیم بەشێکی زۆری پرۆژەکانی ئەم دەساڵەی دوایی پیتەر بروک ڕاستەوخۆ لەسەر شانۆ ببینم.

هەروەها دەزگای (ئەرشیف و لێکۆڵینەوەی) ستۆکهۆڵم دەرفەتی بینینی بەشێکی زۆری نمایشە کۆنەکانی هەزارەی ڕابردووی پیتەر بروک، هەر لە شەستەکانەود تا ددگاتە هەشتاکان، بە تۆمارکراوی بۆ ڕەخساندم. ئەم هەلەش ئەو دەروازە گرنگەی بۆ کردمەوە کە لە نزیکەود لە پرۆسەو هێڵی بەرەو پێشەودچوونی دیدو فەلسەفەی شانۆیی پیتەر بروک بگەم.

ئەم وتانەی (دانا ڕەئوف) سەرنجمان بۆ لای ئەوە ڕاددکێشێت کە ئێمەی شانۆکاری کورد زۆر بێبەش بووین لە بینینی نمایشە شانۆییە جیهانییەکان و تەنها لە ڕێی نووسینەود بەو شانۆییانە ئاشنابین کە ئەم پرۆسەی خوێندنەوەیەو لە ڕووە تیۆرییەکەوە هەرگیز ئەو تامو چێژە نابەخشێت کە پرۆسەکە لەڕێی بینینەوە بێت، هەر لێرددا ددتوانم وتەیەکی ڕووناکبیر (بەختیار عەلی) بەنموونە بهێنمەود کە لە دوا لاپەڕەکانی کتێبی (بەرجەستەکردن لە شێوازەکانی شانۆی نۆژەندا- کە سیروان ڕەحیم نووسیویەتی، دەڵێت: «ئامادەبوون، ئەوە ئەو نهێنییە قووڵەیە کە ئێمە سالگەلێکی زۆر لێی بێبەش بووین. سەرددمانێکی درێژ ئێمە تەنیا لە دووردوەڕا ناونیشانی شانۆو ناوی شانۆگەرییەکانمان ددبیست، لە دوورەوە ڕا ناوی دەرهێنەرەکانمان دەبیست. تەنیا لە کتێبەکانیشدا شانۆی دنیامان دەناسی. ئەمە لە کاتێکدا شانۆ تاکە جێگایەکە دەبێت ببینرێت».

لەپاڵ ئەمانەدا کتێب و نووسینەکانی پیتەر بروک خۆی بۆتە پاڵپشتێکی گرنگ و دێکۆمێنت و سەرچاوەی بەسوود و هەمیشەیی ئەم نووسینەی (دانا ڕەئوف) بووە.

بێگومان نووسینی ئەم کتێبەش ئاسان نەبووە، بەتایبەتی لەو ڕووەوەی کتێبەکە بەشێکی زۆری ڕەوتی شانۆی پیتەر بروک لەخۆ دەگرێت. (دانا ڕەئوف)ی شانۆکار لەم بەرهەمەیدا هەوڵی داوە بەپێی نەخشەیەکی زانستی و ئەکادیمیانە باس لە بەشێکی گەورەی پرۆسەو ڕدوتی شانۆیی و بەرەو پێشەوە چوودکانی ئەم هونەرمەندە بکات، ئەمە جگە لەوەی کە (دانا) هەوڵی ئەودشی داوە کە بۆ هەر سەردەم و قۆناغێکی کارکردنی پیتەر بروک نموونەی گونجاو لەبەرهەم و پرۆژە شانۆییەکانی بهێنێتەوە بەمەش توانیوەتی لەپاڵ ئاشناکردنمان بەکاری تیۆری پیتەر بروک و بیرکردنەوەکانی ئاشناشمان بکات بە چۆنیەتی پراکتیکردنی پرۆژەی شانۆییەکانی بە واتایەکی تر (دانا ڕەئوف) لەزۆربەی بەشەکانی ئەم کتێبەدا هێندە بەقووڵی و بەوردی دەکەوێتە شیکردنەوەی شێوازی پراکتیکیانەی بەرهەمە شانۆییەکانی پیتەر بروک کە وێنەیەکی ئەوپەڕی لە ڕوون و ئاشکرایی بەپرۆسە شانۆییەکە لە ڕووی پراکتیکەوە دەداتە خوێنەر.

هەر بۆیە نووسەر خۆی لەم بارەیەوە دەڵێ: بەم شێوەیە بوارێکی گەورە بۆ خوێنەران دەڕەخسێت تا وێنەیەکی گشتگرو تێگەیشتنێکی تەواودتی سەبارەت بە پیتەر بروک هەبێت.

ئەم کتێبەی (دانا ڕەئوف) بەتەنها کتێبێکی تیۆری نییە، بەڵکو لە تانوپۆی کتێبەکەدا نووسەر هەوڵی ئەود دەدات لەپاڵ بەدەرخستنی لایەنی تیۆری پیتەر بروکدا فەلسەفەو دیدە تیۆری و پراکتیکییەکانی بخاتە ڕوو. بەم جۆرەش تیۆرو پراکتیک پێکدا دەچن و یەکتری تەواودەکەن.

کتێبی (پیتەر بروک لەشانۆی هاوچەرخی جیهانیدا) دابەشکراوەتە سەر (حەوت بەش) و بۆ لەمەولا هەوڵ

دەدەین بە ورد و درشتی لەهەریەک لەم بەشانە بدوێین.

### بەشی یەکەم/ دەروازەیەک بۆ جیهانی پیتەر بروک

پیتەر بروک یەکێکە لە ناوە گەورەکانی جیهانی ئەمڕۆی شانۆ، ئەفسوونی دیدو شانۆکەی ئۆقیانووسێکی گەورەیە دارشتەی ئەو جیهانە، پانتایی و ستراکتۆرێکی گەلێک بەرینەو هەموو سنوورەکانی بەزاندووە. ئەو گۆڕانکاریانەی پیتەر بروک لەشانۆدا بەدی هێناوە گەلێ گەورەیە، لەبەرئەوە ناوی پیتەر بروک هاوکێشەیەکی گرنگ لەسەراپای پرۆسێسی شانۆی هاوچەرخی جیهاندا پێکدەهێنێت.

بیرو دیدی ئەم هونەرمەندە گەورەیە لە دایکبووی سەدەیەکی نوێیە. سەدەی جەنگ و گۆڕانکاریی گرنگەکانی ئەوروپاو جیهان. هەر بۆیە کاریگەری پرۆژەو ئەزموونەکانی پیتەر بروک بەتەنها بەسەر شانۆی ئەوروپای رۆژئاواوە نییە، بەڵکو بەشێکی گەورەی شانۆی جیهانی بێبەری نەبووە لەو کاریگەرییە راستەوخۆیە.

پیتەر بروک لە ئاماژەدانی بۆ شانۆیەکی چاک دەڵێت: ئەو شانۆیەیە کە ئێستەو لەم هەنووکەیەدا دەژی و هەوای ئەم ساتەوەختە هەڵدەمژێت. گرنگ نییە چ پیەسێک پێشکەش دەکرێت. کلاسیکی یاخود نوێ، گرنگ ئەوەیە دڵی پرۆژەکە لە جەستەی ئەمڕۆدا بێت، لەم هەنووکەیەدا. ئەم ئاماژەی پیتەر بروک بۆ شانۆیەکی چاک، شایستەی




هەڵوێستە لەسەرکردنە بەتایبەت بۆ ئێمەی شانۆکارانی کورد کە بەدەست قەیرانی شانۆو نەبوونی بینەرەوە دەناڵێنین، کە زۆریش لەلایەن شانۆکارانەوە قسەی لەسەر دەکرێت و هەریەکەو هۆکارەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ لای شتێکی دیاریکراو بەبێ ئەوەی چارەیەکی ئەم قەیرانە بکرێت، کە رۆژ لەدوای رۆژ لە هەڵکشان و زیادبووندایە، ئەم قسەیەی پیتەر بروک ئایا ئامانخاتە بەردەم ئەو پرسیارەی کە داخۆ شانۆکانی ئێمە (ئەگەر هەمانبێت لە ئێستادا) تاچەند هاوەڵی سەردەم و کوری ئەمڕۆن و هەوای ئێستا هەڵدەمژن؟ وە ئایا ئەم هاوەڵی نەکردنەوەی سەردەم و هەنووکە نەبۆتە هۆی ئەوەی کەبێ شانۆ و بێ بینەر بین؟!

هەر پیتەر بروک لەم بارەیەوە دەڵێت: «هەموو فۆرمێک مانای خۆی لە دەست دەدات، ئەگەر پرشکێک لە ژیانی راستەقینە لەخۆ نەگرێت، پێویستە نمایشەکە لەم ساتە وەختەدا، لەم چاوترووکاندنەی ئێستادا بژی.».

پیتەر بروک بەرلەوەی پێی بنێتە تەمەنی بیست ساڵییەوە، هاتۆتە جیهانی شانۆوە، لەو تەمەنەدا راستەوخۆ رووەدەکاتە شانۆی شەکسپیرو هونەری ئۆپێرا. دەزگاکانی بەرهەمهێنانی نمایش و هونەری ئۆپێرا دەبێتە جێگای سەرنج و بیرکردنەوەی. لە یاداشتەکانیدا بەم شێوەیە لەم رووبەڕووبوونەوەیە دەدوێت: ئەم دامودەزگا کۆن و خەواڵووە دەبێت بە کۆمەڵێ راچڵەکاندن وریابکرێتەوە. بەشێوەیەکی بەهێز رابچڵەکێنیت و فرێی بدەیتە ئەم زەمەنەوە.

بە بروای پیتەر بروک شانۆ دەبێت هەموو ساتێک نوێی بێت، بە چاوێکی وردو دەروونێکی پڕ لە هەناسەوە تەماشا بکرێت، پیتەر بروک لە کتێبی (پانتایی بۆش) کە یەکێکە لە کتێبە گرنگەکانی ئەو شانۆیانەی کە دەیانەوێت بینەران بخەنە گریان یان پێکەنین بەشانۆیەکی (مردوو)ی ناوزەد دەکات و لەم رووەوە دەڵێت: شانۆ لەلای من بەهیچ شێوەیەک لە ژیان جیا ناکرێتەوە نەک هەر ئەوەندەش، بەڵکو دادەنرێت بە بەشێک لە ژیان. لە رێگەی شانۆوە فێری ئەوە دەبین چۆن بژین. لەبەر ئەوە هیچ جۆرە هزرو بیروباوەڕێک دامەرێژە گەر لە ئەزموونی ژیان خۆیەوە سەرچاوەی وەرنەگرتبێت.

یەکێک لە ئەفراندنەکانی پیتەر بروک لەشانۆدا بریتی بوو لەوەی شانۆی لەناو خانووبەرەی شانۆ باوو تەقلیدیەکاندا گوێزایەوە. بە بروای ئەو خانووبەرەو هۆڵی شانۆکان سیفاتە سەردکی و گرنگەکانی هونەری شانۆیان لەخۆ نەگرتووە. بەڵکو پانتایی شانۆکان بەشێوازو

شێوەیەکی هەڵەو نا شانۆیی دابەش کراون. لەبەر ئەوە بروک هەرزوو ئەو شانۆییانە بەجێی دەهێڵێت و رووەکاتە پانتاییە جیاوازەکان. بۆ نموونە: پانتایی پاک، شوێنی بەجێهێڵراو گۆڕەپانی سێرک، گەراج، شەقامەکان، کارگەکان، نەخۆشخانە، گۆڕەپانە گشتییەکان، قوتابخانەکان و زۆر شوێنی تر.

ئەوەی کە پێویستە لێرەدا باسی لێوە بکەین ئەوەیە کە شانۆ لەلای ئێمە زیاتر لەناو هۆڵی داخراودا نمایش دەکرێت و بیر لەوە نەکراوەتەوە شانۆ ببرێتە هەوای کراوە، بەواتایەکی تر ئێمە کارمان لەسەر ئەوە کردووە کە خەڵک بێت بۆ لای شانۆکانمان نەک بە پێچەوانەوە، بۆیە من وای دەبینم لەم دۆخە بەقەیران ناوزەدکراوەدا پێویستە شانۆ بچێتە لای خەڵک و خۆی نمایش بکات.

ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە لەم کارکردنەی پیتەر بروکەوە، دەتوانین ئاماژە سەرەتاییەکانی دروستبوونی شانۆیەکی نوێ بەدی بکەین کە بەشانۆی گەڕۆک ناسراوەو هەنووکەش لەنێوەندی شانۆی ئەوروپیدا جێگەو پێگەیەکی دیاری هەیە.*

**بەشی دووەم/ چەردەیەکی کورت لەژیانی پیتەر بروک- بیۆگرافیا**

پیتەر بروک لە ساڵی ۱۹۲۵ لە ئینگلستان و لە خێزانێکی بەنەژاد رووسی لەدایکبووە، لە بواری شانۆ، ئۆپێرا، سینەما کاردەکات. وەک رێژیسۆر لەشانۆ گرنگەکانی لەندەن و پاریس و نیویۆرک پرۆژەکانی پێشکەش کردووە. پیتەر بروک لە کۆلێژی- ماگدا لین- لە ئۆکسفۆرد خوێندوویەتی. هەروەها ئەم هونەرمەندە تا ئێستا دادەنرێت بە بچووکترین قوتابی لەو کۆلێژەدا کە بڕوانامەی لە ئەدەبی (بەراوردکاری)دا وەرگرتبێت.

بروک هەر لەم کۆلێژەدا یەکەم تەقەلای شانۆیی خۆی بە شانۆنامەی (دکتۆر فاوست)ی کریستۆفەر مارلۆی نووسەری ئینگلیزی دەست پێدەکات و دواتریش چەند ئەزموونێک لە بواری فیلمدا بەرهەم دەهێنێت.

پیتەر بروک بەخوێندنەوە جیاوازو نوێیەکانی بۆ شاکارەکانی شەکسپیر ناوبانگ دەردەکات و بۆ ئەم مەبەستەو لە خوێندنەوەی بۆ شەکسپیر دەکەوێتە ژێر کاریگەری لێکۆڵینەوەکانی رەخنەگری پۆلۆنی (یان کۆت) و کتێبە گرنگەکەی (شەکسپیر هاوچەرخمانە) پیتەر بروک بەتەنها نابێتە رێژیسۆرێکی تایبەتمەندی شانۆنامەکانی شەکسپیر، بەڵکو لە ماوەی چارەکە سەدەیەکدا، زیاتر لە شەست پیەسی نوێ و نووسەرانی (۱۹۰۰)ەکان و شانۆی هاوچەرخی جیهانی دەهێنێتە بەردەم، وەک دەقی شانۆ نووسان: ئاندریا رۆسین، ژان پۆڵ سارتەر، پیتەر ڤایس، فردیش دۆرێمان، ژان ئانوی، ئارتۆر میللەر، هینریک ئەپسن، ئەنتوان چیخۆف، بێرناردشۆ، ژان ژنیە، بێکێت، کریستۆڤەر فرای.

ئەمە جگە لەوەی پیتەر بروک لە پرۆژەو شانۆییەکانیدا گرنگی زۆر دەداتە لێکۆڵینەوەو بەرجەستەکردنی داستان و میتۆلۆژیا گرنگ و گەورەکانی رۆژهەڵات و لەو بوارەدا چەند ئەزموونێکی گەورە بەرهەم دەهێنێت.

**بەشی سێیەم/ پیتەر بروک و شەکسپیر**

پیتەر بروک مامەڵەیەکی زۆری لەگەڵ پیەس و دەقە شانۆییەکانی شەکسپیردا هەبووەو لە دیدێکی زۆر جیاوازەوە پیەسەکانی ولیەم شەکسپیری خوێندۆتەوە. پیتەر بروک یەکەم رێژیسۆرە کە دوور دەکەوێتەوە لەو داب و نەریتە رۆمانسییەی کە بەهاو چەمکە شیعرییەکانی شەکسپیری پێ ناسرابوو. بەمەش شۆڕشێک لە جیهانی شەکسپیردا بەرپا دەکات.

پیتەر بروک لەبارەی شەکسپیرەوە دەڵێت: (ئێمە پێویستمان بەوەیە لە شەکسپیر بکۆڵینەوە، چونکە هەموو ئەو شتانەی جێگای گرنگیپێدانن لەلای برێشت، بێکێت و ئارتۆ لەلای سەکسپیر هەیە).

ئەو خوێندنەوە جیاوازانەی پیتەر بروک دەرگایەکی جیاوازی بەرووی شانۆدا کردۆتەوە کە لەمەوبەر هەرگیز دەرگای وا نەکرابۆوە.

هونەری شانۆ خۆی لە دارشتەیەکی وادا دۆزییەوە کە هەرگیز لەمەوبەر ئەو دارشتەیە، ئەو پانتاییە لەنێو فەرهەنگ و زاراوەکانی شانۆدا، بەو شێوەیە بوونی نەبووە.

لەم رووەوە شانۆی شەکسپیر بۆ پیتەر بروک دەبێتە کیشوەرێکی تازە دۆزراوە.

هەر لەم بەشەی کتێبەکەدا هەریەک لە شانۆیی (خەونی نیوەشەوێکی هاوین و ئەنتۆنیۆس و کیلۆپاترا)ی شەکسپیر کە لەلایەن پیتەر بروکەوە کاری دەرهێنانی بۆ کرا بەووردی باس لەلایەنی تەکنیک و شێوازی کردەییانەی ئەم دوو شانۆییە دەکرێت.

**بەشی چوارەم/ پیتەر بروک و ئەنتۆنین ئارتۆ**

ئەفسوون، رێتواڵ و دیدی ئەنتۆنین ئارتۆ کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر ئێستاتیکای شانۆی پیتەر بروکەوە هەبووە.

هەر بۆیە لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٤دا پیتەر بروک بەهاوکاری چارلس مارۆتیز لەگەڵ کۆمەڵێ ئەکتەری گەنج لەشانۆی -the Aldwychtheatre- لە لەندەن گرۆپەکی ئەزموونگەری، بۆ پراکتیزەکردنی میتۆدەکانی ئارتۆ بەناوی شانۆی توندوتیژەوە دادەمەزرێنێ.

مەبەست لە دامەزراندنی ئەم تیپە ئەزموونگەرییە زیاتر (بۆرێکی شانۆیی دەبێت، نەک پێشکەشکردنی نمایشی شانۆیی. پیتەر بروک لەبارەی (ئەنتۆنین ئارتۆ)وە دەڵێ: «ئارتۆ بنەمای تیۆرەکانی لەشانۆی ڕۆژهەڵات، ژیانی مەکسیکۆ و ئەفسانەکانی تراژیدیای گریکیدا دۆزیوەتەوە، بەڵام لەپێش هەموو ئەمانەدا لە شانۆی ئیلیزابیسیدا.

شانۆی ئیلیزابیسی بنەماکانی ئەو پانتاییە بۆ هونەرمەند دەڕەخسێنێ کە دەتوانێ زۆر بەسەربەستی لەنێوان جیهانە دەرەکی و ناوەکییەکاندا بجوولێتەوە».

هەر لە چوارچێوەی سەرسامبوونی بروک بە تیۆرەکانی ئەنتۆنین ئارتۆ کۆمەڵێ پرۆژەی شانۆیی گرنگ لە ڕەوتی شانۆی پیتەر بروکدا دێتەدی. بۆ نموونە لەوانە:- (ئۆدیب)ی سینکا، (مارا-ساد)ی پیتەر ڤایس، «ئێمەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا- سەبارەت بە جەنگی ڤیەتنام»، (شالیر)ی شەکسپیر، (ئۆیۆی پادشا)ی ئەلفریدگاری و کۆمەڵێ پرۆژەی تر.

کە لەم بەشەدا (دانا ڕەئوف) بەوپەڕی وردو درشتی و شیکردنەوەی تەواوی تیۆرو لایەنی پراکتیکیانەی ئەم بەرهەمانە دەخاتە بەر دیدی خوێنەر.

### بەشی پێنجەم/ مەڵبەندێکی نێونەتەوەیی

لەم بەشەدا (دانا ڕەئوف) باس لە بەناوبانگترین ئەو بەرهەمانە دەکات کە لەم قۆناغە نوێیەی ژیانی هونەری و گەڕانەکانی پیتەر بروکدا هاتۆتە بوون وەک: بەرهەمە بەناوبانگەکانی (ئۆرگاست و کۆنفرانسی باڵندەکان و مەهاباهاراتا» کە لە چوارچێوەی ئەو مەشق و لێکۆڵینەوانەوە لە دایک بوون کە لەنێو ئەو مەڵبەندە شانۆییەی کە دایانمەزراندبوو گفتوگۆیان لەسەر دەکرد و سەرقاڵی کردبوون (مەبەست لەو مەڵبەندانەیە کە پیتەر بروک کاری تێدا کردووە بۆ لێکۆڵینەوەی شانۆیی، کە لە ساڵی ١٩٧١ بەهاوکاری -Micheline Rozan- یەکەم مەڵبەندی شانۆییان دامەزراندو دواتر لەساڵی ١٩٧٣دا ناوەندێکیش بۆ داهێنان هەر لە پاریس دەکاتەوەو ئەم دوو ناوەندەو لێکۆڵینەوەکان لەبارەی شانۆ و مەشقە بەردەوامەکان ئەو بەرهەمانەیان لێ بەرهەم دێت کە پێشتر ئاماژەمان پێدان و سەدایەکی گەورە دەنێنەوە.»

پیتەر بروک لەکارکردنی ئەم پرۆژە شانۆییانەو بەپشت بەستن بە ئەکتەری ئەورووپی و ئەفریقی و ئاسیایی و ڕۆژهەڵاتی دەکاتە دەروازەی خوێندنەوە جیاوازەکان بۆ کلتووری ڕۆژهەڵات و دامەزراندنی کلتوورێکی تری جیاوازو جیهانی.

هەر بۆیە پرۆژەکانی (ئۆرگاست و کۆنفرانسی باڵندەکان و مەهاباهاراتا، چەند نموونەیەکن لەو شانۆ میتۆلۆژییەی پیتەر بروک.

### بەشی شەشەم/ پیتەر بروک و هونەری ئۆپێرا

مۆسیقا زمانێکە پەیوەستە بەجیهانێکی نادیارەوە. بەهۆی ئەم زمانە نادیارەوە ژوورە خامۆش و چۆڵە هەتا هەتاییەکان ئامادەیی لەو داهێنانە نادیارەوە وەردەگرن، لەگەڵ ئەوەشدا، لەسەر ئاستێکی بەرز، ئەو جیهانە نادیارە، ئامادەو دیارە- پیتەر بروک-

ئۆپێرا ڕەنگێکی تری شانۆیە. بەڵام لەم ڕەنگەدا مۆسیقاو گۆرانی توخمێکی گرنگەو فۆرمێکی جیاواز دەبەخشێتە ئەو ڕەنگەی شانۆ، ئۆپێرا بەپێچەوانەی شانۆوە هەمیشە لە بارودۆخێکی کلاسیکی و لە خانووبەرەی گەورەی تایبەتمەندا نمایش کراوە.

پیتەر بروک وەک ئەزموونکارێکی گەورە، هەر لەسەرەتاوە لەم بوارەدا تەقەلای گەورەی داوە، پیتەر بروک هەوڵی داوە بەشێوازێکی جیاواز بیر لە ئۆپێرا بکاتەوەو لەو نێوەندەو لە گرنگیدان بەم هونەرە لە نیویۆرک و لەندەن و پاریس چەندان نمایشی ئۆپێرایی پێشکەش دەکات.

پیتەر بروک لە کتێبی The shifting point- کە لەساڵی ١٩٨٧دا بڵاوی کردەوە، سەبارەت بە ئۆپێرا دەڵێت: «ئۆپێرا بەر لە پەنجا هەزار ساڵ لەمەوبەر لە دایک بووە، لەوکاتەدا مرۆڤ لە کونە ئەشکەوتەکانی خۆیاندا هاتنە دەرەوەو لەخۆوە هاوارو دەنگیان لێوە دەهات.

لەو هاوارو دەنگانەوە ڤیردی، پۆچینی و ڤاگنەر لە دایک بوون.

دەنگێک بۆ ترس، یەکێکی تر بۆ خۆشەویستی، بۆ بەختیاری یان بۆ هەڵچوون و تووڕەبوون هەبوو، تێکڕا ئەو دەنگانە بەر لە دیاریکردنی تۆن و سۆزی ئاوازەکان، تۆنێکی ئۆپێرایی بوون.

هەر لەو چوارچێوەی گرنگیدانەی پیتەر بروک بە ئۆپێرا

هەڵدەستێ بە بەرهەمهێنانی هەریەک لەبەرهەمە ئۆپێراییەکانی (تراژیدیای کارمن) و (دۆن جیۆڤانی)، کە سەرکەوتنێکی گەورەو ناوبانگییەکی گەورەی پێ بەدەست دەهێنێت.

### بەشی حەوتەم/ فۆرمێکی ساکار و قۆناغێکی نوێی کارکردن

لەم بەشەدا (دانا ڕەئوف)ی نووسەری ئەم کتێبە دوای بەدیارخستنی ئەو کۆمەڵە گۆڕانکارییانەی کە لەسەر ژیانی هونەری پیتەر بروکدا هاتووە، شێوازو مامەڵەکردنێکی نوێ و هەنووکەیی پیتەر بروک دەردەخات لە بواری شانۆدا کە لە ئاراستەیەکی جیاوازدا خۆی دەنوێنێت و بەرەو نمایش و پرۆژەی ساکارو ئاسان و دوور لە هەموو جۆرە شتێکی ناتەباو ئاڵۆز هەنگاو دەنێت.

لەو بوارەدا نووسەر دەڵێ: زۆر لە ڕەخنەگرە شانۆییەکانی ئەوروپا ئاماژە بەوە دەکەن کە نمایشەکانی ئەمڕۆی پیتەر بروک ئەو دینامیکییەی جارانی لە دەست داوە، ئەو پریشکە بەهێزو ئەفسوونییەی کە پانتاییە بۆشەکانی دەکردە دۆزەخێکی گەورە، ئەمڕۆ بەتەواوەتی بزر بووە.

پانتاییە بۆشەکەی بۆتە فۆرمێکی ئێستاتیکی ساکار، لەو فۆرمەدا پێوەندییەکان، داستان و بەها مرۆڤایەتییەکان بوونەتە یەکەیەکی فەلسەفی و هونەری و ئاستێکی پڕ لە دەربڕینی ئاشکرایان هەیە.

بە ساکارکردنەوەی ئەم فۆرمانەش لەم ئەزموونە شانۆییەدا، هاوکێشەیەکی فیکری وەها دروست دەکەن کە وێنە شانۆییەکان زۆر سەقامگیرو ئاشکرا بەرجەستە ببن. پیتەر بروک لەم بارەیەوە دەڵێت:

«ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێین زۆر ساکارە، بەڵام زۆر گرانە بیگەینێ. ئەوەش ئەوەیە چۆن بگەینە شێوازە ساکارەکان لە شانۆدا، شێوازی ساکار لە ساکارییەکەیدا ئاشکرایەو لە هەمان کاتیشدا پڕ لە مانایە.

هەر لەم بەشەداو لەبارەی ئەو شانۆییانەو ئەو ئەزموونانەی کە لەسەر ئەم شێوازە نوێیەدا پیتەر بروک بەرهەمی هێناوە بەوردو درشتی باس لە ئەزموونەکانی (کۆستیم و تراژیدیای هاملێت دەکرێت کە لەم چوارچێوەی ئەزموونە تازەیدا پیتەر بروک لەسەر شانۆی جیهاندا پێشکەشی کردووە.

لە پەراوێزی کتێبەکەشدا (دانارەئوف) کرۆنۆلۆژییەکی دەوڵەمەندی لەبارەی پرۆژەکانی پیتەر بروک لە بواری شانۆو ئۆپێراو سینەماو نووسین و کتێبەکانی دەخاتە بەردەستی خوێنەر، کە بەهەمان شێوەو وەکو بەشەکانی تری ئەم کتێبە لەوپەڕی وردو درشتیدا داڕێژراون..

دواجار دەتوانین بڵێین کە ئەم کتێبەی (دانارەئوف)ی شانۆکار لەسەر ڕێژبسۆرێکی گرنگی وەک (پیتەر بروک) یەکێکە لە کتێبە پڕ زانیاری و دانسقەکانی نێو کتێبخانەی کوردی و لە بواری شانۆشدا کتێبێکی تابڵێی ئەکادیمیەو پڕ لە زانیاری نوێیە لەبارەی ئەو ڕێژیسۆرە جیهانییە. ئەمەو (دانا ڕەئوف) جگە لەم کتێبە لە بواری نووسیندا جگە لەوەی خاوەن چەندین وتاری گرنگی شانۆییە بەتایبەت لەنێو گۆڤارەکانی (ڕامان و ڕەهەندو سەردەم) خاوەن چەند کتێبێکی تریشە وەک:

* شانۆی توندوتیژی لەنێوان تیۆرو پراکتیکدا، لێکۆڵینەوە، ١٩٨٨
* گوتاری ئەزموونگەری لە ڕەوتی شانۆی کوردیدا، لێکۆڵینەوە، ١٩٩٥
* سترێند بێری و سۆناتای تارمایی لەنێوان ڕینهارت و بێریماندا لێکۆڵینەوە، ٢٠٠١، چاپی کوردستان.
* سترێندبێری و سۆناتای تارمایی لەنێوان ڕاینهارت و بێریماندا لێکۆڵینەوە، ٢٠٠١، چاپی سوێد...

ئەمانەو چەند بەرهەمێکی تری ئامادەی چاپن.

پەراوێزەکان:

* پیتەر بروک لە شانۆی هاوچەرخی جیهانیدا- دانا ڕەئوف- لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم- زنجیرە (٢٣١)ی کتێبی سەردەم- سلێمانی- ٢٠٠٣.
* بەرجەستەکردن لە شێوازەکانی شانۆی نوێژەندا- سیروان ڕەحیم- لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم- زنجیرە (١٩٣)ی کتێبی سەردەم.
* بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی شانۆی گەڕۆک بڕوانە کتێبی -شانۆی مۆبایل و دەربڕینگەرێتی جەستە- بورهان قەرەداغی- لە بڵاوکراوەکانی لقی پەیمانگاکانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان- ٢٠٠٢.

**سلێمانی/ کۆتایی مانگی ئەیلولی ٢٠٠٤**

# مۆسیقا و گۆرانی لای مەولەوی-ی تاوەگۆزی

سەفەر کەریم هاواری



سەید عەبدولڕەحیمی مەولەوی (١٨٠٦-١٨٨٢) یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی سەدەی نۆزدەهەمی ئەدەبی کوردی، وەک ئاشکرایە زۆربەی شیعرەکانی بەشێوەزاری هەورامییە و ناوەڕۆکی شیعرەکانی لەبارەی عیرفان و جوانیی سروشت و بابەتی ئایینییەوە بووە. مۆسیقای شیعرەکانی مەولەوی کارێکی زۆری کردۆتە سەر خەیاڵی گۆرانیبێژانمان و تا ئەمڕۆش دەبینین مەقام و گۆرانییە ڕەسەنەکانی کوردی وەک (قەتار، ئەڵلاوەیسی، خورشیدی، خاوکەر، سیاچەمانە...) بەشیعرەکانی مەولەوی دەبێژرێن.

ئەگەر ئامارێکی دیوانی مەولەوی بکەین و بزانین چەند شیعرو قەسیدەی مەولەوی تا ئەمڕۆ کراوەتە گۆرانی و ئاوازی بۆ دانراوە، ئەوا دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە هیچ شیعرو قەسیدەیەکی مەولەوی نییە تا ئێستا نەکرابێتە گۆرانی، کە مەبەستی ئێمە زیاتر شیعرە هەورامییەکانیەتی، چونکە لە دەڤەری هەوراماندا شیعری مەولەوی یەکەم سەرچاوەی بەنرخ و ئاسانی گۆرانیبێژانە.

هەر ئەم بەڵگەیە ڕاستیی ئامارەکە دەسەلمێنێ، ئیتر جگە لە گۆرانیبێژانی ناوچەی گەرمیان و سۆران کە هەردەم ئاوازدانەرەکان شیعرەکانی مەولەوییان لە ڕیتم و قالبێکی زۆر جوان و ناسکدا داڕشتووە.

لەلایەکی ترەوە زۆربەی شیعرەکانی مەولەوی تێکەڵ بە گۆرانیی فۆلکلۆر بوون و جیاکردنەوەیان لەیەک هەندێ جار کارێکی گرانە، ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە شیعری مەولەوی زۆر تێکەڵ بە جەماوەر بوون، بەتایبەت لە ناوچەی هەوراماندا.

مەولەوی لەناو کۆمەڵگەیەکی نەخوێندەوارو دوور لە شارستانێتیدا ژیاوە، ئەی چۆن توانیویەتی ئەو هەموو وێنەو دیمەنە ناسک و ناوەڕۆکە پڕمانایانە پێشکەش بە خەرمانی شیعری کوردی بکات؟

ئایا مەولەوی زانیویەتی کە شیعردکانی ئاوا دەکرێن بە گۆرانی؟

ئایا مەولەوی هەستی بەرانبەر بە مۆسیقاو گۆرانی هەستی هۆگری و گونجاوی بووە؟

ئایا مەولەوی توانیویەتی هیچ ئامێرێکی مۆسیقی بژەنێ؟

ئایا هەر لە کۆڕو مەجلیسی ئایینی و خانەقادا هانای بۆ مۆسیقا بردووە یان لە شایی و زەماوەند و خۆشیشدا هاوڕاز بووە لەگەڵ مۆسیقادا؟ تۆبڵێی مەولەوی گوێی لەم هەموو جۆرە ئالەتە مۆسیقییانە گرتبێت و کاریان لێی کردبێ؟ ئەی بۆنا!

ئەگەر هۆگرو وابەستەی مۆسیقاو ئاواز نەبوایا، چۆن ئاوا لە شیعرەکانیدا ڕەنگیان دەدایەوە. چۆن ئەم هەموو ئامێرە مۆسیقایانەی دەخستە ناو چوارچێوەی شیعرەکانییەوە؟

وەک دەردەکەوێت بەپێی بەڵگەنامەکان مەولەوی هەر خۆی لە ژیاندا بووە، گۆرانیبێژان شیعرەکانیان کردۆتە گۆرانی، دەگێڕنەوە لە شاییەکدا مەولەوی گوێی لە شیعرەکانی خۆی دەبێ کراون بە گۆرانی لە لایەن (حەسەنی ئامێ) کە بە یەکێک لە مەقامزان و گۆرانیبێژی ئەوسەردەمەی سلێمانی دادەنرێت.

یەکسەر مەولەوی دەست بەگریان دەکات لە شاییەکەدا، لەو سەردەمەدا بە (مەلا ڕەحیم) ناوبانگی دەرکردبوو.

خەڵکەکە ئەمە دەبینن زۆر پێیان ناخۆش دەبێ، چونکە ئەمان بۆ شایی هاتوون بۆیە داوا لە (حەسەن)ی گۆرانیبێژ دەکەن کە مەقامەکەی ڕابگرێت، بۆ ئەوەی مەولەوی واز لە گریان بهێنێ، (حەسەن) بێدەنگ دەبێت، بەڵام لە دڵدا زۆری پێ ناخۆش دەبێت، کە خۆشخوانێکی وەکو ئەو بێدەنگ بکرێ و نرخی هونەرەکەی نەزانرێت!

بۆیە دەچێتە لای مەولەوی و پێی دەڵێ من شیعری تۆم کردۆتە گۆرانی و دەیڵێم، تۆ بۆ پێت ناخۆشە؟!

مەولەوی دەڵێ بەقوربانی تۆ بم، کەی شیعری من هێندە بەرزەو کەی من وا خۆشم وتووە؟

ئەم بەسەرهاتە ئەوەمان بۆ دەردەخات لەلایەک مەولەوی زۆر مرۆڤێکی سادەو بێ فیز بووەو هەرگیز لەخۆی بایی نەبووە. هەمیشە نرخ و هونەری خەڵکی بەرز نرخاندووە، بۆیە هۆی گریانەکەی داوەتە پاڵ دەنگخۆشیی (حەسەنی ئامێ) نەک بەرزیی شیعرەکانی خۆی و لەلایەکی ترەوە بۆمان دەردەخات کە لەسەردەمی خۆیدا شیعرەکانی کراونەتە گۆرانی و خۆشی گوێی لێ بووەو هەڵوێستیشی بەم جۆرە بووە.

بۆ زیاتر ئاشنا بوونمان بە ناخی مەولەوی بەرامبەر بە گۆرانی، بەسەرهاتێکی تری دەخەینە ڕوو، مەولەوی ڕۆژێکیان بەلای زەماوەندێکدا تێدەپەڕێ، سەیر دەکات ژنێ بەناوی (نەبات) گۆرانی بۆ ژنانی هەڵپەڕکێکەر دەڵێ و لەو لاشەوە پیاوێکی دەنگخۆش بەناوی (فەرەج) گۆرانی بۆ پیاوان دەڵێ، لایان دەوەستێ و سەیریان دەکات و بۆ پاساودانی ئەو سەیرکردنەی نامەحرەم ئەم شیعرە دەڵێ:

**لە صەدای (نەبات) لە چریکەی (فەرەج)**
**لەسەر مەلاو شێخ نەماوە حەرەج**

واتە: لە خۆشیی دەنگی (نەبات) و چریکەی (فەرەج)دا مەلاو شێخ هەموو شێت بوون و هەرچی بکەن گلەییان لێ ناکرێ، چونکە شێت تەکلیفی لەسەر نییە.

هەروەها مەولەوی لە قەسیدەیەکدا کە بۆ وەڵامی قەسیدەیەکی (ئەحمەد بەگی کۆماسی) نووسیویەتی، زۆر بەجوانی دیمەنی شاییەکی کوردەواریمان نیشان دەدات، هەر لە جۆری گۆرانی وتنی ناوشاییەکەو هەموو دیمەنە شاراوەو بەهێنییەکانی ڕەشبەڵەکی کوردیمان بۆ وێنە دەکێشێت:

**صەدای (لار هەی لاو) زرەی زەڕ زنجیر**
**سلسلەر بانی سەر بەند زرێ و لاگیر**
**شەقەر تەقەی گەرم، چەپڵەو چیلەی نەرم**
**چریکەی وەناز، تریکەی وەشەرم**

بەو سێ بەڵگەی سەرەوە، هەڵوێستی مەولەویی شاعیرمان بۆ دەردەکەوێت بەرامبەر بە گۆرانی و شایی و زەماوەند، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بچینە ناو گوڵزاری شیعری مەولەوی و لەهەر باخچەیەک گوڵێک لە نەغمەو مۆسیقای شاعیر بە نموونە بە ئێوە ئاشنا بکەین، کە بڕواناکەم هیچ شاعیرێ تاکو ئێستا وەک مەولەوی ئەوەندە عاشقی مۆسیقا بێت و لە شیعرەکانیدا بەکاری هێنابێت و بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی سەرەوە، هەوڵ دەدەین بەشیعرە ناسکەکانی بگەینە ئەنجام و ئەو نموونانە بخەینە ڕوو وشییان بکەینەوە کە زیاتر نزیکن لە دنیای مۆسیقاو ئاوازو گۆرانییەوە تا بزانین مەولەوی تاچ ڕادەیەک توانیویەتی ئەسپی خۆی لەم مەیدانەدا تاوبدات؟

**١- شیعر وێم تەنخوای سەمتوور سازێ**
**لێدەر، سا نەیچی! هەر تارێش گازێ**

ئەوەتا شاعیر لەو دێڕەدا داوا لە (نەیچی) دەکات و پێی دەڵێت: شیعرەکانی خۆم بە (نەی) لە باتیی سازو سەمتوور لێ بدە، با هەر تەلێکی وەکو گازێ وابێ بۆ دەرکێشانی ڕیشەی جەرگم.

هەر لەو شەوەدا مەولەوی تەنیاو بێ تاقەتە بۆیە داوا لە دەروێش و گۆرانیبێژ دەکات کە ئەو دەستێ لە ڕووی (دەف)بدات، چونکە (گیان) چاوەڕێی لەرینەوەی ئەو ئەڵقانەن کە بە کەللەی دەفەوەن.... گۆرانیبێژیش بەعەشقی ئەو کەسەی کە بە ئاواتی گۆرانی وتنیەوەتی، بۆیە بەجۆرێک دادیان بۆ دەبات کە بەتەنگیەوە بچن و دڵی نەشکێنن:

**سا دەروێش کەفێ بدە نە ڕووی دەف**
**گیان (منتظر)ەن پەرێ ڕێزەی دەف**
**(مغنی)! لێدەر یەک نیمشەو سازان**
**بە شقی ئەو کەسە تۆش ئاوات وازان.**

٢- لە هۆنراوەیەکی تردا مەولەوی چارەسەری دەردی بە مەقام دەکات و خۆزگە بۆ ئەوە دەخوازێت کە (نەیچی)ی لە لاوەبێت بە مەقامێکی ئاوازی قەقنەس خۆش و دڵگیرەوە:

**تا (مطرب) وەساز حەنجەرەی بێ گەرد**
**هوردۆ مەقامێ دەوا کەرۆ دەرد**
**بەڵ ناکا نەیچی بەبۆ جەلاوە**
**وە مەقامەکەی قەقنەس ئاساوە**

٣- لە شەوێکی تری خەماویدا کە سەرتاپای گیانی بەهۆی غەمەوە ئاگری تێ بەربووە، دووبارە هانا بۆ گۆرانیبێژ دەباتەوەو داوای لێ دەکات کە هەموو سازەکانی یەکخات، وەقەزای نەیچی لەماڵی خۆی دەخات، تاوەکو دەم بە (نەی) کەوە بنێ، چونکە دەروونی پڕ لە زووخاڵەو ڕوو لە دەفژەن دەکات و قەزای پەنجەکانی لە گیانی خۆی دەخات، زۆر عاجزە بەشکو دەفێکی بۆ لێ بدا...

**(مغنیی)! کۆکەر سازانت وەهەم**
**سەمتوورێ، تارێ، وەهەم کەرەجەم**
**نەیچی! سالێدەر، قەزات وەماڵم**
**دەمێ دەرجەنەی دەروون زوخاڵم**
**قەزای پەنجەکەت دەک لەمن کەفێ**

**خەیلێ عاجزم سالێدەر دەفێ.**

٤- لە شەوێکی تردا مەولەوی بە بانگی بێ شەرم هاوار دەکات و ئاوازەی (کەڵڵەی وەک سەمتووری) گەرمی کردووەو دەنگ دەداتەوەو سەداو دەنگی هەردوو ئالەتی مۆسیقی (زیل و بەم) دێت و مەینەتی بەسەد جۆرە:

**ئیمشەو دیارەن بانگم بێ شەرمەن**
**زایەڵەی سەمتوور کەڵلەم وەگەرمەن**
**صەدای زیل و بەم مەینەت صەد تەرزەن**
**خەفەت شادیشەن، خەم دەماخ بەرزەن**

هەر لەو شەوەدا خۆی دەکاتەوە فیدای (نەیچی) و پێی دەڵێ: درەنگ مەکەو نەیەکەت بە دەنگ بهێنە:

**نەیچی! درەنگەن سا مەکەر درەنگ**
**فیدای پەنجەت بام، نەی باوەر وە دەنگ**

تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە دەڵێ پاک بوونەوەی هەموو تۆزو گەردێک بە ئاوازێکەوەیە و دەوای هەردەردێکیش بەلێدانی مەقام چارەسەر دەکات.

**جەلای هەرگەردێ وە صەدا یێوەن**
**دەوای هەر دەردێ وەنەوایێوەن.**

٥- ئەوەتا مەولەوی لەلاوانەوەی عەنبەر خاتوونی خێزانیدا، ڕوو لە کاکی شمشاڵژەن دەکات و پێی دەڵێت: بەبێ ڕابواردن لەگەڵ یاراندا ژیان چ خۆشییەکی تێدایە؟

**نەیچی! وەبێ بەزم یاران جانێ**
**کام سەفا مەندەن پەی زیندەگانی؟**

چونکە لە وەزعێکی تاڵ و ناخۆشدا دەژیم، بە دوو ئاوازی شیرینەوە وەرە بۆ لام، ئاوازێکیان یەکجاری بمتوێنێتەوە، ئەوی تریان بملاوێنێتەوەو زیندووم بکاتەوە، هەروەک چۆن لە قیامەتدا بەفوویەک هەرچی زیندوو هەیە دەمرێ و بە فوویەکی تر هەرچی مردووە ڕاست دەبێتەوە:

**چون مەزاق تاڵەن جە گردین لاوە**
**بۆ وە شیرینیی یەک دوو نەواوە:**
**یەکێ یەکجاری تاونۆمەوە**
**ئەو یەک لاونۆم، یاو نۆمەوە.**

٦- مەولەوی لە پارچە شیعرێکدا کە لە لاواندنەوەی خوالێ خۆش بوو، (شێخ عەبدولسەمەدی) خەڵکی (خانەگا)ی لای (پاوە)دا وتووە، کە ڕۆیشتووە بۆ کرماشان تەدارەکی ژنهێنان بکرێ، لە ڕێگا مار دەدا بەپێیەوەو دەمرێ:

**ساقی، مەی هەی داد، (مغنیی)، چەنگێ**
**نەیچی، های فەریاد، (مطرب)، ئاهەنگێ**
**گەرمیی مەی، نەواو کزەی دەف و نەی**
**تێکەڵ بۆ چەنی زایەڵەی وەی وەی**

واتە: ساقی تۆ مەی بێنە، گۆرانیبێژ تۆش بدە لە چەنگەکەت، شمشاڵژەن تۆش باهاوار لە شمشاڵەکەتەوە هەڵسێ، موتریب تۆش ئاهەنگێک سازکە، تا گەرمیی مەی و کزەی دەف تێکەڵی یەک بن لەگەڵ هاوارو گریان و وەی وەی کردندا. مەولەوی لێرەدا هونەری (لف و نشری مشوش)ی بەکارهێناوە، چونکە نەوا هی نەیەو کزە هی دەفە.

٧- مەولەوی لە هەموو کارەساتێکی ناخۆشدا کە بەسەری هاتبێ لە شیعرەکانیدا زیاتر مامەڵەی لەگەڵ ئامێرە مۆسیقییەکاندا کردووە بۆ دەربڕینی ئەو هەستە ناخۆشە، لە غەزەلێکیدا کە بەبۆنەی سووتانی کتێبخانەکەیەوە نووسیویەتی بۆ برادەرێکی و تێیدا گلەیی لە چەرخی ڕۆژگار دەکات و دەڵێ:

**بریان تای ڕوباب قافیە خوانیم**
**نەمەندەن تاقەت عیبارەت زانیم**

ژێی مۆسیقای شیعردانم پچڕاوەو تاقەتی تێگەیشتنی نووسراوم نەماوە، لەم شیعرەدا تەشبیهی شیعر دانان کراوە بە (ڕەبابە) لێدان، هەروەک (ڕەبابە) کە ژێیەکەی پچڕا ئیتر پێی لێ نادرێت، ئەمیش ئەو هێزەی نەماوە کە پاڵی پێوەدەنا بۆ شیعر وتن.

٨- لە لاواندنەوەیەکی تری عەنبەرخاتوونی خێزانیشیدا، داوا لە گۆرانیبێژ دەکات کە صەدای مەرگی هەڵبدات، چونکە دەردی بێ دەرمانەو داوا لە مەیگێڕ دەکات پیاڵەیەک شەرابی مەرگی بداتێ، چونکە یار چاوەڕوانیەتی و بامرێ و بچێ بۆ لای:

**(مطرب) مەقامێ دەردم ناچارەن**
**ساقیبا جامێ دۆس ئینتیظارەن**

٩- مەولەوی لەیادکردنەوەی هەندێ برادەری (زەهاوی)دا، پارچە شیعرێکی وتووە:

**دڵەی خەم خەیاڵ جۆش ئاوەردەوە**
**مەعدووم هەم هەوای (زەهاو) کەردەوە**
**زرنگەی صەدای ساز جە ڕیشەی ئەعزام**
**کەمانچە دەستوور ماوەرۆ مەقام**

زرنگەی دەنگدانەوەی ئەوسازەی کە دروست کراوە لە ڕیشەی ئەندامانی لەشم، وەک کەمانچە ئاوازی لێ دێ، مەولەوی لەم شیعرەدا لەشی خۆی شوبهاندووە بە (ساز) و دەمارەکانی لەشی شوبهاندووە بە تاڵەکانی ژێی سازەکەو لەبەر زۆریی ئازاری لەشی، زریکەیەکی بەخەیاڵ بۆ داناوەو ئەو زریکەیەی شوبهاندووە بەو ئاوازەی کە لە کەمانچە بەرز دەبێتەوە.

١٠- لە شەوێکی جەژنی ڕەمەزاندا مەولەوی ڕوو لەکاکەی گۆرانیبێژ دەکات و پێی دەڵێ: تارەکەت بەدەستی ناز هەڵگرەو فووی پێداکەو ئاوازێکی خۆشمان بۆ لێ بدە.

**های (مغنیی) تار حەنجەرەی وەش تەرز**
**وەسەر پەنجەی ناز باوەرە ئەو لەرز**

١١- مەولەوی لە غەزلێکی تردا کە بۆ دۆستێکی

نووسیوه، پایز داهاتووه ئەو هەر لە کوێستان ماوەتەوە، بۆیە لە دێڕێکدا دیسان مەولەوی هانا بۆ گۆرانیبێژ دەبات و داوای لێ دەکات و کەمێ سەرزەنشتی دەکات:

**موطریب، یەکارەن، مەرسیا سەنگێ**
**من بەی حاڵەوە، تۆوەی بێدەنگی**
**جە تەنخوای نەی بەزم خەم ویلاتەوە**
**هۆردەر نەی چەند فەرد وە دیلاتەوە.**

دیلان: مەقامێکی کۆنی کوردییە لەکاتی بووک بردندا دەوترێ، کاکەی ئاهەنگێڕ لەجیاتی شمشاڵی ئەم ئاهەنگی بووک سوارکردنە دەس کە بەلاوانەوەی خەم و بە مەقامێکی دیلان ئەم چەند شیعرەم بۆ بڵێ.

١٢- لە قەسیدەیەکی تر کە بە بۆنەی ئەوەی دۆستێکی جوابی ناردووە- بەشوێنیدا بچێت بۆ لای، بۆیە دەڵێ: تاکەی بێ فەرمانیی ئازیز بکەم و نەچم بۆلای، دەروێش دەسم دامێنت زووکە بدە لە دەفەکەت کاکەی شمشاڵژەن تۆش شمشاڵەکەت بێ بەدەمتەوە؛ با ساقیش دەس کات بە مەی گێڕان:

**بێ ئەمری فەرمان ئازیز تاوەکەی**
**های دەروێش، نەی چی، مەی چی، دەف، مەی، نەی**

بەڵکو بەهۆی سۆزی ناڵەو دەنگی دەفەوە هێزم بێتەوە بە بەرداو وەک دەف ڕوو بکەمە یاران و پشت بکەمە دواوە!

**دەف ئاسا بەو سۆز ناڵەو صەداوە**
**ڕوو ئەو یاران بوو، پشت ئەو دماوە**

لەسەر ئاوازی نەیەکەش چین چین هەڵپەڕم و تا لێ دەبیتەوە:

**دەس گیرو ئەسەر صەدای نەی پەی پەی**
**تا وەنیشتیهای ئەو سەر صەدای نەی.**

١٣- دیسان مەولەوی بە بۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە لە قەسیدەیەکی تردا دەچێتەوە ناو دنیای مۆسیقاو ئاه و ناڵەی دڵی خۆی تێکەڵ بە ئاوازی مۆسیقا دەکات:

**جەژن و جەژنانەم هەر یەک جەردەیێ**
**بەردەوە پەی هەرد، (مطرب) پەردەیێ**
**لەرزەی ڕیشەی دڵ، سەمتووری دەستوور**
**وەزن طەبع تار پڕ سۆزەی سەمتوور**

جەردە جەژن و جەژنانەمی فڕاندووە بۆ کێو، سا توخوا کاکەی گۆرانیبێژ مقامێکم بۆ بڵێ: ببێ بە مایەی لەرزینەوەی ڕیشەی دڵەکەم کە هەمیشە وەک سەمتوور دەنگی لێوە دێ و ئاوازەکەی لەشێوەی تاربێ و پڕبێ لەو جۆش و سۆزەی کە لە سەمتوور هەستی پێ دەکرێ.

١٤-مەولەوی لە قەسیدەیەکی تردا کە بۆ (مەحموود پاشای جاف)ی نووسیوە بەبۆنەی شایی و زەماوەندی ژن هێنانیەوەو لە شاییەکەدا نافرەتێک گۆرانیبێژ بووەو ناوی (تاوس) بووەو خەڵکی (کەرەند) بووە گۆرانیی بۆ ژنان وتووە، شاعیر لەم شیعرەدا پیرۆزبایی لە (مەحموود پاشای جاف) دەکات و پێی دەڵێ لە جیاتی من باش سەیری هەڵپەڕکێ کەران بکە، تێر تەماشای نازداران بکە کە ڕوویان وەک ئاوێنە ڕۆشنە:

**گرمەی نەقارەو لرفەی شەرواڵان**
**خشپەی پامووروو زرنگەی خرخاڵان**

گرمەی نەقارە (نقارة)و خشەی شەرواڵ و (پاموورە) کە جۆرە خشڵێکە ئافرەت لە پێی دەکات واتە مووروی پێیە، لەگەڵ زرنگەی بازندا تێکەڵ بەیەکتری بوون، کە (نەقارە) ئالەتێکی مۆسیقیی میللییە.

١٥- مەولەوی وەنەبێ تەنیا لە شایی و بەزمی خۆشیدا ئامێرەکانی مۆسیقای خستبێتە ناو چوارچێوەی شیعرو خەیاڵییەوە، بەڵکو لە هەموو دەمێکدا ئەم ئامێرانە هاودەمی مەولەوی بوون، ئەوەتا لە قەسیدەیەکی تردا کە هەر بە بۆنەی مانگی ڕەمەزانەوە نووسیویەتی و دەڵێ:

**لوولەی تەراویح وەش وەش مدۆ دەنگ**
**بێ ئاهەنگەن تارتەموورەی ئاهەنگ**

کە لەم شیعرەشدا دوو ئامێری مۆسیقی میللی بەکارهێناوە (تار، تەموورە) شمشاڵی تەراویح خۆش خۆش دەنگی لێوە دێ و تاروتەموورەی ئاهەنگ و ڕابواردن خۆشیی لێ بڕاوە.

١٦- مەولەوی لە چەند شیعرێکی تریدا کە بۆ دۆستێکی نووسیوە، بەبۆنەی ئەوەی هەندێ کەبابی بۆ ناردووەو دەڵێت:

**نەوای ناڵەی دڵ وێنەی صەدای نەی**
**پیاڵەی زووخاو مەنۆشۆ چون مەی**
**کەواو پارچەی جەرگ، سینەی برێشتاو**
**ڕەحمت بۆ یەنەی، یەمەی، یەکەواو**

ئەو شتانەی کە هۆی خۆشی و ڕابواردنن بریتین لە (ئاواز، مەی، کەباب) من ناڵەی دڵم وەک ئاوازی شمشاڵ وایە و لە جیاتی شەرابیش پیاڵەی زووخاو دەنۆشم و پارچەی جگەری ناوسینەی برژاویشم کەبابە، دەسا میهرەبانیت ببێ لەگەڵم ئەمە ئاوازو مەی و کەبابە، لێرەدا مەولەوی کەباب بۆ تێرخواردنی (نەفسی)ی مرۆڤ و مۆسیقاش بۆ خۆراکی ڕۆح تەماشا دەکات بۆیە هەردووکیان وەک پێویستییەکی مرۆڤ لە قەڵەم دەدات و ئاوازو مۆسیقاش بۆ هەموو کەس گرنگەو سەرچاوەی خۆشی و ڕابواردن شان بەشانی مەی.

١٧- لە قەسیدەیەکی تردا کە بەبۆنەی پیربوونی خۆیەوە دایناوە کە تێیدا دیسان هانا بۆ گۆرانیبێژ دەبات و دەسەو دامێنی دەبێ پێی دەڵێ: لەسەر ئاوازی مقامی (شانازی) یان (حیجازی) دەنگ هەڵبڕەو مقامێکی خەفەتبارمان بۆ بڵێ بەجۆرێ گڕ بەربداتە دڵی ئینسان، بەڵکو لەم خەوی قورسی بێ ئاگاییە بێدار ببمەوە:

**(مطرب) بەو نەغمەی (شانازی)تەوە**

**یا بەو پەردەی پاک (حیجازی)تەوە**
**بولەندکەر دلسۆز صەدای دڵ تەنگی**
**بەڵکم بێدار بوو جەی خاو سەنگی**

١٨- دیسان لە وەرزی بەهاردا مەولەویی شاعیر، ئاوازی (سەحەری) و مۆسیقا، ئامێتەی یەکدی دەکات و خۆشیی بەهار دەبەستێتەوە بە دەنگی مۆسیقاوەو کەمێ سەرزەنشتی خۆی دەکات:

**مەعدوومی، غەفڵەت تاچەندو پەی چی؟**
**گۆش دەر وەناڵەی سەحەریی نەیچی.**

مەولەوی تاکەی لە خەوی بێ ئاگایی خەبەرت نابێتەوەو نازانی ئەم بەهارە خۆشە هاتووە، گوێ بگرە بۆ شمشاڵژەن کە بە شمشاڵەکەی ئاوازی سەحەریت بۆ لێ دەدات.

* ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی سەیری شیعری شاعیرانی نەتەوەکەمان بکەین، هەر لە شیعری فۆلکلۆری و میللییەوە تا هەموو قوتابخانە ئەدەبییەکان... ئەوا دەبینین زۆربەی شاعیرانی کورد لە ناو شیعرەکانیاندا ئامێرە مۆسیقییەکانیان بەکارهێناوە بەتایبەت لە جیهانی تەسەوفدا ئەم دیاردەیە زیاتر دەبینین وەک لای شاعیرانی ڕێبازی کلاسیکی بۆ نموونە (مەحوی، حەمدی، سالم، کوردی، وەفایی....)، دەتوانین بڵێین ئەمانە مامەڵەیان لەگەڵ مۆسیقاو ئاوازو گۆرانیدا زیاتر لە دنیای تەسەوف و عیرفانیدا کردووەو تێکەڵی مەبەستەکانی تریان نەکردووە وەک مەبەستی (وەسف، سروشت، دڵداری....) هەرچی مەولەویی تاوەگۆزییە لە زۆربەی مەبەستەکانی هۆنراوەدا دەستەو دامێنی ئامێرە مۆسیقییەکان و گۆرانی و ئاوازی کوردی بووەو لە زۆر وێنەی شیعریدا بەکاری هێناون، بەوپێیە بۆمان دەردەکەوێت کە مەولەوی لەم حاڵەتانەدا هانای بۆ مۆسیقاو گۆرانی بردووە: (لەشەوە تەنیاو بێدارەکانیدا، لەکاتی غەمباریدا، بۆ مەبەستی لاوانەوە، لەکاتی ڕووداوی ناخۆشدا چ بەسەر خودی خۆیدا هاتبێ یان خەڵکی تر، لە یادی دۆست و هاوەڵانیدا، لەسەردەمی پیریدا، لەوەرزی پاییزدا، لەکاتی دابڕاندا، لە مەجلیسی زیکرو عیرفانیدا، لە مانگی ڕەمەزان و جەژن و بۆنە ئاینییەکاندا، لە وەرزی بەهاردا، لەکاتە خۆش و ئاسوودەکانی ژیانیدا، لە شایی و هەڵپەڕکێدا..).

مەولەوی تەنیا لە هەردوو وەرزی (پایزو بەهاردا) کە بێ گومان پایز وەرزی غەمەو بەهاریش وەرزی خۆشی، پەنای بۆ ئاوازو گۆرانی و مۆسیقا بردووە لە هەردوو وەورزکەی تردا (هاوین، زستان)دا بەهیچ شێوەیەک ئاماژەیان پێ ناکات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گونجاندن و لێک نزیکیی ئەو دیاردانە لە سروشتدا بۆ نموونە لە زستانی سارددا کێ حەز لە دەنگی شمشاڵ دەکات؟

مەولەوی لەشیعرەکانیدا ئەم زاراوەو ناوانەی بەکارهێناوە کە هەموویان دەچنە ژێر خانەی (مۆسیقاو گۆرانی)یەوە: (سەدا، چریکە، چیلە، چەپڵە، شەقەو تەقە، چیلەی نەرم، تریکە، زایەڵە، نەوا، بەزم، ئاهەنگ، کزە، جۆش، زرنگە، وەیلان، سۆز، ناڵە، لەرزە، گرمە، لرفە، خشپە، نەغمە، لاوهەی لاو، وەی وەی، سەمتوور، ساز، نەی، دەف، تار، زیل و بەم، ڕوباب، کەمانچە، نەقارە، لوولە= شمشاڵ، تەموورە، تەلی سەمتوور، حەنجەرە، پەردە، مغنیی، مطرب، نەیچی، دەفژەن، مەقام، شانازی، حیجازی، سەحەری، دیلان.....).

لە کۆتاییدا دەڵێین ئەگەر (مۆسیقاو گۆرانی) هۆگرو وابەستەی مەولەویی تاوەگۆزی نەبووبن و خۆراکی ڕۆحیی نەبن، ئەدی چۆن ئەوەندە لە خۆشی و ناخۆشیدا پەنای بۆ دەبردن؟ و داوای لە گۆرانیبێژو نەیچی کردووە بە ئاوازی خۆش، غەمی دڵی بڕەوێنەوە، ئەگەر مەولەوی شارەزایی تەواوی لەم بوارەدا نەبووایا ئەوا ئەمڕۆ هەرگیز شیعرەکانی هێندە دەسیان نەدەدا بۆ گۆرانی! بەڵام وشەو وێنە مۆسیقییەکانی شیعری مەولەوی وای کردووە کە زۆربەی هەرەزۆری شیعرەکانی ئاوازیان بۆ دابنرێت و بکرێنە گۆرانی، کە لەم بوارەشدا مەولەوی خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە مۆسیقاو گۆرانیی کوردی کردووەو هەتا هەتایە جێ پەنجەی دیارە..

**سەرچاوە:**
**١- دیوانی مەولەوی/ مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس.**
**٢- مەولەوی و سروشت/ عەلی شێخ عومەر قەرەداغی.**
**٣- میهرەجانی مەولەوی/ کتێبی ژمارە (١)ی گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ).**

# چۆن ئاژەڵێک دەکەیتە ئەکتەرێکی سینەمایی؟

نا/ دڵشاد عەزیز
(سلێمانی)

نزیکەی ۲۰ ساڵە ژن و پیاوێ سەرقاڵی بەخێوکردنی ئاژەڵن هەر لە بێچوویەتییەوە ڕایان دەهێنن، ئینجا پێش ئەوەی ئەم ڕاکونە بچووکە بخرێتە بەر پرۆڤەو ڕاهێنان، لایەنە تەندروستییەکانی ڕەچاو دەکرێت تاوەکو لەگەڵ کۆسپەکانی نمایش و نواندنا ڕابێت ئنجا بەهەموو دەنگەکان ئاشنای دەکەن، پاشان لەسەر مۆسیقا، یان گۆرانی ڕای دە[illegible].

ئەنانەت فێری دەکەن چۆن مۆسیقا لێ بدات، گەر لە ئەزموونەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەڵگەنامەی دەرچووی ئەکادیمی تایبەت بەکاری نواندنی ئاژەڵانی دەدرێتێ، بەڵام ئەوەشمان لەیاد نەچێ ئەم ڕاکونە جیاوازە لەو ڕاکونانەی بە مەبەستی فەروو بەکاردێت، بۆ نموونە گەر دەورێ درا بەو ڕاکونەی کە ناوی (تینا)یە بۆ ئەوەی دەرگایەک بکاتەوە تا دەربازبێت، پاش کەمێ ڕاهێنان بەو یاسایەی زانا دەروونناسەکان بە (کرداری پێچەوانەی بەمەرج) ناوی دەبەن، دەتوانێ ئەو کارە ئەنجام بدات و سەرکەوتنی باش وەدەست بێنێت، ئەوەی شایەنی باسیشە پێوەندییەکی خۆش لەگەڵ (تینا) و ڕاهێنەرەکەیدا بەدی دەکرێت، (تینا) فێردەکرێت لە دەرگاکەوە بێتە ژوورێ و چنگ لە خواردنەکە گیر بکات، ئەمەش پاش چەند جارێ بە دووبارەکردنەوەی دەورەکەی، بەڵام لانی کەم (۱۵۰)جار ئەو کردارە بە تینا دووبارە دەکرێتەوە، تا بە ئاسانی و بێ هەڵە بگاتە ئامانجی خۆی بەتایبەتی لەبەردەم کامێرادا چونکە زۆرجار دەبێتە بێزاری وێنەگر و بە فیڕۆدانی کات و بەرهەم.

هەرکاتێ دەرهێنەر ئامادەبێ بۆ وێنەگرتن، تیناش ئامادەیە، کردارەکەی ڕاکونی تینا وەک کردارەکەی (بافلۆف و سەگەکەی) وایە، کاتێ سەگەکەی لەگەڵ دەنگی زەنگەکەدا ڕاهێنابوو، هەرکات زەنگەکە لێ بدرایە لیک بەدەمی سەگەکەدا دەهاتە خوار، یان لە دیمەنێکی تردا دەورێک دەدرێ بە قازێ فێری ئەم دیمەنەی دەکەن بچێ گاز لە پاشاڵی منداڵەکە بگرێ، بەتایبەتی لەو کاتانەی منداڵەکە سەری کردووە بە کولانەی قازەکەدا، قازەکە لە دواوە دێ و دەنووک لە سمتی منداڵەکە دەگرێ.

یاخود ئەو قەلەڕەشە ناوی (جیمی)یە باشترین ئەکتەری سینەماییە و بەشداری گەلێ فیلمی کردووە، زیاتر خەریکی دزینی خشڵ و زێڕە، بەتایبەتی لە زنجیرە تەمسیلی (فدریک و پاشا) فێڵێک لە پیاو خراپەکان دەکات و پاڵەوانی فیلمەکە لە دەستیان ڕزگار دەکات.

هەروەها لە فیلمی (قەلەڕەش)دا دەوری سەرەکی دەبینێ لە پاڵ چەند ئەکتەرێکی بەناوبانگ وەک (فنست برای)، (پیتەر لۆری)، لەو فیلمەدا شەربەت دەخواتەوەو قسە دەکات و ڕێنمایی ئەکتەرەکانی تر دەکات تا لە قەڵایەکی سووتاو دەربازبن. پاشان بابزانین ئایا دیمەنی گلانی ئەسپەکان لە فیلمی کاوبۆییدا سەرنجی ڕانەکێشاوی کە چەند جارێک گل دەدات؟ لە ڕاستیدا ئەم ئەسپانە وا ڕادەهێنرێن کە لە شوێنی خۆیاندا گل بدەن، بۆ زیاتر

تیشک خستنە سەر ڕاهێنانی ئەسپەکان (میکی بێرس) ڕاهێنەری ئەسپەکانی هۆلیوود دەڵێ: (یەکەم جار بەدوای شوێنێکدا دەگەڕێم کە زیان بە ئەسپەکە نەگەیەنێ، واتە ڕەقەڵان و بەردەڵان نەبێ، گلانی ئەسپەکان فێڵێکی سینەمایی نییە، بەڵکو وا ڕاهێنراوە کە خۆی بگلێ دیارە ئەمەش بە ئاسانی ناکرێ و هەوڵێکی زۆری دەوێ، چونکە ئەسپ لەوکاتەی لە دایک دەبێ لە کەوتن و گلان دەترسێ) کەواتە پێویستە سەرەتا ترسی بشکێنێ و وای لێ بکات گلان بەلایەوە ئاسایی بێت، ئەمەش کارێکی گرانە، هەروەک ئەسپ سوارەکان دەڵێن (هەموو ئەسپێک خاوەن تواناو مەزاج و حەزو ئارەزووی تایبەتمەندی خۆیەتی)، زۆرجار مامەڵەی خۆشی ئەسپ و ڕاهێنەر کارەکان خۆشتر دەبەن بەڕێوە، دیارە ئەسپەکە باوەڕی تەواوی بەمەسیکی هەیە، بۆیە وا بە ئاسانی بۆی دەوەستێ، ئەسپەکەش دەزانێ کامە شوێنی گلان و کەوتنە و دوورە لەبەرد و ڕەقەڵان، جگە لەوە، باوەڕی تەواوی بە ڕاهێنەرەکەی هەیە (میکی) بۆ ئەوەی ئەسپەکە لەسەر گلان ڕابێنێ، گوریسێ بە قاچی ڕاستەوەی دەبەستێ لەلای خۆیەوە ڕایدەکێشێ تا ئەسپەکە فێری گلان بکات و ترسی بشکێ، ئنجا ڕاهێنەر بۆ ئەوەی ئەو پێوەندییە خۆشەی نێوانیان نەپچڕێ هێوری دەکاتەوە، چەند جارێ ئەم کارەی پێ ئەنجام دەدات، پاش ئەوەی ئەسپەکەش ڕەزامەندی خۆی نیشان دەدات تا بەولایەی کە دەیەوێ بگلێ، لە بینەریش وایە فیشەک پێکاویەتی.

سەرەتا گوریسەکە ڕادەکێشێ پاشان بەقاچی هێز لە ڕەشوی ئەسپەکە دەکات بەولایەی کە دەیەوێ تا ئەسپەکە بگلێ، کەواتە گەر دیمەنێکی وات بینی، خەفەت بۆ ئەسپەکە نەخۆی، چونکە ئەمەکاری ڕۆژانەی ئەسپەکەیە، تەنانەت ئەسپەکە واخۆی نیشان دەدات کە مردار بۆتەوە. ئەوەندە ئەم کردارە دووبارە دەبێتەوە ئەسپەکە لەگەڵ دەنگی تەقەکانیشدا ڕادێ. وەک ئەوەی مرداربووبێتەوە پاش ڕاهێنانێکی زۆر بەرەڵا دەکرێ تا بە ئارەزووی خۆی بسووڕێتەوە.

زۆرجار دەور دەدرێ بە مەیموونێ. ئەو مەیموونەش ناوی (شاملی)یە لە ستۆدیۆکانی هۆلیوودەوە گەڕاوەتەوە تا پشوویەک بدات وەک مرۆڤێکی ئاسایی ڕەفتار دەکات کە دەگەڕێتەوە مالێ بەچکەیەکیشی هەیە ناوی (جۆنیۆ)یە، (شاملی) لە دیمەنێکدا لە نزیک (مەلەوانگە)کەوە دانیشتووە جگەرە دەکێشێ و گوێ لە مۆسیقا دەگرێ، عەینەکیشی لە چاودایە، خۆی داوەتە بەرهەتاو، پاشان دەست دەخاتە ئاوەکەوە، ساردە، بچێتە ناوی عەینەکەکەی تەڕ دەکات تاوابزانن لەکاتی مەلەکردندا لەبیری چووە دایکەنێ. هەموو دەزانین کە شەمپازی سەر بەخێزانی مەیموونەو ئاژەڵێکی زیرەکە، ڕاهێنانی زۆر ئاسانە، چونکە حەزی لەلاساییکردنەوەیە (کاندی کلۆ) ڕاهێنەری تایبەتی (جۆنی)یە، حەزمان کرد چەند پرسیارێکی لێ بکەین:

پ/ هۆی بەشداری شامپازی چییە لە فیلمدا؟

و/ شامبازی یەکێکە لەو ئاژەڵانەی حەزی زۆر لەلاساییکردنەوەیە، پاشان خاوەن حەزو ئارەزووی تایبەتی خۆیەتی هەروەها خەڵکی خۆشیان دەوێ بەتایبەتی مندالان لەبەر ئەوە ڕاهێنانی ئاسانە.

پ/ چۆن شامپازی ڕادەهێنرێت؟

و/ شامپازی پێویستی بەخواردن و خواردنەوە هەیە پاشان خۆشەویستی، نابێت لێت بترسێت ئەوکاتە دەتوانی بە ئارەزووی خۆت هەڵی سووڕێنیت.

پ/ حەزی لە چ خواردنەوەیەکە؟

و/ حەزی لە خواردنەوەی (سۆدا)یە

پ/ دەتوانی هەندێ لەو شتانەمان پێ بڵێی کە فێرت کردووە؟

و/ ئادەی ماچی کە.... تەوقەی لەگەڵ بکە.. قسە بکە.. قاچت داگرە، چەپڵە لێ بدە، بابچین سواری ئەو پاسکیلە بین، پاشان دەچین پەت پەتێن دەکەین.

کەواتە ڕاهێنانی ئەم ئاژەڵانە هەر لە بچووکییەوە دەکرێ هەر لە ڕاکونەکەی یەکەم جارەوە تا ئەم شەمبازییە، هاوکات بایەخدان و سۆز و خۆشەویستی دەوێ، ئەوەشت لەیاد نەچێ ئارامگرتن و حەوسەڵەی دەوێ، گەر سەرکەوتنی وەدەست هێنا خەڵاتی باش دەکرێت

کەواتە ئێوەش دەتوانن ئاژەڵەکانتان ئاوا ڕابهێنن..

یەکێکی تر لەو ئاژەڵانەی دەوری سەرەکی دەبینێ مشکێکە لە فیلمی (ڕاوی مشک) لە دەرهێنانی (ولیەم هیکی و گۆرڤێرینسکی) و بەرهەمی ساڵی (١٩٩٧) لە نووسینی (ئادەم ریفکن)ە، لەم فیلمەدا بۆ ماوەی (١٤/١خ) مشکێ لەلایەن دوو کەسەوە ڕاودەنرێ، لە کۆتاییدا مشکەکە دەیباتەوە جگە لەوەی کامێرا دەوری سەرەکی دەبینێ لەگەڵ تەکنیکی سینەمایی.


**سەرچاوەکان:**

١- کەناڵی mbc بەرنامەی (فن الخدع السينمائية).

٢- کەناڵی mbc بەرنامەی عالم السينما.

٣- فیلمی (ڕاوی مشک).

# تارمایی جەنگ
# لە فۆرمێکی بەربڵاودا

وریا بوداغی
(بوکان)

«بە بۆنەی کرانەوەی پێشانگای شێوەکاری هونەرمەند ئیسماعیل خەیات لە گەلەری کوردستان»

لە شێوەکاریدا زۆرجار بە دیاریکردنی بابەتێک و کەڵک وەرگرتن لە ڕەنگ و فۆرم، کە زۆرجار تابلۆ دەکەوێتە ناو شێوازێکی ئەبستراکتەوە. سەرەڕای خێرایی و هەندێ تایبەتمەندی تر لە بەرهەمێکدا، هونەرمەند بە قەناعەتێکی یەکجاری ناگا و کاتێک نەگەیشتە ئەم قەناعەتە و بەتایبەتیش لەو حاڵەتانەدا کە دەروونی هونەرمەند بە بابەت گەلێکی دڵتەزێن و نامرۆیانە پڕ بووە، خەریکە باسی کارەساتێکی گەورە دەکا و بەردەوام لەگەڵیدا دژی، ئەم بابەتە لە دەروونی هونەرمەندەوە سەرچاوە دەگرێ. بە کۆمەڵێک ڕەگەز و تایبەتمەندییەوە دێتە بەرهەم و چاودڕوانی بەرهەمێکی باشی لێ دەکرێ. ڕەنگە داهێنان لەیەکەم ساتەکانەوە بە کارەوە دیار بێ یاخود لە کۆتاییدا سەرهەڵدا، گرنگ ئەوەیە کە بەرهەمێک بە کۆمەڵێک تایبەتمەندیی و ڕەگەزی جیاوازەوە دروست بێ بێتە بەرهەم.

کاتێک کە بەردەنگی بەرهەمێک دێتە دیتنی بەرهەم، دوو جۆر بینین لێرەدا هەیە، یەکەم: بینینێکی ساویلکانە و سەرسەرەکی، کە لێرەدا دیار نییە، چەندە لەم بەرهەمە چێژ براوە، یان بە چەشنێکی تر کە بینینی دووەمە: ئەمەیان جۆرێک بینینە کە بەردەنگ دەخاتە بیرکردنەوە و تێرامان و بەدواداچوون بە شوێن ڕەگەزە پێکهێنەرەکان و تایبەتمەندیەکانی بەرهەم ڕەنگە بەهۆی کات، یان شوێن، ئەم بەرهەمە تووشی خەسارێکی گەورە بێت و ئەم خەسارەش ئەوکاتە ڕوودەدا کە بەردەنگ، ناتوانی پێوەندییەکی باش بە بەرهەمەوە بگرێ، کەواتە هونەرمەند بۆ ئەوەی کە ڕێگەی پێوەندی بدۆزێتەوە. بە چەشنێکی تر بابەت دەخاتە کارەوە و ئەمەش تەکنیک-ە کە سەرهەڵدەدا.

«تارمایی جەنگ» پێشانگای تایبەتی هونەرمەند ئیسماعیل خەیات-ە کە ماوەیەک لەمەوبەر لە هۆڵی میدیا- گەلەری کوردستان، لە شاری هەولێر کرایەوە. بە پێچەوانەی بەشێکی زۆر لەو پێشانگایانەی کە لەم گەلەری-ەو گەلەرییەکانی تری کوردستان بەڕێوەدەچن، لەودا بەردەنگی ئەم بەرهەمە تووشی تابلۆ نەبوو کە بەدیواری گەلەری-ەوە هەڵواسرابێ، بینەری بەرهەم دەبوایە لەبەر دەرکی گەلەری کەوشەکانی دانێ و دواتر بچێتە ناو گەلەری و چاوی بە بەرهەم بکەوێ.

ئیسماعیل خەیات بەکارێکی قەبارە گەورە، کە تایبەتمەندییەکانی شێوازی ئەبستراکت و ئێکسپریسیونیزم-ی تێدا گونجا بوو. تارمایی جەنگی نیشاندا.

ئەم بەرهەمە کارێکی جیاواز لە تابلۆ، یا بە جۆرێکی تر دژە تابلۆ بووە. کاتێک کە بەرهەمێکی پێشاندا، لەناو گەلەریدا سنوورەکانی تابلۆ، دەبەزێنێ، بەر لەوەی کە هەڵگری هەر چەشنە بابەتێک بێ، یان لەلایەنی



ئیستاتیکا، بارست خێرایی هێڵ-ەوە ڕاڤە بکرێ. لە یەکەم حاڵەتدا بەردەنگی بەرهەم تووشی تێڕامان و تێفکرین دەبێ کە هەر ئەمەش لەبەرهەمی تارمایی جەنگدا ڕووی دا، بەردەنگی ئەم بەرهەمە لەیەکەم حاڵەتادا هەستی بە جیاوازی ئەم بەرهەمە لەگەڵ زۆریەک لە بەرهەمەکانی تردا دەکرد و هەر لەوێوە دەچۆ ناو هەناوی بەرهەمەوە و پێوەندی لەگەڵدا دەگرت.

دوو ڕەگەزی ئەم بەرهەمە (ڕەنگ و هێڵ) تایبەتمەندییەکی جیاوازتر و باشتریان بەخۆوە گرتبوو بە چەشنێک کە خێرایی لە هێڵدا و تارمایی لە ڕەنگدا و لە بەشێکی تریشدا سپیایی و کاڵی ڕەنگەکان ڕۆڵێکی تایبەتیان بوو بە گشتی هەر ئەم دوو ڕەگەزە پێکهێنەرە، کاریگەرییەکی زۆر باشیان بەسەر ئەو هەمووە بوو.

دیارە ڕەنگ بۆ کاری شێوەکاری نامۆ نییە، بەڵام لێرەدا بەپێی هەست و بابەت و کەرەسە تەکنیک دێتە کارەوە و بابەت و بەرهەمی هونەری بەهێز دەکا.

دوو ڕەنگی ڕەش و سوور ڕەگەزێکی تایبەت و بەرچاوی «تارمایی جەنگ» بوون ئەم دوو ڕەنگە یارمەتییێکی زۆری هونەرمەندیان دا بۆ گەیاندنی بابەتی بەرهەم و بۆ ڕەنگاویکردنی پانتایی و وێناکردنێکی زۆر بەکار برابوون. دیارە ئەم بەرهەمە بەگشتی، وێناکردن و گەیاندنی، کارەساتی شەڕ بوو و بەتایبەت وێرانی و زیانەکانی دوای شەڕ و کاولکارییەکانی بوو. هونەرمەند بە کەڵک ودرگرتن لەم دوو ڕدنگە و بەم شێود بەرچاود، بە گشتی مەبەستی نیشاندانی ناخۆشی و قورسایی زیاتری کاردساتی شەڕبوو بەتایبەت شەڕی ناوخۆ و دواتر جەخت خستنە سەر ئەنفال و کاردساتی هەڵەبجە لەسەر ڕووبەری ئەم بەرهەمە لەگەڵ ئەودی کە ب بەتە ڕدنگیەکان خۆیان هەڵگرو پێناسەیەکی تایبەتیان پێوە دیارە، هونەرمەند بە کەڵکوەرگرتن. لە ڕەنگی سەوز، بەشێکی تر لە بابەتە ڕەنگیەکان وێنا دەکا و لەویشدا هارمۆنێکی تایبەت دەداتەوە سەر بەرهەم و مانایەکی تایبەتتر بۆ ئەم دوو ڕەنگە تەواوکەرە (سوور- سەوز) سازدەکات ڕەنگی سەوز چ وەک فۆرم، یان جیاواز لە فۆرم هاتبێ، بە چەشنێک کەوتۆتە سەر ڕووبەری بەرهەم، کە بە ڕەنگی ڕەش و سوور زۆر تایبەت دەوری گێڕاوە و حاڵەتە ئێکسپرێسیونیزم-ی بەرهەمی زیاتر زەق کردۆتەوە ئەمەش پێوەندییێکی تەواوی بە دەروونی هونەرمەندەوە هەیە و ئەم ڕەنگە سەوزە بەم تایبەتمەندییەوە، تەنیا پێناسەکردنێکی ڕاستگۆیانەیە بەرامبەر بوونەوەرەکان لە کاتی شەڕدا. لەلایەکی ترەوە ڕەنگی سپی و خۆڵەمێشی بەکاربراوە، کە ئەمەش بەشێکە لە خەڵووزەکانی دوای شەڕ و دواتریش ئەگەر هەموو ڕەنگەکانی سەر پالێت لێک دەین و تێکەڵیان کەین، خۆڵەمێشی دەردێن و ئەمەش لە پانتاییەکی تایبەتدا لە ناوەندی بەرهەمدا نیشان درابوو. ڕەنگێکی تر کە ئەوپەڕی بێ ڕەنگی و بێ دەنگی و بێ دەسەڵاتی بوونەوەر و مرۆڤەکانی نیشان دەدا بەکارهێنرابوو کە تەنانەت سروشتی بێ گیانیشی گرتبۆوە و وێناکردنێکی جیاواز و هەستی تایبەتی بە بینەر دەدا. کە ئەم ڕەنگە سپی بوو.

ماسیەکانی ئیسماعیل خەیات، هەتا ڕادەی مرۆڤەکانی ئەو بێ دەسەڵاتن. لێرەدا دەردەکەوێ کە هەموو فۆرم-ە بەکارهاتووەکان بێ دەسەڵاتێکی سەیر و سەمەرەیان پێوە دیارە و هەموو ئەمانەشی بە ڕەگەزە تایبەتەکان نیشان داوە.

لەو بەرهەمەدا دوو جۆر هێڵ بەکاربراوە، یەکەم: تایبەت بە فۆرم-ە کە لەودا هێڵەکان لاوازتر بوون و چ وەک فۆرم، یان دژە فۆرم کەوتوونەتە ناو بێ دەسەڵاتییێکی بەرچاو. دووەم: ئەو هێڵەی کە بە تەواوی سەڵت بۆتەوە و زۆرینەی هێڵەکان لە پانتاییە بەربڵاوەکاندا نیشان دراون، کە بەشێکی زۆریان بەهێڵێکی ڕاست و چەپ، بەسەریەکتردا کێشراون، یان بە چەشنێکی تر زیاتر سەڵت بوونی خۆیان دەسەلمێنن، بەڵام هێڵی دووەمیان بەهێزی و ئەستوورایيەکی زیاتر و بەرچاوتری پێوە دیارە هەتا هێڵی یەکەم. لە لایەکی ترەوە هێڵ خێراییەکی تایبەت بە بەرهەمەکەیان بەخۆوە گرتووە. بەشێک لەم هێڵانە، چ ئەوانەی تەنیا وەک هێڵ بەکارهاتوون و چ ئەمانەی کە نیشاندەری فۆرمە سەڵتەکانن، بەگشتی خێراییەکی بەرچاو و تایبەتیان





پێوه دیاره و ئەمەش هاوتەریب بۆتەوە لەگەڵ جۆری بەکارهێنانی ڕەنگ و لێرەدا دەردەکەوێ کە هونەرمەند دەسەڵاتێکی باشی بەسەر بەرهەمدا هەیە و بەگشتی تایبەتمەندییەکانی لەبەرچاو گرتووە.

هونەرمەند بۆ ئەوەی کە گیانێکی تایبەتتر و زیندووتر بە بەرهەم ببەخشێ، بەرهەم ڕاستەوخۆ جێپەنجە و شوێنپێی مرۆڤی پێوە دیاربوو ئەمەش زۆرینەیان بە ڕەنگی سوور نیشان درابوون.

بە گشتی بۆ ئەم بەرهەمە لە قووماش کەڵک وەرنەگیرابوو، بەڵکو هونەرمەند لە پاشماوەی کاغەزی چاپخانەکان کەڵکی وەرگرتبوو، دیارە کاغەزەکان قەبارەیان بچووک بوو، بەڵام بۆ سازدانی ئەم بەرهەمە هونەرمەند هەموو کاغەزەکانی پێکەوە چەسپاندبوو و دواتر لە گەلەریدا ڕای خستبوون و سەرجەم ڕەنگەکانیشی ڕەنگی پلاستیکی بوون کە بە ئاو دەگیرانەوە.

لە سووچێکی گەلەری-یەوە چەند تابلۆیەک هەر بەم چەشنە بەو بابەتەوە لەسەر بەرهەمە گەورەکە دانرابوون و لەسەر چەند بەشێکی بەرهەمەکە هەروەها لەتە کارتۆنی دڕاو دەدۆزرایەوە کە بەگشتی وێناکردنی هەر ئەم بابەتەی پێشوو بوون. ئەمە بەشێکی گرنگ و بەرچاوی بەرهەمی تارمایی جەنگ بوو. کاتێ کە بەردەنگ بەسەر کارە گەورەکەدا تێدەپەڕێ لەنەکاودا تووشی ئەم لەتە کارتۆنانە دەبوون کە لەسێ، یان چوار دانە تێنەدەپەڕی و دواتریش چاوی بەتابلۆکان دەکەوت کە وەکو مردوویەکی شەڕ لەگەلەریدا ڕاکێشرابوون، کە لێرەشدا بینەر هەر ئەو بابەتەی پێشووی بۆ وێنا دەکرا و شتێکی جیاوازتری لەمەی پێشوو نەدەهاتە بەرچاو. دیسان ئەمە خۆی لێرەدا بەشێکی بەرچاو بوو و هەروەها کاریگەری بۆ وروژاندنی جیاوازیەکان و دۆزینەوەیان لە زەینی بینەردا و لێرەدا بینەر بە شوێن جیاوازیەکاندا دەگەڕاو کە ئەمەش خۆی تایبەتمەندیێکی تربوو، بۆیە دواتر بەردەنگی بەرهەم لە دوای تێڕامان و تێفکرینی خۆی جۆرێک لە جیاوازیەکانی بۆ وێنا دەکرا و کە هەر بەو بابەت و فۆرم و ڕەنگ و کەرەستەیە بوون.

ئەگەر بەردەنگێکی ئەم بەرهەمە پرسیار لەخۆی بکات کە ئیسماعیل خەیات مەبەستی لە کارە قەبارە گەورەکە و تابلۆ و لەتە کارتۆنەکان چییە؟ کە هەموویان بەگشتی هەڵگری بابەتێکی تایبەتن؟ بۆ بابەتی بەرهەم تەنانەت بە چەشنێکی جیاواز نیشانی بینەر دەدا؟ ئایا ئەمە ڕەوتی تەواوکەری کارەکەیەتی؟ لەلایەکی تریشەوە، مۆسیقای تایبەتی بەرهەم هەڵنەبژێردرابوو، بەرهەمی ئیسماعیل خەیات ماوەی چەند ڕۆژ لە گەلەری کوردستان بەبێ مۆسیقا بەڕێوەچوو.

بەگشتی جیاوازیەکان لە ڕووی فۆرمەوە هەڵگری بابەتێکی تایبەت بوون، بە هەموو بوونەوەر و سروشتە بێ گیانەکانی-وە پڕپڕ بوو لە بێ دەنگی و لە چەند بەشێکی ئەم بەرهەمەدا کاتێک کە بینەر چاوی بە نووسینەکان دەکەوت کە وەک چەند دێڕ هاتبوون، دەکەوتە ناو بیرکردنەوە و کارەساتەکەی زیاتر بۆ وێنا دەکرا.

بەگشتی ڕەگەز و پێکهاتە و هەست و تەکنیک، کەوتبوونە وێناکردنی بابەتێک کە هونەرمەند بۆ هەرچی دڵتەزین کردنی کارەساتی شەڕ، کەڵکی لێوەرگرتبوون و وێناکردنێکی بەهێزی بۆ بەردەنگەکانی جێ هێشت.

# فۆتۆگرافی دیجیتاڵی

فارس سەعدی

(٢ - ٢)

## مێژوو لەگەڵ کات

زۆربەی کامیراکان توانای ئەوەیان هەیە بە هەوەسی خۆت کات و مێژوو دانێیتەوە، بۆ هەر گرتەیەک بواری ئەوەت هەیە، یا کات (واتە کاتی بەیانیان، یا ئێواران لەسەر گرتەکە نیشان بدرێت)، یا مێژوو و رۆژەکە بە چەند شێوازێک (رۆژ، مانگ، ساڵ)، یان (ساڵ، مانگ، رۆژ)، یا (ساڵ، رۆژ، مانگ) لە لا تەنیشتێکی وێنەکە دەردەچێت، لەو کاتەی پیل (پاتری) دەخەیتە سەر کامیراکەت، کات و مێژوو کۆنترۆڵ دەکەی و دایدەنێیتەوە، ئیتر بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی رۆژانە خۆی دەگۆرێ، پێویست بە گۆڕین و دانانەوە ناکات.

بەهۆی دوگمەی (SET UP)ەوە دەچیتە سەر چەند خەیاراتێک، یەکێک لەوانە (DATE/ TIME)ە، بەهۆی پەپکی کۆنترۆڵ کردنەوە (OK)ی دادەگری دوو خەیاراتت لەبەردەم دەبێت (DATE) و (OFF)، ئەگەر یەکەمت داگرت ئەوە (OK)ی دادەگری، مانای ئەوەیە کامیرا بۆ گشت گرتەکانت مێژوویان لەسەر تۆمار دەکات، بەڵام ئەگەر خەیاری (OFF)ت داگرت، ئەوە وێنەکان بە بێ مێژوو لەسەریان دەردەچن.

## پرۆگرامی SCN

زۆربەی کامیراکان ئەم خەیارە لەسەر پەپکی شەتەر و (SET UP) هەیە، ئەمە چەندین پرۆگرامی جیا جیا لەخۆی دەگرێ، هەر حاڵەتەی بۆ زروفێکی جیاواز بەکاردەهێنرێ، بێ ئەوەی بیر لە گۆڕینی خێرایی داخەر و کونی هاوێنە بکەیتەوە، یەکێک لەو حاڵەتانە لە پرۆگرامەکە (هێمای ژمارە ١) مانگێک دەردەکەوێ، ئەمە وەک خێرایی (B) لە کامیرای ئەنەلۆگ بەکاردەهێنرێ و بۆ وێنەی شەوانە و گڵۆپ و رووناکی دەستکرد، واتە خێرایی شەتەر زۆر سست دەبێت و درێژ دەبێتەوە ماوەکەی، بۆیە رووناکی گڵۆپ وەک هێڵە رووناکی دەردەکەوێ ئەگەر لە جووڵەدا بێت، وەک لایتی ئۆتۆمبیلەکان لە کاتی رۆیشتنیاندا. هەمان هێما لەتەک هێمای پۆرترێت (هێمای ژمارە ٢) ئەم هێمایە پرۆگرامێکە بەکاردەهێنرێ بۆ وێنەگرتنی پۆرترێت لە کاتی خۆرئاوابووندا بە مەرجێک فلاشی لەگەڵدا بەکاردێت، واتە بابەتەکەت جوان و رێک دەردەچێت. لە هەمان کاتدا باکگراوندەکەشی رووناک و جوان دەردەچێت، لە جیاتی ئەوەی رەش و تۆخ دەربچێت، بەڵام لێرەدا لەبەر ئەوەی خێرایی شەتەر زۆر کەم دەبێتەوە، پێویستە بەو کەسە بڵێی کە وەستاوە بۆ وێنەگرتن، نە جووڵێتەوە لە کاتی وێنەگرتنەکەدا تا ماوەی چەند چرکەیەک، دەنا وێنەکەی لێڵ دەردەچێت.

(هێمای ژمارە ٣) ئەمە کامیرا بە شێوەیەکی وا پرۆگرام کراوە ئەولەویەت دەداتە کونی هاوێنە، واتە بچووکترین کونی هاوێنە دەستنیشان دەکات بۆ وێنەگرتن و لە پاڵ ئەوەدا بە گوێرەی ئەو کونە بچووکەی هاوێنە




خێرایی داخەر (شەتەر) دادەنرێتەوە. ئەمە بۆ ئەوەیە تا قوولترین مەیدانت بۆ قوولی مەیدان دەست بکەوێ، واتە نزیکترین شت لە کامیراوە تا دەگاتە دوورترین شت بە جوانی و ڕێکی دەرکەون لە وێنەکەدا. ئەم پرۆگرامە زیاتر بۆ وێنەگرتنی دیمەنی سروشتی بەکاردەهێنرێ.

(هێمای ژمارە ٤) ئەم پرۆگرامە بۆ وێنەگرتنی پۆرتریتی بەکاردەهێنرێ، لەم حاڵەتەدا کامیرا وا دەکات باکگراوندەکەی لێڵ دەرچێت و تەنیا بابەتی سەرەکی ڕێک دەرچێت.

## ڕەشکردنەوەی وێنە DELETE

کامیرای دیجیتاڵی ئەوەی باشە، هەر وێنەیەک کە دەگری، دەتوانی یەکسەر تەماشای بکەیت و بزانیت ئاخۆ بە دڵتە یا نا، خۆ ئەگەر ڕات لێی نەبوو بەهۆی دوگمەیەکەوە، یان MENU دەخەیتە سەر خەیاری DELETE ئەوە وێنەکەت ئامادە دەکات بۆ کوژاندنەوە، دوو خەیارت لەبەردەم دادەنێ بۆ ئەوەی بزانی ئاخۆ دڵنیای لەوەی دەتەوێ وێنە دیاریکراوەکە دەکوژێنیتەوە، خەیارەکان (OK) ئەگەر دابگری ئەوە وێنەکە دەکوژێتەوە، خەیاری دووەم (EXIT)ە، ئەگەر ئەمە داگری ئەوە وێنەکە دەمێنێتەوە.

هەندێ وێنەش پرۆتێکت دەکرێن، واتە قفڵ دەدرێن و ناتوانرێ بکوژێنرێنەوە. وێنەکان دەتوانرێ یەک یەک بکوژێنرێنەوە، لەهەمان کاتیشدا بەهۆی دوگمەیەک چەندین وێنە دێنە سەر شاشە، لەم حاڵەتەدا دەتوانی خەیاری (ALL IN FOLDER) دیاری بکەیت، ئینجا (OK) دادەگری، لەم بارەشدا گشت وێنەکانی ناو فۆڵدەرەکەی واتە میمۆرییەکە ڕەش دەبنەوە.

## پرۆگرامی A

دوگمەی کۆنترۆڵ لەسەر ئەم پیتە بێت مانای ئەوەیە کامیرا بواری ئەوەت دەدات تۆ کونی هاوێنە دیاری بکەیت و کامیراش خۆی بەشێوەی ئۆتۆماتیکی خێرایی داخەر (شەتەر) دیاری دەکات، ئەمە سوودی ئەوەی هەیە پێویستیت بە قوولی مەیدانی زۆر هەبێت، واتە کونی بچووک بەکاربهێنی، یا بە پێچەوانەوە بۆ وێنەی پۆرتریتی کونی گەورە بەکاربێنی تا قوولی کەمی مەیدانت دەست بکەوێت.

## پرۆگرامی S

ئەم پرۆگرامە بواری ئەوەت دەدات تۆ خێرایی داخەر (شەتەر) دیاری بکەیت، کامیراش بەشێوەی ئۆتۆماتیکی خۆی کونی هاوێنەی شیاو دیاری دەکات کە بگونجێ لەگەڵ ئەو خێراییەی تۆ دیاریت کردووە. ئەمە سوودی ئەوەی هەیە بۆ بەستانی جووڵە کە بتەوێ خێرایی بەرزی شەتەر بەکاربێنی، یان جاری وا هەیە بۆ وێنەی ئاوی تاڤگە و شەپۆلەکان خێرایی سستی شەتەر بەکاربێت تا ئاوەکە وەک هەور دەرچێت.

## پرۆگرامی M

ئەمە بۆ ئەوەیە خێرایی شەتەر و کونەکانی هاوێنە هەردوو ئامرازەکە لە دەست وێنەگر دەبێت و بەدەست دایان دەنێتەوە و دیاریان دەکات، واتە ئۆتۆماتیک نابن بۆ ئەوەی چۆنت دەوێ ئاوا وێنە بگری.

### ئامرازی فلاش

دوگمەیەک دادەگری ئەگەر ئەم هێمایە (ژمارە ٩) دەرکەوت مانای ئەوەیە کامیرا هەردەم فلاشەکەی لێ دەدات و دەتەقێ، بەڵام هێمای (ژمارە ١٠)، ئەم هێمایە کە دەردەکەوێت مانای ئەوەیە کامیرا فلاشەکە دەکوژێنێتەوە و وێنەکە بەبێ فلاش لێدان ئەنجام دەدات، خۆ ئەگەر هیچ جۆرە هێمایەک دەرنەکەوتن، مانای ئەوەیە فلاش لێدان دەبێتە شتێکی ئۆتۆماتیکی ئیختیاری، واتە ئەگەر ڕووناکی کەم بوو، ئەوە فلاش لێدەدات، بەڵام ڕووناکی زۆر بێت فلاش ناتەقێ.

هەندێ کامیرا جگە لە فلاشی کامیراکە، ئەوە پێگەی فلاشی زیادەکیان بەسەرەوەیە، لێرەدا بۆ وێنەگرتنی هەندێ بابەتی زۆر و فراوان و لە شوێنی زۆر تاریک دەتوانی فلاشی زێدەکی گەورە بخەیتە سەر کامیرا و بەکاربێنی و فلاشی کامیراکە دەکوژێتەوە و ئیش ناکات.

## فۆکەس کردن FOCUSING

هاوێنەی زۆربەی کامیراکان بە دوو شێواز فۆکەس دەکرێن،یان بەدەستی، یان بەشێوەی ئۆتۆماتیکی، کەواتە

لەدەست خۆتە، چونکە هەندێ جار فۆکەس کردنی ئۆتۆماتیکی فەشەل دەهێنێ، ئەگەر بابەتی سەرەکی لەگەڵ باکگراوندەکەی لەیەکتری جیانەکرێنەوە، یان شێوەی دیمەنەکە وەک تۆڕ وابێت، لەگەڵ ڕووناکی کز لە هەندێ شوێندا. لەم حاڵەتانەدا فۆکەس کردنی دەستی کاریگەرە.

### پرۆگرامی Braketing

بۆ هەندێ وێنەی گرنگ، بتەوێ گرتەیەکت دەست بکەوێ ئێکسپۆزەری تەواوی بۆ بکرێت، ئەم شێوازە بەکار دەهێنێ، کامیرا سێ گرتەی یەک لەدوای یەکت بۆ دەگرێت، یەکێکیان بە ئێکسپۆزەری کەمتر، دووەمیان بە ئێکسپۆزەری تەواو، سێیەمیشیان بە ئێکسپۆزەری زیاتر لە پێویست، واتە گرتەیەک ئەندەر ئێکسپۆزەرە، ئەویتریان ئۆڤەر ئێکسپۆزەرە و سێیەمیشیان ئێکسپۆزەری تەواوە. کامەیانت لەو سێ وێنەیە بەدڵ بوو، ئەوە دەهێڵیتەوە و ئەوانی تر ڕەش دەکەیتەوە.

### ڕەنگی وێنەکان

لە هەندێ کامیرا بە چەند شێوازێک وێنەگرتنەکە ئەنجام دەدات، دەتوانی وێنەکان بە ڕەش و سپی، یا ڕەنگاوڕەنگ بگری، یا ڕەنگی سیپیا (کە وەک کاکاوی وایە)، یان ڕەنگی پاستیلی هونەری، یان لە شێوەی وێنەی پۆستەری، جاران بە پرۆگرام لەنێو کۆمپیوتەر ئەم کارانە ئەنجام دەدران، بەڵام ئێستا ڕاستەوخۆ دەتوانی بە کامیراکە ئەنجامی بدەی.

### کۆنترۆڵ کردنی سپی WHT- BAL

وەک کامیرای ڤیدیۆ چۆن بەر لە وێنەگرتن دەبێ وایت بەلانس ئەنجام بدەی، ئینجا دەست بکەی بە وێنەگرتن. لە کامیرای دیجیتاڵیش هەمان کردار ئەنجام دەدەیت، ئەگینا وێنەکانت ڕەنگیان نەشاز دەردەچێت. بۆ ئەم مەبەستە چەند خەیاراتێک لەبەردەم وێنەگرە، یەکەمیان وایت بەلانسی ئۆتۆماتیکی، ئەمەیان زۆر باشە ئەگەر وێنە لەبەر ڕۆشنایی تێکەڵەی ڕووناکی جۆراوجۆر بگری، وێنەکان زۆر سروشتی دەردەچن.

هەندێ هێمای تر هەن وەک وێنەی ڕۆژ (هێمای ژمارە ٥)، یان گڵۆپی تەنگستن (هێمای ژمارە ٦) یان نیۆنی فلورسنت، (هێمای ژمارە ٧) یان هەور، (هێمای ژمارە ٨)، ئەمانە هەر یەکەیان بۆ حاڵەتێکی جیا بەکار دەهێنرێن بۆ پلەی گەرمی ڕووناکی دیاریکراو، گەرمی ڕووناکیش بە کلڤن دەپیورێ، لێرەدا ئەگەر ئەو کردارە بە جوانی ئەنجام بدەی پێویستیت بە بەکارهێنانی فلتەرات نابێت وەک لە وێنەگرتنی ئاسایی بەکاری دەهێنی، واتە وێنەگرتنی ئەنەلۆگ یا کلاسیکی.

ماوەتەوە بڵێین کەوا بە کامیرای دیجیتاڵی لەگەڵ هەر گرتەیەکی ستیل دەتوانرێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەنگیشی لەگەڵ تۆمار بکرێت، لەگەڵ هەندێ گرتە ماوەی (٨) چرکە دەنگیشی لەگەڵدا تۆمار دەکرێت. هەروەها دەتوانرێ وەک کامیرای ڤیدیۆش وێنەی بەردەوامی پێ بگیرێت، بەڵام دیقەتیان کەمە.

ئەم کامیرانە فیلمیان تێدا نییە و لەگەڵیاندا بەکارنایەت، بەڵکو بیرخەرەوەیان هەیە، وێنەیان لەسەر تۆمار دەکرێت، هەندێکیان لە شێوەی فلاش کارتە، هەندێکی تر پێیان دەڵێن میمۆری ستیک، هەندێ ناوی تریشیان هەیە، چەندێ فراوانی ئەو میمۆریانە فراوانتر بێت، هێندە دەتوانرێ وێنەی زیاتریان لەسەر تۆمار بکرێت، بەڵام چەندی ئەو میمۆریانە فراوانتر بن نرخەکانیان گرانترە.

دوای ئەوەی ئەو میمۆریانە پڕ دەبن، وێنەکان بەتاڵ دەکرێنە سەر کۆمپیوتەر یان (CD)، ئینجا وێنەکان دەکوژێنرێنەوە، یان ڕەش دەکرێنەوە، پاشان سەرلەنوێ وێنەی نوێی لەسەر تۆمار دەکرێتەوە، واتە هیچ کاتێک پێویستیت بە فیلمی کلاسیکی نابێت.


هێمای ژمارە (١)


هێمای ژمارە (٢)


هێمای ژمارە (٣)


هێمای ژمارە (٤)


هێمای ژمارە (٥)


هێمای ژمارە (٦)


هێمای ژمارە (٧)


هێمای ژمارە (٨)


هێمای ژمارە (٩)


هێمای ژمارە (١٠)

# عەرووزی کوردی

لێدوانی: سەلاح عەبدولقادر
(سلێمانی)

لە ئاسمانی سامالی ئەدەبی کوردیدا ناوی ژمارەیەکی زۆر لە شاعیرانی کلاسیکی کوردی وەکو ئەستێرە دەدرەوشێنەوە، کە لەسەر شێوازی زانستی عەرووز شیعری ناسک و بالازراقیان هۆنیوەتەوە و خامەی گەوهەرباریان لە قەسیدە و چامەی پڕ ئەندێشەی قووڵ و لێوانلێو لە خەیاڵی شاعیرانەدا بەکارهێناوە.

دەمێ ساڵە نووسەران و لێکۆڵەرانی ئەدەبی کوردی لەسەر شیعری کلاسیکی کوردی و شێوازی ستوونیی، توێژینەوە و نووسینیان لە دوو توێی کتێب و لە رووپەڕی رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە، بەڵام تا ئێستا- ئەوەندەی ئاگادارین- کتێبێکی سەربەخۆ و تایبەت بە شیعری عەرووز بە زمانی کوردی چاپ نەکراوە، هەتا لەم ماوەیەدا کتێبی (عەرووزی کوردی) دیدەی عاشقان و هەوادارانی شیعری کلاسیکی کوردی رۆشن کردەوە و کەلێنێکی بەرینی لە کتێبخانەی فەرهەنگیی کوردی پڕکردەوە. کتێبی (عەرووزی کوردی) لە نووسینی مامۆستا (نووری فارس حەمە خان)ە و دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی (ئاراس) لە چوارچێوەی (٤٤٠) لاپەرەدا چاپی کردووە.

مامۆستا نووری سەرەتا دوو رێنمایی کورتی ئاراستەی شاعیرانی کورد کردووە و ئاگاداری کردوونەتەوە کە (گرنگ ئەوە نییە کە عەرووز بزانیت، گرنگ ئەوەیە کە بزانی چۆن عەرووز لە شیعری کوردیدا پیادە دەکرێ).

پاشان نووسەر لە (ل٦)دا لەژێر سەردێری (تێبینیەک)دا چەند تێبینی و سەرنج و راوبۆچوونێکی خۆی لەسەر بابەتەکە خستۆتەڕوو.

هەروەها نووسەر بەناونیشانی (عەرووزی کوردی) و لە توێی (١٠) خاڵدا گرنگی و بایەخی ئەم زانستەی دەستنیشان کردووە.

دواتر مامۆستا نووری دێتە سەر ناوەرۆکی کتێبەکەی و لە بەراییدا ئاماژە بە (ناچارییەکانی شیعر) دەکات و بەسەر «٣» جۆردا دابەشی کردووە کە بریتیین لە (١- لێپترکردن، ٢- لێکەمکردن، ٣- گۆڕانکاری تر) و بۆ هەریەک لەم جۆرانەش بە شیعری کوردی و عەرەبی نموونەی هێناوەتەوە و بە وردی و بەشێوەیەکی فراوان لەسەریان دواوە.

نووسەر لە درێژەی باسی زانستەکەدا هێمای بۆ بابەتی (رێساکانی ئێست و جۆرەکانی) کردووە و لە (١٥) خاڵدا باسەکەی گەلاڵە کردووە.

پاشان لە (نووسینی عەرووزی)دا نووسەر دەنووسێت: (نووسینی عەرووزی جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ نووسینی ئاسایی)ل٦٨، لەو رووەوە مامۆستا نووری دوو یاسای بە بنچینەی نووسینی عەرووزی داناوە و لە درێژەی ئەو



بەشـەدا لەسـەر ئەو گـۆشـەیەی کـتـێـبـەکـە بە چڕوپڕی توێژینەوەی کردووە.

جـێی ئـامـاژەیە نـووسـەر چەردەیەک لەسـەر عـەرووز گفتوگۆی کردووە و پێناسەیەکی بۆ ئەو زانستە شیعرییە داناوە و سوود و بایەخی عەرووزی دیاری کردووە... هەر لە ناواخنی ئەم کـتـێـبـەدا باسـەکـانی (شـیـعـر چـیـیـە؟، جۆرەکـانی شـیـعـر، بڕگـە عـەرووزییـەکـان) پانتـایی بابەتەکەیان گرتووە و لەمـیـانەی بڕگـە عەرووزییـەکاندا هەندێ جار بەراورد لەنێوان بڕگەی عەرووزی عەرەبی و بڕگەی کوردیدا کراوە، کە نووسەر بڕگەی کوردی بە دوو جـۆری سـەرەکی دابەش کـردووە و بۆ هەر جـۆرێکیـان نموونەی لە شـیـعـری شـاعـیـرە ناودارەکـانی کـورد هێناوەتەوە، شـایانی باسە لە کێشی پەنجەدا نووسەر بە وێنەی زیندوو و نموونەی شیعریی باسەکەی پرشنگدارتر کردووە.

هەروەها بۆ تیشک خستنە سەر بابەتەکە بەشێوەیەکی فـراوانتـر نووری فـارس لە (بڕگـەی عـەرەبی، بڕگـەی عەرووزی)دا بە قوولی چووەتە ناو کرۆکی زانستەکەوە و بیروهۆشی خوێنەری بۆ لای عەرووز جلەوکێش کردووە.

دواتر نووسەر بە وردی کێشی بڕگەیی ڕوون دەکاتەوە و کـێـشی دە بڕگـەیی، یا دە پەنجـەیی وەک نموونەیەکی بەرجەسـتـە دەخـاتە پێش چاو و لەچەند خـاڵێکدا و لە چوارچێـوەی دوو خـشـتـەی تەرخـانکراو بۆ نیـوە دێڕی یەکەم= صەدر و نیوە دێڕی یەکەم= عەجز خوێنەران بەو بابەتە ئاشنا دەکات. ل٩٠.

ئاشکرایە لای شەیدایانی شیعری کلاسیکی کوردی کە شاعیرانی ئەو قوتابخانە شیعرییە لە بۆنەی کۆچی دوایی و لەدایکبوون و ڕووداوە شیرین و غـەمگینەکانی گەلی کـورددا و لە هەناوی شـیـعـری بۆنەسـازیدا، سـاڵی ڕووداوەکـانیـان بە پیـتـەکـانی ئەبجـەد دەرهێناوە و هونەرمـەندانە سـاڵەکـەیان دیاری کـردووە، کـە دیارە (بێـخـود)ی شـاعـیری ناودار لەو بوارەدا سەر دەسـتـەی شاعـیران بووە، لەو ڕووەوە نووسەر گۆشەیەکی بە نرخی کتێبەکەی بۆ ئەو ڕەهەندە پێویستەی شیعری کلاسیکی تەرخان کردووە و بەخشـتـەی سەرنجڕاکێش ئەو بوارەی ڕوون کردۆتەوە... لەو میـانەیەشدا بە نموونەی شیعریی دڵگیـر و بەپێی (٢٨) پیـتـەکـەی زمـانی عـەرەبی و بە زانیـاری و ڕیزبەندییـەکی وردەوە، باسـێکی چڕوپڕ و پڕ مـاندوێتی لەسەر گشت پیتە عـەرەبییـەکـان کردووە و نموونەی زۆری لە شـیـعـری کـوردی و عـەرەبی وەرگـرتووە، کە بە ڕاستی زۆربەی کـتـێـبەکەی گرتۆتەوە و پێویستـە بەشێـوەیەکی ئەکادیمیـانە لێکۆڵەران شـیعـری کلاسیکی کوردی لایەنە پۆزەتیف و نێگەتیفەکانی هەڵسەنگێنن و ڕووە چاک و خراپەکانی بخەنە ڕوو.

دواجـار نووسـەر پوخـتـەیەکی لە زانسـتی عـەرووزی دانراوی خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی نووسیوە و لە بەهرە شـیـعـرییـەکـان و لق و پۆپی زانسـتـەکە دواوە، کە وردەکاری و شەونخوونی بە بابەتەکەوە دیارە، جگە لەوە نووری فـارس سەبارەت بە شـیـعـری کێـشی بڕگـە لە دوا وێستگەی کتێبەکەیدا کورتەیەکی پوختی نووسیوە و بە ژمارە کێشەکانی دەستنیشان کردووە.

کـۆتا وشـەم لەسـەر کـتـێـبی (عـەرووزی کـوردی) دوو خاڵە:

١- مـامـۆسـتـا نووری ڕەنج و هەوڵ و مـاندووبوونێکی فرەی لەگەڵ ئەم کـتـێبە کێشاوە و وردەکاری و جوانکاریی شیعریی ئاوێتە کردووە لە شایانی ڕێزلێنان و نرخاندنە، بەڵام تێـبـینیـیـەک لە لام دروسـتـبـووبێ ئەوەیە کـە لەسەرەتای کتێبەکەدا نموونەی شـیعری عـەرەبی زیاتر لە شیعری کوردی بەرچاو دەکەوێت، بێگومان دەگونجا نموونە کوردییەکان زۆرترین، کە لە گۆشەکانی تری کـتێبەکەدا ئەو حـاڵەتە بە فـراوانی دەبینرێ و دیارە بۆ کـەسـێکی بەتوانا و شـارەزای وەک مـامـۆسـتـا نووریش کـارێکی ئاسانە.

٢- هیوادارم پسپۆران و ڕەخنەگرانی شیعری کوردی بە دڵسـۆزی و پەرۆشـیـیـەوە سەرنج لەم کـتـێبـە بدەن و بە شێـوازی زانسـتیـیانە تێبینی و تێڕوانین و ڕاوبۆچوونی خۆیان بخەنە ڕوو و بێ لایەنانە کـتێبەکە هەڵسـەنگێنن، تا ئەگەر- کـتـێـبەکە بەپێوەری زانسـتی شـایسـتـە بوو- بخـرێتـە ناو ڕیزبەندی پرۆگـرامـەکـانی خـوێندن لە قۆناغەکانی ئامادەیی یا زانکۆ لە کوردستاندا.

# فەرهەنگی ناوی کوردی

لێدوانی:
عەباس سلێمان سمایل

فەرهەنگی ناوی کوردی کتێبێکی قەوارە گچکەی (١١٤) لاپەڕەیە، لەلایەن سیروان کاروانی لە وڵاتی سوید بەرگی سێیەمی لە ساڵی (٢٠٠٢) چاپ و بڵاوکرایەوە، لەم ڕۆژانەش (٨) هەشت دانەی بەدیاری بۆ کتێبخانەی گشتی هەولێر ڕەوان کردووەو ئەم بەرگەشی دوابەرگی فەرهەنگەکەیەتی، دیارە بەم زووانەش بەنیازە هەرسێ بەرگ لە یەک بەرگ بڵاوبکاتەوە، هەڵبەت ئەوەش جێگای ڕێزو سوپاسەو دەستخۆشی لێ دەکەین لەم بەرهەمەی.

**پێشەکی:**

گەلانی پێشکەوتوو بەدەیان فەرهەنگی ناو و لێکۆڵینەوەیان لگۆر ناوی مرۆڤ چاپ و بڵاو کردۆتەوە، کەچی گەلی کورد خاوەن کلتوورێکی لەبن نەهاتووە بێجگە لە هەزاران ناوی جوگرافی لە ناوی کانی، چیا، نەهال و ڕووبار، هەروەها خاوەنی هەزاران جۆر گوڵ و گژوگیاو دارودرەختە... خاوەنی فەرهەنگێکە زیاتر لە (١٥٠) هەزار وشەی هەیە، تەنانەت زۆر وشەی لە (١٠٠) هاوواتای زیاتری هەیە وەک: فرمێسک: ئەشک، ئەسرین، ڕۆنی، ڕۆندک، ئاڤۆ، نمی دیدە، هێسر، گلۆرک...

هەر نەتەوەیەکیش ناوی شیاو بۆ ناولێنانی منداڵان لە فەرهەنگەکەی هەڵدەهێنجێت، چونکە ناوی منداڵان زۆر هەستیارە، دەبێ مرۆڤ هەموو حیسابێک و لێکدانەوەیەکی بۆ بکات، لە سووکی ناوەکە، واتاکەی، پیتەکانی، ڕەسەنایەتی، خۆشی و ناخۆشی لەسەر زمان و پێوەندی بەداب و نەریتی گەلەکەی.. چونکە ناوی مرۆڤ زۆرجار لە هاوسەرەکەشی تەمەنی درێژترە و هەمیشە یاوەریەتی.. دیارە ڕۆشنبیرانی کوردیش ڕۆڵی خۆیان بینیوە لەم بوارەو چەند فەرهەنگێکی تایبەت بەناوی منداڵانی کوردیان بڵاوکردۆتەوە، بەڵام بەداخەوە هەندێکیان حیسابێکی وردی ئەوتۆیان بۆ ناوی منداڵان نەکردووە لە شیاوی و نەشیاوی، یەک لەم فەرهەنگانە (فەرهەنگی ناوی کوردی) لە دانانی سیروان کاروانی.

ئەم کتێبە زۆر ناوی جوگرافی نەشیاوی کردۆتە ناوی منداڵان، هەروەها ژمارەیەک لە ناوەکانی عەرەبین، زۆر ناویش واتای گەشبینی تێدا نییەو زۆر ناویشی بە تەواوی لێک نەدایتەوە، جا بۆ ئەوەی دایک و باوکان ئاگاداری ئەم ناوانە بن و لە واتاکانیان تێبگەن نەوەک ناوی منداڵەکانیان پێ ناودێر بکەن و لە ئایندە ببێتە گرفت بۆ منداڵەکانیان، بەپێویستمان زانی واتای هەندێک لەم ناوە نەشیاوانە ڕوون بکەینەوە، هیوادارم سوودی خۆی بگەیەنێت.

**(واتای تەواوی هەندێک لە ناوەکان)**

دهێمات: گوندێکە لە دەشتی هەولێر.

دهێ (دێ، گوند) + مات (مەیت، مردوو)= دێی مردووان، دێی مەیتان، کاتی خۆی لە گرانی خەڵکێکی زۆری ئەم گوندە لە برسان دەمرێت و پڕی لە مەیت دەبێت، بۆیە ناوی دێیەکە بە دهێمات دەگۆڕدرێ و دەبێتە دهێمات بە دێی مردوانی، دهێمات.

ئاژگە: ئاژگە گوندێکە

ئاژ (ئاش، ئاسیاو)+ گە (جێگا)= جێگای ئاش.

ئوسڤا: گوندێکە لە ناوچەی شنگار.

ناوی ئەم گوندە لەناوی یوسف هاتووە کە بەزمانی عیبری واتای کۆتر دەگەیەنێت.

ئەرکەواز: گوندێکە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات.

هەروەها هۆزێکە سەربەهۆزی گەورەی کەلهوڕ، لە کوردستانی باشوور لە نێوان خانەقین و مەندەلی نیشتەجێن بەشێکیشیان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات نیشتەجێن.

ئەرخەمە: گوندێکە سەر بە شەرگات.

ئەگەر ئەم گوندە سەر بەشەرگاتیش بێت ئەوا هەموو گوندەکانی شەرگات عەرەب نشینن، مەگەر بە دەگمەن گوند هەبێت (١-٣) ماڵە کوردی تیا نیشتەجێ بێت. دەبوایە نووسەر ناوی گوندەکەشی لێکبدایەوە، هەرچەندە ئەرخە واتای (کۆمەک) دەگەیەنێت.

ئەروا: گیان، ڕوح.

ئەم ناوە کۆی وشەی (ڕۆح)ی عەرەبییە.

ئەستوندە: کۆڵەگە، دینگە.

ئەم وشەیە نابێتە ناو



ئینجە" ناوەڵناوێکی تورکیەو واتای باریک دەگەیەنێت و نابێتە ناو، هەرچەندە لە هەمبانە بۆرینە بەواتای خۆ بەزل زانین هاتووە.

بافستیان: دێیەکە لە باشووری کوردستان.

ڕاستییەکەی باپشتیانەو نزیک دیانە هەڵکەوتووە، دیارە نووسەر ئەم ناوەی لەسەرچاوەی عەرەبی یا فارسی وەرگرتووە، لەبەر ئەوەی لە زمانی عەرەبی پیتی (پ) نییەو دەگۆڕێت بۆ پیتی (ف) وەک پارس = فارس، ئەسپەهان= ئەسفەهان، پەهلەوی= فەیلی فارسیش دەقە عەرەبییەکە بەکار دەهێنێت.

بووب: هەبوایە- نابێتە ناو

بیمارۆک" دێیەکە لە ناوچەی دەربەندیخان، (بیمار) بە زمانی فارسی واتای نەخۆش دەگەیەنێت، (ۆک)یش پاشگرێکی گچکە کراوەیە= نەخۆشۆکەک

پاسار: سواندەی خانوو، نابێتە ناو.

حەستاو حەلاوێ: عەرەبینەو ناشێن بۆ ناو.

خاچێ: وەکو خاچ، نابێتە ناو.

خەمیسی: بریتییە لە مێوژ و گوێز نابێتە ناو، هەروەها ناوێکی باوە لەناو عەرەبان واتای ڕۆژی پێنجشەممە دەگەیەنێت.

خەمسان-یش واتای چیرپوونەوەی زۆر شت دەگەیەنێت بەهۆی تەڕبوونیان بەناو.

خەولە: ناوێکی عەرەبییە

دێرێ: ناوی چەند گوندێکە.

ئەم ناوە واتای پەرستگای دیانان دەگەیەنێت.

زەنتێ: گەلییەکە لە ناوچەی ئاکرێ.

ڕاستییەکەی (زەنتە)یە نەک زەنتێ.

سادا: دێیەکە لەناوچەی عامودێ، لەوانەیە دێیەکیش بێت لەناو نۆمەریان.

دیارە نووسەر ئاگادار نییە یەک لە لووتکەکانی چیای ئاکرێ ناوی سەری (سادا)یەو کەوتۆتە بەرامبەر شارۆچکەی بجیل.

شلکە: شلکەی نەرمەی ڕان.

ڕاستییەکەی هەموو شتێکی نەرم و ناسک کە شلکە بکات پێی دەگوترێت شلکەی دەکات، ئەو شوورکە دارە چەند شلکە، هەژان لەبەر نەرم و ناسکی.

شەماسە: ناوی ژنێکی ناودار بووە لە هەرێمی بتلیس، هەروەها شەمماسە پایەیێکی ئایینی مەسیحییەو نابێتە ناو.

شاکرۆ: ئەم ناوە لە شاکر هاتووە.

ڕاستییەکەی هەندێک لەم (شاکرۆ)یانە شەکرۆیەو لە شەکر هاتووە، لەوانە مێژوونووسی کوردی ئێزدی ئەلەگازی یەریڤان (شەکری حزۆ)، لای ئێمە بە شاکر ناوی دێنن.

عومبەر: (عومەر)، ناوێکی عەرەبییە.

کردکی: شێوەو زاراوەی زازاو دملییە ڕاستییەکەی زازا لەهەر ناوچەیەک بەناوێک ناسراوە وەک زاز، دملی، کردکی، کوردی، کرمانجی.

هەسکا: هۆزێکی کوردی ئێزدی شنگارە.

ڕاستییەکەی هۆزی (هەسکان)ە، ئەم هۆزەش لە ڕۆژئاوای شارۆچکەی شنگال نیشتەجێن.

ئورامار: دێیەکە لە کوردستانی باشوور.

ڕاستییەکەی ئورامار هۆزێکی گەورەیە لە ئوستانی هەکاری لەسەر سنووری کوردستانی عیراق نیشتەجێن بەشێکیشیان لە گوندی بەعویزەی نزیک شاری موسڵ نیشتەجێن و بەزاراوەی شەبەکی قسە دەکەن لەبەر ئەوەی گوندی بەعویزە لەناوچەی شەبەکان هەڵکەوتووە.

ناخەبان: خۆڵەبان، گڵ ڕووکردن لەسەربان، نابێتە ناو.

**تێبینی:** زۆر ناونامەی دیکەش هەیە، نامەوێت ناویان بێنم زۆر لەم کەم و کورتیانەیان تێدایە، هیوادارم دانەرەکان پیای بچنەوەو بژاری بکەن وەک نموونە هەندێک لەم وشانەی کە پێشنیاریان کردووە ببێت بەناوی منداڵان:

هەڤ: هەموو.

ڕاستییەکەی هەڤ واتای پێکەوە دەگەیەنێت.

ب هەڤرا: بەیەکەوە، پێکەوە، ئەوەش نابێتە ناو.

زاگە: هۆزێکە لە دەوروبەری هەولێر،

ڕاستییەکەی زاگە ناوی گوندێکە لە شەمامکێ، لە کۆنەوە بنەماڵەیەکی زەنگەنە لەم گوندە نیشتەجێ بووینەو ئەمڕۆکەش بووەتە کاولگە.

زاگە واتای ئەو زەویە دەگەیەنێت کە مەری لێ زابێت.

دەڵێن بەر لەوەی ئەم شوێنە ببێت بە گوند، چەند جارێک مەری لێ زاوە، بۆیە پێی دەڵێن زاگە، پاشان ئەو گوندەی لەم شوێنە ئاوەدان کراوەتەوە بەناوی زاگە ناسراوە، هەندێکیش دەڵێن ناوی زاگە لە زەنگەنە هاتووە.

ئیتر لێکدانەوەی وشە پسپۆری و شارەزایی دەوێت، مرۆڤ پێویستە وردبین بێت لە شیکردنەوەی وشە. بۆ نموونە لەسەرەتای ئەم مانگە واتە مانگی حەوت یەکێتی نووسەرانی کورد دوو کۆڕی گرێدا کە جێگای ڕێزو سوپاسە، بەڵام بەداخەوە کەسانێک لەو کۆڕانە دەدوان کە پێوەندی بەوانەوە نەبوو، بۆ نموونە برادەرێک وتی تیرەیەک لە بارزان هەیە بەناوی ئیسۆمەرا دوورنییە سۆمەری بن...!!

ڕاستییەکەی ئیسۆمەرا ناوی گوندێکە لە ناوچەی زێبارەتی نزیک گوندی پیرەدکەپردو بنار چیای پیرس لەسەر زێی بادینان، لەساڵی (١٩٧٨) کە مامۆستابووم لە گوندی (ئامادا)ی نزیک گوندی ئیسۆمەرا، چەند جارێک چوومەتە ئەو گوندە کە دانیشتوانەکەی زێبارینە، ناوی گوندەکەش لە عیسکۆمەرا - ئیسکۆمەرا هاتووە، ئیسکو (عیسا) ناوی یەکێکە، مەرا، مەران ناوێکی کۆنە گوندێک هەر لەم ناوچەیە بەناوی (مەران) هەیە.

هەروەها هەمان برادەر لە کۆڕی دواتر لەسەر ناوی مەلایەکی کوردستانی ئێران (یاسین)ی بردوە سەر (یەسنا)ی ئاوێستا.. و ڕۆشنبیرانیش چەپڵەیەکیان بۆ لێدا..

ڕاستییەکەی یاسین لە دوو برگە پێک هاتووە یا (ئامرازی بانگکردنە)+ سین (خوداوەندی مانگی ئاشووری و بابلیەکانە هەندێ جار بە خوداوەندی شەریش ناسراوە کە گەورەترین خوداوەندیان بووە، بەڵام لەبەرئەوەی ئایینی ئیسلام ژێر خانەکەی کلتووری جزیرەیە بۆیە بەسەدان زاراوەی ئایینە کۆنەکان ڕەنگیان داوەتەوە لە ئیسلام وەک عەبد کە جاران واتای بەندەی بتپەرستی دەگەیاند، بەڵام لە ئیسلام واتاکەی بۆ بەندەی خودا گۆڕا، (یاسین)یش هاوارکردن و نزاکردن بوو بۆ خوداوەندی مانگ بەڵام لە ئیسلام بوو بە ناسناو بۆ پێغەمبەر (د.خ)، (نابو)ی خوداوەندی ئەستێرەی گەلاوێژی بابلییەکانیش لە ئایینی ئیسلام بوو بە نەبی: پێغەمبەر جا لەبەر پیرۆزی (نابو) وەک پێشگرێک ڕەنگی لەناوی مرۆڤ دەدایەوە وەک: نەبوخوذ نەسەر، نابو پۆلای سەر، نبو بلاسر، نابو شوما.

# بەرپرسیارێتی نووسین و ڕۆشنبیری

**زیاد ڕەشاد قادر**

هەرچەند ئەمڕۆ ئێمە لەبەردەم دنیایەک نووسینی وتار و ڕادەربڕین و هەڵوێست گرتنی جۆراو جۆرداین کە هەندێکیان کەمترین ئاستی لێپرسراوێتی تێدا مەوجود نییە، بەڵام ئەمە هەرگیز لەماهیەتی ئەو ڕاستییە کەم ناکاتەوە کە هەموو هەڵوێست گرتن و دەنگ هەڵبڕین و نووسینێک پرۆسەیەکە لێوانلێو لە ئەرک و ئەمانەت و مەسئولیەت، هەموو ئەوانەیشی بە جۆرێک لە گوێ پێنەدان و فەرامۆشکردن و بە هەند نەگرتن خۆ لەقەرەی دنیا ڕەنگالەییەکەی نووسین و ڕووناکبیری دەدەن پێش ئەوەی ناپاکی لە خوێنەر بکەن و خیانەت بەرامبەر ئەدەب و ڕۆشنبیری نەتەوەکەیان و مرۆڤایەتی بە گشتی بنوێنن، غەدر لە قەڵەم و ویژدان و هزری خۆیان دەکەن، بەر لەوەی بە زانیارییەکی نا دروست یا بە هەڵە گواستنەوەی ڕستەیەک یا ئاماژە نەدان بەسەرچاوەیەک... بەرامبەر لە خشتەبەرن، خودی خۆیان دەخەڵەتێنن.

قورئانی پیرۆز لەم بارەوە هۆشیاری گرنگ ئاماژە پێدەدا و ئادەمیزاد ئاگادار دەکاتەوە لە بابەت و بوارێک نەئاخڤێ کە زانیاری لەسەر نییە و، پێیدەڵێ کە بەرپرسە لەو شتەی لێی دەدوێ و شوێنی دەکەوێ، وەک دەفەرمووێ (ولا تقف ماليس لک به علم ان السمع والبصر والفؤاد كل اولئک كان عنه مسؤولاً) الاسراء-٣٦.

واتە: (ئەی ئینسان لە شتێک مەدوێ و شوێنی مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بە ڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بەرپرسیارە بەرامبەریەوە)(١). هەر قورئانی پیرۆز کە باس لە مرۆیە سەر ڕاست و نموونەییەکان دەکات ئەوە بەیان دەکا کە بە ناناگایی و کوێرانە بەدوای شت ناکەون (والذين اذا ذكروا بآيات ربهم لم يخروا عليها صماً و عمياناً)الفرقان -٧٣- واتە: [بەندە چاکەکان کاتێ بە ئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاریان بێداربکرێنەوە، هەروا بەکەڕی و کوێری بەلایدا تێناپەڕن، بەڵکو تێدەفکرن و لێکی دەدەنەوە و پاشان پەیڕەوی دەکەن](٢).

هەموو ئەوانەی واخۆ نیشانی خوێنەر و جەماوەر دەدەن کە پێتۆڵ و بلیمەتی بوارەکانی ڕۆشنبیرین و بەساختە خۆبانمان لێ دەکەن بە ئەفلاتوونی سەردەم، یا بۆ هەندێ پایە و بەرژەوەندی شەخسی و دەسکەوتی ماددی ڕووی قەڵەمەکانیان دەگۆڕن، زوو، یا درەنگ ڕووی ڕاستەقینەیان دەردەکەوێ. هەموو ئەو کۆشش و نووسینانەشیان کە ڕەچاوی ئەخلاقی نووسین و بەرپرسێتیان نەکردووە، لە باتی ئەوەی پێی گەورەبن و ببنە خاوەنی شۆرەتێکی باش، بە پێچەوانەوە لەبەرچاوی هەر تاکێکی هۆشیار و خوێنەرێکی بە سەلیقە و ڕاستەقینە تا دوا ئاستی بچووک بوونەوە بچووک و ناوبانگ زڕاو دەبن، ئەو خاوەن قەڵەمەیش ویژدانی مۆڵەتی نادا ناپاکی لەگەڵ وشەو ڕستەدا بکات، یان بێ

دەنگ دەبێ یا هۆشیارانە و بەرپرسانە مامەڵە لەگەڵ نووسین و ڕۆشنبیری دەکات، ئەوا نەک لەبەر نامەسئولەکان ناوی تەڵخ نابێ، بەڵکو لەناو هەموو ئەو ماددە بۆیەکراوانەی جوان خۆ نیشان دەدەن و دوای ماوەیەک ڕووە ڕاستەقینەکەیان دەردەکەوێ، مەعدەنە بێ خەوشەکەی ئەو بە ڕەونەق و پرشنگدارتر دەبێ.

(میرابۆ)ی نووسەر و وتاربێژی دیاری فەرەنسایی (١٧٤٩-١٧٩١)ز ماوەیەک دوای مردنی، کاتێ زانرا لەلایەن (لویسی شازدەیەم)ی پادشای ئەوسای فەرەنسا کڕدراوە و لە مامەڵەکردن لەگەڵ نووسیندا پاک و ڕاستگۆ نەبووە، وەک ناوی چووە نێولیستی نووسەرانی بێ مەبدەئ و چڵکاوخۆر و بوویە قەڵەم بە دەستێکی ناوبانگ خراپ، هەروەها هەر ئەوساکە تەرمەکەی لە (پانتیۆن)ی گۆڕستانی گەورە پیاوان دەرهێنراو لاشەکەی سووتێنرا، پاشتر سووتووەکەیان بردە گۆڕستانی دز و خائین و خۆفرۆشان. کەچی فەیلەسووفی ناوداری یۆنانی سوکرات (٤٧٠-٣٩٩)پ.ز کە تا ئەمڕۆش یەکێکە لە فەیلەسووفە هەرە گەورەکانی دنیا لەگەڵ ئەوەش نەک کتێب، بەڵکو تاقە وتاریکیشی نەنووسیوە.(٣)

نەبوونی بەرپرسیارێتی لەسەر نووسین و ڕادەربڕیندا ئەو دەمە زۆرتر کارەسات خوڵقێنە کە لە ئاخاوتنی خەڵکی ڕەشۆکی و هەڵوێستی عەفەویانەی هەندێجاری جەماوەر دەردەچێ بۆ هەڵوێست و نووسین و لێکۆڵینەوەی نوخبەی ڕۆشنبیری و نووسەران و ڕۆژنامەنووسان، وەک ئەمڕۆ لە زۆر شوێنی جیهان باوە دەبینین جاری وایە ژمارەیەکی بەرچاو لە کەسی ئەکادیمی و ڕۆژنامەنووس و هونەرمەند... وەک نارەزایی دەربڕین دژی دەرچوونی کتێبێک دەرژێنە سەرشەقام، کەچی زۆربەیان ئەو کتێبەیان نەبینیوە و نەخوێندۆتەوە، یان نوخبەیەک بە حەماسەتەوە ستایشی ئایدۆلۆژیایەک، فەلسەفەیەک، ئاراستەیەکی سیاسی.. دەکات ئەمە بێ ئەوەی سەرچاوەی سەرەکییەکانی ئەم ئایدۆلۆژیا، فەلسەفە، ئاراستە سیاسییەی دیبێ و دیراسەکردبێ.

کاتێ خۆی کە نووسەری ڕووسیایی بۆریس پاسترناک (١٨٩٠-١٩٦٠) ڕۆمانی (د. ژیڤاگۆ)ی نووسی، زۆر کەس نەیخوێندبۆوە! کەچی لە دژی دەوەستا و قسەی پێ دەوت و داوای دەکرد پاسترناک لە یەکێتی نووسەرانی ڕووسی دەربکرێ، هەر ئەودەم شاعیری عێراقی (عەبدولوەهاب بەیاتی) کە ئەویش ڕۆمانەکەی نەخوێندبۆوە، لەگەڵ ئەوەش لە شیعرێکیدا نووسیبووی (کەللە سەری د. ژیڤاگۆ دەکەین بە تەپڵەکی جگەرە)(٤). چەند ساڵێکیش پێش ئێستا کە چاپێکی تازەی ڕۆمانی (خوانێک بۆ گژوگیای دەریا)ی (حیدر حیدر) کەوتە بازاڕ، وەک نارەزایی دەربڕین دژی لە چاپدانەوەی ئەم کتێبە جەماوەرێکی دیار لە زانکۆی ئەزهەری میسری خۆ نیشاندانی بەرفراوانیان سازکرد کە زۆربەیان قوتابی و مامۆستای زانکۆ بوون، کەچی بەشی زۆریان ڕۆمانەکەیان نەخوێندبۆوە، هەندێکی تەنیا ناوی بیستبوو، هەندێکی تر چەند لاپەڕەیەکی لە ڕۆمانەکە بۆ خوێنرابوویەوە.

لای خۆشمان کەم نین ئەو خوێندەوار و ڕۆشنبیرانەی لێرەو لەوێ بە ئایینی زەردەشتی دەنازن و دەخوازن پەیڕەوی لێ بکەین کە بەشی هەرە زۆریان نەزانن بە ڕێنمایی و پرەنسیپەکانی ئەم ئایینە، تەنانەت تا ئەم ساڵانەی دوایی جگە لە کتێبێکی شاکر فەتتاح، هیچ نووسراوێک بە کوردی لەسەر زەردەشت و ئاڤێستا چاپ نەکرابوو(٥). بە هەمان شێوە بەشێکی دی داوا دەکەن بۆ نووسینی کوردی ئەلف و بێی لاتینی بەکاربردرێ لەباتی هی عەرەبی کە تێیاندا هەیە بۆ خۆی نەک نازانێ قازانج و ئیجابیات چییە لە بەکاربردنی ئەلف و بێی لاتینی، بەڵکو نازانێ خوێندنەوە و نووسینیش بەو ڕێنووسە ئەنجام بدات.

هەروەها بۆ زۆر بابەت و مەسەلەی تریش بەبێ زانیاری و ئاگالێبوون دەبینرێ کە قسە و ڕاو هەڵوێست دەردەبڕدرێ و دەنووسرێ، وەک لە کوردستان (٨)ی مارسی هەموو ساڵێک کە ڕۆژی جیهانی ئافرەتانە زۆرێک لە ڕێکخراوەکانی ئافرەتان چالاکی و مەراسیم لەم ڕۆژە ئەنجام دەدەن لە کاتێکدا ڕەنگە هەندێکیان کە ئەم یادە دەکەن بە جەژن، نەزانن لەچییەوە هاتووە و لەم ڕۆژەدا چ شتێک ڕووی داوە، یاخود کە دەبینی خەڵکێکی زۆر لەگەڵ هاتنی مانگی نیسان درۆی شاخدار دەکەن بێ ئەوەی بزانن ئەم نەریتی درۆکردنە بۆچی و کەی هاتووە. هەروەها بۆ ڕۆژی خۆشەویستی (ڤالانتاین) و چەند یاد و بۆنەی دیکە بەهەمان شێوە..

د. کەمال مەزهەر باشی پێکاوە کە دەڵێ: (بابان و سۆران و بۆتان بوونەتە ناوی ئەفسانەیی پڕ لە ئازار و شانازی لە زمانی کوردیدا، کەچی تائێستا زۆر بەداخەوە شتێکی ئەوتۆیان دەربارە نازانین)(٦). (ئەحمەد شاکەلی)ش کە ئەم دەردەی بە زەقی لەناو هاوزمان و کۆمەڵگەکەی بینیوە، بۆیە وای لێ کردووە بڵێ: (خەڵکی وامان هەن بە تێپەڕبوونیان بە پەنادیواری کتێبخانەیەکدا بۆ سبەینێ لێت دەبێتە ئەفلاتوون و خۆی

بە عەلی وەردی و سارتەر دەزانێت.. سەمینارت لەمەڕ هەر بابەتێکەوە بۆ خۆی حەزی لێ بێ بۆ دەگرێ..)(٧)

هەمووان باوەڕمان بەوە هەیە کە باش وتن و باش نووسین لە پێشەوەتر و چاکترە لە خراپ وتن و خراپ نووسین (ئەگەرچی لە پرۆسەی نووسیندا خراپ و باش دیاریکردن ئاسان و سادە نییە)، بەڵام لە بواری کردارەکیدا کەم نین ئەوانەی چۆنایەتی دەکەن بە قوربانی چەندایەتی و خەمی گەورەیان دەبێتە ئەوەی ئەم مانگە چەند بابەتیان بڵاوبۆتەوە و ئەوساڵە چەند بەرهەمیان بە چاپ گەیاندووە، خۆنەبانکردن لەوەی دەینووسێ و دەریدەبڕێ و چییە و چۆنە و کێ دەیخوێنێتەوە و خزمەت بەکام بوار دەکات و چەندە کاریگەرە، وەک بڵێی نووسین لەپێناوی نووسینە و زۆرتر ئامانج شوهرەت پەیداکردن و دەسکەوت و دەسخستنی پۆست و پایەی گەورەیە نەوەک داهێنان و ئیزافەکردن و خزمەتکردن و پێشخستن، روونە ئەمەش گەورەترین زەبر لە نووسەر و پرۆژە و بەرهەمەکانی دەدات، پەلەکردن لە بە چاپ گەیاندن و بڵاوکردنەوەی بابەتی بێ حیساب کردن بۆ مەسئولیەتی وشە و نووسین مەسەلەیەکە تابڵێی نەشیاو و بێ ئەرزش، زاهید و زانای ئیسلام شێخ حەسەنی بەصری (٦٤٢-٧٢٨) کە لەکەمی قسەکردنی پرسیاردەکەن، دەڵێ: (من وشە هەڵدەسەنگێنم پێش ئەوەی بیڵێم، ئەگەر زانیم ئەم وشەیە دەچێتە ناو تەرازووی کردارە چاکەکانم، وتوومە، ئەگەر زانیم دەچێتە نێو تەرازووی کردارە خراپەکانم، پشتم تێ کردووە و نەموتووە... وایشم بینیوە زۆربەیان دەچنە تای تەرازووی خراپەکان بۆیە کەم قسە دەکەم..)(٨)

یەک لەو هۆیانەی وادەکات دیاردەی نابەرپرسانەی ئەزموونکردنی نووسین و رۆشنبیری روو لە زیادبوون بێت، تێنەگەیشتن لە رۆڵ و ئەرکی وشە و دەسەڵاتی نووسین و قەڵەمە، هەروەها کەمی موتالاو بێ ئاگاییە لە چەمک و پرسە گرنگەکانی گۆڕەپانی رۆشنبیری هاوچەرخ، بە جۆرێک هەندێ کەرەت وتارو بابەتی وا لە چاپکراو و رووپەڕەی بڵاوکراوەکان بڵاودەکرێنەوە، جگە لەوەی بەهۆی کرچ و کاڵی سەلیقەی خوێنەر چک دەکەن، هەروەها لێوانلێون لە مەعلوماتی نادروست و تێڕوانینی سادە و سەرپێیی بە مانای وشە، ئاخر دەبێ چی چاوەڕێ بکەین لە کەسێ بە ساڵێک (٦٠) بابەت بڵاوبکاتەوە، بەڵام شەش کتێب نەخوێنێتەوە، سەیری هەموو گۆڤار و رۆژنامەکان بکات وەک سەیرکردن وەڵێ حەوسەڵەی وردخوێندنەوەی تەنیا ستوونێکی نەبێ، گشت چەمک و زاراوەکان تووتی ئاسا ئەزبەر بکات و نەتوانێ قووڵ لە هیچیان تێبگا، فریای ئەوە نەکەوێ گوێ لە دەنگ و باسی رۆژانە بگرێ و تەحلیلی سیاسی بکات و..تاد.

دیارە هەموو ئەمانە ئەگەر بۆ کەسێکی بێ دەنگ بچێتە سەر، بەڵام یەکێک ناوی لەخۆ ناوە (رۆشنبیر، نووسەر، هونەرمەند، رۆژنامەنووس..) و بە مرۆڤێکی قسەکەر ناسراوە، نەک بێدەنگ ئەوا بە حەقیقەت پڕ مەترسی و کارەساتبارە.

خۆزگە هەموومان بەقەد گەورەیی و بارقورسی و پڕ مەسئولیەتی هەر وشە و ڕستەو بابەتێک ئەوەندە واگا و هۆشیار و ورد و ئەمانەتپارێز دەبووین تا هەم وەکو پێویست لە کاروانی خزمەتکردن و داهێنانکاری و پێشکەوتن دانەبڕێین، هەمیش هزر و ویژدانمان ئاسوودە و بێ وەی بکەین.

**پەراوێزەکان:**

١- بورهان محەمەد ئەمین، تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، چاپی سێیەم، (٢٠٠٢).

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣- مەریوان وریا قانیع، دەربارەی فەلسەفە و ئیسلام و رۆشنگەری، چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٢.

٤- د. مارف خەزنەدار، ئەدەبی رووسی و کێشەی پاسترناک.

٥- فاروق رەفیق، خۆرئاواو (ئەو)ەکانی: موسڵمان وەکو ئەوی خۆرئاوا، رەهەند، ژ (٨/١٩٩٩).

٦- د. کاوس قەفتان، چەند لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی بابان.. سۆران.. بۆتان، بەغدا- (١٩٨٥).

٧- ئەمجەد شاکەلی، ئەوەی نابێ بگوترێ دەبێ بگوترێ، سازکردنی: (حەکیم کاکەوەیس) هەولێر- (٢٠٠٤).

٨- گۆڤاری (المجتمع)، بەداخەوە ژمارەکەیم کاتی خۆی تۆمار نەکردبوو.

# وەڵامێ بۆ کتێبەکەی (دەستەوارەیێ نان بۆ مێژوو)

باکووری

بەڕێز کەماڵ ڕەئووف محەممەد، نووسەر و لێکۆڵەرەوەیەکە، کەس وەک خۆی حاڵی حازر خاوەنی ئەو بەهرە جوانە نییە کە بەو نەفەسە درێژ و بەو خۆ ماندووکردنە بەدوای سەرچاوە و بەڵگەدا بگەڕێ.. لە هەموو کەل و قوژبنەکانی شارە گەورەکانی کوردستانی عیراق: سلێمانی، هەولێر، دهۆک دەگەڕێ، ئەگەر بزانێ لە هەر جێگایەک تاکە وێنەیەکیش هەبێ، یان تاکە نامیلکەیەکیش هەبێ و چنگی دەکەوێ سەبارەت بەو بابەتەی کە خەریکی دەبێ و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکا، یان لە بابەتیەوە وتار دەنووسێ! ئەز بەخۆم موعجەبم بەو مرۆڤە و لە نووسینەکانمدا زۆرم سوود لێی وەرگرتووە، چ لە ڕۆژنامە یان لە گۆڤار یان لە بەرنامەی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنیدا، هەروەها لە هەردوو بەشی کتێبەکەم (گۆرانیبێژە نەمرەکان)دا.

لە هەمان کاتدا ئەویش زۆر سوودی لێم وەرگرتووە، پێی ناوێ بڵێم چۆن و کەی و لە چی، چونکە لێرەدا مەبەستی سەرەکیم وەڵامدانەوەیەکی هێمنانەیە بۆ ئەو (ڕەخنە) گرژە و ئەو دوو سێ دێرە کە پڕە لە دڵڕەقی و ناهەقی و چەند وشەیەکی ناشرینیش کە ئاراستەی منی کردووە، حەز دەکەم جارێ ئەو دوو سێ ڕستانەی ڕەخنە ناسا لە کتێبەکەیدا کە ناوی (دەستەوارەیێ نان بۆ مێژوو)ە و لە سلێمانی ئەمساڵساڵی (٢٠٠٤) لە چاپی داوە و بڵاوی کردۆتەوە، لە لاپەڕە (٢٤٠)یدا، دوای ئەوەی زۆریشی قسە بە چەند نووسەری تر گوتووە، هاتووەتە سەر من و ئاوای نووسیوە: «... سەیرو سەمەرە گەورەترە کاتێ کە (باکووریی) حازر خۆر، لە کتێبەکەیدا: (گۆرانیبێژە نەمرەکان) لە ئەو (واتا لە نووسەرەکە کەوا لەپێش من هێرشی بردۆتە سەرم» خراپتری کردووە و ڕەنج و کرد و کۆششی منی پێشێل کردووە و شەعبان و ڕەمەزان پێش دەخات و بێ پرسم، لێکۆڵینەوەکانم و وێنە کۆکراوەکانی بڵاوکردۆتەوە، کە ئەمە بەڵگەی بێ وێڵییەکی گەورەیە».

جارێ پێشەکی ئەو برایەمان وادەزانێ هەر ئەوە لە مەیداندا و نابێ کەسی تر باسی دایکی جەمال و مریەم خان و باقی گۆرانیبێژانی کۆن بکات و تەنیا نووسینەکانی ئەو دەبێ لە مەیدانابن و خەڵک بیانخوێننەوە.

من دەپرسم: ئایا خۆی ئەم زانیارییانەی لە کوێ هێناوە..؟ لە خەو دەیانبینێ و دێ لەسەر کاغەز دایان دەڕێژێ و دەبنە وتار و مێژوو؟ یان لە ژوورێکدا دادەنیشێ و سەیری بنمیچەکەی دەکات و ئەو باس و خواسانەی بۆ دێنە خوارەوە و (وەحی) دەدەنێ و دەیانووسێتەوە؟




ئەی خۆشی لەم کتێب و لەو گۆڤار و لەو دوکان و لەم ماڵ و لەو خەڵکە، لە عومەر قەزاز و لە کتێبی (گۆرانی) و گۆڤارەکانی گەلاوێژ و دەنگی گێتی تازە و ڕۆژنامەکان و نووسەرەکانیان و فلانە و فیسار ئەو بابەت و زانیارییانە وەرناگرێ؟ بێگومان دەبێ وەڵامەکە «بەڵێ» بێ! ئەگەر نا، ئەوە دەبێ بنیادەم (سیحرباز) بێ و پێوەندی (ڕوحی) لەگەڵ ڕۆحی (حەمدی ئەفەندی) و (دایکی جەمال) و (مەلا کەریم) و ئەوانی دیکەدا هەبێ؟ تۆش و خوێنەرانیش چاک دەزانن، نە ئەمڕۆ و نە دوێنێ و نە سەد ساڵ لەمەوبەر، کەس نییە هەموو زانیارییەکی هەبێ لە بابەت ئەو بابەتانەی دەیاننووسێت، کە پێویستە چاو بە دەیان (سەرچاوە)دا بخشێنێ پێوەندی بە دەیان کەسی دیکەشەوە بکات، تا بەرنامەکەی دەیەوێ دایبڕێژێ و بینووسێ، تێر و تەسەل بێ و هەموو لایەنێکی ورد و درشتی بگێڕێتەوە و باسیان لێوە بکات.. ئەی ئەوە نییە هەرخۆی، هەمیشە پەراوێزەکانی لاپەڕەکان پڕ دەکاتەوە لە (ڕوونکردنەوە) و جگە لە (پەراوێز) و (سەرچاوە)کانی کە لە کۆتایی بابەتەکانیدا دەیانهێنێتەوە ناوی کتێب و نووسەر و تەنانەت لاپەڕەکانیش، زۆر زانستییانە و ورد دەنووسێتەوە؟

منیش بەدەیان جار، لەو دوو کتێبەمدا زۆر بە ڕێزەوە ناوی ئەوم هێناوە و نووسیومە کە ئەم باسە، یان ئەم دێڕانە، یان ئەم وێنەیەم لە فلانە وتاری کاک کەمال ڕەئووف محەمەد، کە لە (فلانە) گۆڤار بڵاوکراوەتەوە وەرگرتووە! ئەمە چی تیایە؟ ناجایزە؟ ئەگەرنا بۆچی دەڵێ «...ڕەنج و کرد و کۆششی منی پێشێل کردووە.»؟ ئایا ئەگەر منێک بڕگەیەک لە نووسینێک وەربگرم کە لەگەڵ نووسینێکم دەگونجێ و زیاتر ڕۆشنایی دەهاوێتە سەری و ڕوونی دەکاتەوە، ئەم کارە گوایا پێشێل کردنی کرد و کۆشش و ڕەنجی ئەوە؟ بە پێچەوانەوە، دەبێ سوپاسم بکرێ، چونکە شتێک پێش بیست ساڵ یان زیاتریش کە نووسراوە و بڵاوکراوەتەوە ئەوسا بەشێک لە خوێنەران خوێندوویانەتەوە و زۆربەش نەیخوێندۆتەوە، خۆ لاوان و خوێنەرانی ئەمڕۆکەش هەر ئاگایان لە نووسینەکانی ئەوکاتە نییە و ناشزانن کاک کەمال چۆنی وتووە و نووسیوە، بەڵام کە من بێم و ئەمڕۆکە سەرلەنوێ لە دەیان شوێن، لە کتێب و گۆڤار و وتارەکانمدا، ناوی بهێنمەوە یاد و نووسینەکان بە خەڵکی ئەمڕۆ بناسێنمەوە و ئاشنایان بکەم، گوایا ئەمە پێشێل کردنە بۆ ڕەنج و کردەوە و بابەتەکانی، یان دەبێ مایەی سوپاس و ڕێز لێنان بێت؟ من ئەگەر بمەوێ ئەو هونەرمەندە گۆرانیبێژانە بخەمە ناو مێژووی سەروەریی زانایان و هونەرمەندان و نووسەرانی کورد و بیانخەمە ناو لیستی نەمرانەوە، ئەی نابێ جگە لە زانیاریی خۆم و ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ زۆربەیانم ڕابواردووە، باسێکی ئەو ڕۆژانە بکەم، لە کەسانی تری وەک کاک (کەمال)یش زانیاری زیاتریان ئەگەر هەر نەبێ (وێنە)یان کە لە لای ئەو هەبێ، بۆچی من لە کتێبەکانم بۆ جاری دووەم و سێیەمیش بڵاویان نەکەمەوە؟ کاک کەمال وێنەیەکی (سەعید ئاغا جەزراوی) دەست کەوتبوو، پێش (٣٠) ساڵ بڵاوی کردەوە، بۆچی وەچەی ئەمڕۆ وێنەیەکی (سەعید ئاغا) نەبینن؟ چی تیایە ئەگەر لەوم وەرگرتبێ، مادام ناویم هێناوە و ئاماژەم بەو سەرچاوەیە دابێ کە ئەم وێنەیەم لێ وەرگرتووە؟

با کاک کەمال و خوێنەرە خۆشەویستەکانیش لەگەڵمان چاوێک بە هەندێ لە لاپەڕەکانی کتێبی (گۆرانیبێژە نەمرەکان)ی مندا بگێڕین و لەو شوێنانەی کە پێویستیم هەبووبێ و سوودم لە نووسین یا وێنەکانی وەرگرتبێ، بزانن چۆن ناوی (کەمال ڕەئووف محەمەد) هاتووە، ئینجا بڕیار بدەن کە ئایا من ڕەنج و کۆششی ئەوم

پێشێل کردووە؟ یان کارەکەم سوودی بۆ خوێنەر هەیە کە خەڵکانی هۆگر و ئاشقی ئەم گۆرانیبێژە نەمرانەن، تۆ بڵێی «ئەمە بەڵگەی وێڵییەکی گەورە» بێ تا پێم بڵێ:
(حازر خۆر)؟ دەبا جارێ بە دوای ناوەکەی ئەودا بگەڕێین و بزانین من قسەی ناشرینم پێ گوتووە؟

(١) سەیری لاپەڕە (٤١)ی (بەشی یەکەم)ی «گۆرانیبێژە نەمرەکان» بکەن کە نووسیومە: «....پاش ماوەیەکی زۆر نووسەر (کاک کەمال ڕەئووف محەمەد) ئەیدۆزێتەوە- لە بابەت دایکی جەمالەودیە- لە سلێمانی و «١٣» ساڵ لەو خانووە دانیشتووە کەوا کاک کەمال چووەتە ئەوێ و دۆزیویەتەوە و گفتوگۆی لەگەڵدا کردووە..»

دیسان باسی (عومەر قەزاز) کراوە کە من نەبینیومە و نە گفتوگۆم لەگەڵدا کردووە، تەنیا گفتوگۆیەکەی ئەوم نووسیوەتەوە و ئاماژەم بۆ ناوەکەی کردووە، بەم جۆرە: «.... ئەم قسەیە ساڵی (١٩٨٠) لەگەڵ نووسەر.. کەمال ڕەئووف محەمەد کراوە».

تەنانەت ئەوەشم دەربڕیوە کە وێنەکانم لە بەڕێز کەمال ڕەئووف محەمەد (واتا لە نووسینەکەی ئەو)م وەرگرتووە!

(٢) لە لاپەڕە (٤٥)دا، لە بەشی یەکەمی (گۆرانیبێژە نەمرەکان)دا، کە ناوی چەند سەرچاوەیەکم نووسیوە و سوودم لێیان وەرگرتووە بۆ نووسینەکەم لە بابەت (مەلا کەریم)، سەیرکەن یەکەم سەرچاوە، کە لە ژێر ناوی مەلا کەریمە، ناوی (کەمال) هاتووە! ئینجا لە دامێنی هەمان لاپەڕەدا نووسیومە: «کاک کەمال ڕەئووف محەمەد» لە گۆڤاری (کاروان)... ساڵی (١٩٨٣- مانگی تەمووز) دەڵێ: لە ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە (٣٨) ساڵی (١)-١٩٣٨...تاد، قسەکانی کاک (کەمال)م نووسیوە بە تەواوی کە سوودیان هەبووە بۆ زانیاریی لە بابەت ڕۆژی مردنی ئەو کەڵە هونەرمەندە (واتا مەلا کەریم).

(٣) لە لاپەڕە (٤٧)دا، لە ناوەڕاستی لاپەڕەکە نووسیومە «... کاک کەمال ڕەئووف محەمەد، بۆ دۆزینەوەی قەوانەکانی لە حەفتاکان و هەشتاکانا- سەدەی ڕابردوو- هەوڵێکی چاکی داوە و خۆی ماندوو کردووە تا توانیویەتی (١٢) دوازدە قەوانی بدۆزێتەوە چ لە ماڵان یان لە دوکانان یا لە چاپخانان، ئەوەش کارێکی یەکجار بە نرخە و خزمەتێکی گەورەیە بۆ پاراستنی کەلەپووری هونەری و ئاوازی کوردی.»

باشە ئەم کارەم خراپە یان بەبا بردنی ڕەنجی ئەوە؟ یان ستایشە بۆ هەوڵ و کۆششی ئەو لە کاتێکدا ئەوەی پێش (٣٠) ساڵ باس کردووە کە ئەمڕۆ مەگەر بەهۆی خوێندنەوەی کتێبەکەی من، خوێنەران بزانن ئەو چی کردووە و چ خزمەتێکی بە هونەری کوردی کردووە، ئەگینا کەس لەم سەردەمەی ئەمڕۆ ئەو شتانەی نەدەزانی و باکیشی بە ڕەنج و کۆششەکەی نەبوو کەسێکی وەک من نەبێ کە خولیای کۆکردنەوەی ئەو بەرهەم و ئەو سەرچاوانەی هەیە! ئەو گۆڤارانەی ئەو شتی تێدا نووسیوە هەموویان دوای ڕاپەڕین لەسەر شۆستەکانی شەقامەکانی سلێمانی و هەولێر...

(٤) خوێنەرانی هێژا باوەڕتان بێ وەڵڵاهی وەبیللاهی وەتەڵڵاهی من لە نووسینی بابەتەکەمدا لەسەر ژیاننامەی (گۆرانیبێژی ئافرەت: مریەم خان) قەت و قەت چاوم بەسەرچاوەیەکی (کەمال ڕەئووف محەمەد) نەکەوتووە و نەمزانیوە لەسەر مریەم خانی نووسیبێ! بەڵام هەندێ زانیاریم لە گۆڤاری (ڕەنگین) لە نووسینی (شەعبان مزیری) وەرگرتووە، کەوا (کەمال ڕەئووف) بەگاڵتەوە دەڵێ: «شەعبان و ڕەمەزانی پێش من خستووە!» بۆ خوێنەری ئازیزیش ڕوونی دەکەمەوە کە (ناوی ڕەمەزان)ی بە تووڕەبوونێکی زۆرەوە هێناوە، چونکە لە نووسەرانی بادینان: شەعبان هەیە، بەڵام ڕەمەزان نییە، تەنیا ڕەمەزان جەزراوی گۆرانیبێژ هەبووە، بەڵام نەخوێندەوار بوو، مەولوودنامەی لەبەر کردبوو، دەیتوانی لە مەولوودان بیخوێنێ، بەڵام نووسینی نەبووە. دیسان بۆ (مریەم خان) و وێنەکانی سوودم لە کاک (ئیسماعیل بادی) وەرگرتووە لە وتارێکی، کە لە گۆڤاری (دهۆک) بڵاوکراوەتەوە و وێنەکانیشی تێدایە، کە ئەویش لە نووسینەکانی بەڕێز (جەلال مەلا حەسەن خۆشناو)ی وەرگرتووە. خۆ من لە نووسینەکەی (شەعبان مزیری)ش تەنیا ئەو زانیارییەم گواستۆتەوە کە تێیدا دەڵێ: «مریم خان موسڵمان بوو، ناوی مریەم کچی محەمەد بوو، نەک (فەلە) بووبێ وەک هەندێ ژێدەر دەریان بڕیوە.»

جا ئەگەر (شەعبان و ڕەمەزان) نووسینەکانی کاک (کەمال ڕەئووف)یان وەرگرتبێ و ناویشیان نەهێنابێ، من گوناهم چییە؟

هەروەها من و تیمێکی تەلەفزیۆنی هەرێمی کوردستان- هەولێر، لە ساڵی (١٩٩٨) سەفەرێکی دوور و درێژمان کرد، تیمەکە بەسەرۆکایەتی من بوو، چووین بۆ دەڤەری بادینان و بۆ دهۆک و زاخۆ و دەورووپشتیان، بە مەبەستی ئامادەکردنی دوو بەرنامەی تێر و تەسەل لەسەر ژیان و هونەر و لاوک و

گۆرانییەکانی هەردوو گۆرانیبێژی نەمر (حەسەن جەزراوی) و (مریەم خان) و چەند رۆژێکمان لەوێ بەسەر برد و دوای پرسین و گفتوگۆمان لەگەڵ چەندین پیاوی ماقوول و بەتەمەن و هونەرمەندانی ئەو دەڤەرە کرد و دوو بەرنامەی زۆر رێک و پێکم ئامادەکرد و تۆمارمان کردن و تا ئەمرۆش بە بۆنەی ساڵرۆژی کۆچی دواییان، هەریەکە و لە رۆژی خۆیدا، پەخش دەکرێن و ئەو زانیارییانە شتی ئەوتۆیان تێدابوو کە رەنگە تائێستاش ئەو نایانزانێ!

(٥) لە مێژووی ژیانی گۆرانیبێژی نەمر (سەعید ئاغای جزیری)دا، لە لاپەڕە (١٠٩)دا، هەر لە یەکەم دێری بابەتەکە، دەڵێم: «چاکترین و فراوانترین زانیاری (نووسراو) لەسەر ژیان و سترانەکانی سەعید ئاغا جەزراوی، لەلایەن کاک (کەمال رەئووف محەمەد)ەوە بە زمانی کوردی، لە گۆڤاری (کاروان)ی ژ-(٣١)ی ساڵی (١٩٨٥)دا نووسیویەتی..» تەنانەت لەژێر وێنەکەیشی، نووسیومە: «ئەم وێنەیەی سەعید ئاغای لاوکبێژ، لە هەمان گۆڤاری (کاروان) بلاوکراوەتەوە و من لێم وەرگرتووە!»

(٦) دیسان سەیری لاپەڕە (١٣٤) بکەن، کە لە بابەت نەسرین شێروانە و لاپەڕە (٢٠٦) کە لە بابەت (ئەڵماس محەمەد)ە و بزانن چۆن ناوی لە یەکەم دێڕ و یەکەم سەرچاوەی باسەکاندا هاتووە، جگە لە زانیاریی دیکەش دێڕێک لێرە و دێڕێک لەوێ کە هی ئەو بووبێ ناوم هێناوە و ئاماژەم بە سەرچاوەکەی داوە.

(٧) لە بەشی دووەمی کتێبەکەمدا رەنگە ئەم کتێبەی نەدیبێ کە یەکەم ناوی گۆرانیبێژی نەمر (حەمدی ئەفەندی)یە و ئیعتیمادی زۆرم لەسەری کردووە و هەر جارەش ناوی نووسراوە.

(٨) سەرەرای هەموو ئەو ئەمانەتەی لە نووسیندا پاراستوومە وێنەیەکی زۆر جوانی جەنابی کاک (کەمال رەئووف محەمەد)یشم بە ڤات و بۆینباغ و بە بێ ڕدێن و کڵاوی (مەتران)ەکان... لە لاپەڕە (١٤)ی بەشی دووەمدا بلاو کردۆتەوە، ئەویش بۆ شانازی پێوەکردن بوو. ئەگەر بە چاکی کتێبەکانم بخوێنێتەوە، ناوی ئەوم لە زۆر شوێنی تریش وەک سەرچاوە و رێزلێگیراو، دەدۆزێتەوە! من هەموو ئەوانەم کردووە، نەک لە حازری بەشی ئەوم خواردبێ، ئایا ئەوەی من کردوومە (رەوشتی) ئاسایی نووسەر نییە؟ ئایا ئەم جۆرە کارانە، نووسەرانی هەموو دنیا پەیرەوی لێناکەن؟ خۆ ئەگەر پرسیشم پێ نەکردبێ، لەبەر ئەوەیە کە لە دەرەوەی وڵات بووە.

بە هەرحاڵ، من هێشتا زۆر ماوە سەبارەت بە هونەرمەندان و گۆرانیبێژان باسی بکەم و رابردووی خۆم و بیرەوەریم لەگەڵیاندا بگێڕمەوە و ژیانیان بە هونەرمەندانی ئەمرۆ بناسێنم، لەوانەیە دیسان لە هەندێ شوێندا وەک سەرچاوەیەکی گرنگ بگەرێمەوە سەر بابەتەکانی ئەو و ناوی بەو شێوەی لەم نووسینەدا باسم کرد بهێنمەوە ئینجا ئەگەر حەز بەوە ناکەیت و رازی نیت، ئەوە ئاگادارم بکەرەوە بۆ ئەوەی هیچی تر پەنا بۆ بەڵگە و نووسینەکانت نەبەم، ئەگەریش مانعت نییە و روخسەتم بدەیت، ئەوە سوودیان لێوەرگرم دیسان بە هەر هۆیەکەوە بێت ئاگادارم بکەیتەوە تکایە، بۆ ئەوەی ببێتە جۆرێ لە پێوەندی نێوانمان و رێکەوتن لەسەر ئەم پرسە تا لەمەودوا گلەیی ئەوەم لێ نەکەیت کە پرسم پێ نەکردووی.

دوا داواکاریشم ئەوەیە، زۆر مەمنوونت دەبم ئەگەر ئەو چەند نامیلکە یان گۆڤار یا شتی تری من کە لەلات ماون، وەک نامیلکەکەی خوالێخۆشبوو (کەریم سەعید زانستی) کە ناوی (گۆرانی)یە و هەروەها چەند ژمارەیەکی (هنا بغداد) و ئەوانی ترکە ناویانم لەلای خۆم نووسیوە و لە ساڵی(١٩٨٣) لێت وەرگرتم، حەز دەکەم بۆم بنێریتەوە وەک ئەو چاکەیەی لەگەڵت کردم و گۆڤارەکانی (دەنگی گێتی تازە) و دوو ژمارەی گۆڤاری (هنا بغداد)ت ئەمساڵ پێش دوو مانگ بۆ ناردمەوە، ئیتر سوپاست دەکەم و سەرکەوتنی زیاترت بۆ دەخوازم بۆ خزمەتی وشە و هونەری کوردی.

# رووینشتنەک کورت دگەل چیرۆکنڤیس (حەسەن ئیبراهیم)ی



دقارا نڤیسینا چیرۆکێ دا، مشە نڤیسەر هەنە و بەردەوامی دایە نڤیسینێ، لێ چەند شیاینە ڤێ بەردەوامیێ، وەک هونەرێ نڤیسینا چیرۆکێ پێش بێخن، ئەڤە پرسیارەکە و پێدڤی شرۆڤەکرن و لدویڤچوونێ یە ژلایێ رەخنەگرێن وێڤە.

چیرۆکنڤیس حەسەن ئیبراهیم، ئێکە ژوان چیرۆکنڤیسێن گەنج، سالا ١٩٦٦ێ ل گوندێ (کێڤلا) ل ژووریا قەزا سێمێلێ ژ دایکبوویە، خواندنا خو ل پەیمانگەها تێل و بێ تێل ل بەغدا ب داوی ئینایە.

ل دەستپێکا سالێن هەشتیان کورتە چیرۆک نڤیسی یە و ل سالا (١٩٨٣)ێ بۆ ئێکەمین جار چیرۆکەکا وی هاتیە بەلاڤکرن.

ل سالا (١٩٩٢)ێ بوویە ئەندامێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد، و هەر ل وێ سالێ ل باژێرێ سێمێلێ ژی ئەندامێ دەستەکا نڤیسەرێن کۆڤارا (تیرۆژ) بوویە.

ل دەستپێکا سالێن نۆتا بەر ب ئەوروپا مشەخت بوویە و ل باژێرێ نورنبێرگ ئاکنجی بوویە.

بەری دەمەکی ب سەرەدان هات و دووپەرتووک گەهاندنە چاپێ، بەری نوکە ژی دوو پەرتووکێن دیتر ژی چاپکرینە.

ب هەلکەفتا سەرەدان و دەرکەفتنا بەرهەمێ وی، ئەڤ دیدارە دگەلدا هاتە سازکرن.

* ژبلی دوو کومەلە چیرۆکان، نوکە وە چ ل بەر دەستە بۆ چاپکرنێ؟

– نهو مژویلی چاپکرنا دوو پەرتووکێن دی بووم، ئەوژی رۆمانەک بوو بناڤێ (دۆزەخا سپی)، یادی ژی کۆمەلا چیرۆکان بوو، بناڤێ (هەلوو ئەوروپا)، کو تازە ئەوژی ژ چاپخانێ دەرکەفتن.

* ناڤەرۆکا وان ب چ ڤە یا گرێدایە؟

– ناڤەرۆکا وان ژی گرێدای غەریبی و دویرکەتن ژ وەلاتی یە و ئەو ئاتاف و ئاستەنگ و کارەسات توش دبنێ، کو ئەز ژی ئێک ژوان کەسانم و ژیانا من ژی چیرۆکەکا درێژە کو چەندین سال دناڤ گێلەشوکا ئەوروپا بوراندین.

* تەدڤێت تێدا چ بێژی؟

– پتر من ڤیایە، دڤان هەردوو بەرهەمان دا، حەلیانا مرۆڤێ مشەخت نیشا بدەم، کا چەوان ژ دورهێلەکێ کو ئەو تێدا مەزنبووی و عادات و رەوشتەکێ تایبەت ب خودڤە گرتی و چوویە د دورهێلەکێ دیدا کو ب هەمی رەوش و تێکەلێن خوە ژ یێ وی دویرە.

* چیرۆکێن تە پتر دکورتن و تێر بابەتن، ئەڤە ژ چ هاتیە، یان لدویڤ چ رێبازا ئەدەبی دنڤیسی و بۆچی؟

– چیرۆکا کورت، شیانێن مەزن پێ دڤێن، هیڤیدارم کو ئەز شیابم وێ چیرۆکا کورت بنڤیسم کو خواندڤای رازی کەت، هەلبەت هەر یەک ژمە دوارێ ئەدەبی دا دشێت ب رەنگەکی دەربرینێ ژ رەوشا خوەیا دەروونی و هەلچوونێن خوە بکەت. لەورا دبێژم ل دویڤ چ رێبازێن ئەدەبی ناچم. من دڤێت وەکو خوە بنڤیسم، ئەز وەکو حەسەن ئیبراهیم، شێوازێ خوەیێ تایبەت هەبت، من نەڤێت چاڤلێکرنێ بکەم، بێ شک ژی چاڤلێکرن خوەکوشتنە.

نهو کەس خوە ب رێبازان ڤە گرێ نادەت، بەلکو ل قالبێن نویتر و نویتر دگەرن. ژیان بلەز دبوریت، دەم خوە ل چ ناگریت، جیهانگەرێ کاروانێ خوە ل بەر بەردەرێ هەر مالەکێ راوەستاندیە. دەم یێ کێمە و ژیان یا ب زەحمەت کەتی، لەورا مرۆڤی ژی گێولێ خواندنێن گران و درێژ نەمایە. هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ژی من کورتە چیرۆک هەلبژارتیە، لێ دڤێت کورتی، چ ژ ناڤەرۆکێ نەگۆهورت و ناڤەرۆک دڤێت یا تەمام بیت و رامانا خوە بگەهینت. هەلبژارتنا بابەتی، زەنگینیا رستاو دارێشتن و زمان د کورتە چیرۆکێدا گرنگیا خوە هەیە، ئەگەر نە، کورتە چیرۆک چ خوشیێ ناگەهینیت، چونکو کورتیا رستا و بارگرانیا وان ژلایێ رامان و هێمایێ ڤە، تنێ ئەوە خوشیەکێ ددەتە خواندڤای.

* پێشکەفتنا چیرۆکا کوردی، چ جوداهی ژلایێ فورم و روخسارێ ڤە لێ هەنە، هەکە هەڤبەر بکەین ئەوێن ل کوردستانێ دهێنە نڤیسین بەرامبەر یێن ل ئەوروپا دنڤیسن؟

– کوردستان، بەهەشتا سەر گویا زەمین، ژ هەمی

لایانڤە چ کێمتر نینە ژ وەلاتێن دەوروبەر، بەلکو ژ هندەک وەلاتێن خودان ئالا و سنور پێشکەفتی ترە، ئەڤە ژی دبتە ئەگەرا پێشکەفتنا رەوشەنبیریێ، ئەدەب ژی لایەکە دچارچوڤێ پێشکەفتن و پێشداچوونا کوردستانێ وەراریێ دکەت و پێشکەفتنێ دبینیت.

چیرۆک یانژی ئەدەب ب گشتی د هوندرێ کوردستانێ دا، پێشکەفتنەکا مەزن ب خوە ڤەدیتی یە، چ ژ لایێ ناڤەرۆک و روخساریێ ڤە بیت، چ ژلایێ زمانی ڤە بیت، کو ل هونەردا پێشکەفتنەکا گەلەک مەزن ب خوەڤە دیتی یە، قالبێن نوی یێن چیرۆکێ دیار بووینە، دیوارێن کلاسیکێن ئەدەبی ژ گەلەک لایانڤە هاتینە شکاندن، ئەڤەژی جهێ دلخوەشیێ یە. زێدەباری ڤێ چەندێ ناڤێن نوی و خودان شیان دوارێ چیرۆکێدا دیار بووینە و بەرهەمێ باش هاتیە پێش، بتایبەت ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد تایێ دهۆکێ کارەکێ گەلەک پیرۆز دکەت، کو زنجیرا وەشانێن خوە دەرگەهـ بۆ ڤەکریە و کۆمەکا بەرهەمێن باش دیاربووینە، داخوازا بەردەوامیێ بۆ دکەم. کو ئەڤ پێنگاڤە ژی پالدەرەکە کو نڤیسەر بهێنە پێش و قەدرێ قەلەمێ وان ژی بهێتە زانین. هەر ئەڤ پێنگاڤە پالدەرەکە بۆ دیار بوون و هەبوونا قەلەمێن نوی ژی. کو چاپکرن و پربوونا پەرتووکان ب زمانێ کوردی، هاریکارە بۆ پێشکەفتن و وەرارا زمانی ل جەم نڤیسەران.

ژلایێ ڤێ وەرارا زمانی ڤە، کورتە چیرۆکا ل هوندرێ کوردستانێ دهێت نڤیسین، جۆداهیەک دگەل یا ژ دەرڤە هەیە، ژبەرکو ژێدەرێن کوردی دکێمن و ئەو وەختێ بەرفرەهـ ژی مەنینە کو مژویل بین و ل ژێدەرا بگەرین. دیسان کێم نڤیسەرێن مشەخت ماینە بەردەوامی ل سەر نڤیسینێ کری، دبیت ژی ئەگەر ئەوبن کو مژویلی بارێ ژیانێ بن، ئەگەر نە، ل هەر جهەکێ مرۆڤ لێ بیت، ب دیتنا من دێ شێت بەردەوامیێ ب بەرهەمێ خوە بدەت و داهێنان و ئافراندنێ ژی بکەت. هەرچەندە، دبت هەڤدژیەک ژی بیت دگەل گوتنێن من، لێ نهو ئەنترنێتێ جیهان یا کریە گوندەکێ بچویک و هەر تشتەکێ مرۆڤی بڤێت و ژێ حەز بکەت ب ساناهی دێ کەفتە بەردەست. لەورا دبێژم ئەو هێجەتا نڤیسەرێ ل دەرڤە دژیت، دگریت کوییێ دویرە ژ رویدان و بوویەرێن و هێن پێش، هێجەتەکا گەلەک لاوازە.

* رویدان و کارەساتێن ب سەرێ گەلێ کورد دا هاتین، ئەرێ نڤیسەرێ مە شیایە بۆ نڤیسینا چیرۆکێ مفای ژێ وەرگریت؟

– بەرامبەر وان کارەسات و ئەنفال و دەربدەری و رەڤا ملیۆنی و سەرهلدان یێن گەلێ کورد و کوردستان بەرهنگاربوویێ، یا ژمن هێشتا ب دروستی رەنگڤەدانا وان د ئەدەب و هونەرێ کوردی دا نەهاتیە دان. چونکو ئەڤ کارەساتێن مللەتێ کورد توشبووین، کاروانێ ژیانا وی گۆهوریە و بەر ب قۆناغێن دی بوویە. سەرهلدان کو گۆهورینەکا مەزن و دیرۆکی بوو، رویدانەکا دیروکیا مەزنبوو دژیانا گەلێ کورد دا، لێ هەتا نهو ئەڤ رویدانا هندە مەزن، یا ژمن ڤە ب دروستی حەقێ وێ نەهاتیە دان. ئەز نابێژم ژی نڤیسەران ئێکجار چ نەکریە، بەلکو ب دەهان بەرهەم هاتینە پێش. بەلێ ئەڤا هاتیەکرن، تنێ چپکەکە ژ دەریایەکا مەزن. یا دیژی دڤێت بهێتە گوتن کو نە مەرجە دگەل رویدانێ و دەمێ پەیدابوونا وێ دا تشت بهێتە نڤیسین، بەلکو ل پاشەرۆژێ بەرهەمێن باش و تێر ل سەر بهێنە نڤیسین. هەر چەندە دڤان (١٠) (١٢) سالان دا تەخسیری نەهاتیەکرن، لێ بەرامبەر رویدانێن پەیدابووین کێمە، چونکو وان رویدانان مەژیێ کەسێ کورد هەژاندی یە و بەر ب قۆناغەکا پێشکەفتیتر بری یە.

* سەربۆرا ژیانا نڤیسەری و رەنگڤەدانا وێ دناڤ بەرهەمێ ویدا، هەتا چ رادە یا ب مفایە و ئەڤ تشتە گرنکە دناڤ بەرهەمێ نڤیسی دا هەبیت؟

– ژ خواندنا بەرهەمێ هەر نڤیسەرەکی دیار دبت کو وی ب دەهان بیرهاتن و یادگارێن زارۆکینیا خۆ دناڤ دەقێ ئەدەبی دا بکارئینایە. ئەو سەرهاتی و رویدانێن دگەلدا ژیای، بووینە کەرەستە بۆ ئاڤاکرنا دەقەکێ ئەدەبی. چونکو من باوەری یا هەی، هەر رویدانەک یان رەوشەکا د دەقێ ئەدەبی دا دهێتە بەحسکرن و نڤیسەر ب خوە دگەل دا نەژیابیت، یا ژمن ڤە نەشێت بدروستی دەربرینێ ژێ بکەت. گەلەک جاران یا هاتیە گوتن کو نڤیسەرەکی خواستیە، دەمەکی دگەل زیندانیا د زیندانێ ڤە ببورینت، دگەل هەژارا بژیت، د سەروبەرێ ژیانا کەسانێن مافیا شارەزا بیت... و هتد، ئەڤە هەمی ژبوونا وێ یەکێ یە کو گاڤا دەربرینێ ژ رەوشەکێ بکەت، شارەزایی و تێکەلی دگەلدا هەبیت و ژوان رویدان و بوویەرێن چێدبن یێ دویر نەبیت، دابشێت ب دروستی دەربرینێ ژێ بکەت. لەورا دبێژم سەربۆرا نڤیسەری و رەنگڤەدانا ژیانا وی دناڤ بەرهەمێ ویدا، تشتەکێ گرنگە، لێ دڤێت ب شێوازەکێ جوان و ئەدەبی بهێتە نڤیسین و خەیالەکا دی بدەتێ، داکو وەک دەقەکێ ئەدەبی بهێتە نیاسین و ب سەرهاتیێن کەسایەتی ڤە نەهێتە گرێدان. چونکو مە بیرەوەری و سەرهاتی ژی هەنە و گەلەک نڤیسەران ب جوانی ژی نڤیسینە، لێ بیرهاتن وەکو وێ دارشتینە و چ خەیالا ئەدەبی نە بەردایە سەر، لەورا دبێژم دەمێ سەربۆرا نڤیسەری دبتە دەقەکێ ئەدەبی، دڤێت وەک بەرهەمەکێ ئەدەبیێ خودان خەیال و ئەندێشە بهێتە دارێتن، داکو ژ بیرهاتن و سەرهاتیێن کەسایەتی بهێتە جۆداکرن.

**ژبەرهەمێن وی یێن چاپکری:**

١- چاڤێن من... چاڤێن وی...، چیرۆک-٢٠٠٠.
٢- توخیبێ مرنێ، چیرۆک، ٢٠٠٠.
٣- هەلوو ئەوروپا، چیرۆک، ٢٠٠٤.
٤- دۆزەخا سپی، رۆمان، ٢٠٠٤.

**ئا: ئیسماعیل بادی**

**دانا فایق:**

# نووسەر جگە لە ساتە پاکەکانی منداڵی، چ شتێکی دیکەی نییە شانازیی پێوە بکات



دانا فایق دوای ڕاپەڕین وەک چیرۆکنووسێک هەوڵ و کۆششەکانی خۆی بڵاودەکاتەوە. ناوەناوەش بۆچوون لەبارەی باری ڕۆشنبیریمانەوە دەنووسێت. لەم دیمانە کورتەدا لە هەوڵ و کۆششەکانی دەدوێت.

* لەناو هەموو دەقێکی سەرکەوتوودا منداڵییەکی پڕ خەم، یان بەختیار ئامادەیی هەیە و چاو دەگێڕێت.

ئایا لای تۆ منداڵی بووەتە شاکەسی چیرۆکەکانت، یان چەند وەک مەرجەع گەڕاویتیەوە بۆ منداڵیت و کارت پێکردووە؟

– ڕەنگە نووسینەوەی منداڵی لە جۆرە هەرە قورس و گرانەکانی نێوکایەی نووسین بێت. ئاخر دوای جێهێشتنی ئەو تەمەنە شەفاف و جوانە و ڕێکردنت بەنێو زبری و دڕکوداڵی گەورەییدا و گونجانت لەگەڵیدا، ئەستەمە جارێکی تر بتوانیت بەو زمانە ناسک و ئاوریشمییە بدوێیت و سەرکێشی و حیکایەتە سەمەرەکانی ئەوکات بگێڕیتەوە. هەروا ئاسان نییە جارێکی تر بەپێی پەتی منداڵی ڕابکەیت و نەهێڵی بزماری ژەنگاوی و شووشەشکاوی گەورەیی بەپێتدا بچن.

مەرج نییە گێڕانەوەی هەموو منداڵییەک دەقێکی سەرکەوتوو بخوڵقێنێ، یان لەنێو هەموو دەقێکی سەرکەوتوودا منداڵییەکی پڕخەم، یان بەختیار ئامادەیی هەبێت، بەڵام گەڕانەوە بۆ ئەو سەردەمە، هەر نەبێت بۆ چەند ساتێک ئاسوودەییت پێدەبەخشێ و چەند چرکەیەک لە جەنگەڵی گەورەیی دوورت دەخاتەوە. ئاخر مرۆڤ جگە لە ساتە پاکەکانی منداڵی، چ شتێکی تری نییە شانازیی پێوە بکات.

دوور نییە ئەو هەموو گەڕانەوەیە بۆ منداڵی، جۆرە یارییەکی خۆخەڵەتێنەرانە بێت بۆ درێژەدان بەژیان. بە واتایەکی تر ڕەنگە ئەو کەسانەی کە خۆیان دەکوژن، کەسانێک بن منداڵییان لەبیرکردبێ.

بەو هەموو داخەوە کە بەجەستەی منداڵیمەوەیە و بەو هەموو تاوان و زوڵمانەشەوە کە لە ڕۆژەکانی ئەوکاتم کراوە، هێشتا ئاوڕدانەوە بۆ ئەو زەمەن شاگەشکەم دەکات. بەداخەوە هێشتا گەورەکانمان لە مانا تایبەتەکانی ئەو دنیایە تێناگەن و دەیانەوێت هەرزوو منداڵەکان فۆتۆکۆپیی ئەوان بن و وەک ئەوان هەڵسوکەوت بکەن و قسان بکەن. بەدڵی ئەوان بخۆن و بپۆشن و بەفەرمانی ئەوانیش بخەون و هەڵسنەوە.

ڕوومەتی منداڵیی هەر یەکێکمان سەیرکەیت، بەدەیان مۆر و زللەی دەستی گەورەکانی پێوەیە، چونکە لەو کاتانەدا نەمانزانیوە، یان نەمانتوانیوە بەخواست و دڵی ئەوان ڕەفتار بکەین، ئەوانیش لەوە بێهێزتر بوون وەک (سەلیم بەرەکات) لە جوانییەکانی ئەو دنیایە تێبگەن و بڵێن: (جوانیت ئەوکاتەی مارمێلکە کەوڵ دەکەیت و هێلانە تێکدەدەیت.. جوانیت ئەوکاتەی پاقلە دەدزیت و تەڵە بۆ کۆتر دەنێیتەوە، جوانیت ئەوکاتەی گاکان لە گەوڕەکان دەردەکەیت و گاکان تاردەبن.. جوانیت ئەوکاتەی دەنووکی عەلەشیشەکان لێک دەئاڵێنی....).

لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم، دوور نییە نووسینەوەی منداڵی تاکە هۆکارێک بێت کە نووسینی لا خۆشەویستتر کردووم، یان نووسینەوەی منداڵی تاکە هۆکارێک بێت کە بەرەو نووسینی بەکێش کردبم. بۆیە بەردەوام هەوڵدەدەم ئەو دنیایە بە هەموو ماناکان و جوانییەکانەوە بنووسمەوەو هەردەم خەون بەوەوە دەبینم کە بتوانم تەنیا جارێک بەقەد مەزنییەکەی قسەی لەسەر بکەم، یان لە دەقێکدا هەقی تەواوی پێبدەم، چونکە بەردەوام دەبێ ئەوەمان لەیادبێت، منداڵی بەنرخترین گەنجینەی لە دەستچوومانە و تازە بەدەستهێنانەوەی مەحاڵە.

* دەکرێ لەسەر ڕۆمانی کوردی بوەستیت و پانۆرامایەکمان بدەیتێ؟.

– هەڵبەت قسەکردن لەبارەی ژانرێکی گەورەی وەکو ڕۆمان و باسکردنی لە پانتاییەکی ئاوەها تەسکدا، جگە لەوەی کارێکی ناڕاست و نازانستییە، لە هەمانکاتدا بەیەکچاو سەیرکردنی هەموو ئەو کتێبانەی کە لە کتێبخانەی کوردیدا لەسەریان نووسراوە (ڕۆمان) و پۆلێنکردنیان لەیەک خانەدا کردەیەکی بێویژدانییە.

(بوون و نەبوونی ڕۆمانی کوردی) ئەو باسەیە کە لە ئێستای ئەدەبی کوردیدا زیاتر قسەی لەبارەوە دەکرێ.

بێگومان لەنێو ئەدەبی کوردیدا کۆمەڵێک تێکست بەرچاو دەکەون کە لەسەریان نووسراوە (ڕۆمان)، بەڵام ناوهێنانی زۆربەی هەرەزۆریان وەکو (ڕۆمان) جگە لەوەی بێویژدانییە بەرامبەر ئەو ژانرە مەزنە، لە هەمانکاتیشدا بێ ئاگایی و خۆخەڵەتاندنێکی بێماناشە.

هەندێک لەو بەناو ڕۆمانانە، تەنیا گێڕانەوەی چەند بیرەوەرییەکن، بەڵام زۆر بێلەزەتانە، هەندێکی تریشیان ئیشکردنن لەنێو کارەسات و مەرگەساتەکانی گەلەکەمان، بەڵام بێ ئەوەی نووسەرەکانیان ئاگاداری ئەلفوبێی هونەری ڕۆمان بن، بۆیە ئەو ئیشکردنانە دواجار بەسووکایەتیکردنی ئەو کارەسات و مەرگەساتانە تەواو دەبن. بەداخەوە هەندێک چیرۆکنووسیشمان پێیان شەرمە تا دەمرن تەنیا چیرۆک بنووسن و ڕۆمانیان نەبێت. بێئاگا لەوەی چیرۆکێکی جوان گەلێک زیاتر لە یادەوەریی خوێنەردا دەمێنێتەوە نەک چەندین ڕۆمانی خراپ. بۆیە باشترە چیرۆکنووسێکی سەرکەوتوو بیت، نەک ڕۆماننووسێکی ناسەرکەوتوو.

خۆزگە ئێمەی کورد چەند نووسەرێکی ڕاستگۆی وەک (جەلیل قەیسی)مان دەبوو، کە دەڵێ: (دوای نووسینی چەندین چیرۆک، هەوڵی نووسینی ڕۆمانم دا. شتێکم نووسی، لەدواییدا کە خوێندمەوە هەستم کرد نووکتەیەکی خۆشە، دڕاندم. زانیم کە توانای ڕۆماننووسینم نییە....)

دیارە لەولاشەوە نابێ لەبیرمان بچێت، کە چەند ناوێکی کەمی دڵخۆشکەر و جدیشمان هەن کە بەوپەڕی ئاگایی و تواناوە هەوڵی گەڕانەوەی حورمەت دەدەن بۆ ئەو ژانرەو بە ئەدەبەوە لێی دەڕوانن، بەڵام هێشتا بوونی سیما و خەسڵەتی تایبەت بە ڕۆمانی کوردی نەک نییە، بەڵکو جێی ئومێدیش نییە.

* ئەی ئەگەر قسەیەکی خێرا لەسەر ڕەخنەی ئەدەبی کوردی بکەین؟

– ڕەنگە زێدەڕۆیی نەبێ، ئەگەر بڵێم بەدرێژایی مێژووی ئەدەبی کوردی، ڕەخنە سستترین کایە بووە لەنێو سەرجەم کایەکانی تری ئەدەبدا.

هیچ ساتێکی ئەو مێژووە نابینی ڕەخنە لە ئاستی دەقە داهێنەرەکاندا بووبێت، بەردەوام دواتر قسە لە جوانکاری و داهێنانی ئەو داهێنەرانە کراوەو تا ڕادەیەک هەقیان دراوەتێ. بۆ نموونە هەرگیز ئەو قسانەی کە لەسەر داهێنانی (شێخ نووری شێخ سالح و گۆران) کراون لەسەردەمی خۆیاندا، نەگەیشتوون بەنیوەی بڵندی و هونەری ئەو داهێنەرانە و بەرزیی کارەکانیان. بە هەمان شێوە تا بە ئێستاش دەگات، کوان ئەو ڕەخنە بەپێز و جدییانەی کە لەسەر ڕۆمانەکانی (بەختیار عەلی) نووسراون، کام خوێندنەوە و قسەکردن گەیشتوون بەبڵندیی ئاستی ئەو کارانە.

سەیرەکە لەوەدایە، زۆربەی جار کەسی شاعیر، یان چیرۆکنووس باشتر ئاگاداری لایەنەکانی ڕەخنەبووە لە ڕەخنەگر. لەکاتێکدا ئاساییە شاعیر، یان چیرۆکنووس کەسێک بێت هێندە ئاگاداری لایەنەکانی ڕەخنە نەبێت و لە هەمانکاتدا داهێنانیش بکات.

جگە لەوە، بەداخەوە گەلێک جار ڕەخنە دەوری خراپی دیوە لە ئەدەبی کوردیدا و بۆ مەبەست و سووککردنی بەرامبەر بەکار هاتووە.

زۆرجار شەڕو ناکۆکی کەسەکان خراونەتە سەر کاغەز و لەدواییشدا بەناوی ڕەخنەوە بە ئەدەبی کوردی فرۆشراوە. هەندێ نووسینیش لە ئەنجامی لێکنزیکی و هاوڕێیەتی دووکەسدا لە دایکبوون و دەقی زۆر نزم و بێپێزیان تێدا گەورە کراوە و دیسان بەناوی ڕەخنەوە بە ئەدەبی کوردی فرۆشراوە.

جگە لە دەردی کوشندە و نیگەتیڤی ناوچەگەرێتی، کە دەورێکی یەکجار خراپ و بەرچاوی هەیە لە پانتایی ڕەخنەی کوردیدا. بێگومان لەگەڵ ڕێزمدا بۆ کۆمەڵێک ڕەخنەی جدی و دوور لەم دەردانە.

* تایبەتمەندییەکانی چیرۆکی نەوەی ئێوە چین، ئەو جیاوازییانەی ئێوە جیادەکەنەوە لەگەڵ نەوەی پێش خۆتان؟

– خۆشبەختانە جیاوازییەکان زۆرن. هەر لەلایەنی زمانەوە بگرە تا دەگاتە سەر لایەنی گێڕانەوە و بیرۆکە و کەسێتی و.... .

ئاشکرایە زۆربەی چیرۆکنووسانی نەوەکانی پێشوو، بەشێوەی هەندەسی چیرۆکیان نووسیوە و کەمتر توانیویانە خۆیان لەو چوارچێوەی (سەرەتا.. گرێچن.. کۆتایی) ڕزگار بکەن، کە ئەو چوارچێوەیە لە چیرۆکی ئێستادا بە باشی تێکشکێنراوە، وابزانم هەر بەرچاو ناکەوێ، لە جاراندا و بەهۆی بارودۆخی سیاسی

ئەوکاتەوە، چیرۆکیش شێوە گوتاریکی سیاسی وەرگرتبوو، کەمتر وەکو ئەدەب مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. زۆربەی بیرۆکەکان ڕەنگدانەوەی دۆخی واقیعی سیاسی ئەو سەردەمانەن و کەمتر خەیاڵ دەوری بینیوە. ئەمە هەندێک دەقی بە ئەندازەیەک کوشتووە، کە زۆرجار تاوانێکی گەورەیە وەکو چیرۆک، یان دەقی ئەدەبی قسەیان لەسەر بکرێ، بەڵکو زۆرتر دەچنە خانەی شیعارات و هوتافی سیاسییەوە. هەڵبەت ئەم دەردە لە چیرۆکی ئێستادا زۆر زۆر دەگمەن بەرچاو دەکەوێ و ئەم وێنەیەش تەواو تێکشکێنراوە. بۆیە ئاساییە ئەگەر بڵێین، لەسەردەستی ئەم نەوەیەی دوای ڕاپەڕین، بیرۆکەی چیرۆکی کوردی بەباشی سیمای ئەدەبی پێبڕاو تا ڕادەیەکی باش لە گوتاری سیاسی پاککرایەوە.

بێگومان بۆ کەسێتیش بەهەمان شێوە. لە چیرۆکی جاراندا کەسێتی جگە لە گوتارە سیاسییەکە و بینینی دەوری ئەفسانەیی و سوپەرمانی، ئەرکێکی تریشی لەسەر شان بوو، ئەویش چاککردنی باری هۆشیاری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا بوو. بۆیە زۆربەی پاڵەوانە سەرکەوتووەکانی ئەو چیرۆکانە، کەسانی چاکەخوازو فریشتەیین، وەک نیمچە واعیزێک لە هەوڵی ئاگادارکردنەوە و هۆشیارکردنەوەی خەڵکیدا بوون. بێگومان ئەمەش دیسان بەزیانی لایەنی ئەدەبی چیرۆکەکان کۆتایی هاتووەو دوورخستنەوەی چیرۆک بووە لە هەم و ئەرکی ڕاستەقینەی خۆی، لێرەدا دەبێ دەوری گرنگ و سەرەکی چیرۆکنووس (شێرزاد حەسەن) لەیاد نەکەین، کە هەر لە هەشتاکانەوە ئازایانە هەموو ئەو قەیدانەی پچڕاند و خۆی لەو چوارچێوە تەنگانە ڕزگارکرد و ڕچەشکێنێکی باشیش بوو بۆ نەوەی نوێی دوای ڕاپەڕین.

بێگومان چیرۆکی ئەم نەوەیەش بەدەرنییە لە کەموکوڕی، بەڵام ئێمە باسمان لە تایبەتمەندی و جیاوازییە زەقەکان کرد.

**ئا: سەباح سابیر**




## گالێری ئارام
## ماڵێک لە جوانی و هونەر

گالێری ئارام، وەک هەر هەوڵێکی جیدی و هونەری دیکە، پرۆژەیەکی تاکەکەسییەو، بووە بە ماڵێک لە جوانی و هەوڵێک بۆکۆکردنەوەی ئەو توانا هونەرییانەی کە لەمیانی کارە هونەری و تابلۆکانیانەوە دنیایەک لە خەیاڵ و ئەندێشەو فیکر بەرهەم دەهێنن... هەوڵی لەم جۆرە بۆ بنیاتنانی ناوەندێکی نمایشی بەردەوام بۆ کاری هونەری کە بە (گالێری) ناوزەد دەکرێت تازە نییەو ناکرێت هەوڵەکانی هونەرمەندان نامیق عەلی قادر و بورهان سابیر لە دروستکردنی (گالێری ئاری) لەسەر قەڵای هەولێر لە ناوەڕاستی هەشتاکان و هەوڵی (د. فەرهاد پیرباڵ) لە دامەزراندنی (گالێری ئەربیلا) هەر لەسەر قەڵای هەولێر و هونەرمەند (سالار مەجید) لە دروستکردنی (گالێری سالار) لە سلێمانی و چەندان لە هونەرمەندی دیکەی ئەم بوارە لە یاد بکەین، لە بنیاتنانی ئەم ناوەندە هونەرییانەی کە بۆ خزمەتگەیاندن بە بزووتنەوەی شێوەکاری کوردی پێوەی ماندوو بوون.. گالێری (ئارام)یش یەکێکە لەو هەوڵە جیدی و باشانەی کە لەم بوارەدا بە هەوڵێکی تاکەکەسی لەلایەن هونەرمەندی شێوەکار (ئارام عەلی) و بەهاوکاری کۆمەڵێ هونەرمەندی شێوەکاری دیکەو کۆمەکی هونەردۆستان لەساڵی ٢٠٠٤ لەشاری سلێمانی دامەزراوە،.... ئەم گالێرییە پێکدێت لە هۆڵێک کە لەژێر زەمینی ماڵی هونەرمەندی ناوبراودو، شوێنێکی گونجاوە بۆ نمایشی تابلۆ و پەیکەر و سیرامیکی هونەرمەندان، لە هۆڵەکەدا کە نزیکەی (١٠×١٠م) دەبێت، بەرهەمێکی زۆری هونەری هونەرمەندان هەڵواسراوەو، زۆربەی کارەهونەرییەکان ڕەگەزەکانی

خۆیان بەرەو ئاقاری هونەری نوێ دەبەنەوەو زۆربەی هەوڵەکان لە نزیک فیکر و ئەندێشەی نوێگەری چڕ دەبنەوە.

خولی یەکەمی نمایشەکانی ئەم گالێرییە هەر لەساڵی ٢٠٠٤ دا بووەو لە خولەکەدا بەرهەمی هونەری (٤٩) هونەرمەندی تێدا پیشاندراوە، کە لەژێر ناوی (خولی هونەرمەند سەروەت سەوز) وەک ڕێزلێنانێک بۆ گیانی ئەم هونەرمەندە ناونراوە، لەم خولەدا هونەرمەندان هەریەک بەیەک تا دوو بەرهەمی خۆی بەشداری کردووە، جگە لەمەش «گالێری ئارام» لە هەوڵێکی دیکەیدا پەرەی بەلایەنی تیۆری هونەری شێوەکاری داوەو لەم بوارەشدا تاکو ئێستا کۆمەڵێ کۆڕ و سیمیناری زۆر نایابی ڕەخساندووە بۆ هونەرمەندان و ڕۆشنبیران تا هەم لەکارەکانی خۆیان بدوێن و باس لە ڕەوتی ئەم هونەرە بکەن لە دنیادا.. لەم بوارەشدا یەکەمین کۆڕی لە ٢٠٠٤/٧/٢٢ بۆ هونەرمەند (شێرکۆ عەباس) و بەڕێز (عەبدوڵڵا محەمەد) سازکرد کە کۆڕێکی ڕەخنەیی بوو بۆ سەر کارێکی هونەرمەند (شێرکۆ عەباس) لەژێر ناوی «ماڵێک بێ دیوار».. ئەمەو هەر لەوێدا بڕیار درا کە هەموو ڕۆژێکی پێنج شەممە کۆڕێک ڕێک بخرێت، کۆڕی دووەم بۆ هونەرمەند (قادر میرخان) سازکرا لەژێر ناوی (زمانی فەخار) هەروەها کۆڕی سێیەم بۆ ڕەخنەگری سووری (سامی داوود) سازدرا بەناوی «جمالیات المکنه».

ئەمەو چەندین کۆڕی دیکەی بۆ هونەرمەندان (بورهان هەژار) و (هیوا دۆمان) و (ستار قادر) و (تەها عەبدوڵڵا) و (گارا) و (کامەران شەوقی) و (تەیب عەلی) و (محەمەد فەتاح) ڕێک خستووە بەجیا لە نمایشکردنی کۆمەڵێ چالاکی دیکەی نمایشی (سلاید) بۆ کارە هونەرییەکانی هەریەک لە هونەرمەندان «ئیسماعیل خەیات» و «ڕۆستەم ئاغاله» و گرتنی کۆڕێک بۆ هونەرمەندی فەرەنسی «خاتوو ئیدیت» لێپرسراوی ڕێکخراوی باڵندەباران، هەروەها نمایشی فیلمێک سەبارەت بە (فرانسس بێکۆن) و کردنەوەی پێشانگایەکی «ئەنستلەیشن» بۆ کۆمەڵێ هونەرمەندی دیکە.

شایانی باسە گالێری ئارام ئێستا سەرقاڵی خۆ ئامادەکردنە بۆ کردنەوەی خولی دووەمی گالێرییەکەی، ئەم گالێرییە لە پرۆژەیدایە درێژە بە کۆڕ و سیمینارەکانی بدات و نمایشی چەندین فیلمی دانسقەی هونەری بکات، سەبارەت بە هونەری شێوەکاری جیهانی، گالێری ئارام لە شاری سلێمانی دەکەوێتە گەڕەکی شۆڕش کۆڵانی تەنیشت ئەمنە سوورەکە، ڕۆژانە خەڵکی هاموشۆکاران و دۆست و هونەرمەندان سەردانی دەکەن و یەکێکە لەو بنکە هونەرییانەی کە دەچێتە نێو مێژووی تازەی هونەری شێوەکاری کوردییەوەو هەوڵێکە جێگای دەست خۆشی لێ کردنە.

**حەمە هاشم**



# پێشانگایەکی تایبەت بە منداڵان

منداڵانی بێ ناونیشان.. منداڵانی لاکۆڵان و کارپێکراو، بابەتی سەرەکی سەرجەم ئەو تابلۆ فۆتۆگرافییانە بوون، کە خاتوو (مژدە مەحموود جاف) لە کاتژمێر (١٠)ی سەرلەبەیانی ڕۆژی ٢٠٠٤/١١/٢٣ لە هۆڵی میدیای شاری هەولێر نمایشی کرد. ئەم پێشانگایە کە لەسەر ئەرکی خاتوو «مریەم»ی کچی پێشەوا قازی محەمەد ڕێک خرابوو، تێیدا نزیکەی (٣٠) تابلۆی فۆتۆگرافی قەبارە ٥٠×٣٥سم نمایش کرابوو، ئەمە جگە لەوەی کە کۆمەڵێ یاری ساکاری دارەدەستی منداڵە هەژارەکان هەڵواسرابوون، لەوانە «دار لاستیک و تایەیەکی ئاسنینی پایسکل».. لە تەک ئەمانەشدا خاتوو (مژدە) بە ئارەزووە شاعیرانەییەکەی خۆی، کۆمەڵێ دێڕی شیعری هەڵواسیبوو کە گوزارشتکردن بوون، لە گرتە فۆتۆگرافییەکانی، ئەگەرچی لە ڕووی تەکنیکەوە وێنە فۆتۆگرافییەکان سادەییەکیان تێدا بوو، بەڵام (مژدە) وەکو ئیحساسێکی مرۆڤ دۆستانە، مەزەندەی دیمەنەکانی کردبوو، سەرجەم ئەوبارە نالەبارە زەحمەتانەی کردبوو بە هەوێنی بابەتەکانی، کە ئەمڕۆ منداڵانی کوردستان تێیدا دەژین،.. منداڵانی کارپێکراو، ئەو منداڵانەی کە لەسەر گوفەکەکان بۆ دۆزینەوەی تیشکی هەتاو دەگەڕێن، منداڵە چاو بە فرمێسکە باوک ئەنفالکراوەکانی گەرمیان و ماندووە ڕێگا دوورەکان، ئەمانە سەرجەم دیمەنە وێژدان هەژێنەکانن، (مژدە) بەسوود وەرگرتن لە پێشە

ڕۆژنامەوانییەکەی.. سەرنجی لەم کارەداوەو، بەرهەمە فۆتۆگرافییەکانیشی زۆربەیان دەچنە خانەی هونەری فۆتۆگرافی ڕۆژنامەوانییەوە،.. ئەو دەیەوێت لە ڕێگای پیشاندانی ئەم دیمەنانە دەنگی نارەزایی منداڵان بگەیەنێتە حکومەت و لایەنە پێوەندیدارەکان، ئەو دەنگەی کە لە قووڵایی ناخی منداڵەکاندا سەرکوت کراوە.

پێکهاتەکانی دارشتن لەو گرتانەدا زۆر لاوازن، چونکە (مژدە) نەیتوانیوە ئەو کایە هونەرییانە بدۆزێتەوە کە بۆ هاوسەنگی تابلۆکانی پێویستن، زۆرجار هەست دەکەین لە تابلۆکانیدا سەنگی قورساییەکی تۆخ، یان کوتلەیەکی گەورە کەوتۆتە لایەک و لاکەی دیکەی کاڵتر و کەم بایەختر نیشان دراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە (مژدە) لە هەوڵەکانیدا سەرەتاییە و هێشتا ئەو ممارەسە زۆرەی نییە لەسەر فۆتۆ وەک (هونەر) تابتوانێ لە چوارگۆشەی هاوێنەکەیەوە کوتلە و فیگەرەکان بەهاوسەنگی و بەبێ دوودڵی جێگیر بکات، ئەمەش بۆ ئەو ئەوینییە سەرەتاییەی دەگەڕێتەوە کە حاڵەتێکی مەعنەوییە لە بینینی گوزارشتی گرتەکان، واتە ئەو هێندەی بابەتەکە کاریگەری بەسەری هەبووە، ئەوەندە حیسابی بۆ لایەنە هونەرییەکەی نەکردووە، وەک (هێڵ و فیگەر و تاریکی و ڕووناکی و بۆشایی).. کە ئەمەش بۆخۆی لایەنێکی پۆزەتیڤە لەکاری هونەری فۆتۆگرافدا.

لەلایەکی دیکەوە بەجێهێشتنی بۆشایی بەو ئەندازە زۆرە کە دەبینرێت، کە گرنگی بابەتەکانی کەم کردۆتەوە، هێندێ جار بابەت دەبێت بە پنتێکی بچووکی نێو ئەو بۆشاییە زۆرە و لەنێویدا دەخنکێت...

جگە لەمانەش هەرچۆنێک بێت کاری لەم جۆرەی (مژدە) جێگای دەستخۆشی لێکردنەوە و دەروازەیەکی سەرەکییە ڕووە و بابەت و بەرهەمی ئەفرێنەر لە دنیای هونەری فۆتۆگرافدا و ئەمە نیشانەی بەردەوامیتی و هەوڵدانە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە هونەرییانەی کە لە دوارۆژدا چاوەڕوانییێتی.

**هەناسە**

## پرۆفیسۆر (فرید هیلم مینیکس) و چوارکۆڕی شێوەکاری لە سلێمانی



وەک بایەخدانێک بە ڕەوتی شێوەکاری و ڕەخنەی شێوەکاری ڕۆژانی ٢٥-٢٨/٩/٢٠٠٤ لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی لەسلێمانی و بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی بەرچاوی شێوەکاران و ڕۆشنبیران، ڕێکخراوی (تاقیگەی هونەرهونەر) بانگێشتی پرۆفیسۆرو دکتۆر (فرید هیلم مینیکس) کرد بۆ بەستنی چەند کۆڕێک لەسەر ئەزموونە ناوازەکانی ڕەوتی شێوەکاری، بەرنامەی کۆڕەکانیش بەم شێوەیە دەستی پێکرد ڕۆژی ٢٥-٩/٢٦ کۆڕێکی تایبەت بەناونیشانی (فرانسس بیکۆن و ڕەگەکانی لەنێو هونەری سوریالیزم و بیکاسۆدا) لەم کۆڕەدا پرۆفیسۆر باسی لە ئەزموونی بیکۆن کرد و دواتریش ڕادەی کاریگەری ئەو لەسەر هونەری سوریالیزم لە دنیادا بەگشتی و لە ئەوروپادا بەتایبەتی کرد، پاشان چۆنیەتی کاریگەری ئەم ئسلوبە لەکارکردن لای هونەرمەندان و چۆنیەتی گەشەسەندنی لە دنیادا ڕوون کردەوە، دواتریش کاریگەری بیکۆن لەسەر هونەرمەندی جیهانی بەناوبانگ (بیکاسۆ) کە ئەمە لەمێژووی شێوەکاریدا زۆرنادیارەو ئەم پرۆفیسۆرە زۆر هونەریانە شیکاری کرد و ئامادەبووانیش بەدیالۆگ و پرسیار ئەمەندەی تر کۆڕەکەیان دەوڵەمەنتر کرد، پاشان مینیکس ڕاوبۆچوونی خۆشی وەک ڕەخنەگرێک خستەڕوو. لەکۆڕی دووەمیدا کە لە ڕۆژانی ٢٧-٩/٢٨ بەڕێوە چوو هونەرمەند باسێکی دوورودرێژی بەناونیشانی «جۆزیف بۆیس.. هونەرێک بەدەر لە جوولە» پێشکەش کرد لەم کۆڕەشیدا بەدوورودرێژی هەڵوێستەی لەسەر تێزەکانی جۆزیف بویز کرد وەک ڕەخنەگر و هونەرمەندێکی ناودار و داهێنەر، بەدوورودرێژیش وەزیفەی شیکارکردنی تابلۆی بۆ ئامادەبوان خستەڕوو کە بەشێوازێکی نوێ، بۆ یەکەم

جاریش بۆبینەران گوێیان لەو تێڕوانینە تازانە بێت سەبارەت بەخوێندنەوەی تابلۆ وەک تێزێکی هونەری هاوچەرخ.

پاشتر بە دووروودرێژی لەسەر وەزیفەی ڕەخنە لە ڕەوتی شێوەکاری دواو سەرجەم بۆچوونەکانی لەسەر بینینی هونەریانەی تابلۆ خستەڕوو، بەتایبەتی لەوبۆچوونەی کەتێکست و بەرهەمی هونەری، یان تابلۆ بەریەک دەکەون و پێکەوە دەقێکی نوێ دەخولقێنن بەدەر لەویستی هونەرمەند ئەوەی شایەنی باسە پرۆفیسۆر مینیکس ئەم کۆڕانەی بەتایبەتی بۆ شێوەکارانی کورد گرتبوو کە ئەمەش هەنگاوێکی گەورەیە بۆ شێوەکارانی کورد، مینیکس لەساڵی (١٩٤٠) لە ئەڵمانیا لەدایک بووەو خوێندنی لەبواری زانستی ڕامیاری و ئاین و فەلسەفە لە زانکۆی (بۆن میونخ) لە فرانکفۆرد تەواوکردووەو دواتر دکتۆرای وەرگرتووەو لەساڵی ١٩٩٦ بووە بە پرۆفیسۆر و مامۆستا لە ئەکادیمیای هونەرەجوانەکان لەبەرلین و خەڵاتی پرۆفیسۆری وەرگرتووەو تا هەنووکەش چەندین خەڵاتی نێودەوڵەتی وەرگرتووەو چەندین کتێبی چاپکراویشی لەسەر شێوەکاری هەیە، ئەمە جگە لە چەندین وتار و لێکۆڵینەوە لە بڵاوکراوەکانی ئەڵمانیا.

**کاردۆ ئەحمەد**
**(سلێمانی)**

---



## تونێلەکانی ڕەنو

بە ناونیشانی (تونێلەکانی ڕەنو) هونەرمەندی فۆتۆگرافی (دکتۆر نەوزاد)، لە ڕێگای بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری و هونەری پارێزگای هەولێر، پێنجەمین پیشانگەی فۆتۆگرافی تایبەتی خۆی لە هۆڵی گەلەریی میدیا کردەوە لە ماوەی (١ - ٢/ ١٢/ ٢٠٠٤) بەردەوام بوو.

لەم پیشانگەیەدا هونەرمەند (٣٠) تابلۆی ڕەنگاوڕەنگی قەبارە (٣٠ × ٤٠)سم خستبووە ڕوو، زۆربەی هەرە زۆری تابلۆکان گوزارشتیان لە ناوچەکانی کوێستانی کوردستان دەکرد. هەندێ گرتە گوڵی جۆراوجۆر لە کەلێنی بەردە شاخ و لەناو بەستەڵەکدا سەریان دەرهێنابوو، سەرەڕای ژیانی کوردەواری لەو ناوچانەدا کە چۆن گوزەرانیان بە سەختی بەسەر دەبەن، لە هەندێ گرتەی تردا تەمومژ و هەوری سەر شاخە سەختەکانی بە گۆشەنیگای تایبەتییەوە بەرجەستە کردبوو.

ژیان و جوانی کوێستان لەلای خەڵکی ئێرە ون و شاراوەیە، هونەرمەند لە میانی ئەو گرتانەیدا توانیبووی هەوا و کەشی کوێستان بە بینەرانی ئاشنا بکات. ئەوەی جێی سەرنج بوو بابەتەکانی پچڕ پچڕی و پەرتوبڵاوی پێوە دیار بوون، وەنەبوو زۆربەی گرتەکان لە تەوەرەیەکی سەرەکی بخولێنەوە، هەستت بەوە دەکرد لەنێو دنیای سروشت و بابەتی ورد و ناسکدا بازت دەدا و دەچوویتە نێو ژیانی لادێییەکان، بەڕای من پیشانگەکە سەرکەوتووتر دەبوو ئەگەر بهاتایا بابەتەکانی یا سروشت بووان، یانیش ژیانی ئەو دەڤەرە، بۆ ئەوەی ڕیتم و ئیقاعی بابەتەکان پچڕ پچڕی تێنەکەوتایە. بەهەرحاڵ من زیاتر چێژم لە پیشانگەکانی پێشووی وەردەگرت و یەکگرتوویی لەنێو بابەتەکانی نێو پیشانگەکانی پێشوویدا بەدی دەکرا، کە ئەمە دڵێم وەنەبێ لە ئاستی هونەریی ئەم هونەرمەندە کەم کەمەوە، چونکە کاک نەوزاد عیشق و خۆشەویستییەکی گەورەی هەیە بۆ دنیای هونەری فۆتۆ و کوێستانی کوردستان، بۆیە ئومێدی ئەوەی لێدەکرێ لە داهاتوودا هەنگاوی لەبارتر لەم مەیدانە بهاوێ.

ماوەتەوە بڵێین هونەرمەند لە ساڵی (١٩٦٢) لە شاری کەرکوک لەدایک بووە و دەرچووی ئامادەییە و یەکەم بەرهەمی هونەری لە ساڵی (١٩٩٦) نمایش کردووە.

**ب. هەوراز**

# جەلال کۆچەر: ئەو هونەرمەندەی لە نەهامەتیشدا سەری نەوی نەکرد



یەکێک لەو هونەرمەندە کوردانەی چەپکێ گۆرانی بۆ جێهێشتووین کە هەمیشە ئەو گۆرانییانە زیندوون و ئەرشیفی گۆرانی کوردییان دەوڵەمەند کردووە «جەلال کۆچەر»ی خوالێخۆشبوو، کە ئەمیش وەک (قادر کابان و قادر زیرەک)ی ڕەحمەتی سەربردەی ژیانی هەر هەمووی مەینەتی و کوێرەوەری بووە.

ئەم هونەرمەندە گۆرانیبێژە ناوی تەواوی «جەلال ئەحمەد وەیسە»یە وەک دەڵێن هەر زوو دڵی خەبەری داوەو نازناوی (کۆچەر)ی بۆ خۆی دانابوو، لەساڵی (١٩٤٣) لە گەڕەکی دەرگەزێن هاتۆتە دنیاوە.

ساڵی (١٩٥٢) چۆتە قوتابخانەی فەیسەلییەو هاوینانیش لە قوتابخانەی (کەشتی نوح)ی مامۆستا (نەجمەدینی مەلا) خوێندوویەتی، هەر لە منداڵییەوە خولیای وتنی گۆرانی بووەو ئارەزووی گوێگرتنی مۆسیقای هەبووە، بۆ ئەوەش دایکی هاندەری یەکەمی بووە کە ناوی (عیسمەت خانی قادر ئاغای مەحموود ئاغا) بووە، بۆ یەکەمجار لەساڵی (١٩٦٠)دا چۆتە سەرشانۆ لە قەڵادزێ و لەشانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر)دا بەشداری نواندنی بەسەرکەوتووانە کردووە، لە ساڵی (١٩٦٢)بووە بە ئەندامی کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی کورد لە سلێمانی، لە ڕەشبگیری ساڵی (١٩٦٣)دا لە سلێمانی دەگیرێ و دوای بەربوونی بۆ بژێوی ژیان و خولیای بۆ هونەر و گۆرانی چۆتە بەغدا و لەئێزگەی ئەوکاتەی ڕادیۆی کورد لەبەغدا بووە بە ئەندامی تیپی نواندنی ئێزگە و لە چالاکییەکانی ڕۆژانەدا بەردەوام بووە، لەساڵی (١٩٦٤)دا دەیکەنە ئەندامی کۆرسی گۆرانی ئێزگەی کوردی، هەر لەو ماوەیەدا پاشان دەنگی تاقی دەکەنەوەو لە (١٨/١٢/١٩٦٤)دا بۆ یەکەمجار گۆرانی «ئەستێرەی پرشنگدار» لە ڕادیۆی بەغدا تۆمار دەکات، کە لە شیعری (بەختیار زێوەر)و ئاوازی خۆی بووە، دواتر لە چالاکییەکانی لەگەڵ هونەرمەند «حاجی مەکی»دا بەشداری لە فیلمی «ڕەهێڵە» کردووە، بەڵام بۆیان تۆمار نەکردوون.

لە ڕێکەوتی (٢٦/١١/١٩٦٧) بۆ یەکەمجار گۆرانی (پەریزاد)ی بۆ (TV) تۆمار کردووە کە لە شیعری (کەیفی عەبدوڵڵا پشدەری) و ئاوازی خۆی بووە، ئەم گۆرانییە بۆ یەکەمین جار یەکەمین گۆرانییە کە لە سەرەتای دامەزراندنی (TV) کەرکووکدا تۆمارو پیشان درابێ، هەر لە درێژەی چالاکییەکانیدا (١٤) گۆرانی بۆ (TV) کەرکووک پێشکەش کردووە، یەکێک لەو گۆرانییانەی ڕەنگاو ڕەنگە لەشیعری (عەلی عارف ئاغا)یە بەناوی (گوڵ و خونچە) لە ئاوازی (ڕەفیق چالاک) کۆی گۆرانییەکانی لە ئێزگەی کوردی بەغدا گەیشتۆتە (٦٨) گۆرانی و مەقام و سروودیشی تێدایە.

ساڵی (١٩٧٠) دەگەڕێتەوە بۆ شاری سلێمانی و دەبێت بە ئەندامی ئەوکاتەی (کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی) و بەئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر هەڵدەبژێردرێ و دەبێتە لێپرسراوی بەشی گۆرانی و مۆسیقاو هەڵپەرکێ و ڕۆڵێکی باش و بەرچاوی هەبووە وەک هونەرمەندێ هەوڵی نوێگەری پێوەدیار بووە، لەساڵی (١٩٧٤) خێزانی پێکەوەناوەو لە ساڵی (١٩٧٦)دا پێناسەی ئەندامێتی ڕۆژنامەنووسانی وەرگرتووە، هەوڵی وەرگێڕان و خوێندنەوەو فیلم و بەڵگەنامەی گرتۆتە ئەستۆ، جگە لەمە لە کتێبخانەی ئەرشیفی شانۆییدا کاری کردووەو ئەرشیفێکی باشی بۆ شانۆی کوردی دامەزراندووە تا ساڵی (١٩٨٢) هەر لەوکارەدا بەردەوام بووەو هەر لەهەمان ساڵدا داوای کردووە بیگێڕنەوە بۆ (TV) کەرکووک، بەڵام بۆیان نەکردووە، ئەویش ناچار کشاوەتەوە بەغداو تا ساڵی (١٩٩٠) ماوەتەوەو پاشان بەیەکجاری دەگەڕێتەوە شاری سلێمانی و «کۆمەڵەی هونەری نەتەوەیی کورد» لەدوای ڕاپەڕین دروست دەکات، پاش ماوەیەک و بەنیازی سەردان و وێڵبوون بەدوای کەسوکار و کارێکی گونجاو لەگەڵ هونەری کوردیدا ساڵی (١٩٩٣) دەیەوێ بچێتە شاری مەهاباد، لە ڕێگا لە نزیک شاری سەردەشت بەهۆی وەرزی سەرماو

سۆڵەو شەختەو بەفرێکی زۆرەوە ڕۆژی (٣/٣/١٩٩٣) دەبن بەژێر هەرەسی بەفرەوە وبێ ئەوەی کەس گوێی لە ڕازی دڵ و دەروونیان بێت سەرپۆشی بلوورینی بەفر بە بێدەنگی خۆی و (هونەر)ی کوری دادەپۆشێ و گیانیان تێکەڵ بە جریوە کۆچەرییەکانی ئەو دەڤەرە دەبێ و دواتر تەرمەکانیان دەهێنرێتەوە شاری سلێمانی و لە گردی سەیوان بەخاک دەسپێردرێن، بەم ئاکامە ناکامەوە هونەرمەندێکی خەمڵیوی ژێر دەستی کوێرەوەری و ئەشکەنجەو دڵشکان سەردەنێتەوەو دەنگێکی تری زوڵاڵ و هەست ناسکی دیوەخانی هونەری کورد کپ دەبێ، ئەو دەنگە بەسۆزەی کە هەر کەسێ گوێی بۆ ڕادێرایە، چەندە بێ ئاگاش بوایە، ڕاپێچی دەکردە دنیایەکی جوانەوە، هونەر بەلایەوە دەربڕی دیمەنی جوانی سروشت بوو، لە ڕێی مۆسیقاو گۆرانییەوە هەوڵی دەدا تا ژیان جوانتر برازێنێتەوە، هەر بۆیە نیازی بوو لە پاڵ ئەو (١٠٠) مەقام و گۆرانییەی کە وەک بەرهەمی خۆی تۆماری کردبوون دەنگی چەند هونەرمەندێکی بەناوبانگی کوردیش بەیەک ئاوازەوە و لەیەک سازدا بگونجێنێ و تۆماریان بکات، مخابن مەرگ یەخەی پێ گرت و ڕێگەی نەدا هەموو ئەو پرۆژەو هیوا جوانانەی وەدی بێنێ کە بۆ هونەری مۆسیقاو گۆرانی کوردی لە ناخیدا پەنگی خواردبوو.

**ئەحمەد دەنگ گەورە**
**(سلێمانی)**

---

# قانیع: ئەو شاعیرەی شەهیدی عیشقی میللەت بوو

قانیع ئەو شاعیرە ئێسک سووکەیە کە بەشاعیری چەوساوەکانی کوردستان ناوبانگی ڕۆیشتووە و، بەڕاستیش شاعیری خەمخۆری چەوساوە و داماو و هەژاران بووە. بلیمەت و بوێری ئاوێزانی ژان و ژیواری خەڵکی ستەمدیدە و بوێرانە بەگژ هەر کردەیەکی ناهەموار و نالەباردا دەچووەوە و نەیدەتوانی نەیەتە دەنگ.

قانیع ئەو سەرە بڵندە بوو کەسەری پڕبوو لە (سەودای نیشتمان) و بۆ کزی کوردی بێکەس چاوەکانی ئەشکی پیادەهاتە خوار... خاوەنی ئەو دەم و دەنگە بوو هاواری هۆزی پێدەکرد، هەر ئەوەبوو ناوی بەهەموو کووچەیەکدا ڕۆیشت و پەخش بوو، لەبیرمە قوناغی سەرەتایی خوێندنم لە کۆڕی گەرمی شەوانەی ماڵی مامم (حاجی ئەمینی جەڕاح) لالە فەتاحی هاوسێمان دەست پێکرد کە بە (فەتەی نامە) ناسراو بوو، پیاوێکی قسە خۆش و کۆڕگەرم و یەکسەر بە وەڵام بوو، زۆرێک لە شیعرەکانی مامۆستا قانیعی ئەزبەر بوو بەبێ خوێندەواری و هەر کە دەهاتە ژوورەوە دەیوت: توخوا (شریتەکەی مامۆستا قانیعی ڕەحمەتیم بۆ لێدەن با بیژێ) کە شریتێکی تەسجیل بوو ئەو دەم لەناوخەڵکدا بڵاوبوو. بەداخ و کەسەرەوە دوای ئەو هەموو ئازار و نارەحەتیانەی قانیع لە ژیاندا چەشتی لە پێناو چەوساوە و هەژارو خاک و وڵات و گەل و نیشتماندا، تا ئاستی پێویست هێشتا ئەوەی لەسەر نەنووسراوە شایان و شیاو بێت. بەتایبەتی شاعیرێکی وەکو قانیع دەبوو دوای ڕاپەڕین زۆر و زیاتر لە هەگبەی بیر و شیعریدا دەربهێنرایە و لەسەری بنووسرایە. قانیعێک کە شەهیدی عیشقی میللەت بوو.

حەزدەکەم بە وردبوونەوە و سەرنجدان و چوونە ناو دنیای شیعری قانیعەوە وەکو کوردێکی وەفادار گەر بەسەر پێش بێ، چەپکێ گوڵی شیعری لە گوڵزارەکەی بهێنم و ئێوەش لە بۆبەرامەی نازەنینی ئەو گوڵە شیعریانەی ڕامێنن، کە لە ڕۆژگارێکدا دەیکردە مەدالیای سەرسنگی میللەتەکەی، کەم کەس دەیوێرا ئاوا سنووری پەرژین ببڕێت و گوڵ بهێنێ بۆ کوڕ و کچ و کاڵی ئەم گەلە. بەڕاستی بێ ئەوەی زۆر بەدوای شیعرەکانیدا بگەڕێیت، دەست بۆ هەر بەیت و دێڕ و شیعرێکی بەریت، پڕە لە پەند و ئامۆژگاری و شتی ناوازە، هەر بۆیە هەر شیعرێکی بگری بابەتێک هەڵدەگرێ، بەداخەوە گەلێ جار بەوە تۆمەتبار کراوە کە کابرایەکی هەڵگەڕاوە بووە لە ئاین و ئیسلام و کەچی وانییە و هەڵەگۆیی دەکرێت، بەڵکو ئەو لە ڕۆژگارێکدا ژیاوە کە دەست برین



و چاوبەست و فێڵ بەناوی دینەوە زۆر کراوەو ماڵ و موڵکی هەژار لە خزمەتی بەگ و ئاغاو مەلای نامەلاو شێخی بەناوشێخدا بووەو ئەوانیش تەنیا ڕەنجی بێ گەنجی پڕ لە ژانیان بۆ ماوەتەوە، قانیعیش پێی ڕەوا نەبووە و هاتۆتە دەنگ و هاوار و هەرای لەسەر کردووە و گەندەڵی ئەو ڕۆژگاری بەدەرخستووە لە بڵندگۆ و گۆشە نیگای شیعری خۆیەوە بۆیە دەڵێت: بەکوفری تێ مەگەن ئەشعاری ووردم- هەمووی پەند و دووڕو مەرجانە بۆتان.

قانیع هەمیشە بەگژ دوژمندا دەچووەوەو تاک و کۆمەڵی لە زیانبەخشی ئاگادار دەکردەوە و ئەوەتا لەشیعری (چۆن، نەگریم؟)دا کە سەرەتاکەی بە (کوردە: چۆن نەگریم هەمیشە...)دا دەڵێت:

**خوێنی تۆیە شەربەتی ڕۆژی جلوسی ئەجنەبی**
**سەیری دوژمن کە، لە شار و کوچەو و بازاڕی تۆ**
**سەوزەگیای کارێزی پاشا، مێشکی باپیری منە**
**ئێستە وا فەرشە لەبەر پێی، دوژمنی خوێنخواری تۆ. (ل١٨٣).**

قانیع بێباکە لە کۆت و بەندی دوژمن و هەمیشە بە مەردی و نەبەردییەوە تا دوا هەناسەی ماڵئاوایی بۆ کورد لە کاردا بێ و لە بارداییت بڕیاری دەدا نکوڵی و کەمتەرخەمی نەکات و خۆی نەفرۆشێ و بەپارەو تاج و بەرگی بێگانە ناسنامەی خۆی ناشیرین نەکات، ئەوەتا دەڵێت:

**هەتا ماوم ئەبێ بۆ غیرەتی ئەم خاکە دەعواکەم**
**خەڵاتی دوژمن و فەرقەی خیانەت قەت لەبەرناکەم. (ل.٢٥)**

لە شیعرێکی تردا قانیع بە ناونیشانی (سەرم ناوێ) زۆرێک لە ئەندامەکانی جەستەی هەر لە (سەر و چاو و گوێ و دەم و زمان و دەست و قاچ)ی هێناوە و نایەوێ گەر یەکێکیان مەیلی بەلای دوژمندا بڕوات و بۆ ژیانی داماو و هەژار و گەل و وڵات خۆی بفرۆشێت، چونکە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی هۆش و بیر و دەم و دەستەوە مەیلی هەواداری دوژمنی هەبێت، یا لافی بەگی و سەرداری لێبدات و دەڵێت:

**سەرم ناوێ کە فیزی بەگلەری و سەرداری بنوێنێ**
**دەمم ناوێ کە تیکەی زل زلی تەنهایی بکلێنێ.... تاد. (ل-٢٥١)**

چەن مرۆڤدۆستانە و خەمخۆرانە بیری کردۆتەوە هەمیشە بەتەنگ خزمەتەوە بووە گەر بۆی بلوایە، ئەوەتا لە شیعری خۆزگەی (قانیع)دا کە چوار پارچە شیعرە و هەریەکەیان لەکاربەدەستی (مەئمور- حاجی و توجار- تەبیب- ئاغا)یەو باسیان لێدەکات و دەڵێ: خۆزگە من لەوانە بووایەم ئایا ناوچاوم لە داماو و هەژار و نەدار و بێ دەرەتانان گرژ و مۆن دەکرد؟ یا کارم بە چاکی و پاکی بۆ ڕادەپەڕاندن و هەڵوێستی کوردانە و مەردانەم لەگەڵیاندا دەکردن، بۆ نموونە لە پارچەی یەکەمیاندا دەڵێت:

**خۆزگە من ڕۆژێ ئەبووم بە مەئموور- ئەهاتن بۆ لام لە نزیک و دوور**

دواتر دەڵێت:

**ئاخۆ ناوچاوم لەکەس گرژ دەکرد- دەستی تەماعم بۆ هیچ کەس ئەبرد**

دواتریش دەڵێت:

**بەهۆی چواراوەوە منیش پیاوم- دانیشتووی کورسی و خاوەنی ناوم. (ل ٣٢٠)**

قانیع لەسەر دەست بڕین و باسی بەشوودان و نوشتە و فێڵ و ئازار و ئەشکەنجەی بەگ و ئاغاو خۆویستی و یەکنەگرتن و دوژمنایەتی و تەگەرەدان و پاشقوڵ و کەپکەنانەوەو بردنی پیت و بەرەکەت و سورانە و سەرانە و دزی و جەردەیی و کوێرەوەری و دەربەدەری و جەهل و نەخوێندەواری و دواکەوتن و زۆر شتی تر، زۆری وتووە و دەردەدڵی زۆر هەڵڕشتووە بە چارەسەری و مەرهەمی (یەکگرتن و هاوکاری تەبایی و برایەتی و خوێندەواری و دڵسۆزی و لێبڕان و چاکەخوازی و ماف و حەق و یەکسانی و پەروەردە و ڕەوشت و ڕاستگۆیی و خەبات و قوربانی... تاد) گەر بکرێتە پرۆگرامی پیادەکردن چارەی دەکات، تا میللەت و کۆمەڵگە لە جەهل و نەزانین قوتاربێت.

قانیع لە زۆر بواری تردا شیعری وتووە و گەشتی شیعری خۆی ڕێک خستووە، شیعری (ئاینی و مێژوویی و وەسف و ستایش و جوانی) کوردایەتی بەتایبەتتر هەوێنی مەیینی شیعرەکانێتی، لێرەدا ناکرێ لە هەمووی بدوێین و بخرێتە ڕوو بەگەشتکردن بەناو مەملەکەتی شیعری قانیعدا زۆر شتی تر بەدی دەکەین کە قانیعانەو بە ئەنگوستی ئەو نایاب بینەخشێنێ و لەگەڵ وشەدا ئاوا ئاوێزان بن.

بەهیوایین هەر هیچ نەبێ نمەیەک لە دەریای شیعری قانیعمان بەدەرخستبێ و وەکو وەفایەکیش بۆ ئەو دڵسۆزییەی قانیع و ئەو هەستە پاکەی بەرامبەر بەگەل و وڵات و خاک و نیشتمان و چەوساوە و هەژارەکان شتێکمان کردبێ لە شایان بوونەوە نزیک بێت. لە کۆتاییدا هەر بەو دێڕە شیعرە دێینە کۆتایی گەر خۆشەویستی قانیع و کەسانی هاوشێوەی قانیع بەرامبەر خاک وا دێوانە بن کە خاکی سووتووی نیشتمان بکەنە سورمەی چاوەکانیان و قانیعانە بڵێت و بڵێین:

**نیعمەتە ئەم خاک و خۆڵەم، تا ئەبەد جێی نایەڵم**
**خاکی سووتاوی وەتەن، بۆ سورمەیی چاوانمە (ل١٤٨)**

**عەبدولرەحمان تاوەگۆزی**
**(زەڕایەن)**



# سادق هیدایەت لە زمان برازاکەیەوە

**خۆکوژی سادق هیدایەت**
**چڵەپۆپەی دەسەڵاتی ئەو بوو لە بڕیارداندا**

جاری یەکەم کە هیدایەت دەستی بۆ خۆکوژی برد، سەبارەت بەلاوێتی، بێ ئەزموونی و پەلەکردن، ڕێگایەکی بۆ گەیشتن بەمردن هەڵبژارد کە نەگرینگ بوو نەحیساب بۆ کراو. بۆیە کاتێک کەوتە ناو ڕووباری ماران، دوولاوکە لەو نزیکانە خەریکی ئاژۆتنی بەلەم بوون، دەنگی پەلەقاژەی ئەویان بیست و لە ئاوەکە دەریان هێنا. ئەم ڕووداوە لە ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی (بانەمەڕ)ی ساڵی (١٣٠٧)ی هەتاوی (١٩٢٨)ز ڕووی داو لەدوای ئەمە هیچ ئاگایەکمان لە هیدایەت نەما سەبارەت بەوەی کە هەوڵی پساندنی هەودای ژیانی بداتەوە، تا (١٩)ی (خاکەلێوە)ی ساڵی (١٣٣٠)یانی بۆماوەی (٢٣) ساڵ. لەوماوەیەدا بیری خۆکوشتن لەلای هیدایەت کەم ڕەنگ ببۆوەو بەهەر جۆرێ بوو درێژەی بەو ژیانە پڕ چەرمەسەرییە دا. دوای هەوڵی یەکەمی بۆ خۆکوشتنی برا گەورەکەی هیدایەت واتە عیسا هیدایەت، کە لە مەدرەسەی (نظام الفنون)ی (بلۆ) خەریکی خوێندنی سەربازی بوو، بۆ باڵوێزخانەی ئێران لە پاریس بانگ کراو لەوێ براکەیان دایەوە دەست ئەو کە هەوڵی خۆکوشتنی دابوو. دەبێ ئەوەمان لەبیربێتِ کە سادقی هیدایەت لەلای بەرپرسانی باڵوێزخانەی ئێران کەسێکی سادەو ئاسایی نەبوو. (مەهدی قولی خانی هیدایەت) -مخبر السلطنە- سەرەک وەزیر بوو. (قولی خانی هیدایەت)- اعتضاد الملک- باوکی سادق بەرپرسی کابینەی سەرەک وەزیران بوو و....

تەواوی ئەندامانی باڵوێزخانە و لەوانە (حوسێن عەلاء) وەزیری شای ئێران لە پاریسیش ئەم ڕاستییەیان دەزانی و هەربۆیە دەیانویست لەحاست ئەو ڕووداوەدا، بەئاگایی و بەشێوەیەکی جوان بجووڵێنەوە کە نەکەونە بەرلۆمەو تەشەری ئەم لاو ئەولا.

هەربۆیە براگەورەکەی سادق کە لە فەرانسەدا بوو، بانگ کرا. دەستی (هیدایەت)یان خستە ناو دەستی براگەورەکەیەوەو بەم جۆرە ئەو بەرپرسایەتییەیان لەسەرخۆ لابرد.

(عیسا هیدایەت)ی باوکم ماوەی مانگێک لەلای سادق مایەوە. بەپێی ئەو قسانەی کە باوکم بۆی گێڕامەوە، دەڵێ کە لەو ماوەیەدا هەوڵی داوە بەو جۆرەکە دڵخوازی سادقە، لەگەڵیدا بجووڵێتەوەو هەڵسوکەوت بکات. باوکم دەیوت کە هەوڵم داوە خۆم لە ئامۆژگاری کردنی بپارێزم. لەبەرئەوە کە ڕەنگ بوو سەرلەنوێ بیێتەوە هۆی وەخەبەرهێنانی هەستی خۆکوژی لەلایەوە. لەلایەکی تر بەرنامەی ڕۆژانەی ژیانی خستبۆوە دەست سادق. لەم بارەیەوە باوکم دەیوت دوای ئەوەی ماوەی لە چەند پزیشکێکی داخلی و دەمارو و دەروونناسی، بۆ سادق وەرگرتووە، بردوویە لای ئەوان. لەباری بەدەنیەوە هیچ کەموکوڕیەکی تێدا بەدی نەکراوە پزیشکێکی (دەروونناس) ئاوای پێ وتم: «مێشکی بەتەواوی ساغ و ئاساییە. تەنیا بەگومانەوە دەڕوانێتە جیهان. دەبێ ئەو گومان و ڕەشبینییەی لەبەرچاو لابدرێ یان ئاڵوگۆڕ لە شوێنی ژیانیدا پێک بهێندرێت».

باوکم دەنووسێ کە لە ماوەی مانگێک ئاگاداری کردنی (سادق)، «شەو و ڕۆژ لەگەڵی بووم و تەنانەت بۆ ساتێکیش لێی جیا نەدەبوومەوەو هەموو ئاکارو هەڵسوکەوتم خستبووە ژێر چاوەدێری، زۆر کات لەچایخانەی (دارکۆ) دادەنیشتین و قسە و باسمان دەکرد. نووسراوەکانی بۆ دەخوێندمەوە. منیش بیروڕای خۆم دەردەبڕی و هانم دەدا کە لەسەر نووسین بەردەوام بێت. بۆ وێنە سەبارەت بە «ستارە شکستە» و «مغکدە»، ڕای پێچەوانەم دەربڕی و ئەویش قبووڵی کرد. جگە لەوە کە ڕۆژانە بۆ ماوەیەک لە چایخانە دادەنیشتین و قسەو باسمان دەکرد، لەناو پارکەکانی پاریس و هەروەها دەوروبەریدا، لەناو دارستانەکان پیاسەمان دەکردو هەوڵم دەدا کە بۆ ژیانی ئاسایی بیگێڕمەوە. تەنانەت جارێک ئەو هەلەم ڕەخساند کە لەگەڵ کیژێکی فەرانسەویدا دۆستایەتی و پێوەندی نزیک دامەزرێنێ. هەڵبەتە سەبارەت بەوەی کە تەمەنی لەسەرێ بوو، هیچ دڵخوازیەکی لەسەر ڕەگەزی مێینە نەبوو و کاتی خۆی لەپێناو ئافرەتاندا بەفیڕۆ نەدەداو ئەوەندەی کە هۆگری خۆی بەنووسین، خوێندنەوەو تێبینی و لێکۆڵینەوە نیشان دەدا، بەو ڕادەیە لە ژێر کاریگەری هەواو هەوەسی بەدەنی خۆیدا نەبوو. هیچ هۆگری بەخواردنەوە ئەلکۆلیەکان نەبوو.

ئەو دەیویست کە بەتەواوی وشیارانە بەسەر کات و شوێن و هەموو شتێدا زاڵ و ئاگاداری ڕووداوەکان بێت. تەنانەت ئەو شەوانەی کە بۆ دڵخۆشکردن ڕوومان لەگازینۆکانی شەوانە دەکردو سەرمان لە کابارەو میوانخانەکان دەدا، بەهیچ چەشنێک دڵی بۆ خواردنەوەو سەماکردن نەدەچوو. لەو زەمانەدا، لەناو کۆڕو شوێنەگشتییەکاندا، ژنان و پیاوان زۆر دڵیان بە سەمای (فۆکستڕۆت)، (تانگۆ)، (والس)، خۆش بوو، بەڵام سادق تەنانەت نەدەیزانین و نەپێشی خۆش بوو فێریان بێت. ماوەیەک دواتر لەیەکێک لەوکارتە تایبەتییانەی کە بۆی

ناردبووم، نووسیبووی: لەبەرئەوەی کە سەما بە تەواوی بۆتە مۆدی ڕۆژ، ناچار بووە کە فێری بێ و بەگاڵتە نوسیبووی (سمتت بلەنگێنە بە قازانجە).

هەموو ئەو شتانەی کە باوکم لەسەر ڕووداوی هەوڵی خۆکوشتنی و ڕووداوەکانی دوایی گێڕاویەتییەوە، ئەوە دەگەیەنن کە سادق نە لەگەڵ ڕابواردندا بووەو نە لە فیکری وەدوا ئافرەت کەوتن، نە خواردنەوەو نەشتی پروپووچ، بەڵکو لاوێکی تەواو ڕاستەقینە و هۆگر بەزانست و ئەدەب و لێکۆڵینەوە بووە.

لەماوەی ئەو یەک مانگەدا باوکم بە ڕێکوپێکی باوک و دایکی سادقی لەوەزع و حاڵی ئەو ئاگادارکردەوەو بەوردی هەموو شتێکی لەنامەدا بۆ نووسیون. بەداخەوە هیچ ئاگادارییەکم لەچارەنووسی ئەو نامانە نییە. ئەگەر نامەکان لەدەست دابان، زۆر لەو قسەوباسە تەمومژاویانەی کە لەسەر سادقی هیدایەت دەکرێن، ڕوون دەبوونەوە.

دوای ئەوەی کە باوکم ماوەی مانگێک ئاگاداری لە سادق کرد، هاتە سەر ئەو بڕوایە کە ئیتر سادق هاتۆتەوە سەر حاڵەتی ئاسایی خۆی و ئیتر فیکری بێ هیواییانەی مەرگ خولقێن بەمێشکیدانایە. پاشان باوکم بەردەو شوێنی خوێندنی گەڕایەوەو سادقیش بۆ درێژەپێدانی خوێندن لە پاریس مایەوە. لەوکاتە بەدواوە ئەوان بەهۆی نامەو یەکتر دیتن لە ڕۆژانی کۆتایی حەوتوودا ڕۆژانی پشوو لەگەڵ یەکتر پێوەندییان هەبووە.

**نێوەندەکانی تاران**

سادقی هیدایەت دوای گەڕانەوەی لەفەرانسە لە نێوەندەکانی کۆبوونەوەی تاراندا شێوازی فەرانسەوی لەدەوری یەک دانیشتنی لە چایخانە، یان میوانخانە، یەکتربینین لەگەڵ دۆستان و ئاسیاوان و قسەو باس و ئاڵوگۆڕی بیروڕای هێنایەکایەوە لەتەواوی ئەو ماوەیەدا کە سادق لە تاران بوو، شەووڕۆژ لە چایخانە و میوانخانە جیاجیاکاندا، لەگەڵ دۆستانی لەدەوری یەک دادەنیشتن و زۆر بابەتی ئەدەبی ئەوکات و بەرهەمەکانی هیدایەت و خەڵکی دیکەیان دەخستە ژێر باس و ڕاوێژەوە. یەکەم دەستەی پێکهێنەری ئەم کۆڕانە دەستەی (ربعە)ی پێ دەوترا. دۆستانی ڕاستەقینەی هیدایەت ئەو کەسانە بوون کە هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی دۆستایەتییەکی نەگۆڕ و هەمیشەیی و بەدوور لە فروفێڵیان لەگەڵ هەبوو. (بۆ وێنە لەو کەسانە دەتوانین ناوی مەسعودی فەرزاد، بزورگی عەلەوی، موجتەبامینەوی و حەسەنی ڕەزەوی، ناوبێنین). هەروەها لەو نێوەدا هەندێک دۆستیش هەبوون کە لەنیوەی ڕێگادا تووشی جۆرە ڕایەک لە (نکوڵی لێ کردن) بوون و ئەوەی کە لە ڕابردوودا لەسەر هیدایەت وتبوویان یان نووسیبوویان، لە بیر خۆیان بردەوە یان حاشایان لێ کردو بیروڕایەکی نوێیان سەبارەت بەهیدایەت بڵاوکردەوە کە لەگەڵ ئەوەی پێشوویان جیاوازییەکی بەرچاوی هەبوو. نموونەی دیاری ئەو پاشگەز بوونە کتوپڕە دکتۆر (پەروێزی خانلەری)یە کە لەیەکێک لەوتووێژەکانیدا بێ پێشەکی و ئاکام لێ وەرگرتن شکی خستە سەر خوێندەواری و نووسەرێتی سادق! هەڵبەتا با ئەوەش لەیاد نەچێ کە ئەم کارەی دکتۆر خانلەری بەپێشنیاری (ئەسەدوڵڵا عیلم) و بۆ کەم ڕەنگ کردنەوەی ناوو ناوبانگی هیدایەت بوو. ئەم هەڵوێستە، (خانلەری) لەلای زۆر کەس شکاند. تەنانەت ئەو بابەتانەی کە لە گۆڤارەکانی ئەو دەمەدا، لەو پێوەندییەدا بڵاودەکرانەوە نیشانیان دا، کە مامۆستایەکی وەک (خانلەری) «هێشتا نەپێیاوە، هەڵی بڕیوە»..❖

**تێبینی:** ئەم بابەتە بەشێکی کورتە لە بابەتی (صادق هدایت ازربان برادرزادە اش). لەبەر درێژی بابەتەکە و بەش بەش بوونی بەباشمان زانی کە هەر ئەوەندە وەربگێرین کە هیچ لەناوەرۆکەکەی ناگۆڕێ.

**(وەرگێر)**

**و/لەفارسییەوە: شاخەوان عەزیزی**
**(سەردەشت)**

**سەرچاوە:**
(پژواک اراء) ژمارە (٤) ١٩٩٨.

---

# ڕۆمانی ئەڵەمانی و ململانێی نێوان نووسەرانی

دەکرێ دان بەو ڕاستییەدا بنێین کەوا ئەدەبی ئەڵەمانی لە وەتەی (گۆتە)وە، لەوانەیە لە پێشتریش جۆرە ململانێیەکی بە خۆیەوە بینیوە و لایەنی سەرەکی ئەو ناکۆکی و ململانێیەش (گۆتە) و نووسەرانی تری هاوسەردەمی بوونە. بۆیە (گۆتە) هەر زوو هەستی بەو بازووبادانە کردووە و لە ژیانیدا نووسەرانی وەکو (هۆڵدرن) و (کلیشێت) و نووسەری شانۆیی (لنز)ی ڕەت کردۆتەوە بە بیانووی ئەوەی ئەوانە خوددی و هزرپارێزن، بەڵام ئەگەر بە وردی هەندێک لە ڕۆمانەکانی (گۆتە) خۆی بخوێنینەوە ئەوە بێگومان ئەوانیش دەچنە پاڵ چیرۆکە خوددییەکانی (بۆخنەر) و (کلیشێت). کەواتە ململانێی نێوان نووسەران لە ئەدەبی ئەڵەمانی وەکو دیاردەیەکی گشتگیری لێ هاتووە و سەرجەم ئەدەبیاتی کۆنی ئەو زەمانەی گرتۆتەوە. بۆیە دەکرێ بڵێین زۆربەی نووسینە سەرەکییەکان خوددی و ڕۆمانین و تەنیا کەمێکیان ڕێبازی کلاسیکی و هوشیاری سروشتیان گرتووە. ئەگەرچی گشت ئەو گرفتانە لاوەکی و سەرتایین و بەشێکی کەمی ئەو نەخۆشییە گەورەیە دەردەخەن کە بەبێ جیاوازی تێکڕای نووسەرە ئەڵەمانییەکانی گرتبۆوە. هەرچەندە ئەو بابەتانەی کە (کافکا) نووسیونی و بە ئاشکرا دەری بڕیون و گوزارشتی لێکردوون زۆربەیان (خوددی) نین، بەڵکو بابەتێن و لەسەر هەردوو ئاستی هونەری و تەکنیکیدا بەپێشکەوتوو لە قەڵەم دەدرێن. هەر ئەو نووسینانەش یارمەتیدەری ئەوەن هزر و بۆچوونە تازەکان و پێشکەوتنە

تەکنیکییەکانی دوور لە ڕۆمانسیەت و زێدەڕۆیی کردن تیایدا لە بەرهەمەکانی (بۆخنەر) و (کلیشێت) بەدی بکەین، هەر لێرەشدا دەگەینە ئەو ڕاستییەی کەوا نووسەرە ئەڵەمانیەکان بەرهەمێکی زۆریان خستۆتە سەر کولتووری مرۆڤایەتی و خەرمانێکی گەورەیان لەم بوارەدا پێشکەش کردووە، چونکە بەرهەمەکانیان هەر تەنیا گوزارشت لە ئەدەبی ئەڵەمانی ناکات، بەڵکو نووسینەکانیان سنووری ئەورووپا و ئەمەریکایان بڕیوە و سەرتاپای جیهانیان تەنیوەتەوە. هەر ئەم نووسەرانە پێشبینیی ڕووداوەکانی سەدەی بیستیان کردبوو، هەروەها وێنەی ئازار و خەمەکانی ئەو چەرخە نوێیەی مرۆڤیان کێشابوو، بۆیە ئەمڕۆ کە بەرهەمێکی وەکو (چیرۆکی لینز) دەخوێنیتەوە، هەروەک ئەمەوایە بابەتێکی ژیانی ئێستامانت لەبەر دەست بێ، کەواتە چیرۆکی ئەڵەمانی هەوڵ دەدا دیمەنە گشتییەکانی ژیان ڕەنگڕێژ بکات و پیشانیان بدات، بە واتایەکی دیکە دەکۆشێ ڕەمزییەتێکی سەرتاپایی بێنێتەدی، دژی ئەو ڕێچکەیەی کە چیرۆکە ئینگلیزی و فەرەنسییەکان گرتوویانەتە بەر. کە ئاراستەیەکی جیایان هەیە و تیمەی چیرۆک تیایدا بەپێی پێویستی ئەزموونەکە پارچە پارچە دەکرێت ئەوەشی بۆ دڵنیابوونە لەوەی تا درێژدادڕی زیاد لە پێویست لە چیرۆکەکەدا نەکرێ یاخود درێژدادڕی لە ڕۆڵی کەسایەتییەکاندا بکرێت، بەڵام ئەمە لەلای نووسەرە ئەڵەمانییەکان بە تەواوی بەپێچەوانەوە دەردەکەوێ، چونکە هیچ کەسێک نییە ڕۆڵی (تۆماس مان) بەرز نەنرخێنێ، بەڵام فەرەنسی و ئینگلیزەکان زەحمەتێکی زۆر لەوەدا دەبینن لا لە بەرهەمەکانی بکەنەوە و بایەخی پێ بدەن، لەبەر ئەوەی نووسینەکانی کۆمەڵە هزر و بابەتێکی وای لەخۆ گرتووە فەرەنسی و ئینگلیزەکان ناچاردەکات فەرامۆشیان بکەن. (تۆماس مان) ئەو بورژوازیەی بوو بە هونەرمەندێکی هەڵکەوتوو بەرادەیەک هیچ کەس متمانەی پێ نەدەکرد بەتایبەتی ئەوانەی کە دەیانناسی یا ئەو زۆربڵێیانەی کە لە چایخانەکاندا کۆڕ و مەجلیسیان گەرم بوو. تۆماس لە بەدبەختی خۆی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە ڕێگایان نەدا چیرۆکەکەی بەناوی (مندالی و خەمێکی پێش وەخت) وەکو چیرۆکێکی سەرکەوتوو چاپ بکات، کە شایانی خوێندنەوە بێت، هەرچەندە ئەو چیرۆکە بە باشترین بەرهەمەکانی تۆماس لە قەڵەم دەدرێ. هەندێک لە ڕەخنەگران لە ڕیزی نووسینە سیحرییەکانیان داناوە، تیایدا کەسایەتییەکی نادیار بەرچاو دەکەوێ خواستراو لە کەسایەتی ئەو ڕزگارکەرەی کە بۆ دووەمین جار دەگەڕێتەوە میونیخ بۆ ئەوەی لە دژی بازرگانە تازەکانی هونەر بجەنگێ. هەرچەندە ئەم خواستە زۆر لە ڕاستییەوە نزیک نییە، بەڵام هۆشدارییەکی باش بوو، ئاماژەکردنێک بوو بە ڕووداوی کتێب سووتاندن لەلایەن سەربازان و چەتەنازییەکانەوە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکیش بەسەر نووسینی ئەم چیرۆکە، دەبینین تۆماس لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا پێشبینی ئەو ڕووداوانە دەکات کە لەسەردەمی دواتردا ڕوودەدەن. هەر هەمان پێشبینی لەو چیرۆکانە بەرچاودەکەوێ کە پێشتر هەریەک لە (بۆخنەر)، (کلیشێت)، (شفایتزەر) نووسیویانن. لە یەکێک لە چیرۆکەکانی (کلیشێت)دا دەبینین ناوبراو مرۆڤێکی ڕاستەقینە، کە بارودۆخێکی مێژوویی نەگۆڕی هەیە، دەکاتە کەسێکی نادیار و ونبوو. دەیباتە جیهانی خەیاڵی سیحری، هەروەها (شفایتزەر) لە ڕۆمانێکیدا بەناوی (بریجیا) مێژووی کردۆتە باکگراوەندی کەش و هەوای ئەو ڕۆمانە کاریگەرەی، تەنانەت (هۆخمان شال) لە ڕۆمانی (هەقایەتی سوارچاکان) چیرۆکێکی سەیر و دەوڵەمەند و پڕ مانای نووسیوە، بە بەکارهێنانی بارودۆخێکی مێژوویی تەواو. هەر لێرەدا یەکێک لە توێژەران پێش ڕووداوەکان دەکەوێ و بۆچوونەکانی خۆی لەبارەی ئەو هۆکارانەوە دەنووسێ کە پاڵی بەو نووسەرانەوە ناوە بۆ دەرخستنی ئەو دیمەنانەی کە زۆر جار لە مەودای تێگەیشتنمان دوورترن پەنا بۆ ڕووداوە ڕاستەقینەکانی ژیان دەبەن. ئەمەش بۆ ململانێی سەختی نێوان هوشیاری ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەگەڕێتەوە. یاخود بە دیاردەی ساغ و نەخۆشی نێو ئەو لێکۆڵینەوانەیان دەبەستنەوە کە هەوڵ بۆ وێکچوونی نێوان تاک و کۆمەڵ دەدات. ئەو تێزەی بووەتە یەکێک لە دەرهاویشتەکانی ئەو ڕاستییانەی باڵیان بەسەر مێژوو و جوگرافیای ئەڵەمانیادا کێشاوە. ئەو ڕووداوە ڕاستەقینانەی چەشنی بۆمبێکی تەوقیت کراو خۆیان مەڵاس داوە، ئەنجامێکی وای لێ کەوتەوە مرۆڤ هیچ باوەڕی بە ئەزموونە مرۆییەکان نەمێنێ و بەشتی پڕوپووچیان لە قەڵەم بدا، چونکە مرۆڤ وا هەست دەکات لەناو ژیانێکدایە کە پێشتر هەموو وردە کارییەکانی بۆ دەستنیشان کراوە و تەمەنێکی وا سەیر و سەمەرە دەباتە سەر کە هەموو شتێکی پێشوەخت بۆ بڕابێتەوە. کەوا هیچ شتێک لە ژیانی سەربازیی باشتر ناتوانێ ئەم تێزە جۆراوجۆرانە نمایش بکات. هەربۆیەش ئەم جۆرە ژیانە نەبۆتە شانۆی ڕووداوەکانی زۆربەی ئەو چیرۆکە ئەڵەمانیانەی کە لەم سەردەمەدا نووسراون. سوپا بە سیستەمە ئاسنینەکەی مرۆڤ گەمارۆ دەدات. دوور لە جەنگ و ژیانی ناو سوپا و سەربازیش، سەیر و سەمەرەیی مردن بە سروشت و ئافرەت و خێزانەوە وێنەیان دەکێشێ. کە دواتر دەبنە خەون و ورێنە تاوەکو حاڵەتێکی خەون ئاسای پڕ لە ئەوین و مەرگ و ژیان لە بارودۆخێکی مێژوویی دیاریکراودا ڕەنگڕێژ بکەن.

لێرەدا دەتوانین بڵێین نووسەرە ئەڵەمانیەکان لە نووسینی ڕۆماندا زیاتر گرەوی سەرکەوتنیان بردۆتەوە نەوەک لە کورتە چیرۆکدا، چونکە لە دووەمیاندا مەودای دەربڕینی ژان و ئازارەکان کورتترە و ڕووداوەکان کەمتر ئامانجەکان دەپێکن. نووسەرە ئەڵەمانیەکانیش لە هەموو کەسێک زیاتر دەرکیان بەو ڕاستییە کردبوو.

**و: تاهیر عوسمان**

**سەرچاوە:**

الزمان، ژ«١٨٤٥» ڕۆژی (٢٦/٦/٢٠٠٤).

# ئەو ملکێ کوردان

## گوتنی: سەعید ئاغا جزیری



ئەو ملکێ کوردان چەند خێر و بێرە
ئالیک مەعدەنە ئەم زێر و زیوە
ئەز ئیرۆ چبکەم مایە ل خەلکێ را
هەی ئامان، ئامان، سەدجارا ئامان
خەلکێ وان کوشتێ هەر دایێ چەمان
چەند شیر و حاکم ناو مەدا نەمان
هەر کەس (قوام)بی ئەم هەر (پەیا)ماین
ئەو (مەلیکێ) کوردان (تەمام کار نینە)
هەر مێرک کوردان ب سەد مێرینە
ئیرۆ ئەم کەتین م کەسەک نینە
هەر مێرک کوردان حەفسەد مێرینە
ئیرۆ ئەم کەتین، ئاخ ئەم بێ خۆینە
ئەو ملکێ کوردان، هەموو سەیرانە
ئەو جێ هەمی، جێ یێ غەمانە
ئەو دنیا هەمی، جێ یێ غەمانە

فەرهەنگۆک:

١- ملکێ کوردان: مەبەست کوردستانە.

٢- قوام بوون: مللەتان گەیشتن بە مافی خۆمان.

٣- پەیامان: ئێمەی کورد نەگەیشتین بە مافی خۆمان.

٤- مەلیکێ کوردان تەمام کارنینە: سەرکردەکانی کورد یەکگرتوو نەبوون.

* ئەم گۆرانییە رامیارییەی (سەعید ئاغا جزیری) باسی سەردەمی میری عوسمانی و سەردەمی (ئەتاتورک) دەکات لەبارەی ڕەشەکوژی کوردانەوە، کە داوای مافی ڕەوای خۆیان دەکرد لەسەر خاکی دابەشکراوی کوردستان، کەچی بە ئاگر و ئاسن و ئاوارەکردن و سووتانی دێهاتەکان وەلامیان دەدانەوە، هەروا باسی خاکی کوردستان دەکات کە هەمووی زێڕ وزیو و مەعدەنە، داگیرکەران کەلکی لێ وەردەگرن، هەروا باسی ئازایەتی و مێرچاکی کورد دەکات، بەلام دەلێ، حەیفو سەدمخابن سەرۆکەکانی یەک دەست نینە و دوژمنانی کورد سوودیان لێ وەرگرتووە. بۆیە زۆربەی میللەتان بەمافی ڕەوای خۆیان شادبوون، تەنها ئێمە لە کاروانی ڕزگاری بەجێ ماوین.

هەندێک دەلێن ئەم شیعرە رامیارییە شیعری شاعیری نیشتمانپەروەر «جگەر خوین»ە.

** سەعید ئاغا: ناوی تەواوی هونەرمەند «سەعید کوڕی محەمەد»ە، بە سەعید ئاغا جەزیری بەناوبانگە، لە گوندی (عەندیوەر) سالی (١٩٠٠) لە دایک بووە، لە کوردستانی ڕۆژئاوا.

ئەم هونەرمەندە بەوەستای لاوک و بەستە دەژمێردرێت، گەرووی هونەرمەند پڕ بوو لە ئاواز و گۆرانی ڕەسەنی کوردی، دەنگی یەکجار خۆش و زولالە، چینەکانی دەنگی بەرز و کاریگەرن، خۆی و بنەمالەکەی هەستی نەتەوایەتییان بەهێزبووە.

لەنێو لاوک و بەستەکانی لەکاتی تۆمارکردنی لە بەغدا لە کۆمپانیای (هیز ماستەرس فۆیس) و کۆمپانیای (چەقماقچی) بژی کورد و کوردستان (سەعید ئاغا)، تۆمارکراوە.

لە سالی ١٩٥٨ بە نەخۆشی (قورگ) لە شاری (بێرووت) چووەتە بەر دلۆڤانێ خودێ و تەرمەکەی دەگوێزنەوە (دیاربەکر) و بەخاک دەیسپێرن.

**ئا: جەلال مەلا حەسەن خۆشناو**

**سەرچاوەکان:**

١- هاوکاری ژمارە/ ٥٠٢ لە ١٩٧٩/١٢/٣.

٢- هاوکاری ژمارە/ ٥٠٣ لە ١٩٧٩/١٢/١٠.

٣- کاروان ژمارە/ ٣٠ لەسالی ١٩٨٥.

٤- کاسێتی تۆمارکراوی سەعید ئاغا جزیری.

# داهێنان لەبەردەم نائومێدیدا



**جەبار جەمال غەریب**

* ئەگەر مەبەستی ماکس ڤێبەر بە «نائومێدی جیهان» مەبەستی بێ ئومێدی دنیا بووبێ لە خەیاڵە بێسەروبەرەکانی، یان مەبەستی دابڕانی ئینسان بووبێ لە تەفسیرە وەهمییەکانی بۆ دیاردە سروشتی و نهێنییەکانی ژیانی خۆی، ئەگەر نائومێدی جیهان لای ماکس ڤێبەر نائومێدی جیهان بێت لەو هەموو خۆهەڵواسینە کوێرانەیەی بە دەزووە وەهمییەکانی ئاسمانەوە، ئەنجامێکی سەرەتایی ڕۆشنگەری بووبێ، ڕەوتی تازەگەری ئەوەی بەسەر ئینساندا سەپاندبێ کە تەفسیرە موقەدەسەکانی کەنیسە چیدی لەبەردەم دۆزینەوەکانی زانستدا خۆناگرن و ئینسان بۆی دەردەکەوێ ئەو سەدانەی لێیانەوە هاتۆتەدەر چ تاریکن، «نائومێدی جیهان» هیچ نییە، جگە لە دەرکەوتنی ئەو ڕاستییەی کە مرۆڤ کائینێکی تەنیا و بێ پشت و پەنایە و بێجگە لە خودی خۆی، بێجگە لە عەقڵ فریادڕەسێکی دیکە نییە.

* «نائومێدی داهێنان» یان نائومێدی ئێمە لە داهێنان کەشفکردنی کام حەقیقەتە؟ ئەو نائومێدییە قورسەی ئێمە دۆزینەوەی کام ڕاستییە؟ بێ ئومێدییە لە کام لەو ساڵە تاریکانەی لێیانەوە هاتووین؟ کەشفکردنی چ وێرانەیەکی ئەدەبی و داهێنان و شارستانییە؟ بێ ئومێدییە لەو باوەڕهێنان و تەسلیم بوونەمان بە تەفسیرەکانی مزگەوت؟ نەکرانەوە و نەگۆڕانی ئاستی ڕۆشنبیریمانە بۆ ئەبەد؟ ترسی پووچەڵکردنەوەی ئەو قەناعەتەیە کە ئێمە لە بوارەکانی فیکر و هزردا باڵاین؟ ترسی بە خەسارچوونی ئەو لاپەڕە و زەمەن و خەیاڵەی لە ئەدەب و ژانرەکانی بەرگریدا بە خەرجمان دان. ناکرێ خۆمان لەو ڕاستییە بدزینەوە چ نەهامەتییەکە! چ نائومێدییەکی درێژخایانە لە داهێنان، چ قەیرانێکی کوشندەی تازەبوونەوە و زیندووبوونەوەیە؟!

* ئەگەر وەهمەکانی دنیا، خەیاڵە بێ بنەماکانی، ئەو ئومێدانەی لاهووت دابوویە مرۆڤ لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا جیهانی نائومێد کردبێ، بەڵام هەر ئەو سەردەمە پەنای بۆ زانست برد و عەقڵی بە چاکترین و بە وەفاترین هاوڕێی مرۆڤ زانی، زانست و کرانەوەی کۆمەڵگا «نائومێدی جیهان»ی لە فەنابوون ئازاد کرد. ئینسان توانی بە تەواوی ئاگاییەوە پێوەندی لەگەڵ خوادا دروستکاتەوە، پێوەندییەک ماهیەتی «تاکخوازانەی» خۆی تێیدا ڕەنگ بداتەوە، پێوەندییەک تەنیا لەنێوان خۆی و خوادا دابێ و کەسێک بە ناوی قەشە و کەشیش و ڕابەرەوە لێڵی نەکات.

* ئەگەر «نائومێدی جیهان» ڕزگارکەرێکی لەگەڵ خۆی هێنابێ، ڕزگارکەری «نائومێدی داهێنان» لای ئێمە چییە؟ گواستنەوەی کۆمەڵگا لە شارە گوندئامێزەکانمان بۆ ناوجەرگەی دێهاتە پڕ مۆبائیلەکانە؟ بۆ ناوجەرگەی گوندە ئینتەرنێتەکانمان، بۆ ناوجەرگەی گوندە گەورە دووکەڵەییەکانمان، چ مژدەیەکی بۆ «نائومێدیمان» هەڵگرتووە؟ ئەو گوندە گەورە و جەنجاڵانەی کاتیان بۆ تەئەموول کوشت؟ شوێنێکیان نەهێشتەوە بۆ بیرکردنەوە و دەزووی ڕوحێکیان نەهێشتەوە بۆ شاعیر، ئەو کۆمەڵگایەی ئومێدی وەهمەکانی کوشتێن، ئەو کۆمەڵگایەی خوای وەک دادپەروەرێک و ڕوحی داهێنان لێستاندینەوە و یاسایەکی نەداینێ پێی بژین.

* داهێنان لە چ پەرستگایەکی ڕەنگاوڕەنگەوە سەرمان لێبدات؟ لە کام دەزگای چاپ و «پڕ داهێنانەوە» سڵاومان لێبکات؟ لەسەر مێزی چ داهێنەرێکی مەست بنیشێتەوە؟

* لە دوای پچڕانمان لە ڕابردوو، لە دوای ئەوەی شانازی وەهمی و پیرۆزی نەتەوەیی، بێگەردی ئەخلاقمان چیدی هەموو ماناکانیان بۆ پڕ نەکردینەوە، زانیمان ئەو دەستەواژانە چ بەتاڵن، ئەو دنیایە بەسەرچوو شتەکان هەموو لە یەک مانادا کۆکاتەوە و ماهیەتی ئینسان بۆ یەک تاکە مەبەست بێ؟ لەو نائومێدییەدا تازەگەریی سەری لێنەداین و ڕۆشنگەری نەبوو بە ئومێدمان، زانست لە پڕکردنەوەی ماناکاندا یارمەتی نەداین.

ببوورن دنیای یەک ڕەنگمان لەدەست چوو، دنیای سەد ڕەنگیشمان بۆ دروست نەکرا.

